

بەرگی دووەم

ڕۆمان

د.ئەحمەد خالید مصطفی

# ئەنتیخریستۆس

وەرگێڕانی : فەیسەڵ هەمەوەندی




فێربوون

# ئەنتیخریستۆس


- بەرگی: دووەم
- بابەت: رۆمان
- نووسینی: ئەحمەد خالید مستەفا
- وەرگێڕانی: فەیسەڵ هەمەوەندی
- دیزاینی ناوەوە: محمد حسین خەتی
- دیزاینی بەرگ: ئیبراهیم صالح
- لەبڵاوکراوەکانی: ناوەندی فێربوون
- زنجیرە : ١٤١
- نۆرەی چاپ: یەکەم - ٢٠٢٢
- تیراژ: ١٠٠٠ دانە
- ژمارەی وشە: ٧٦،٠٠٠ وشە
- قەبارە : ١٤سم × ٢١ سم
- نرخ : (٧٠٠٠)

**لە بەڕێوبەرایەتی گشتی کتێبخانە گشتییەکان**

**ژمارە سپاردنی (٧٤٢)ی ساڵی (٢٠٢١)ی پێدراوە**

د. ئەحمەد خالید مستەفا

# ئەنتیخریستۆس

بەرگی دووەم

ڕۆمان

وەرگێڕانی
**فەیسەڵ هەمەوەندی**

**ناوەندی فێربوون**

بۆ چاپ و بڵاوکردنەوە

بەڕێوەبەری گشتیی ناوەند: عیماد ڕەشید

بەڕێوەبەری چاپ و بڵاوکردنەوە: ڕەنج عیماد




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون - ژمارە (١٤١)

ناونیشان / هەولێر بازاڕی کتێب فرۆشان - بەرامبەر دەرگای قەڵا

٠٦٦٢٢٣١٣١٥ - ٠٧٥٠٤٠٤٨٢٨٥



ktebxanay ferbwn

## ئامازەکردن(١)

هەموو کەسایەتییەکان لە بنیادەم و جنۆکەو شەیتانەکان کە ناویان لە ڕۆمانەکەدا هاتووە، کەسایەتی ڕاستەقینەن، هەموو ئەو ڕووداوانەش کە گێڕدراونەتەوە، لەڕووداوی ڕاستەقینەوە وەرگیراون.

***

## ئامازەکردن (٢)

ئەوە چ سەرسامییەکەتە لەخوێندنەوەی ئەم ڕۆمانەدا، ئەوە مانای ئەوەیە کە تۆ حەزی زۆرترت لە ئاشکراکردنی ژوورێك لە کتێبەکاندا هەس، تا ئەو سەرسامییەت بڕەوێنیتەوە.

***

ژوورێکی چکۆڵە، لە خۆم و خۆت بەولاوە کەسی تری تێدا نییە.

ڕووناکییەکی کزۆڵە، نە تۆ ڕوخساری من دەبینیت و نەمنیش دەموچاوی تۆ دەبینم.

کەسێك بەهێز لەدەرگاکە دەدات، چون ئەوەی بیەوێت دەرگاکە بشکێنێت.

گرەوت لەتەکا دەکەم، دەرگایەك بەو بێ هێزییەی خۆی بۆ یەك خولەکیش خۆی بۆ ڕاناگیرێت.

خۆ ئەگەر نووکە دەرگاکە بکەنەوە، بێشك ئەوەی نەشێت بەجەستەمی دەکەن و دواتریش لەسێدارەم دەدەن.

مرۆڤ لەیەك خولەكدا چی پێدەكرێت؟!

لێمگەڕێ بە چرپە چرپ پێتبلێم، لەم جیهانەدا دوا هیوا و ئاواتم تۆ دەبیت. ئەگەر ئەم پەرتووكەی منت پێگەیشت، دانیشتبویت، دەستبەجێ لەشوێنی خـۆت ڕاسـتەوەبە و لەبەرچـاوان خـۆت ونبكـە و بەتـەنێ بكـەوەرە خوێندنەوەی.

ئەگەر بەشەو دەستت بەخوێندنەوەی كرد، چاوەڕوانی ڕۆژ مەبە، خۆ ئەگەر بـە ڕۆژیـش شـانت لەخوێندنـەوەی قـایمكرد، چـاوەڕوانی شـەو مەبـە، تـا بەتەواوی لێی دەبیتەوە

هەر چاوێك چاوی بەم كتێبە خشاند، هـەر گوێچكەیەكیش گوێڕایەڵی بـوو، ئەوا داواكراو دەبێت.

تۆ هیچ پەناگەیەكت دەست ناكەوێت.

یا ئەوەتا هەر ئێستا دەتبینن، یا بەم نزیكانە ئامادەگییان دەبێت.

شتگەلێك لە جنۆكەو بنیادەم لەهـەموو لایەكـەوە دووت دەكـەون، هـەر وەك چۆن منیان ڕاوكرد، هەر بەو شێوەیەش ڕاوت دەكەن.

خولەكەكە تەواو بوو؟

دەنگی شتێك دێت، یاری بە قوفڵی دەرگاكەوە دەكات!

ئەوەتا دەنگی چكە چكی قوفڵەكە وەك زەنگی ڕوحكێشان بەگوێمدا دێت.

***

# ریوایەتی (نوسوول)

وێنەیەکی زیندووی ناو شاشەی کۆمپیوتەرکە.

لای پشتەوەی شاشەکە ئەستێرەیەکی شەش لای دڵگوشەرت لێوە دیارە، هێمای ماوسەکە لەگۆشەیەکی شاشەکە وێستاوەو ناجووڵێتەوە.

لەپڕ دەکەوێتە جووڵە..

بە پەلە کەوتبووە گەڕ، دیاربوو منەی شتێکی دەکرد، دەستی بە هەڵدانەوەی هەندێ لیست کرد.

ئایکۆنی کردنەوەی کامێراکەی دۆزییەوە.

ماوسەکە لەوێ وێستاو دوو کلیکی لای چەپی لەسەر کرد.

شێوازی ماوسەکە بۆ چاوەڕوانی وەرچەرخا، ئەوجا کامێراکە کرایەوە، لەدەرکەوتەی کامێراکەوە پەخشێك دەرکەوت.

ژوورێکی بنمیچ داخوراو، پانکەیەکی کۆنی پێوە هەڵواسراوە، سووک سووک دەخولایەو و نووزەیکی کزی لێوە دەهات، مینا نووزەی کەسێك دەهاتە بەرگوێ.

بەدوو کلیکی تری ماوسەکە وینەی کامێراکە پڕاو پڕی شاشەکەی گرتەوە.

لەناکاو چەکێك لە کارمەندێك نزیکەوەبوو، دواتر وێنەکە بۆ چەند ساڵێك وەك ئەوەی کوێرەوە بووبێت، تاریکبوو.

ئەوە دەستی کەسێکبوو، کامێراکەی بەدەستەوە گرتبوو تا ڕاستی بکاتەوە.

خشە خشێکی زۆر لەڕاستکردنەوەی کامێراکەدا هات، تا گەنجێکی نابووت و ناشرینی ددان زەردەوبوو دەرکەوت، نابووتییەکەی زیاتر لەچاوەکانییەوە

بوو، لەچاوانی شێتێك دەچوون، ڕوخسارە ناشرینییەکەی لەشاشەکە نزیکەوە کردو گوتی:

- ئەم شتە نەفرەتییە تۆمار دەکات؟

لەپشتییەوە گەنجێکی قژ درێژ دەرکەوت، دەموچاوی لەشاشەکە نزیك کردەوە، ئەگەرچی چاوەکانی خەواڵوو بوون، بە هاوڕێکەی گوت:

- ئەوە گرفتی گەمژەیلی وەك تۆن، ئەوەتا دوگمەکە بەرامبەر چڕوچاوتە، نایبینی؟

هەردووکیان دەمامکی گوێرەکەکەیان پۆشی، ئەوجا لەگۆشەیەکی شاشەکەوە وشەی(REC) بەڕەنگی سوور دەرکەوت، بەو ئاوایە گەمژەکە ریکۆردەکەی خستە گەڕ، لەچاوەکانییەوە نیگایەکی هەفپەیڤین دیاربوو، بەو شێوازەی کە ریکۆردەکە دەبینێت، ئەوجا گەمژەکە گوتی:

- ئەمشەو بەچاوی خۆتان لەم شوێنەوە لەسێدارەدانی کەسێکی گۆشەگیر دەبینن.

گەمژەکە بە هەردوو قامکەکانی دۆشاومژەو ئەسپێ کوژە چڵمە شۆڕەکەی تووڕدایە سەر زەوییەکەو ئەوجا دەمامکەکەی پۆشییەوەو گوتی:

- ناوی (بۆبی)یە، ئەویش کە فەرمانی لەسێدارەدانی بۆ دەرکردووە، باوکێتی، هەڵوێستی نەفرەتی واتان بینیوە، باوك فەرمانی لەسێدارەدانی کوڕەکەی بدات.

- لیۆبۆڵد.. ئێدی بەسە ئەم ئەمریمەنە نەفرەتییە بەمرۆڤ ناوزەد بکەین.

لیۆبۆڵد تەماشای کامێراکەی کردو گوتی:

– ببووره بیرم چوو، هەموو ڕێکخراوە باڵاکان نزیکەی ساڵێکە بەدوویدا دەگەڕێن، تا پێی بگەن، دەڵێی شەیتان تفی بە دەویدا کردووە، وا خۆی ونکردووە، مەگەر خودی شەیتان جێگای پێ بزانێت، ئێمەش بە ڕێکەوت شوێنەکەیمان دۆزییەوە.

هاوڕێکەی دەستی بەرزکردەوەو گوتی:

– بەڕێزان باوابێت، چاوە نەفرەتییەکانتان زەق زەق بکەنەوە، هەر ئێستا ( بۆبی فرانك)تان پیشان دەدەین.

هەردووکیان لەبەرامبەر کامێراکە دوور کەوتنەوە، تا هەرزەکارێکی دەست و پێ لەکۆتا دەرکەوێت، چاوەکانی لەترسا زەق زەق دەیانڕوانی، یەك لە دوو هاوڕێکە ئیشارەتی بۆ ئەویتر کرد، تا پەخشەکە ڕابگرێت. لیۆبۆڵد داچەمییەوە سەر کۆمپیوتەرکەو ڕیکۆردەکەی ڕاگرت، هەردووکیان دەمامکە گوێرەکەکەی داکەند، چاوەکانی لیۆبۆڵدی گەمژە بە ڕقەوە تەماشای هەرزەکارەکەیان دەکرد، گوتی:

– دیمەنی داهاتوو لەڕیکۆردکردن گرتەی لەسێدارەدانتە، لە تیزابت هەڵدەکێشین، ئەوە تەنها ڕێگای ڕێکخراوە بۆ کوشتنی هەرکەسێك نهێنی ئاشکرا بکات، بەڵام چارێ نا. لویب با هەوڵجار ئەوەی لەسەری ڕێککەوتین، ئەوە ئەنجام بدەین.

لویب.. بە قژە درێژەکەیەوە لە هەرزەکارەکە نزیکبووەوەو گوتی:

– ئەمە یەکەمجارە لەجیهانی ڕێکخراوی نهێنیماندا، خودی سەرۆکی باڵای ڕیکخراوەکە لە ئەمریکا کە باوکی نەفرەتیتە( یاقووب فرانك) فەرمانی لەسیدارەدانی بۆ دەرکردووی، ئەگەرچی کوڕی تاقانەی ئەو باوکەشیت، تۆ خاوەن هزرێکی بەهێزیت، بەوای ئەوەی باوکت

بەردەوام دەیوویست جێگرەوەی بێت، بەڵام وەك خۆفرۆشێك لەو ڕێكخراوەیە هەڵگەڕایتەوەو هەڵهاتی، دوای ئەوەی كۆمەڵێك زانیاریت لا درووست بوو، كە بەر دەستی كەس نەدەكەوت، هەندێ لەو یادەوەرییانەت بۆ ڕای گشتی بڵاوكردەوە، ئەی هیچ و پووچی نەفرەتی، دوای بەدواداچوونمان بۆ ئەوەی بڵاوت كردنەوە، بۆمان دەركەوت زانیاری سەرەتایی بوون، كە دیسانەوە بەلای ئێمەوە نهێنییەو دەزانین خەڵكی بە ئاسانی لەوە حاڵی نابن، پێمان بڵێ، ئەودوای نهێنییەكانت لەكوێ داناوە؟ لەكوێ شاردووتنتەوە؟

لویب دەمامكەكەی لابرد و لە پرتەو بۆڵە بۆڵی خۆی نەكەوت، لەپڕ لیۆبۆڵد لەیەخەی كراسەكەی گرت و ڕایكێشا و گوتی:

- لویب ئەم نەفرەتییە لەتەكمانا نایەتە ژێر بار.

بۆبی ترسێك دایگرت، یا بڵێین تۆقی، كاتێك گوێی لەهێنانەوەی دەمانچەیەك بوو، لەگەڵ ئاوڕدانەوەی لەپشتی خۆی لویبی بینی دەمانچەكەی تاقی دەكردەوە، گوتی:

- لیۆبۆڵد دان بەخۆتا بگرە، كارێك بەم ناجسنە وا لێدەكەم بەكەس نەكرابێت.

لویب چنگی لەقژە سەری گیركردو كەللەی پێ بەرزكردەوەو گوتی:

- هەتیو بۆبی.. دەزانم حەزت لە گەمەی نەفرەتییە، تۆ لەتەك خەڵكیدا گەمەی (ئیلۆمیناتی)یت دەكرد، نهێنییە سەرەتاییەكانی ڕێكخراوت ئاشكرا دەكرد، بۆیە ئێمەش گەمەیەكی لەو بابەتەمان بۆت ئامادە كردووە، یارییەك دوا دواییت بێت، وەڵ با لەتەكدا ڕاستگۆ بم، ئەگەر هەموو گێمێكت تا كۆتایی بڕی، ئەوا سەرفراز

دەبیت، خۆ ئەگەر لە هەر گێمێکدا دۆڕایت، بەم چەقۆیە پارچەیەك لە ئەندامەکانی جەستەت لێدەکەمەوە، گەمەکەش بەردەوام دەبێت تا دەمریت و بۆگەن دەکەیت.

بۆبی فرانك.. بە ترسەوە لێی ڕوانی و لەولاشەوە لویب درێژەی پێداو گوتی:

- گەمەکە لەسەر ئەم مێزە دەکرێت، بەکارتگەلێك و لەشێوازێکی تر، شێوازێك بۆنی مەرگی پێوەیە.

بۆبی بە دڵەکوتەوە لەمێزەکەی ڕوانی، لیبۆڵدیش کارتەکانی (ئیلۆمیناتی)یەکانی هاویشتە سەر مێزەکە، کارتگەلێکی جیاوازبوون، لەوانی پێشووتر نەدەچوون، لیۆبۆڵد لوولەی دەمانچەکەی نایە ژێر چەناگەی بۆبی و گوتی:

- ئەی سەرکزی وریا، هەی نەفرەتی، چاوت بە گەمەکە کەوت، بەڵێ کارتی (تاروت)ن، کە لەگەنجینەکەت دەستمان کەوتووە، کارتگەلێکی تێکەڵاوە، لە کارتی کۆن و نوێ، لە سێزدە بەشدا دانراون.

بۆبی بە پەژیوانییەوە لەکارتەکانی ڕوانی، کە زۆر تایبەتبوون و دەستی ئەو نەگریسانە کەوتوون. لویب لوولەی دەمانچەکەی زیاتر لەچەناگەی گیرکرد و گوتی:

- بۆبی.. ئەم گەمەشمان لەدوو بنەما زیاتری تێدا نییە.

ئەوجا لوولەی دەمانچەکەی لەدەوی بۆبی نا، گوتی:

- بنەمای یەکەم.. لەهەموو گێمەکانی کارتەکاندا، کۆمەڵێك لەو کارتانە ڕادەکێشیت، ئەوجا بەپێی ڕیزبەندییان دەڕوانیتە وێنەکانی

سەر کارتەکەو دەکەوێتە شرۆڤە کردنیان، بەو ئاوایەی نهێنییەکانی باوکت وێیداوێت، بۆمانی ئاشکرا دەکەیت، زیاتر مەبەستی ئێمەش ئەو نهێنییە قووڵانەی تەنها لەپلە باڵاکاندا باسی لێوە کراوە، کۆدی ئەو کارتانە کە ئەندامانی ڕێکخراوەکە لەو وێنانەدا شاردوویانەتەوە، کەسیش لێیان حاڵی نابێت، تەنها و تەنها ئەوانەی وەك باوکت لەپلەی باڵادان.

لیۆبۆڵد دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ و فیشەگی خستەبەر، گوتی:

– بنەمای دووەم.. ئەگەر نهێنییەکت پێگوتین و ئێمە دەمانزانی، یا یەکێکمان کە ئەندامی ڕێکخراوەکەین بەلامانەوە شاراوە نەبوو، ئەوە مانای ئەوەیە ئەو زانیارییەی لاتە هیچ نییەو دەستی ئێمە نادات، گێمەکە دەدۆڕێنیت، ئەوجا منیش ئەم چەقۆیە لەجەستەت گیر دەکەم و پارچەیەکی لێدەکەمەوەو لەبەرامبەرت دایدەنێم، نەخەڵەتابیت درۆ بکەیت.

لیۆبۆڵد چەقۆیەکی سویسری لە گیرفانی دەرهێناو بۆبی پەلکیش کردە لای مێزەکەو پێیگوت:

– هەی هیچ و پووچ، دەی ئەو دەستە کلاوانەت درێژ بکەو یەکەمین کۆمەڵە ڕاکێشە.

بۆبی لە کارتە دەمەوقوڵپکراوەکان نزیکەوەبوو، بەدەستە لەرزۆکەکانی ئەو کۆمەڵەیەی ڕاکێشا، کە پێنج کارتی لەخۆ گرتووە، کەسیش هیچی دەربارەیان نەدەزانی.

کارتی یەکەم..کارتی شازنی جوان و دڵڕفێن، وێنەی ئەهریمەنێکی بەسەرەوەیە، کۆمەڵێ داوی فرتوفێڵاوی و هەڵخەڵەتاندنی بە دەورەوەیە.

کارتی دووەم.. کارتی ئەهریمەنە، وێنەی شێوازی دانیشتنێکی ترسناکی ئەهریمەنی بەسەرەوەیە کە بە چوارمشقی ڕۆنیشتووە.

کارتی سێیەم.. کارتێکی ئێرەیی بردنە، وێنەی ژن و پیاوێکی دڵخوازی بەسەرەوەیە، لەپشتی دارێکیشەوە ئافرەتێك ئێرەییان پێ دەبات.

کارتی چوارەم.. کارتی داری ژیانە، وێنەیەکی خەیاڵئامێزی داری ژیانی بەسەرەوەیە، کە بەرهەمەکەی ڕووناکییە.

کۆتا کارت.. کارتی شەوێ لەدڵتەنگی، وێنەی شوێنێکی ناخۆشی نێوان دوو چیا و گورگ و دووپشکی تێدایە، مانگیش لەسەرووی ئەمانەوە، مانگ وێنەی مرۆڤێکی غەمبار دەداتەوە.

بۆبی فرانك تفی ناو دەمی قووتدا، بە پەشیمانییەوە دیقەتی زەوییەکەی داو ناچار دەستی بەگێڕانەوە کرد.

***

# بەشی یەکەم

## سەرەتا سێ بوون
## ۷۰۰۰ پێش زایین

### مرۆڤ کە چاوی لەدوای خاکبوو، دەبێت بە وێرانە

خاکێك.. مرۆڤ زۆر منەی کرد و سوسەی کرد، تا چاویان کوێربوو، کەس ئەو خاکەی نەدۆزییەوە، تەنها هەندێك نەبێت، هەر کەسێکیش پێی زانیبێت نەیدرکاندووەو لای خۆی شاردوویەتییەوە، لەو خاکەوە سەربوردەکان دەست پێدەکەن. لەسەردەمانێکی زۆر کۆندا، ڕەنگە نۆ هەزار ساڵ لەمەوپێش بووبێت، تاوێرە شاخی سەوزباو تا چاو بڕ بکات، تافگەی دڵڕفێن لە چەپ و ڕاستیدا هەر وەك ئاوێکی زوڵاڵ بۆ ناو ڕووباری نیل دەهاتە خوارەو، وا نەزانیت ئەوە (نیل)ی ئەفریقایە، ئەوە (نیل)ێکی ترەو لەشوێنێکی ترە، وەك زوڵاڵ بەنێو ئاژەڵانی (لیزۆ)ی خۆڵەکەوەیی تێدەپەڕێت، باڵندە زەبەلاحەکانی (تیراتۆ)ن بەسەرمانا دەفڕین و دەمێکیش بۆ توینێتی لە لێواری ڕووبارەکە دەنیشتنەوە، (مار)گەلێکی فرە گەورە لەسەرخۆ لە لێواری ڕووبارەکە دەگەڕان.

لەنێو هەر هەموو ئەمانەش وێنەی دەستێکی گەنمڕەنگی پیاوێك کە بەلای ئەسمەرییدا دەیڕوانی، دەرکەوت، ئەویش مرۆڤێکە هەر وەك من و تۆ، چیلکەدارێکی بەدەستە لەرزۆکەکەی گرتووە، خشتێکی قوڕ لەبەردەمیدا، هەوڵی نووسین دەدات، وەلێ دەستە لەرزۆکەکەی ڕێی وێنادات، پیاوێکی بالاّ بەرزی ڕوخسار جوان و قژ لوول درێژ، کە تا سەرشانی شۆڕبووەتەوە، لەسیلەیشیدا پەرییەك بەناوی (ڕازئێل) لەسەر شێوەی بنیادەم وێستاوەو بۆ دڵنیایی دەڵێت:

– سرات.

ئەوە وشەیەکی (عیبری) کۆنە، پەرییەکە وشەکەی بۆ دووبارە کردەوە (بنووسە)، زەلامەکە دەستە لەرزۆکەکەی ڕێگربوو لە نووسین، ئەوجا بۆ جاری سێیەم پەرییەکە پێی گوتەوە:

– ئەگەر ئەم چیلکە بێ بایەخەت بخەیتە سەر خشتە قوڕەکە، ئەوا نهێنیی پێنووست دەبێت و دەبیت بەگەورەی هەموو گیانلەبەران، کە بەسەر ئەم زەوییەدا گوزەران دەکەن.

پیاوەکە دەستی بەنووسین کرد، بەو نووسینە فێری زۆر شت بوو، لەگەڵ ڕازئێل کەوتە گەشتکردن و تەماشای خولقێنەرەکانی خودای دەکرد، کە بەدەوروبەرییەوە بوون، تا بەگردێکی بەرز گەیشتن، لەبان گردەکەوە تەماشای دەریای کرد، چاوی بەو دیمەنە دڵفرێنە ئەبڵەق بوو، ئەو شەپۆلانەی سەر دەریاکەی بینی، بەلایەوە زۆر سەرنج ڕاکێش بوون، شارگەلێکی بینی وێنەیان نەبوو، دەیانڕوانییە سەر دەریاکەو خانووەکان بە چیاکەوە دەتگوت ئاوێزانن، تەمومژ دایپۆشیبوون، پیاوە گەنمڕەنگەکە گوتی:

- پازنێل ئەوانەی ئەویٚ چین؟

پازنێل.. چاوە ڕەنگ سەوزەکانی کز کردنەوەو گوتی:

- ئەوە خەڵکانێکن، باشتر وایە لێیان نزیك نەبیتەرەو ئەوانیش لێت نەیەنە پێشەوە، نەخەڵەتابیت بیر لەوە بکەیتەوە بچیتە لایان، تەنانەت دڵیشت بۆ ئەویٚ نەجووڵێت.

پیاوەکە بەدڵەڕاوکیوە دیقەتی ئەو شارگەلەی دەدا، ئەو پیاوە پاك و بێگەردە باوکمە، باوکی تۆشەو هی هەموو بنیادەمەکانە، ئەوە (ئادەم)ە.

***

# کوندەبوویەک و مارێک و ژنێک لەیەک جەستەدا

دوو لێوی تەڕو ئاودار، لەشۆخیدا وێنەی بۆ نییە، ڕوخساری سپیکەڵانەو برژانگی درێژ و پرچێکی پڕو ڕەنگ نارنجی بۆ دواوە هەڵدراوە، بە ڕەزێکی گەورەی سەرزەمینی (عەدەن)دا گوزەری دەکرد، با پرچەکەی دەژاکاندو کراسەکەی هەڵدەدایەوە، خۆی لەنێو دارستانێکدا مەڵاس دا، ڕێک لەبن دارێکی گەورە، پەری فێری کردبوو قەدی دارەکە هەڵکۆڵێت، تا تێیدا نیشتەجێ بێت، ئەگەرچی گیانەوەرەکان بە لاییەوە تێدەپەڕین، وەلێ هیچ ترسێکی لێ نەنیشتبوو، دارە گەورەکە بەدەم ڕەشەباکەوە لارە لاری بوو، ئا لەو دەمەدا ڕاچڵەکی، نەبادا دارەکە بەسەریا بکەوێت، لەپڕ دارەکە لە لارە لار کەوت، زەوییەکە شەقی برد، جەستەی بەهێزو ڕوحی بەهێزتر هاواری لێکرد:

- سامنجلۆف!

دەنگێک لەناخیدا چون تیرێک چەقی، دەنگی بەسەر پەرییەکەوە هەڵبڕی، ئەوی لەشێوەی بنیادەمدا و ڕزگاری کردبوو، لێ خەتەرناکییەکە نەبڕابووەوە، مارێک چون ئەوەی شاڵاوبەرێت لە لقەدارێکەوە بەرەوەبوو، سەری لێ بەرزکردەوە، لەنکاو دەستی ژنەکەی لێ ڕاستەوەبوو، لەملی مارەکەی گرت، مارەکە خۆی ڕاپسکاندو بەرەوەبوو، سەری بەرز کردەوە، تا دارەکەی تێسروێنێت، پەرییەکە سەری لە ئازایەتییەکەی سوڕما، دواتر هاواری لێکرد:

- لیلیس.. دوورکەوە، ژارەکەی کوشندەیە.

پێیەك بەهێز مارەكەی بەزەوییەوە پان كردەوە، ئەوجا بەدارێك سەری مارەكەی پان كردەوە، لیلیس بە حەپەساوییەوە لەخاوەن پێیەكەی ڕوانی، كە جەستەیەكی بەهێزی هەبوو، ڕوخسارێكی ساف و بێ گەرد، ئەویش ئادەم بوو. لەیەكەم ڕێكەوتی دیداری لەتەك ژنی یەكەمدا، (لیلیس)ی بەدلاّ چوو، لێی پرسی:

– تۆ ئادەمی؟

بەدەم دیقەتدانییەوە، هەموو بیرەوەرییەكانی هەڵفڕین، گوتی:

– تۆ دەمناسیت؟

لیلیس بە ڕوویەكی خۆشەوە گوتی:

– نامناسیت؟ تۆ لەبەر من بۆ ئێرە نەهاتوویت؟ منیش دەتناسم، ئەو زانیارییەی لای تۆ گەلاّڵە بوو، لای منیش هەس.

ئادەم بە دەنگێكی نەرم گوتی:

– تۆ لەمنیت و منیش بۆ تۆم، تۆ لەكوێیت، منیش لەوێم.

بەچاوە زۆرزانییەكەیەوە گوتی:

– ئەی تۆ لەكوێوە هاتیت؟

– خودا بەدەستی خۆی خوڵقاندمی و دواتریش تۆی لەمنەوە درووست كرد...

قسەكەی پێ قاچی و گوتی:

– خودا چییە؟

ئادەم بەوای پرسیارەكەی لیلیس لەترسا چاوی زەق هەڵگەڕا و گوتی:

- خودا خەڵقەندەی هەموو شتێکە، ئێمەش بەندەی ئەوین.

لیلیس بە ڕوحی ڕەشییەوە هاواری کرد:

- بینیوتە؟ خودا لەکرێیە، دەترسێت خۆی دەربخات؟ ئەوەی دەیەوێ بەندەی ئەو بێت، با بەندەی ئەو بێت، من بەندەی کەس نیم و ناشبم بە بەندەی کەس.

ئادەم دڵی کەوتە خورپە، نەیدەزانی لیلیس چییە، ئەو قسەی خۆی کرد و دوورکەوتەوە، لیلیس کوفری کرد، پێشتر نە بنیادەم و نەیش فریشتەو جنۆکە کوفری وایان نەکردووە، بەحەپەساوییەوە لێی ڕوانی، هەستی کرد ڕوحیان بەیەکە نەدەساکا، وەك ئەوەی دڵی بە بەردەوە چووبێت.

***

## ئەهریمەن فریوی دا.. یا خۆی هەڵخەڵەتاند؟

لە تاریکی و ئەمووستەچاوی شەودا لیلیس لەکەنار دەریای عەدەن بە ژێر تیشکی مانگەشەوەوە وەستابوو، بیرۆکەگەلێك لەمەڕ ئادەمەوە دڵی ناڕەحەت کردبوو، ئاخر ئادەم لەتەکیدا زۆر نەرم و نیان و بەسۆزبوو، سەری نەوی کرد و لە ئاوەکە تەماشای خۆی کرد، جوانییەکەی لەناو ئاوەکەدا جێی بەخۆی نەدەگرت، لەپڕ شتێك هات بەهزریداو وایلێکرد ترس ئامبازی بێت، وای بەخەیاڵدا هات وێنەیەکی تر لەناو ئاوەکەدا دەرکەوتبێ، ڕوخسارێکی نابووت و ناشرین، ما خۆی لەناو ئاوەکە نزیکتر بکاتەوە، وەلێ لەپڕ خەیاڵەکە بەسەر ئاوەکەوە نەما، بەپێخاوسی چووە ناو ئاوەکە،

سێبەرێك بە بەری پشتییەوە بەبان ئاوەكەوە دەركەوت، كەسێك لەپشتییەوە وێستابوو، بەشڵژاوییەوە لای لێكردەوە، هیچ بوونەوەرێكی نەبینی، بەلام چاوی بەو ئاژەڵ و باڵندانە كەوت، هەڵدەهاتن، لیلیس بە ترسەوە لەدەورووبەری خۆی دەڕوانی، ئەوجا لەسەرخۆ لای لەپشتی خۆی كردەوە، هیچ سێبەرێكی نەبینی. بەر لەوەی لیلیس بیر بكاتەوە، لەپشتییەوە چرپەیەك هات، ئەمجارە ڕوحیشی ڕاچڵەكی:

– ئاوەكە تێڕوانینتی شێواندووە، ئەی بنیادەم جلوبەرگەكەت داكەنەو دابەزە ناو ئاوەكە تا جلوبەرگەكەشت نەشێوێنێت!

ئەمجارەیان بەتووڕەییەوە ئاوڕی لەپشتی خۆی دایەوە، بەرامبەری گرت و مات لێی بڕوانێت، هەموو شتێك بەلایەوە نامۆ بوو، پیاوێكی پیرو گۆچ، ددانێكی كەم لەدەویدا، چەند تاڵەموویەكی خواروخێچ بەچەناگەیدا شۆڕببوەوە، عابایەكی ڕەشی ونجڕ ونجڕی لەبەردابوو، لیلیس بەزمانێكی توند گوتی:

– تۆ چیت؟

سەری بەلای چەپدا وەرچەرخاند، بێ ئەوەی چاو لەچاوەكانی ببڕێت و گوتی:

– من (حارس)م.

هاواری بەسەریا كردو گوتی:

– تۆ لەو نیشتینگا ڕەنگاو ڕەنگانەی شاری نێو دەریای؟

لەسەرخۆ لێی نزیكبووەوە، بەدەنگێكی كز چون فیشكەی مار پێیگوت:

– ئەوێ نیشتمانی منە، وەلێ بەوای تۆوە ئەوانیشم بیرچووەتەوەو دووراو دوور دووت كەوتووم.

بەوریاییەوە گوتی:

– بۆچی کەوتوویتەتە دووم؟

بەدەم سەر بادانییەوە بەلای چەپدا، گوتی:

– تۆ لەو هزرمەندتر و داناتری، لەڕاستیدا تۆ زیرەك و جوان و نەشمیلی، جوانی وەك تۆم لەسەر زەوی نەبینیوە.

دواتر پەشیمانی درۆزنانەی بەسەروسیمایەوە دەرکەوت، کاتێ لەجەستەی ڕوانی، گوتی:

– ئەم لەشولارە جوان و قەشەنگەت هی ئەوە نییە لە دارستاندا بژێیت و قەدی دار بکەی بەنیشینگەی خۆت، جوانی وەك تۆ لای ئێمە شاژنن.

لیلیس بەخۆیدا هاتەوەو خۆی بادا و گوتی:

– ئێوە کێن؟

بە پەنجەی دۆشاومژەی ئیشارەتی بۆ ئەو شارانە کرد، تەمومژی دەریایان لەخۆگرتبوو، پێیگوت:

– خاکی ئێمە زۆر لەخاکی ئێوە دڵڕفێنترە، خاکی ئێوە تەنها دوو بوونەوەری تێدایە، وەلێ ئێمە گەلێك زۆرین.

خۆشییەك بەناخیا ڕۆچوو، بی ئەوەی دەریببڕێت، گوتی:

– بمبە بۆ نیشتنگەکانتان.

بە ددانە شاشەکانی زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، بەدەم ڕۆیشتنەوە لای لێ کردەوەو گوتی:

- ناتوانین لەڕێی دەریاوە بڕۆین، وەرە با لەڕێی چیاکانی ئاکرۆزییانی سوورەوە بتپەڕێنمەوە.

لیلیس دووی (حارس) کەوت، وەلێ گوێی لەکەسێکبوو هاواری لێکرد و گوتی:

- لیلیس!

ئەویش سامنجلۆفی فریشتە بوو، پێیگوت:

- لیلیتۆ.. دووی مەکەوە، ئەوە ئەهریمەنە.

لەگۆشەنیگایەکی چاویەوە دیقەتی دا، دواتر ڕووی لێ وەرگێڕاو لەتەک شەیتان کەوتە ڕێ، نەیدەزانی لەتەك چ ئەهریمەنێکدا دەڕوات، چ هەڵەیەك دەکات، ئەوەی دووی خۆی خستبوو، هەرماسێکی ئاسایی نەبوو.

***

## بۆ ئاشتی خەڵقەندەبوویت، وەلێ ئاشتەواییت لێوە دوورە

لەتوونێلێکی نێو چیاکانی ئاکرۆزییان لیلیس بەدووی شەیتانەوە دەڕۆیشت، نەیزانی بۆچی لەپڕ بیری (ئادەم)ی هاتەوە، بەتایبەت لەم ساتەدا، دیارە بەوای ڕووخۆشییەکەیەوە بووبێت، یا بەقسە خۆش و نەرمەکانیەوە بێت، چی وایلێکرد دووی ئەم شتە بکەوێت؟ لەپڕ شەیتان وێستا، ڕوخساری لەنێو تاریکییەکەدا وا دەرکەوت باڵابەرز و بەهێز بێت، لەسەرخۆ لای لێکردەوەو عاباکەی لەسەر خۆی لابرد، لیلیس دڵی کەوتە خورپەو کەمێك بەرەو دوا گەڕایەوە، چاوی لەبەژنوباڵا بەرزەکەی و قژە قەترانییەکەی کە بەسەر

شـانییەوە شـۆڕببوەوە بـڕی، ئـەو سەروسـیما گەنمڕەنگـەی وایلێکـرد لەدڵەڕاوکێدا بێت، بەتووندی پێیگوت:

– تۆ کێی؟

بەو تێڕوانینەی سەری لێ نـەوی کـرد و چاوەکانی زەق زەق کردنـەوە، وەك ئەوە وابوو بەڕوحیدا ڕۆچێت، پێیگوت:

– ئەی بنیادەم.. چاوەکانت ترس نایاتپرووکێنێت، ڕوحیشت وەك مار سەرکێشی دەکات، من لۆسیفەرم، خەزنەداری ئەم سەرزەوییە.

لـەتێڕوانین و قسانیش کـەوت، بەدوویـەوە ڕۆیشـت، تـا گەیشـتنە نیشـتنگە ڕەشەکان، وەك ئەوەی بەسەر دەریاوەبن، لێـل شـەپۆڵەکان دەجووڵانـەوە، هەرلەوێ چاوی بە گیانەوەرە مل درێژەکان کەوت، لەدەریاکەدا گوزەرانیـان دەکرد، گومبەتگەلێکی سوور چون گومبەتگەلی کۆشـك دەرکـەوتن، شـەیتان دووی خـۆی خسـت تـا گەیشـتنە شـاری جنۆکـەکان، کـە بەبـەردی گـەورەو زەبـەلاح بنیـاتکرابوون، هـەر بەسـەر یەکـەوە لەکەڵەکـە بـەرد دەچـوون، لەناوەندی هەر هەمووشیان و لەنێو تاریکییەکەدا چاوێلێکی ڕەشی بریقـەدار دەرکـەوتن، جێیـان بـەخۆیان نـەدەگرت، دواتـر چـاوەکان زیادیـان کـرد، شـێوەگەلێك لەجنۆکـەبوون، بەدەوریـدا گردبوونـەوە، یـەکێکیان هەڵیـدا و گوتی:

– باوکە.. ئەمە چییە؟

لۆسیفەر بۆ ئەوەی لیلیس پێی بزانێت، پێیانیگوت:

- ئەمە هاوڵی ئەو بنیادەمەیە، ئەوەی خودا لەسەر زەوی کردی بەجێنشینی خۆی، لەکوفرا گرتم، هێشتا مانگێک بەسەر خەڵقەندەیی تێپەڕ نەبووە.

لیلیس هەستی کرد بە ناڕەحەتی لێی دەڕوانن، یەک لەبەساڵاچووەکان هاواری کرد:

- خوانەناسە.. خوانەناسە.

کۆمەڵێ جنۆکەی منداڵ بەدەوریانەوەبوون، ئەوانیش بۆیان سەندەوە، خوانەناسە.. خوانەناسە.. خوانەناسە.

***

## بەکەللەسەرەکان ناخی زەوی سیخناخ دەکات، بەوانەی دووی شەیتان کەوتوون و وادەزانن ئەو لەسەر هەقە

ناتوانێت لیلیس ناڕەحەت بکەیت و لەخۆشیدا بمێنێت، لەپڕ لیلیس شاڵاوی بۆ ئەو جنۆکەیە بردو لەناقرگەی گرت، وەلێ هەر زوو سەری سوڕما کە بینی دەستی بەناو جەستەی جنۆکەکەدا وەک ئەوەبوو بەناو تیشکا ڕەتبووبێت، تەن نەبوو، بەترسەوە لێی کشایەوە، شەیتان دایە قاقای پێکەنین، لەپڕێ هەمووان بێدەنگ بوون، هەموو جنۆکەکان ئاوڕیان لەدوای خۆیانەوە دا، بەدوو ڕیزی ڕێك و بەرامبەر یەك بە شکۆوە وێستان، وەك ئەوەی ڕێگا بۆ کەسێك چۆڵ بکەن، ئافرەتێك بەدەرکەوت، لیلیس بەوردی دیقەتی دا، هەستی بەکۆتایی خۆی کرد. ڕوخسارێکی کەوەیی، چاوانی بەکل کرابوو،

پرچی بە پەلکی ڕەش و سپی بەردابووەوە، ئەوە (وازییە) بوو، ژنی یەکەمی لۆسیفەر، بەدەنگێکی هێمن و لەسەر خۆ، گوتی:

- ئەی بنیادەم.. فریشتەکەت ئاگاداری نەکردووی کە ناتوانیت ئازاری جنۆکان بدەیت؟

لیلیس بەرسقی نەدایەوە، ما بە ڕقەوە لێی بڕوانێت، تا وازییە هەڵیداو گوتی:

- ئەی بنیادەم.. تۆ بەفەرمانی ئەهریمەن لێرەیت، هیچ ئازارێك نادرێیت، بەتایبەت ڕوحت بە ڕوحی خوداوە دیواربەند کراوە.

لیلیس لەسیلەی وازییە ڕۆیشت و لەجنۆکەکانی دەوروبەری خۆی دەڕوانی، وازییە پێیگوت:

- تۆ بەخودا خوانەناسی؟

لیلیس بەخۆڕاگرییەوە وەڵامی دایەوە و گوتی:

- باوەڕم بەشتێك نییە بەچاواتی خۆم نەمبینیبێت.
- دەبێ بڕوات بەو چاوانەت نەبێت، تۆ ئێمە وەك جنۆکە دەبینیت، ئەوە لەبەر ئەوەی تازە خەڵقەندەی، ناخت بێگەردە، ئەم جەستە جوان و نەشەنگەت بەرەو لەززەتەکانت دەبات، ڕوحت لەتێڕوانینماندا قورس دەکات، وەك ئەو ئاژەڵانەت لێ دێت، ئەوانەی لەدارستانەکەدا بینیت، لە بینینی جنۆکەو ڕوحەکان نابینان.

لەشوێنێکی کە زۆر دوور نییە، لۆسیفەر لە لیلیس دەڕوانێت، لەپڕ دەنگێك لەخوار خۆیەوە لەتەکیدا کەوتە قسەکردن و گوتی:

- دەزانیت ئەم ئافرەتە چی لەدەست دێ، ئەگەر ئەو ڕاستییە بزانیت لێی حاڵی دەبیت؟

لۆسیڤەر چرنووکە درێژەکەی نایە سەر لێوی و گوتی:

- هەموو شتێك دەسووتێنێت.

لۆسیڤەر دەمێك بێدەنگی ڕاگرت، دواتر ڕوانییە خۆاری خۆی و گوتی:

- لەوباوەڕەدایت ئەوێك لەناوماندایەو ئەوەی لەدەست بێت؟

***

## ژاری مارەجنۆکەکان ڕوحەکان دەکوژێت

ڕۆژگار تێدەپەڕێت و شەویش لە تاریکی خۆی ناکەوێت، چاوانی لیلیس سۆسەی هەموو شتێکی دەکرد، هەموو شتێك لەو دەڤەرە دڵ دەخاتە خورپەوە، ئەو قەومەش بەشەو نەبێت دەرنەدەچوون، کاتێ ڕۆژ دەبووەوە، سایەکانیان پێ سەیر بوو، وەك ئەوەی بیانەوێ بەپیرییەوە بچن، بەو خاکە ڕەشەی خۆیان دەگوت دەیجوور، ئەو ئێوارەیە و بەنێو سایەی دارەکان خاکی دەیجوور بوونەوەرێك ڕسکا، هەر جنۆکەیەکیش گوێی لەدەنگەکەی دەبوو، بلەز خۆی لەنیشنگەکەی دەناو دەرگای لەسەر خۆی کڵۆم دەدا، مینا هەموو سرووشت لەناو خولقابێت و تەنها ئەو لەژار خەڵقەندە بوویێت، هەرچەندێ بە وشەکانی دەیفیشکاندە سەر هەر دەڤەرێك، خەڵکەکەی لە ئاشـــتەواییدا هەڵدەگەڕانـــدەوە ســـەر داوێنپیســـی، لەباوەڕبوونیشـــدا هەڵیانیدەگێڕایەوە سەر خوانەناسی، ئەوە هەوەڵین شەوبوو لەمێژوودا ئەو بوونەوەرە بەرەو ئاراستەیەك ڕۆیشت، کە لیلیس بوو.

لەناو کۆشکی بەرەش ڕووپۆشکراو، لیلیس کە دەنووست، پەنجەرەکەی لێوە دوور نەبوو، مانگ بەرەو پڕبوون دەچوو، هەورێکی خۆڵەکەوەیی بەدەورەوە بوو، لەناو بێدەنگیدا دەنگێک وەك فیشکاندنی مارێکی زەنگۆڵەدار هات، لەپەنجەرەکەوە خۆی بەژوورا کرد، بەرەو جەستەی لەخەودا ڕۆچوو، ڕۆیشت، لووتی لەسەروملی نزیك کردەوە، وەك ئەوەی بیەوێت بۆنی بکات، لیلیس خەوی سووکبوو، بێ هیچ پێشهاتێك ڕاچڵەکی و لەخەوەکەی ڕابوو، چون ئەوەی شەیتان دەستی لێدابێت، هەر کە بێدار بووەوە، هەستی بە بوونی باڵندەیەکی ڕەش کرد، لەبەردەم پەنجەرەکەی هەڵفڕی، دڵی خورپەی کرد، هەستیشی کردبوو، گوێی لەدەنگی باڵندە ڕەشەکەبووە، وەلێ لەدەنگی باڵندە ڕەشەکە نەترسابوو، ئەوە دەنگێکی تربوو، لەنزیك پەنجەرەکەوە هاتبوو، دەنگەکە لەفیشکەی مار دەچوو.

لەسەرخۆ ڕاستەوەبوو، لەپەنجەرەکە نزیکبووەوە، ترپەی دڵی لەزیادبووندابوو، چاوەکانی بەشتێکەوە لەتەنیشت پەنجەرەکەوە کەوتبووە ڕەشکەوپێشکە، یا کەسێك لەتاریکییەکەدا ڕوون نەبوو، یا ترس ئەو هەستەی تیا ڕسکاندبوو، بەرلەوەی هەنگاوێکی تر هەڵبێنێت، لەنێو تاریکییەکەدا گوێی لەدەنگێکبوو:

- ئەمڕۆ پەرلەبشی نێو دارستانەکە نییت؟

دەنگێکی ژنانەی ناسك، کە ڕوحی دەبووژاندەوە، بوونەوەرەکە لێی نزیك بووەوە، تیشکی دەرەوەی پەنجەرەکە سیمای ئاشکرا کردو بەجوانی ڕوخساری بینی، دیمەنەکە زۆر لەدەنگەکە نامۆتر بوو، هیچ ڕوخسارێکی مێینەی پێوە دیار نەبوو، کۆسە ڕوخساربوو، موو بەدەموچاوییەوە نەبوو، عابایەکی بەسەرەوە، لەتەوقی سەرییەوە تا قوولەپێی داپۆشیبوو، نەیدەزانی نێرە یانەخۆ مێ، لیلیس پێیگوت:

- تۆ کێی؟

ڕووە ڕووتەکەی لەژێر عاباکەوە دەرکەوت و بەرسڤی دایەوە:

- بە سێرینت ناوزەدم دەکەن.

بەر لەوەی پرسیاری تری لیٚ بکات و لێی حاڵی بێت، ئەو وتەیەی پێگوت کە هەژاندبووی:

- وامدەزانی جوانترین و قەشەنگترین سیماو ڕوخسارت هەن.
- واو!
- هاوڕێکەتم بینیوە، ژنێکی جوان و وریاتری لەتەکدابوو.
- ئادەم!
- خودا ئەمڕۆ بەهەشتیان پیٚ دەبەخشێت، بەهەشتی مەزن(جان ئەکویلۆ)، هەرچی تۆی لێرە لەنێو جنۆکەو شەیتانەکاندا تڕۆ کراویت.

ئەوەندەی پێنەچوو لیلیس لەدەرەوەی خاکی دەیجوور گیرسایەوە، کۆشکی ئەهریمەنی بەدڵپڕی و دڵشکاوەییەوە جێهێشت، چون ئەوەی ئاوری تێبەربووبێت، سەرە ڕۆیانە کەوتە گەڕ بەدوای (ئادەم)دا.

***

## نێرەیی بردن مارەکەی کوشت

لەشیرین خەودا بوو، ڕوحی بەنزاو پاڕانەوە بەدووی ڕووناکیدا وێڵبوو، دواتر خەونێکی سەیری بینی(( ژنێك بەوپەڕی جوانی و نازدارییەوە سەمای دەکرد، پیاوێلێکی زۆریش بەدەورییەوە لێی ڕامابوون، کوت و مت

لە(لیلیس) دەچوو. لەنێو پیاوەکانیش پاشای وڵات بەجۆش و خرۆشەوە لە لەشو لاری سەماکردنەکەی دەڕوانی. ئەویش زۆر بەنازێکی مێینانەی خۆی و بەدەم سەماکردنەکەیەوە نیگای تێبڕیبوو)).

ئەوە خەوتی (ئادەم)بوو، سووك و لەسەرخۆ چاوی کردەوە، لەسەر زەوی عەدەن ڕاکشابوو. هەر کە چاویشی کردەوە، وای هاتە بەرچاو ئافرەتێکی پرچ ڕەش بەسەر سەرییەوە وەستاوە؛ هێشتا نیمەتەکە بەبەر چاویەوە ون نەبیوەوە. کچێکی جوانی چاوبرۆ قەوی و دەموچاو ڕووناك لەبەرامبەریدا دەرکەوت، پێستێکی گەنمڕەنگ. ئەگەر چاوت تێبڕی ڕوحت دەگەشێتەوە، جوانێك بەو پرچە خاو و لوولەی کە تا سەرشانی هاتبوو، وێنەی نەبوو، هەر کە چاوی پێکەوت ناسییەوە. چونکە ڕازێل خوێندبیە گوێی پێیگوت((ئەوە حەوایە)). بزەیەك گرتی و دڵی بۆ والآ کرد و گوتی:

- تۆ (حەوا)یت؟

بەدڵپاکییەوە لێی ڕوانی و گوتی:

- بۆ دەبێت من (حەوا) بم؟
- چونکە گەنمڕەنگیت و ژیانەوەش لەڕوحتدا هەیە.

ئەوجا شتێکی بیرهاتەوە، کە دڵەڕاوکێی پێ خستبوو؛ بۆیە بەوریاییەوە لێی پرسی:

- لەکوێوە هاتوویت؟

زۆر بەسادەیی پێیگوت:

- لەتۆوە.

دڵی دلکەوت و پێیگوتەوە:

- تۆ لەمنیت و منیش نیشتنگەی تۆم، تۆ لەکوێ بیت لێلتدام، ئەگەر ڕوحیشم پەرتەوازە بێت، تۆ کۆی دەکەیتەوە، کاتێکیش کۆم دەکەیتەوە، ئەوا خۆت کۆ دەکەیتەوە.

بەو وتەیەی خەنیەوە، حەوا ڕوح سووکی و سۆزی خۆی بۆ دەربڕی، نیگاکردنی سیحراوی بوون، قسەکانی ئارامی پێ بەخشی، لەخودای داوا کرد هاوڵێکی هەبێت، خوداش ژنێکی پێ بەخشی. ئادەم.. ئەوەی خودا فێری کردبوو، حەوای فێر کرد، ئەو ڕۆژەی لەپاین چیای (ماتاریمۆن)ی پێدەشتە سەوزەکەی فریشتەی پایەبەرز (ڕازئێل) هاتە لایان و پێیانی گوت:

- خودا کە بینی کردەتان باشە، فەرمانی داوە لەبەهەشتی خاکی( ئەکویلۆ)دا نیشتەجێتان بکات.

ئیشارەتی بۆ گردێکی پڕ لەدارو درەخت کرد، کە دیمەنێکی دڵڕفێنی هەبوو، ئەوێ خاکی ئەوان دەبێت، ئادەم و حەوا دڵیان بەوای ئەو بەخششە و ئەو بەهەشتە دڵڕفێنە کەوتە هەڵفڕین. فەرمانی خودایان بەجێ گەیاند و دەستیان نایە دەستی یەك و بەرەو ئەو بەهەشتە بەڕێکەوتن، لەم ئانوساتەدا بوو، ڕازئێل لە دوای خۆیەوە هەستی بەشتێك کرد، هەر کە ئاوڕی دایەوە، لۆسیفەری بینی لێیان ڕاماوە، ڕازئێل بەدەم ڕێوە بە (ئادەم)ی گوت ئیشارەتیشی بۆ لۆسیفەر کرد:

- ئەی ئادەم.. بڕوانە ئەو بوونەوەرە عابا ڕەشە، ئەوە لەجنۆکەکانە، ئەوەی نیشینگەکانیانم نیشان دایت، ئەو دوژمنی تۆ و هاوسەرەکەتە، ئێوەش نەچنە بن باری و تا پێتان دەکرێت دژایەتی بکەن، ئاگادار بن لەم بەهەشتی خودایە وەدەرتان نەهێنێت، دواتر تووشی دەردەسەری و مەینەتی زۆر دەبن.

ئادەم دیقەتێکە قووڵی لۆسیفەری دا، (حەوا)ش هەروەسا، دواتر پشتیان تێکرد و لێل ڕازئێل بەرەو بەهەشت کەوتنە ڕێ، ئەودەم ڕازئێل گوتی:

- ئەی ئادەم.. بەهەشتی جان ئۆکیلۆ بەهەشتێکی پیرۆزە، لەوێ نوێژ و نزاو پاڕانەوەمان بۆ خودا دەبێت، گوناە لەوێ مەحاڵە، هەرچی گوناهێك بێت، نابێت بکرێت، ئەوێ نەبرسێتی تێدایە نە تینێتی، نە گەرما و نەسەرما و نەیش ماندوویێتی.

ئادەم و حەوا بەرەو بانی گردە پیرۆزەکەی بەهەشت ڕۆیشتن، دیمەنێك هەڵوەستەی پێکردن، گۆڕەپانێکی گەورە، ڕووباری نیل بەنێویدا تێدەپەڕی، دەروازەیەك بۆ ناو تونێلێك، بەهەموو سەردەمەکانەوە تا ئەمڕۆش کەس دەروازەی مەزنی وای نەبینیوە، دوو تەلاری هەرە بەرز لەخشتی مەرمەڕی سپی، هەردوو کۆشکەکە وەك دوو ستوونی بەهەیبەت لەناوەندی ڕووبارەکە بەرز بوونەتەوە، بەبەری پشتی ئەو دوو تەلارەوە ئاسۆ و هەور دیارن، بۆن و بەرامەی بەهەشت، بۆنی (مسك)ی لێ دەهات، هەردووکیان بە توونێلەکەدا تێپەڕین، فریشتەیەك بە جلوبەرگی ئاوریشمینەوە ڕوو بە ڕوویان بووەوە، سڵاوی خودایان لێکرد.

ئادەم و حەوا بەدەم تێڕوانینیان بۆ دەوروبەری خۆیان چوونە ژوورەوە، چیاکان بە سەوزایی و گوڵ و گوڵزار داپۆشراوە، سرووشتێکی هەتا بڵێیت دڵی دەکردەوە، ئاو لەهەموو لایەکەوە هەڵدەقوولآ، کەش و هەوایەکی خۆش ڕوخساری دەبووژاندەوە، لەنێو ئەو هەموو جوانییەی بەهەشتدا هات و دڵیانی داخورپاند.

فریشتەیەك بە عابایەکی ڕەشەوە، دەموچاوی لەتاریکی ژێر عاباکەوە دیار نەبوو، فریشتەیەك بوو لەسەر زەوی هیچ مرۆڤێك نەبووەو نابێت لەسەرە

مەرگدا نەیبینێت، ئەویش( پێمەردە)بوو، ئەوە ڕوحی مرۆڤەکان هەڵدەکێشێت، لێیان نزیکەوەبوو، پێیانی گوت:

- ئادەم و ئیڤا.. هەرچی گوناهەکانی بنیادەم و جنۆکەکانە کە دەیزانن، نابێت لێرە ئەو گوناهانە بکرێت، هەرچی مێوەی دارەکانی بەهەشتە بیخۆن، تەنها و تەنها ئەو دارەی لەوێیە لێی نزیك مەبنەوە.

ئادەم و حەوا بۆتاوێك لەدارەکەیان ڕوانی، ئەو دارەی فریشتەکە یاساغی کرد، دارێکی سەوزی گەورە، پڕە لەبەری زەردی شەقبردوو، ناوێکی سووری چون ڕەنگی خوێن، وەك چاوێلێکی سوور لەدوورەوە دەبریقانەوە، هەروەك ئەوەی بزانن چی ڕوودەدات.

***

## شتەکان لەخودی خۆیاندا نەفرەتکراو نین، ئەوە ئێمەین ئەو نەفرەتییانە دەسازێنین

لیلیس چون ئەوەی دڵی ئاوری گرتبێت، هەر وەك ئەوەی بیەوێ ئەو گڕەی ناخی لەخاك بەربدات، بەهەڵەداوان بەدەم کەناری دەریاکەوە بەرەو ئەو چیایەی سەرچاوەی ئاوەکەی لێ دەهاتە خوارەوە، ڕۆیشت، چیای (ماتاریمۆن)ی سەوز، کە بەهەشتی (جان ئەکۆیلۆ)ی بە بانەوەیە، وەلێ بەرد و تاوێری ئەو چیایە هی ئەوە نەبوون پێایدا هەڵگژێت، بەدەوری چیاکەوە کەوتە گەڕ، تا شوێنێك بۆ سەرکەوتن بدۆزێتەوە، هەناسە بڕکێی پێکەوت،

لەدامێنی چیاکە لۆسیفەری بینی، چاوەکانی بە ڕقەوە تێبڕی، لۆسیفەر بەدەم تەماشاکردنی بۆ ترووپکی چیاکە گوتی:

- ئەو بەهەشتەی سەرەوە میوەگەلێکی پێوەیە جۆری نییە، فریشتەکان بەهەموو شوێنێکدا بڵاوبوونەتەوە، تا ئاکانجییەکان ڕێنمایی بکەن.

لیلیس هاواری بەسەریا کرد:

- دەدەی بمگەیەنە ئەوێ، هەر وەك چۆن بۆ خاکە ڕەشەکەتان بردمت.
- ناتوانیت بۆ ئەوێ بچیت، ئەوێ بۆ هەموو کەسێك نییە.

لیلیس دەمێك بەتووڕەیی و بێدەنگی لێی وێستایەوە، دواتر بە فیشکاندنی مار پێیگوت:

- تەنها یەك ڕێگا هەیە.
- چییە؟
- ئەگەر بتوانیت کەسێکی تیا دەربکەیت، تا بتوانیت جێی ئەو بگریتەوە.

دڵی ئاگری تێبەربیو، گوتی:

- ئەگەر ئەو ژنە جوان و گەنمڕەنگە دەربهێنیت، ئەوا جێی ئەو دەگریتەوە، تەنانەت لای هاوڵەکەشی.

چروچاوی بەیەکا داو گوتی:

- بەڵکو هەردووکیان لەوێ دەردەهێنم.

چاوەکانی سەرنج ڕاکێش و دڵنەواییان تێکەوت، گوتی:

- دەتوانیت شتێکی لەوە گرنگتر بکەیت، شتێکە خۆیانی بۆ دەکوژن، ئەودەم ژیانیان کۆتایی پێ دێت و تۆش وەك شازن بۆ خاکی دەیجوور دەگەڕێیتەوە.
- چۆن لەم بەهەشتە دەریان بهێنم؟

شتێکی چکۆڵەی بۆ هاویشت، دەستبەجێ گرتییەوە، ئەوجا پێیگوت:

- ئا بەمە.

ئەو شتەی بۆی هاویشت، مێوەیەکی چکۆڵەبوو، ڕەنگی زەرد بەقەد دەنکە خورمایەك دەبوو یا نەدەبوو، چون ئەوەی بیکات بە پرسیار، چاوی هەڵبڕی ، شەیتان پێیڕاگەیاند کە چی بکات و چۆن بچێتە ناو ئەو بەهەشتە، ئاوری دڵی هێزێکی گەورەی وێدا، ئەوجا هیمەتی لێکرد و بۆی چما.

- لەوێ چاوەڕوانت دەبم.

ئەمیش پێیگوت:

- تۆ دەتوانیت ئوکە ئاودیوبیت.
- من گەنجینەی ئەم زەوییەم، وەلێ ناتوانم تۆ لەتەك خۆمدا بەرم، تەنها لەدەرپەڕاندنیاندا تەواو هاوکارت دەبم.

لیلیس بە لێواری چیاکەدا هەڵگژا، تا دەهات ترپەی دڵی لەزیادبووندا بوو، لەو ڕێگایەی لۆسیفەر بۆی وەسپ کردبوو، ڕێگای ئەمریمەنی گرتەبەر.

***

## بەهەشتێك لەسەر زەوی و بەهەشتێك بەئاسمانەوە و بەهەشتێكی دی لەنێوانیاندا

لیلیس بە ڕێگایەكی سەخت و هەزار بەهەزار و بەردەڵاندا ملی نا، لقی دارە چڕەكانی لەخۆی دوور دەخستەوە، زۆر ماندوو بوو، هەناسە بڕكێی تێكەوت، لۆسیفەر دووراو دوور بەدوویەوەبوو، بێ ئەوەی خۆی لێ ئاشكرا بكات، تا گەیشتە ئەو شوێنەی ئەهریمەن بۆی دیاری كردبوو، بەوەش شوێنەكەی زانی، كە لەبەرامبەریدا چاوی بەو دارە زۆر چڕانە كەوت، كە بەیەكا چووبوون و ڕێگایان بڕیبوو، داچەمییەوە، بە بنیاندا ڕەتبێت، هەر بێ سوود بوو، چمكێ لەكراسەكەی لای دەستە ڕاستییەوە بەلقە دارێكەوە درا، ناچار بەسكەخشكێ ڕێی بۆ خۆی كردەوە، لۆسیفەر لەو جەستە نەرم و شۆخ و شەنگەی دەڕوانی كە وەك مارێك بۆ ڕاوكردنی نیچەرەكەی بەملاو ئەولادا خۆی دەهێناو دەبرد، ئەو دیمەنە هەرگیز لەبیر نەچووەوە، دەیتوانی بچێتە بەهەشت، ئەگەر خۆی بانگهێشتی بكردایە، بەو ئاوایەی ئەو پارێزەری زەوییە، وەلێ كە درۆی لەتەكا كرد، بۆ مەبەستێكی خۆی بوو، دەیوویست ڕیسوایی و زەبوونی بنیادەم ببینێت، تا لەوێوە دەردە سەری ماڵوێرانی بۆ بنێتەوە.

لیلیس ڕاستەوەبوو، تا خۆی لەووردە دارو چیلكەو دڕك بتەكێنێت، كاتێ سەری بەرز كردەوە و تەماشای بەرامبەری خۆی كرد، واقی وڕما، لەپڕ و پێ هیچ پێشهاتێك و پێشەكییەك خۆی لەبەهەشتا بینییەوە، خاكێك بەگوڵی سپی لەباخچەیەكی سەوزدا بڵاوبیبوەوە، بۆنی خۆش و گوڵی وەنەوشەیی و گوڵاڵەسوورە بە حەواوە، چون جوانكاری و كەش خۆشكردنی بەهەشت ڕسكابوون، ڕووباری (نیل)ی شین بەنێو هەموو ئەوانەدا تێدەپەڕی، تا بە ئاڤگەیی بەسەر سێ جۆگەدا دەڕژایە خوارەوە، ئەوانیش جۆگەكانی

(سیحان و جیحان و فورات)ن، بێستانێك لێوان لێو لەمێوە، زەمینەیەك بۆ هاموشۆ، هەر كە ئەوانەی بینی خۆی بۆ ڕانەگیرا، لەخۆشیا دایە قاقای پێكەنین و هەردوو باڵی لێ كردەوە، تا دەست بە گەڵا ڕەنگاو ڕەنگەكاندا بێنێت، ئەوەندەی هەناسەی قووڵی هەڵمژی ، بۆن و بەرامەی ئەو سرووشتە بۆنخۆشە چوو بەناخیا، لیلیس دوا بڕیاری خۆی داك ە لێرە بمێنێتەوە، ئەوانیش لەبەهەشت وەدەرنێت.

لیلیس چەند هەنگاوێكی هەڵهێناو دواتر هەڵوەستەیەكی بۆ كرد، شتێك، بەڵكو شتگەلێك لە ئاسمانەوە بەری ئاسۆی ئاسمانیان گرت، لەناخەوە ڕاچڵەكی، كاتێ چاوی بەفریشتەگەلێك كەوت، بەژن زراف، هەموو ئاسمانیان تەنی، گوێی لەدەنگێكبوو، زیكریان دەكرد((پاك و پیرۆز.. پاك و پیرۆز.. پاك و پیرۆز)) ئەگەرچی ترس ئامبازی بوو، وەلێ لە ڕێوڕۆیشتنی خۆی نەكەوت، ئەوەی زیاتر سەری پێ سوڕكردبوو، كۆمەڵ كۆمەڵ جنۆكەكان لێرەو لەوێ نوێژیان دەكرد، سلاَوتیان لێدەدا، ئەوجا قسەكەی لۆسیفەری بیرهاتەوە لەمەڕ مێوەكە، مێوە بچووكەكەی دەرهێناو تەماشای كرد، كەوتە سۆسەكردنی تەنها كەسێك كە حەوا بوو، گەڕانەكەی زۆری نەخایاند تا بیدۆزێتەوە.

***

## ئەگەر دوو ناحەز بەیەك گەیشتن، ئەوا شەیتان ئۆقرە دەگرێت تا فێربێت

حەوا هەر بەتەنیا خۆی بوو، لەپێدەشتی گوڵەكان دادەچەمییەوە تا بەدەستی خۆی ڕەوە باڵدارەكانی (فیلی ڕەش)و باڵندەی (ئەلەوا)ی

کەوەیی دان بدات، لەپڕ لیلیس بە پرچە پرتەقاڵییەکەی و دیقەتدانە هەڵچووەکەی لەبەرامبەریدا قیت بووەوە، حەوا ڕاچڵەکی، ڕاچڵەکینێك بەوای ئەوەی کە هیچ بوونەوەرێکی مێینەی وەك خۆی پێشتر نەبینیوە، لیلیس لەسەرییەوە تا بنی پێی لێی ڕوانی، چون پشکنینێك بۆ ئەو ئافرەتەی ئادم و خودای ئادەم بەسەریا فەرزیان کردبوو، ڕاستە دوو چاوی کەوەیی و پرچێکی سەرنج ڕاکێشی هەیە، وەلێ لیلیس بە زەردەخەنەیەکی گاڵتەجاڕانە پێی گوت:

– تۆ حەوای؟

سەری بە بەڵێ بۆی لەقاند و بەترسیشەوە پێیگوت:

– تۆش وەك من بنیادەمی؟
– وادەزانیت خودا هەر تۆی خولقاندووە؟

حەوا چاوی بردە لای ڕق و گوتی:

– تۆ ئەو ئافرەتەی ئادەم باسی لێوە کردووە؟

لیلیس دانی بەخۆیدا گرت و بەرسڤی دایەوە:

– خودا منی هێناوەتە ئێرە وەك چۆن تۆی لێرە داناوە، من زۆر بەر لەتۆ لێرەم.

حەوا بەسەرسوڕمانەوە وەڵامی دایەوە:

– چۆن، تۆیەکی خوا نەناس چۆن خودا لێرە دایناویت.

لیلیس بلەز هەڵیدا و گوتی:

- هاوڵەکەت واپێگوتی، تا بیرت لەمن دوور بخاتەوە، پێمبڵێ لێرە چ دەکەیت؟

- خودا فەرمانی پێکردووین بەتەنگ گیانەوەرانی بەهەشتەوە بین، خۆرهەڵاتی ئەکویلۆی سپاردە ئادەم و ئەم خاکەشی بەمن دا.

ئیلیس بزەخەنەیەکی ساردی تێسرواند و گوتی:

- مێوەکانی بەهەشتت لاچۆنە؟ بەدڵتن؟

حەوا بە دڵپاکییەکەی خۆی گوتی:

- تاموچێژێکی زۆر خۆشیان هەیە، ستایشی خودا دەکەین، ئەو هەموو میوەی دارەکانی وێداوین، تەنها یەك دار نەبێت، نابێت لێی نزیك بینەوە.

ئیلیس چاوی بڕییە حەوا و دەستیشی پڕبوو لەو مێوە زەردەی کە لۆسیفەر وێیدابوو، ئەوجا گوتی:

- مەبەستت ئەمەیە؟

حەوا بە دڵەڕاوکێوە دیقەتی ناولەپی (ئیلیس)ی دا و میوە زەردەکەی بینی کە خودا لێیانی حەرام کردبوو، بەشپرزەییەوە پاشەکشەی کرد، ئیلیس پێیگوت:

- دەزانیت لەنێو هەموو مێوەکانی بەهەشت ئەم مێوەیە خواردنی تایبەتی منە، هەر بەوای ئەم میوەیەوە چاوم کرایەوە، شتگەلێك دەبینم پێشتر وەك تۆ نەمدەبینی، حەوا واقی وڕما و گوتی:
- ئەی خودا چی لێ کردی؟

- هیچی نەکرد، بەڕاستی تۆ هیچ نازانیت، ئەگەر ئەم مێوەیەت خوارد، نەمر دەبیت، نەپێستت چرچ و لۆچ دەبێت، نەیش جوانییەکەت پیر دەبێت، هەر بەشۆخی دەمێنیتەوە.

لیلیس ناولەپی پڕ مێوەکەی بۆ حەوا درێژ کرد، ئەو مێوەیەی، گوێژێکی بۆندار، ڕەنگی ئاڵتوونی مێشکی مەست دەکرد، ئەویش گوێزە باوە بوو، کە خودا لەسەر بنیادەمی حەرام کردبوو، ئەوای ئەوەی هێز لەدەست دەدات، حەوا بەدوودڵییەوە لەگوێزە باوەکەی ڕوانی، گوتی:

- ناتوانم، دەترسم...

لیلیس دەستی نەکێشابووەوە، دەیویست حەوا پەژیوان بێتەوە لە حەرامکردنی و دەستی بۆ بەرێت، بەڵێ دواجار حەوا دەستی برد، هەر کە دەستی بەر بەرەکە کەوت، ئەوجا لیلیس دەستی لێ کێشایەوە، حەوا سەرسام بوو، لیلیس گوتی:

- کێ ناڵێ کە ئەم بەرەت خوارد وەك فریشتەکان تووشی لووت بەرزی نابیت، تەنها بۆ خۆت نەمری هەڵدەبژێریت و لە ئادەمی حەرام ناکەیت؟
- قەسەم بەخودا ئەگەر بێجگە لەو مێوەیە لەسەر زەویدا هەر نەبوایە، لەوم نەدەبڕی.

لیلیس بەنیگاکردنێکی ئێرەییانە لێی ڕوانی، وەلێ سەرکەوتوو نەبوو، بڕۆ و برژانگەکەی بۆ نەشاردرایەوە، دواتر دەستی بە بەرەکەوە بۆ درێژکرد، حەوا بەرەکەی برد، بەڵام لەناخیەوە شتێك ڕێی وێنەدا لەزاری بنێت، گوتی:

- کێ ناڵێ درۆم لەتەکا دەکەیت، نایخۆم تا تۆ بەر لەمن نەیخۆیت.

بۆ چەند ساتێك لیلیس ڕوخساری زەرد هەڵگەڕا، لۆسیڤەر ئاگاداری کردبووەوە، ئەو بەرەی ناو بەهەشت کە وێیدابوو، نەیخوات، ڕوخساری پەشیمانی پێوە دیاربوو، هەستی بە نائومێدی کرد، بەهەچ شێوەیەك بێت دەبوو گرەوەکە بباتەوە، بەرەکەی لەدەمی نزیك کردەوە، دڵی وەك دڵی پاسارییەك لەدەست واشە ڕزگاری بووبێت هەزار و یەك لێیدەدا، لیلیس هیچ ڕێگایەك لەبەردەمیدا نەمابوو، ناچار هەندێ لەبەرەکەی خوارد، تامی ناخۆش بوو، دانی بەخۆیدا گرت، حەوا لێی ڕامابوو، لیلیس گوتی:

– دەی ژنی شۆخ و شەنگ تۆش بیخۆ، ئێستا باوەڕت پێکردم؟

– نا، تا پرس بە ئادەم نەکەم، ئەوە ناکەم.

حەوا ڕووی لێ وەرچەرخاند و بەرەو ئەو شوێنەی ئادەمی لێبوو ڕۆیشت، لیلیس لەجێی خۆی سڕببوو، زۆریش تووڕەو بێزاربوو، کارێگەری گوێزە باوەکەیش لەجەستەیدا کەوتە کار، هەستی کرد هێزی دێت و دەڕوات، خۆی بۆ ڕانەگیرا، هەموو شتێکی لەو دەوروبەرەی خۆیدا بە خاو دەبینی، باڵندە و ئاژەڵەکان لەسەرخۆ دەهاتن و دەچوون، شتێك لەناخیدا وەك ئەوەی بەئاگای بێنێتەوە، هەژاندی، شتێك نازانێت چییە، چون ئەوەی چێژێکی نامۆی پێیبەخشێت. ئەم گوێزەباوەیە هەستی کرد، ئارەزووی سێکسیشی وروژاند.

***

# ئەهریمەن درۆ ناکات، وەلێ هەق تێکەڵ بەناهەق دەکات

لەپێدەشتی سەوزی ئەکویلۆدا، ئادەم پەلەوەری (ڕاتیتی) بچووکی دەبرد بەڕێوە، چاوی بەلۆسیفەر کەوت، هێدی هێدی لێی نزیك دەبووەوە، شەیتان چرپاندییە گوێی و گوتی:

– تەنیا دارێك هەیە، هەرکەسێك لەبەرەکەی بخوات، بەنەمری دەمێنێتەوە.

ئادەم بە وریاییەوە لێی ڕوانی، ئەوجا کەوتە بەڕێوەبردنی پەلەوەرەکان و گوتی:

– لێم دوور کەوە، چیم لەنەمری داوە، خودا تەمەنی خۆم و نەوەکانی پێڕاگەیاندووم چەند دەژێین.

ئەهریمەن تەماشای زەوی کردو گوتی:

– ئادەم.. ڕۆژێ لەڕۆژان وەك تۆ بووم، کەخودا نەوەی پێ بەخشیم، بەدەر لەوەی ئامۆژگاریم کردن، ئەگەر تەمەنم درێژ نەبوایە، نەمدەتوانی کاریان ڕاست بکەم، ڕەنگە (تۆ)ی یەکتریان ببڕایەتەوە.

ئادەم بەپەرۆشەوە گوتی:

– ئەوە نەوەی تۆ بوون، وەلێ خودا پێی ڕاگەیاندووم نەوەی من بەدخوویی و بێ ئابڕوویی ناکەن.

ئەهریمەن هەستی کرد، ناخی لەجۆش سەندندایە، گوتی:

– بۆخۆم دانم بەخۆمدا گرت و بەدخوویی بێ ئابڕووییشیانم ڕاست کردەوە، خودا ڕێزی لێنام و لەبەهەشتی بالا نیشتەجێی کردم، تۆ هێشتا ئەو بەهەشتی بالآیەت نەبینیوە، ئای کە دڵگیرە.

ئادەم بەوبوایە سەری بە بەردێکا بکێشیایە، شەیتان چاوەکانی کز کرد و گوتی:

- ئادەم.. ئەگەر نەمریت بەدەستهێنا، تەمەنت تا بێت درێژتر دەبێت، لەبری ئەوەی هەزار ساڵ خوا پەرستی بکەیت، هەزران هەزار ساڵت بۆ دەلوێت بۆ خواپەرستی، تا خواپەرستیشت زۆرتر بێت، لەڕووناکی خودا نزیك دەبیتەوە، مەزنترین خەڵقەندەی خودا ئەو کەسەیە ڕووناکییەکی پتری لەخودا بەردەکەوێت.

ئادەم بەوای ئەو قسەیەی لە نووری خودا نزیکی دەکاتەوە، کارێگەرییەکی بەسەرەوە بوو، تا لەم ئان وساتەدا حەوا دەرکەوت، حەوا بەگومان و دڵەڕاوکێوە لە شەیتانی ڕوانی، دواتر لەئادەم نزیکەوەبوو، شتێکی چرپاندە گوێی، شەیتان زانی چرپاندنەکە لەمەڕ دارە قەدەغەکراوەکەوەیە، بەر لەوەی جێیان بهێڵێت، گوتی:

- ئەی بنیادەمێل، سوێندم خواردووە ڕێ پیشاندەرتان بم، درۆتان لەتەکا ناکەم، ئێمە لەم بەهەشتە پیرۆزەداین، ئەگەر دەتانەوێ وەك فریشتەکان نەمر بن، ئەوا چۆن ئەو دارە لەئێمەش حەرام کرا، دواتر لێمان خوارد و تەمەنی نەمریی بۆ ئەو کەسەیە کە خواپەرسـ ی زۆرتر دەکات، دیارە ئێوەش بۆ نزیکبوونەوە لە نووری خودا، دەبێت نەمری هەڵبژێرن، گوناهی خۆتان بەمل خۆتان، ئەوەی لەسەر من بوو، پێم ڕاگەیاندن.

***

## ئەگەر خودا لێت تووڕەبوو، بەهەشت دەبێت بەدۆزەخ و ڕوحت دەسووتێنێت

لەبەرامبەر دارە یاساغ کراوەکەدا وێستان، ئەوەی شەیتان لەمەڕ بەرە زەردەکەیەوە بە گرێزیاوەکەی هەڵیدەدا، ما لەدارەکە ڕابمێنن، وەك ئەوەی بیانەوێ خۆیان یەکلابکەنەوە، حەوا خۆی بە باڵی (ئادەم)ەوە توند گرتبوو، هەڵیداو گوتی:

- ئادەم.. هەر بەڕاست لەبەرەکەی دەخۆین؟

ئادەم نیگای لەبەر پێی خۆی بڕی، هیچ وەڵامێکی کوتوپڕی بۆ حەوا نەبوو، زۆریش بەدوو دڵییەوە تەماشای دارەکەی دەکرد، هەزار و یەك داڵغە بەمێشکیدا دەهات، ئەوەی ئادەم بیری بۆ نەدەچوو، بەتایبەت لەو ئان ساتەدا، دەرکەوتنی لیلیس بوو، ڕاچڵەکی و مزری شێوا، حەوا پێیگوت:

- ئادەم.. من ئەم ئافرەتەم بینی لەبەری دارەکەی خوارد.

لیلیس بەدەنگێکی کزۆڵەوە گوتی:

- ئادەم.. پلەم لای خودا لەتۆ باڵاترە، تەنها بەوای ئەم دارەوە، فریشتەکان ئێرەییت پێ دەبەن، نایانەوێ لەنووری خودا نزیکببیتەوە.

لیلیس لەبەرامبەریاندا بەرێکی تری بارەگوێزەی خوارد، هەستی بەدڵنەوایی زیاتر کرد، ئادەم دەستی حەوای گرت و گوتی:

- بەڵێ، من و تۆش لەو بەرە دەخۆین، ئەمە خودایە لەنووری خودا نزیك بینەوە.

***

## بەرێکی زەرد لەبەهەشتدا، خاکی پیرۆزی بەڕەنگی خوێن سوور کرد

ئادەم بەلەرزە لەرز دەستی بۆ بەری دارەکە برد، برێکی لێکردەوە، هەندێکی لێ دایە حەوا، دواتر بە دوودڵییەوە بەرەکەی لەزاری نزیك کردەوە، وەلێ شتێك رێی وێ نەدەدا و شتێکی تریش هەڵوەدای دەکرد، حەوا لەسیلەی مێردەکەی بەترسەوە دەمی بۆ بەرەکە والآ دەکرد و دایدخستەوە، ما لەیەك بڕوانن، چاوانیشیان لەنێوان ترس و گومان و نەمریدا بڕیارێکی مۆلەق بوو، هەر کە بەرەکەیان بۆ دەویان برد، بەوای تامە ناخۆشەکەی هەرزوو تفاندیانەوە، چەند چرکە ساتێکی نەبرد، حەوا بەرچاوی سوورا، ئادەم گوێی لەحەوا بوو دەنگی قورس دەبوو، ئادەم لەسەر چۆك دانیشت و کەللەی تا دەهات قورستر دەبوو، تا وایلیهات لەپڕ بەرەوە بوو، دوا شتێك کە بینی، نزیکبوونەوەی پێی شەیتان بوو.

ئەهریمەن سەرزەنشت ئاسا تەماشای کردن، نەخێر بەتێڕوانینێکی ڕقاوی و دڵڕەقانە لێیانی دەڕوانی، لیلیس بەدیاریانەوە لەدۆخی سەرمەست بونیانی دەڕوانی، چاوی لێبوو حەوا دەستی برد و جلەکانی (ئادەم)ی دادەکەند، لیلیس دڵەکوتەی تێکەوت، دواتر ئادەم حەوای ڕووت کردەوە، بەو ئاوایە جێیان هێشتن و جلوبەرگەکانیشیان لەگەڵ خۆیان برد، لیلیس دیقەتی شەیتانی دا، دواتر بەهەستێکی وورووژاوەوە لای لە ئادەم کردەوە، هەستی کرد شتێك لە ئادەمدا هەڵوەدای کردووە، چون ئەوەی بەزەیی بە (ئادەم)دا بێتەوە، یا شتێکی تربوو،جارێ بەتەواوی لەخۆی حاڵی نەبووبوو، چی لە ئادەم دەوێ.

لەنێوان بێدەنگی و ڕووتبوونەوە، هەمووان گوێیان لە کەڕەنایەکی گەورە بوو، گوێی کەڕ دەکرد، ئادەم بەدەم چاوکردنەوە، شتێك مێشکی هەژاند،

حەوا پێشتر بەئاگاهاتبووەوە، هەر کە چاوی کردەوەو خۆی بە ڕووت و قووتی بینی و ئادەمیشی لەسیلەی خۆیدا بە ڕووتی بینی، دڵی خورپەی کرد و بلەز بەرەو دارێکی نزیك غاری دا، تا خۆی پێ بشارێتەوە، دەستی برد و گەڵا پانەکانی لەدارەکە کردەوەو عەورەتەکەی خۆی پێ داپۆشی، هەرچی ئادەم بوو، کە بەئاگا هاتەوە، لەشەرما نەیزانی چی بکات، هەر کە بینی حەوا بەگەڵای دار خۆی داپۆشیوە، ئەویش هەر زوو خۆی پێ گەیاند و وەك حەوای کرد، جارێکیتر گویان لەکەڕەناوەکە بوو، بە هەموو بەهەشتا دەنگی دایەوە، ئەوجا فریشتەکانی سزادان دابەزین.

***

## هەڵەی باوکان بەمل وەچەکانیاندا دەشکێتەوە

ئیبلیس هەر کە گوێی لەکەڕناوکە بوو، بەپەلە لەو شوێنە دوور کەوتەوە، (لیلیس)یش دووی کەوت. شەیتان بۆخۆی گوتبووی((تا گوناهێکی گەورە نەکەن لەبەهەشت دەرناکرێن)).

ئیبلیس لەشوێن خۆی وێستا، لەرز کەوتە لاقەکانییەوە، سەری بەرز کردەوە، بێ ئەوەی خودا ببینێت، خودا قسەی لەتەکدا کرد، خودا هەروا لەتەك هەوەڵین خەڵقەندەکانیدا دەدوا، ئەویش وەك بەزەبیەك، ئیبلیس لەنێو فریشتەکانا یەکەم خەڵقەندەی خودایە، خودا پێیگوت:

- ئەی ئیبلیس چی ڕێی پێ نەدای کڕنۆش بۆ خەڵقەندەی من نەبەیت؟ خۆت بەگەورە دەزانی، یا پێت وایە پلەت لەو باڵاترە؟

ئیبلیس چاوەڕوانی ئەو پرسیارە نەبوو، بەسەرماتی کڕنۆش بردنەکە ماوەیەکی زۆری بەسەر چووبوو، هەنووکە سەرزەنشتی دەکات؟ ئیبلیس بەدەم وەڵامدانەوە، هەموو جەستەی لەترسا لەرزی لێهاتبوو، گوتی:

– خودایە.. کڕنۆش بۆ بنیادەم چۆن بەرم، کە لەقوڕ دروستکراوە.

بەترسەوە سەری بەرز کردەوەو گوتی:

– منت لەو باشتر خوڵقاند، منت لە ئاگر خوڵقاند، ئەویش لەقوڕ.

ئەوجا فەرمانی خودا هات، کە لەخەیاڵیشدا نەبوو:

– لەبەهەشت دەرچۆ، نابێت خۆت بە زل بزانیت، بەرامبەر دەستکردی من، دەرچۆ لە ڕیسوایانیت.

لیلیس لەسیلەیدا وێستابوو، بەحەپەساوییەوە لێی ڕامابوو، گوێی لەو قسەکان گرت، کە لێل خودادا کردی، بێ ئەوەی گوێی لەقسەکانی خودا بێت، ئەوجا تێگەیشت لۆسیفەر هەڵیخەڵتاندووە، ئەویش هەر وەك ئەوانە و باوەڕی بە بوونی خوداو لەفەرمانیشی دەرچووە. فریشتەکانی عەزاب هاتن و لەپشتە ملیان گرت، لیلیس ما لەدیمەنەکە بڕوانێت. لۆسیفەر.. ئەوی دیمەنێکی سامداری هەبوو، لەپڕ ڕەق هەڵات و هەردوو لاقی جووتبوون و عابا ڕەشەکەی بەبەرییەوە ونجڕ ونجڕبوو، جەستە لاوازەکەی دەرکەوت، بەجەستەیەوە شوێنەوارێك دەرکەوت، لە شوێنەواری کۆنی شمشێرێك دەچوو، سنگی تا خوارەوە شەقی بردبوو، ئەوە سەری بە لیلیس سوڕ نەکردبوو، وەلێ کە عاباکەی دڕا، باڵەکانی لۆسیفەر دەرکەوتن، سێ باڵی لای ڕاست و سێی تر لای چەپی هەبوون، بەڵام ڕوخساری لۆسیفەر لە شکۆمەندییەوە بۆ ئازار گۆڕدرا، لەپڕ هاواری لێ بەرزەوە بوو، بێ ئەوەی دەستێك پێیبگات، باڵەکانی لەت لەت دەبوون و بەردەبوونەوە، قرچە قرچی

باڵەکانی وەك تێکشکاندنی ئێسك و پرووسکەکانی بوو، لۆسیفەر لە دەمیشیەوە خوێنی هەڵدەهێنا، لەهاوارو ناڵە کردن نەکەوت، هەموو بوونەوەرەکانی ئاسمان گوێیان لە ناڵە ناڵی بوو.

لۆسیفەر کەوتە سەر چۆك، لەپشتیشیەوە دوو فریشتە لە گەرد هەڵکردنێکدا ڕسکان، چون ئەوەی لەنەبوونەوە هاتبن، ئەوانیش هارووت و مارووت بوون، بەتووندی باڵیان گرد، ئەویش سەری لێ شۆڕ کردبوو، باوەڕی نەدەکرد دوای دوو هەزار ساڵ ئەوەی بەسەر بێت، کە ئەرز و ئاسمانی بەدەستەوەبوو. لۆسیفەر بیری چووبوەوە، خۆ بەزل زانین بە گوناه ئەژمار دەکرێت، لەوەش گوناهتر لەبەهەشتا خۆی بەزل زانی، ئەمەش یەك مانای هەیە، ئەویش دەرکردنێتی لەبەهەشتا. جبریل بەرەو ڕووی ئادەم و حەوا ڕۆیشت، بێ بەزەییانە دایانیە پێش خۆی، هەستیان بەشەرمەزاری کرد. بەو ئاوایە فەرمانی خودا بەسەر هەمووانـدا هاتە خوارەوە(( دابەزنە سەر زەوی، هەندێکتان بۆ هەندێکتان دوژمنن، لەسەر زەویش جێ و ڕێتان هەیە، هەر لەوێ ژیانەوە و مردنتان دەبێت.

***

## دەرچوون لەبەختەوەری، هەموو دەوروبەرەکەی بەگورگ دەبێت، ئەگەر فریشتەش بن

زەوی لەژێر پێی دەلەرییەوە، ڕەشەبا گەڵای بەدارەکانی بەهەشتەوە نەهێشت، گەڵاکان بەر ڕوخسار و جەستەیان دەکەوت، بە شەکەتی دەڕۆیشت و (حەوا)ش بەهاوشانییەوە، باڵی گرتبوو، جەستەی دەلەرزی،

لەترسـان دەسـتیان لـەناو دەسـت یـەک نـابوو، هـیچ شـتێك جەسـتەیانی نەپۆشیبوو، تەنها ئەو گەڵادارانەی بەدەستی خۆیان چنیبویان، تـا پۆشـتە بن، دەستیان بەسەرییەوە بوو، نەبادا ڕەشەباکە ڕووت و قووتیان بکاتـەوە، لـەدەروازەی سـەرووی بەهەشـتەوە، زۆر بەناڕەحـەتی بـەپێوە وێسـتابوون، ئاوڕێکیان لەو شوێنە دایەوە کە دەبوو تیا دەربچن.

ئەو شوێنە چون بەهەشت نەبوو، بەڵکو شتێکی زۆر جودا بوو، ڕوح ئۆقرەی تیا نەدەگرت، ئەشکەوتێکی تاریك و نووتەك، تەنگەبەر و وشك و بـەردەڵان، لەپڕ ڕوو بەڕووی فریشتە پێمردە بوونەوە، تەماشای کردن، وایانزانی بۆ ڕوح هەڵکێشانیان هاتووە، پێیان زەوی نەدەگرت، کەوتنە سەر زەوییەکە، چەند هـەنگاوێك لێیانـەوە هـەردوو فریشـەی هـارووت و مـارووت وێسـتابوون، لۆسیفەریان باڵبەست کردبوو، لۆسـیفەر بەسەرزەنشـتییەوە لـە (ئـادەم)ی دەڕوانی، لیلیسیش لەسیلەی لۆسیفەردا هاواری لە ئادەم کرد:

- ئادەم.. هەر خوای ئەم زەوییە تۆی نەخوڵقاند، ئەدی بۆچی ترۆتی کردووە و لە بەهەشت دەرتدەپەڕێنێت؟ ئەمە ئەو خوا نییە؟

ئادەم جووڵەو دەنگی لـەخۆی بڕیبـوو، وەك ئـەوەی لەسـەرە مـەرگا بێـت. جارێکی تر بەدەنگی بەرز لەئادەمی خوڕی:

- ئادەم!

بەنیازی هەڵهاتن ئاوڕی لەپشتی خۆی دایەوە، وەلێ لەپڕا ڕاچڵەکی، هـەردوو بـاڵی بەجەسـتەیەوە شـەتەك درا، جەسـتەی وەرسـوڕا، ڕوو بـە ڕووی فریشتەکان بووەوە، دواتر بورایـەوەو لەسـەر گازەرەی پشـت کـەوت، یـەك لەفریشتەکان لەکوڵی گرت و دوور کەوتنـەوە.

لەنێو باوبۆران و گەڵا ڕزاوەکاندا، سێبەری فریشتەی سێیەم دەرکەوت، دەرکەوتنەکەی ڕێک لەسەر شێوەو ڕوخساری بنیادەم بوو، لە ئادەم نزیکەوە بوو، بەو دەنگەی خۆی کە ئادەم دەیناسییەوە، پێی گوت:

- ئادەم خودای مەزن قسەیەکی بۆت هەیە.

ئادەم تەماشای فریشتەکەی کرد، ڕوخساری تێکچوو، بە گریانەوە گوتی:

- ڕازئیل.

فریشتە ڕازئیل دیقەتی دا و گوتی:

- تۆ بەر ڕەحمەتی خودا کەوتی، خودا فێری قسانت دەکات، بەوشەیەک خولقایت، بە وشەیەکیش هاتیتە بوون، هەر بەقسەیەکیش لێت خۆش بوو، ئەی ئادەم.. هەستەو پەیڕەوەکانی خودا وەرگرە.

ئادەم ئومێدی بۆ گەڕایەوە، بەجەستە لەرزۆکەکەیەوە ڕاستەوە بوو، دەستی (حەوا)ی گرد تا هەڵیسێنێتە سەر پێ، ئەوجا تەماشای دەوروبەری خۆی کرد، کەسی لێ نەبوو، دوو فریشتەکە لۆسیفەریان بە باڵ بەستراوی بردبوو، لەسەر چیای ماتاریمۆند دایانتا، بەسەر گازەرەی پشت ڕاکشابوو، تەماشای ئەستێرەکانی دەکرد، هەرچی ئیبلیس بوو، بەدەست فریشتەوە بۆ خاکی وشك و بەرنگ هەواڵە دەکرا، ئەو خاکەی نە ئاوی تێدابوو، نەیش خۆراك، (ئادەم و حەوا)ش لێل فریشتە پێمەردە بەرەو ئەشکەوتە تاریکەکانی بردن، ئەشکەوتی مەرگ.

***

## ***تەواو***

تا کۆتایی سەربردەکە بێدەنگبوون، لویب کارتەکانی بەدەستەوە گرت و بەبێدەنگی لێیانی دەڕوانی، هەرچی لیۆبۆڵد بوو، خۆی لە بۆبی فرانك نزیك کردەوەو گوتی:

- دەپرسم.. مرۆڤی گێل و گەمژە کە خودا لەگوناهەکان ئاگاداری کردووەتەوە، کەچی گوناهەکان هەر دەکات، پێدەچێت سەرگورشتەی ئادەم لەهەموو سەروبەندێکدا و لەهەموو سەردەمێکیشدا خۆی کۆپی دەکاتەوە، تۆش هەی ملۆزم، هەی نەفرەتی ، گەورەکانت لە ڕێکخراوەکە ئاگاداریان کردیتەوە خیانەت نەکەیت، خیانەتەکەت کرد و ئەمەشت بەسەر خۆتا هێنا.

لیۆبۆڵد دەمانچەکەی بەرز کردەوە، بۆبی ڕوخساری زەرد هەڵگەڕا، هەرچی لویب بوو، بەدەم تەماشاکردنی کارتەکانەوە هەڵیدا و گوتی:

- لیۆبۆڵد..لێی گەڕێ، ئەم بەسەرهاتەی باسی لێوە کرد، لەنێو ئەم کارتانەدا هەیە.

بۆبی سەری دانواندبوو، دەستبەجێ دوای قسەکەی لویب گوتی:

- وێنەکان بە بەرچاوی هەمووانەوەیە، کۆدی کردنەوەی تەنها لای تایبەتمەندەکانە.

لیۆبۆڵد پشتاو پشت لەسەر کورسییەکە بەرامبەر بۆبی دانیشت و هەردوو دەستی خستە سەر پشتێنەی کورسییەکەو دەمانچەکەشی لەسەر پێ بوو، گوتی:

- لە قسەی قیز و بابەتی ترسناکەکان گەڕێ. گوێ بگرە، هەرچی هەیە و پەیوەستە بە شرۆڤەی تەواوی ئەم حیکایەتە - بێ درۆ و ئەملاو ئەولا بیخەرە ناو دەستمان. دەنا هەرچی لەناو سکتدایە بەم دەمانچەیە دەریدێنم. پێم بڵێ.. ڕێکخراوی نهێنی ئەم حیکایەتەی لەکوێوە هاوردووە، کە لەهیچ پەرتووکێکدا باسی لێوە نەکراوە؟

بۆبی بەترس و دڵەڕاوکێوە گوتی:

- بیرۆکەکە ئەوەیە مرۆڤەکان وا دەبوانتنە پەرتووکە پیرۆزەکان کە ئاینە، وەک دەقی مێژوویی وەریناگرن. بەو تاولیەی ئەو پەرتووکە مێژوویانە باشترین بەڵگەن. ڕێکخراوە نهێنییەکان تەنها ڕێکخراون وەک مێژوو تەماشای ئەو پەرتووکانە دەکەن. بەو شێوەیە هەرچی دەقــە لەتەنیشــت یــەکا وەک توێژینــەوەی مێــژوویی کۆیــان کردووەتــەوە، ئــا بــەو شــێوەیە هەنــدێ گەنجینــەی ڕاســتیان دۆزیوەتەوە.

لیزبۆلد دەمانچەکەی وەلا ناو گوتی:

- کام دەق؟ ئەم حیکایەتەی گێراتەوە هیچ دەقێکی وای تێدا نەبوو.

بۆبی هەرزوو بەرسڤی دایەوەو گوتی:

- دەقــەکانی تــەورات و ئینجیــل و قورئــان و فــەرموودەکان و دەستنووســەکانی جوولەکــەو دەقــە شــاراوەکانی مەســیح، کــە بــە پەرتووکی ئادەم و حەوای لەبیرکرلو ناوزەدکراوە، گشت ئەوانــەیان نایە پاڵ یەك و بوو بەو چیرۆکانەی ئەمڕۆ بارە.

ئەمجارە لوپیب خۆی لەباسەکە هەڵقورتاند و کارتەکانی وەلا ناو گوتی:

- مەحاڵە ئەو پەرتووكانە لە سەربوردەیی (ئادەم و حەوا)دا دژ بەیەك بن، لیۆ پێدەچێت ئەم هەتیوە زۆڵە درۆمان لەگەڵدا بكات.

بۆبی بەدەم تەماشاكردنی كۆمپیوتەرەكە ، گوتی:

- ڕاستییەكەی.. پەرتووكە شاراوەكانی جوولەكە زۆر لە ڕووداوەكانی قورئاندا نزیكن، ڕووداوگەلێك لەو گێڕانەوانەدا هاتووە، بەتەنها موسوڵمانەكان لە قورئان و فەرموودەكانیاندا باسیان لێوە كردووە، وەك كڕنۆش بردن بۆ فریشتەكان و كڕنۆش نەبردنی ئیبلیس بۆ ئادەم و ئەو قسانەش كە خودا بە ئادەمی ڕاگەیاند، ناردنی ئادەم لەكۆتایی ژیانیدا بۆ بەهەشت، وەك لە فەرموودەیەكدا هاتووە(( برۆن لەبەروبوومی بەهەشت كۆبكەنەوە)) شێوازی مردنی ئادەم و گۆڕكردن و كفن كردنی لەفەرموودەكاندا هاتووە، هەرچی بیرمەندانی ڕێكخراوەكەیە، تەنها ئەو دەقانەیان دانا، كە لەیەك (لەوح)دا هەموویان هاوڕابوونە، ئەو چیرۆكەیان داهێنا، ڕێك وەك توێژینەوەی مێژوویی.

لیۆبۆڵد قسەكەی پێ قاچی و گوتی:

- هەی سەر خڕ ئەوە بۆچی جاروبار تەماشای ڕیكۆردەكە دەكەیت، دەترسێی، پەلەت نەبێت، ئەم ڕیكۆردە تایبەتە بە ئێمە، تا هەر زانیارییەك ئاشكرای دەكەیت، لەبیرمان نەچێت، ئەو گرتنەیەش لەدیواربەندی نەفرەتیت بڵاو دەكەینەوە، تەنانەت گرتەی لەسێداردانیشت بڵاو دەكەینەوە، ئیتر درۆمان لەتەكا مەكەو كاتیش بەفیڕۆ مەدە، خۆت ڕزگار بكە.

لویب بەدەنگێكی بەرز بە هاوڕێكەی خۆی گوت:

- گێلە، تۆش قسەی ئەم نەفرەتییە مەبڕە، با قسەمان بۆ بکات.

لیۆپۆڵد بەتووڕەییەوە گوتی:

- چ قسەیەکی گرنگی کردووە؟

بۆبی فرانك گوتی:

- نهێنییەکە لەوەدایە ئەو بەهەشتەی ئادەمی تیا دەرکرا، ئەوە ئاگرێك دەنێتەوە کوژانەوەی بۆ نییە، لەنێو دەستووسە پیرۆزەکان ئەوانەی هاوڕان لەسەری بە پێی دەقە ئاسمانییەکان، کە هاتووەتە خوارەوە، دەرکەوتووە ئەو بەهەشتە لەسەر زەوی بووە، نەك لە ئاسمان.

لیۆپۆڵد ئاوڕی لێ دایەوەو گوتی:

- ئەوە چ گاڵتەجاڕییەکە؟

بۆبی هەر وەك گۆشەگیرێك سەری بەلادا برد و گوتی:

- لەتەوراتـــدا نەتانخوێندووەتـــەوە بەهەشـــتی نـــەمریی بەیـــەك گەیشتنەوەی چوار ڕووبارە، یەکێکیان ڕووباری فوراتـەو ناسـراوە، ئەویش لەفەرموودەیەکی محەمەد دا هاتووە لەسەر زەوییە، ئـادەم بەنـەوەکانی خـۆی گوتووە((ڕۆڵـەکانم وەك نەخۆشـێك تامـەزرۆی بەرووبومی بەهەشت دەکەم، لەو بەرووبومەم بۆ بێنن)) بـەو مانایـە بێت کەواتە بەهەشت لەسەر زەوییە.

لویب بە گرنگییەوە گوتی:

- لەوە گەڕێ، مەبەستت چییە کە دەڵێی نهێنییەکە کە ئاشـکرا بـوو، کێشەی هەرە گەورەی لێ دەبێتەوە؟

بۆبی بەدووردڵییەوە گوتی:

- ڕێکخراوەکە بەو شوێنەی بەهەشتی زانیوە، ڕێك لەسەر زەوییە، ئەگەر بێتو ئەم شوێنە ئاشکرا بێت، ئەو جەنگە هەڵدەگیرسێت، پشکی گەورەی ئەو جەنگەش لە قودس دەبێت.

لیۆبۆڵد لە یاخەی کراسەکەی گرت و دەمانچەکەی لە کەللەی نزیك کردەوەو گوتی:

- وام لێمەکە پرسیار بکەم، بۆ خۆت پیاو بەو وەڵام بدەرەوە، ئەو شوێنە کوێیە؟

بۆبی ترسی لێنیشت و گوتی:

- نووکە مەپرسە، ئاشکرا کردنی لە کۆمەڵە کارتی دوای ئەم کارتانەوەیە.

لیۆبۆڵد دەمانچەکەی لێ دوور خستەوە، لویب چرن ئەوەی لەگەڵ خۆیدا قسە بکات، گوتی:

- ئیلیس و هەموو ئاینەکان و پەرتووکە مێژووییەکان ڕێککەوتوون کە ئەوە ئەفسانەیە، تۆ بەچ هەقێك دەڵێیت ڕاستییە؟
- لەخۆت نەپرسیوە ڕێکخراوە نهێنییەکان بۆچی تا ئەم ئاستە ئەوە پیرۆز دەکەن، کە ئەفسانەیە؟

لویب متەقی لەخۆی بڕی، (بۆبی)ش درێژەی بەگێڕانەکەی داو گوتی:

- هەموو شتێك لەمارەوە دەستی پێکرد، بەو ئاوایەی لەتەوراتدا هاتووە، پرسیارە ژیربێژییەکە ئەوەیە.. مار چۆن قسان دەکات؟ جوولەکەو مەسیحییەکان پێتدەڵێن ئەوە تەنها سوونبوولە،

شرۆڤەکارانی قورئانیش ئەوەندەیان لەو بابەتە گوتووەتەوە، هەر نەبێت، ئەگەرچی لە قورئانیشدا ئەو باسە نەهاتووە، تەنانەت لەفەرموودەکانی پێغەمبەریشدا نەهاتووە، ڕاست ئەوەیە ، هەموو ئەو سالآنە لەنێوان ئاینەکاندا دەماو دەم گوێزراوەتەوە.

لویب سەبری سوا، بۆبی هەرزوو درێژەی بەقسەکانی داو گوتی:

– سەرەداوی ئاشکرابوونی نهێنییەکە لە پەرتووکی(ئەلزەهار)ەوە سەری هەڵدا، کە گرنگترین پەرتووکە لە(کابالا)((نهێنییەکانی خواوەندی جوولەکە)) زۆر بە ئاشکراو ڕوونی هاتووە.. هاوڕێی شەیتان لەبەهەشتدا ئافرەتێك بووە، بە ماری لوولپێچ ناوزەد کراوە، بەوە نهێنییەکە دەرکەوتووە، کاتێ تەورات بۆ یەکەمجار وەرگێردرایە سەر زمانی لاتینی، وشەی (لیلیس)یان وەرگێڕایە وشەی(لامیا) کە لە ئەفسانەکانی یۆناندا ئافرەتێکە نیوەی مارەو نیوەکەی تری بنیادەمە ، لێرەوە سەرچاوەی ئەفسانەکە دەردەکەوێت.

لویب بەگومانەوە پێی گوت:

– دەتەوێت بڵێی نازناوی مار لەتەوراتدت کە هاتووە، نازناوی ئافرەتێکی ئاساییە و ناویشی (لیلیس)ە؟

بۆبی سووربوو لەسەر قسەکەی و گوتی:

– بەڵێ، نازناوی (مار)یشی لێنرا، ئەویش بەوای بەدکارییەکەیەوە بوو، لۆسیفەر بۆ فریودانی ئادەم و حەوا و دەرپەڕاندنیان لەبەهەشتدا لیلیسی بەکارهێنا، تا بەلارێیاندا ببات، بەدیوێکی تر (لیلیس)یشی فریودا، دواتر پیرۆزی کرد و تەنانەت

بەخوداوەندیشی کرد، بابلییەکان بەناوی (تیامات)ەوە دەیانپەرست، یانی خوداوەندی دەریا، کە نیوەی بنیادەم بوو، نیوەکەی تریشی (مار)بوو، هەرچی سۆمەرییەکان بوون بەناوی(بیلیلی)یەوە دەیانپەرست، میسرییەکان بەناوی(واجیت)ەوە دەیانپەرست، بەوەی ئافرەتێکەو ڕوخساری ماری هەبووە، هەر ئەو مارەیە کە لەسەر سەری (توت عەنخ ئامون)ی بەناوبانگ دانراوە، کاتێ ئومەتی تەورات هاتن و لە ریوایەتی (ئەلتەکوین) باسیان لێوە کرد، تەنها نازناوەکەیان نووسی، ڕەنگە ئەوەش بۆ بێ نرخ کردنی کردبێتیان.

لویب بەزمانێکی نەرم گوتی:

– پێدەچێت لەقسەکانتا هەندێ بیرژیری تێدابێت، تەنانەت بەناوبانگترین وێنەکێشەکانیش بەردەوام وێنەی ئەو مارەیان کێشاوە، کە لەسەر شێوەی ئافرەت فریوی ئادەم و حەوای دا، وەك تابلۆکەی (مایکل ئەنجیلۆ) کە بە ڕوودیواری کلێسەی (سیستینا)دا بەدارەوە کراوە.

بۆبی لێل تەماشاکردنی بۆ ڕیکۆردەکە، گوتی:

– ئەوە تەنها بەلگەش نییە بۆ ونبوونی ئەو ئافرەتە، شتگەلی زیاتریش هەن، ئەویش لە پلەیەکی بالآی کارتەکاندا دەردەکەوێت.

لویب شتێکی بیرهاتەوەو گوتی:

– ئەو (ڕازئێل)ە کێیە؟پێشتر ئەو ناوەمان نەبیستووە!

بۆبی ئاهێکی هەڵکێشاو گوتی:

- ڕازئێل.. ئەوە سەرداری گومجینەی نهێنییەکانە، لای جوولەکەکان ئەو فریشتەیەکە نهێنی (کابالا)ی هێنایە خوارەوەو ڕادەستی بنیادەمی کرد، لەپەرتووکێکا باوەڕی تەواویان پێی هەیە، بەو ناوایەی کتێبی پیرۆزی (ئادەم)ە و پێی دەڵێن پەرتووکی ڕازئێل( ڕیوایەتی ڕازئێل.

لیۆپۆڵد بەتووڕەییەوە گوتی:

- لە چ شتێکا گرنگەو بۆچییە ؟

بۆبی چاوەکانی نووقاند، وەك ئەوەی خۆی هێور بکاتەوە، گوتی:

- دواتر دەزانیت.

لیۆپۆڵد کۆمەڵەی دووەمی کارتەکانی ڕاکێشاو لەبەردەمی بۆبی دا دایناو گوتی:

- سەربوردەی ئەمجارە زۆرێك لەدەرگا کڵۆم دراوەکان دەکاتەوە، دوای دەرکەوتنی چوار دەستنووسی کۆن لەشوێنی جیاواز لەجیهاندا دەرکەوت، هەر دەستنووسێکیش بۆ سەردەمێکی جیاواز دەگەڕێتەوەو بەزمانێکی جیاواز نووسراوەتەوە، ئەوەی سەیرە، هەر هەموشیان هەمان سەربوردە دەگێڕنەوە، کە هیچ کەسێك دەربارەی ئادەم و حەوا و خەڵقەندەی بنیادەمەکان نازانێت، کاتێ ئەم چوار دەستنووسە دەرکەوت، بیر و هزری جیهانیان گۆڕی، بەوای جیاوازی دۆزینەوەی شوێنەکانیان و زمانەکانیان و سەربوردەییان بە هەمان ڕووداوەو بەو شێوەیە ڕاستگۆیی مێژووی ئەو سەربوردەییە دەردەخات، خەڵکی ئەو دەستنووسانەیان بە (ژیانی ئادەم و حەوا) ناوزەد کرد، لەهەر هەمووشیاندا

بیرەوەرییەکانی ئادەم و حەوا کە نووسیبوویان تا بە نەوەکانیانی ڕابگەیێنن، کە چۆن بوونەو چییان بەسەر هاتووە.

ئەمجارەیان سێ کارتمان هەیە.

کارتی یەکەم: کارتی ئاواتەخوازییە، وێنەی ژنێکی خەمباری بەسەرەوەیەو لە ئەشکەوتێکدا نیشتەجێیە.

کارتی دووەم: کارتی خۆشەویستییە، وێنەی ژن و پیاوێکی بەسەرەوەیە، لەپشتیشیانەوە فریشتەیەکی شکۆمەند دیارە.

کارتی سێیەم: کارتی گەمژەیەکە، وێنەی شەیتانێکی گاڵتەجاڕی بەسەرەوەیە، سەمایەکی گاڵتەجاڕانە دەگێڕێت.

***

# بەشی دووەم

## هەوڵێن ڕستەکان لە مێژوودا

## ٧٠٠٠ پێش زایین – ٦٨٠٠ پێش زایین

حەوا دەڵێت:

(( چاو لەچاوم ناکەن و دەشپرسن، ئەوەندەی لەتەکتانا ژیام خۆم لەوە دزیوەتەوە، تا لەنیگای چاوەکانتانا سەرزەنشتیم خوێندەوە، چەند لەژیانا تووشی دەردەسەری و مەینەتی دەبوون، سەرزەنشتیتان بەو چاوە بێدەنگانەتان گلەیی و گازندەتان تێدەسرەواندم، چەند لێم تووڕە دەبوون، شەرم ڕێی پێ نەدەدان پێمی بڵێن، بڵێن.. دایکە کێشەکە تۆ بووی، باوکمانت لەبەهەشت دەرکردو ئێمەشت لەو خۆشبەختییە کرد، بڵێن، هەرچیتان هەیە بیڵێن، وەڵێ بەزەییشتان پیاما بێتەوە، ئێدی ئەوەندە بەو چاوانەتان لێم مەڕوانن، نەوەکانی دوای ئێوەش هەر نەفرەتیم دەکەن، وەڵێ هیچتان ڕاستییەکە نازانن، ئەو سەربوردە ڕاستیە تەنها لای منە، کوڕی خۆم خۆتی لێ گێل مەکە بەسەرهاتەکە بنووسەوە، ئەم دەستنووسانە وەک ڕوحت بپارێزە، ئەمە خوایە نەوەکانی دوای خۆتان لێی حاڵی بن.

کوڕی خۆم.. فریشتەی گیانکێشان بەرەو ئەشکەوتێکی تاریک و نووتەک پەلکێشی کردین، وەک دووپاساری بێ چارە دەلەرزاین، دەمانزوانییە ئەو بوونەوەرەی بۆ یەکەمجار عابا ڕەشەکەی هەڵمالی و خۆی لێمان ئاشکرا کرد، بە بینینی ترسێکی وای تیا ڕسکاندین، ئەوەندەمان نەمابوو ڕوحمان

بێته دەرەوە، دەیان ساڵ لەهەوڵی ئەوەدا بووم ڕوخساریم لەبیر بچێتەوە، بڕوا بکەن بەقەد چاوپرووکانێك ڕوخساریم بینی، ئێوەش دەیبینن، بەڵام کاتێ بۆ ڕوح کێشانتان دێت، ئەوسا ئەوەی من لێی تۆقیبووم، ئێوەش دەیبینن و باوەڕ بەقسەکانم دەکەن. کوڕی خۆم ئەو پەیکێکی نێردراوبوو، بەزەیی تیا نەخولقاوبوو، دوا تێڕوانینمان بۆ بەهەشت و ئاسمان ئەوەندەی تر بێ ئومێدی کردین، بەردەکەی بە بەر کونی ئەشکەوتەکە دادایەوە، بەتەواوی دنیا تاریك و ئەمووستەچاو بوو. ڕۆڵە.. تۆ جارێ نازانیت ڕوح کە تاریك بوو، یانی چی!

بەوریاییەوە بەنێو بەردەڵانە تاریکەکەی ناو ئەشکەوتەکە ڕۆیشتین، تا قووڵتر دەڕۆیشتین تاریکتر دەبوو، چوون ئەوەی بەقووڵایی دۆزەخەدا ڕۆچین، لام لەئادەم کردەوە، بەوای تاریکییەکەوە نەمبینی، تەنانەت گومانم کرد لەسیلەمدا بێت، دەستم بۆی گێڕدا، هەر کە دەستم بەر دەستی کەوت، دڵم ئۆخەی کردو توند دەستیم گوشی، دەستی گەرم و گوڕ بوو، شتێك دڵی داخورپاندم، لەرز گرتمی، هەستم ڕاگرت، چاوم زیاتر کردەوە، شێوەو ڕوخساری ئەهریمەن ڕوو بە ڕووم بووەوە، دەستم کێشایەوەو هاوارم کرد، گوێم لەدەنگی ئادەم بوو، لەنزیکەوە بانگی لێوە کردم، بەرەو شوێنی دەنگەکەی ڕۆیشتم، دەستی گرتم، بە قوڕگی پڕ لە گریانەوە گوتم:

- ئادەم گیان.. ئەمە منم، لەوێ ئەهریمەن...

قسەکەم بۆ تەواو نەکراو گوێم لەهەناسەی گەرمی گرت، گوتی:

- حەوا.. ئەهریمەن لێرە زیانی بۆ نییە، ئەگەر وابوایە هەڵدەهات.

بەخەمبارییەوە پێمگوت:

- ئادەم.. ئەمە گۆڕمانە؟

لەسەرخۆ وەلامی دامەوەو گوتی:

- حەوا.. چۆن چاومان بە فریشتەو جنۆکەکان کەوت، هەرواش چاوکان بەهەموو خەلقەندەکانی خودا دەکەوێت، کە بەگۆڕەکاندا دەگەڕێن.
- چی بەگۆڕەکاندا دەگەڕێت؟

لەپڕ شوێنەکە لەرییەوە، دەنگی لەرینەوەکە ئاوێتەی دڵمان بوو، ئادەم توند دەستی گرتم و بەوریاییەوە ڕۆیشتین، چاومان لێڵ تاریکییەکە ڕاهات، کەمێك چاومان لەتاریکییەکە کرایەوە، ئەوەی بەرچاومان کەوت، لەوەی تاریکییەکە باشتر نەبوو، بەردێلێك لەسەر شێوەی ئەمریمەن قیتەوە ببوون، دەترسام بەسەرمانا بکەون، نەماندەوێرا دەست بەرز بکەینەوە، بەر بەردەکان دەکەوت، گوێمان لەهاوار و نزووڵەی دوور بوو، بەئادەمم گوت:

- لێرە دەمرین؟

ئادەم بەدەم ڕوانینی خاڵێکی دیاریکراو، دەمێ بێدەنگ بوو، دواتر گوتی:

- حەوا.. ڕەنگە ئێمە ئاواتەخوازی مەرگ بین.

نیگام بەرەو ئەو خاڵەی ئەو نیگای کردبوو، گواستەوە، زانیم دەیەوێت لەزۆر شت بدوێت، ئەگە چی ئێمە زیندووین، ڕوانینمان وەك نیگاکردنی ئێوە نەبوو، هەموو شتێکمان بەچاوی خۆمان بینی.

***

# ئەوانەی لەسۆزی خودا دا دەرکراون،

# خاکیش بەزەیی پییانا نایەتەوە

ئادەم دەڵێت:

دەستی (حەوا)م گرتبوو، لەلای ڕاست و چەپمانەوە دوو سێبەر دەرکەوتن، وەك ئەوەی لەدیوارەوە دەرچووبن، ڕووەو لای ئێمە دەهاتن، دەستی (حەوا)م گووشی و بەرەو دوا کشاینەوە، ئەوەدەم ڕوخساریان ئاشکرا بوو، لەخۆوە ترسی مردنمان لێ نیشت، پرچیان درێژ و سیمایان ڕەشی دەکردەوە، حەوا متەقی لەخۆی بڕیبوو، دەتگوت لەسەرە مەرگدایە، هەوڵمدا لەبەرامبەریان ڕاوەستم، وەلێ پێم لەدووەمدا نەهات، لەڕوخساریان ورد بوومەوە، پێستیان وشکەهەڵاتوو، زیاتر ترسی حەوام بوو، نەبادا ڕوحی دەربچێت.

ئاوڕم دایەوە، هەستم بەساردی دەستی حەوا کرد، ورتەیەکی لێ بەرزەوە بوو، لێی حاڵی نەبووم، دەستی حەوام بەرنەدابوو، بەهەموو مێزمەوە هەوڵی هەناکاو هەڵهێنانمدا، لەولاترەوە لام لێ کردنەوە، لەجێی خۆیان وێستابوون، چاوەکانیان سپی و بێ گلێنە، هەستم کرد بەزەیی لەچاویانا هەر نییە، ئەوی لای چەپ هەڵیداو گوتی:

- هۆ ئادەم.. دەتانەوێ لەخودا هەڵبێن؟

فرمێسکی گەرمی چاوەکانم داهات، ڕوحیشم خەریکبوو لەسینەم دەربچێت، گوتم:

- شەرمە لەخودا.

ئەوەکانی ئادەم وەچەکانتان فێر بکەن، کە شۆڕ کرانە ناو گۆڕ دوای ئەوەی دەنگی ئامادەبووانی سەر گۆڕستان دوور دەکەونەوە، دەیانبینن.

زەوییەکەی ژێر پێمان لەرییەوە، خاک تەنگەوە بوو، دیوارەکان لەیەک نزیکەوە بوون، چون ئەوەی بمانفلیقیننەوە، حەوا بەدەم هاوارەوە دەستی لەدەستم کردەوە، جوولەی زەوییەکە لێکی دوور خستینەوە، بینیم دەستی بۆ درێژ کردم و هاواری بۆ کردم، منیش هاورم بۆ کرد، تا خۆی لەنێو ئەو قلیشەی تەنشتییەوە بکات، بۆ ئەوەی دیوارەکان نەیفلیقیننەوە، ما بەدوای یەک هاواری لێ بکەم، ئەویش بەخەمبارییەوە دیقەتی دەدام، دواتر لێم حاڵی بوو، لای لەپشتی خۆی کردەوە، خۆی هاویشتە دووتوێی قلیشەکە، خۆیشم دیوارەکان تەنگیان پێ هەڵچنیم، تا بەردەکان فشاریان کەوتە سەر سینەم، ئێوەش لەکاتی گۆڕنانتاندا ئەوەتان بەسەر دێت.

ئەو شوێنەی حەوای لێبوو بەرزەوە بوو، ئەوەی من لەسەری بووم داکەوت و رمیا، هاوارم لێکرد، بەدەنگێکی خەمبار و نائومێدەوە بەرسڤی دامەوە. دوای دارمیانی زەوییەکە لەدەوروبەری خۆم روانی، خۆم لەشوێنێك بینییەوە، کەمێك لەناو ئەشکەوتەکە بەرینتر بوو، قلشێکی نۆری تێکەوتبوو، هاوارم لەحەوا کرد، وەڵامی نەبوو، ما ئەوەندە هاواری لێ بکەم تا چاوم ئەبلەق بوو. لەپشتەوە دەنگی زمانێکی تلیشاوی هەناسەی دەدا، هەر کە ئاوڕم لێ دایەوە ، وەختەبوو لەخۆم بچم، لەنێو کونێکی ئەشکەوتەکە سەری مارێك دەرکەوت، هەستم کرد لەوەتەی خودا خەڵقەندەکانی درووست کردووە هیچ روحێك لەکەڵبەکانی رزگاربوونی بۆ نەبووە.

***

# ئەگەر موسوڵمانی تەواون، هەق وایە لەخودا بترسن

حەوا دەڵێت:

(( ئێدی هاوار و فریاکەوتنی ئادەمم لەخۆم بڕی، ئەو شوێنەی منی لێبووم، زۆر بەسام بوو، منیش بەوای بێ ئادەمییەوە تووشی شۆك بووم، دڵم ها ئێستا نا دەمێکیتر لەجەستەم دەردەچێت، من ئەوە حاڵم بوو، لەڕێڕەوێکی بەردەڵاندا بووم، شتێکم لێ دەرکەوت، تۆقاندمی، لەوسەری ڕێڕەوەکە گڕێکی سووربا‌وی کزم بینی، هەریەرەتا دەردەکەوت، پێم لێ هەڵبڕی و بەرەو گڕەکە ڕۆیشتم، ئاخر ترس وا لەبنیادەم دەکات بەرەو سەرچاوەی ترس بڕوات، ئەو دەمەی دەزانێت مانەوە لەشوێنی خۆی بەرەو فەوتانی دەبات، بەوریاییەوە لەڕێڕەوی بەردەڵانەکە کەوتمە ڕێ، هەرچەند بەرەو پێری ئاگرەکە دەڕۆیشتم هەستم کرد هەمان مەودای دووری لێمەوە دوورە، ئەوەندە ڕۆیشتم، پێکانم پەنمان، گڕەکەش هەر لێمەوە دوور بوو، نەمدەزانی لەکوێم و بەرەو کوێ دەڕۆم، لەخۆم دەپرسی ئاخۆ ئەمەی ئێیدام گۆڕەکەمە؟ لەبەردەم ئاورەکە پیاوێك بە قامچییەکەوە کە لە کلکی وشتر دەچوو، ئیشارەتی بۆ کردم.

پیاوەکە قامچییەکەی بە بەردەکانا دەکێشا، پێدەچوو هەرچی بەزەییە لەڕوحی ئەودا نەبوو، لەترسا لەجێی خۆم ڕەق ڕاوەستام، دەستم بەبەردێکەوە گرت، زەلامەکە لێم نزیك دەبووەوە، تا بەتەواوی ڕوخساریم بینی.

هەندێ شێوازی حاڵی بوون ئازار بەخشە، ئەوە لێل من ڕوویدا، ڕوخساری زەلامەکە وەك ئەوەی سڕابێتەوە کۆسە بوو، ئەو زەلامە لەوانە نەبوو گوێی لەهاوارت بێت و بەزەیی پیاتا بێتەوە و لێت خۆش بێت)).

## خوا ئەناس لەناو گۆڕەکەیدا گیانەوەرێکی بۆ دێتە خوارەوە، قامچییەکی چون کلکی وشتری بەدەستەوەیە، بۆ ئەوەی بکەوێتە وێزەی، کەرەو گوێی لەدەنگت نییە، لێی بپارێنێتەوە

### فەرکوودەیەکی درووستی پەیامبەری

ئادەم دەڵێت:

لەوەتەی پێمان خستە سەر زەوی، بەوای مارەکانەوە خۆشگوزەرانیمان نەبینی، ئەو مارانەی ژێرخاك وتجرکەرترن، ئەو مارانە بەرەو ڕووم هاتن، دەمیان کردبووەوەو چاویان گرژ گرژ کردبوو، بەو دیمەنە هەر چوار پەلم لەگۆ چوون، ئەوەندە لێم نزیکبوونەوە، هەستم بە هەناسەیان کرد، ڕوحم ئۆقرەی نەبوو، مارەکە منی بوارد و لەسیلەمەوە تێپەڕی، چون ئەوەی بۆ شتێك لەپشتمەوە بچێت، بینیم خۆی بەقڵیشێکی ناو ئەشکەوتەکەدا کرد. ئەوە هەوڵجارم بوو، درك بە تووتێل و ڕێڕەوی دەورو بەری خۆم بکەم، ئەوەش مانای گومرایی بوونم بوو.

برکۆکەیەك وێستام، دواتر دوا بڕیاری خۆم دا، بەو ئاوایەی سەرە ڕۆیانە بکەومە ڕێ و نەوەستم، بەو ڕێڕەوەی مارەکە خۆی پیا کرد سێ ڕۆژ و سێ شەو لەڕۆیشتن نەکەوتم، لە ئەشکەوتێکەوە بۆ ئەشکەوتێکی تر، بەردەوامیش هاوارم لە حەوا دەکرد، ئیدی بێ ئومێدی لەهاوار کردنی خستم، هیچ خواردنێکم دەست نەکەوت، لەڕو لاواز بووم، گەرووم میشك بوو، وەختەبوو بمرم، لەپڕ دەروازەیەکم لە ئەشکەوتەکە دۆزییەوە، ڕوحم بووژایەوە، خۆشییەك بە گیانما هات، هەتاوم لێوە دەرکەوت.

لە ئەشکەوتەکە دەرچووم، چاوم بەڕووناکییەکە هەڵنەدەهات، دەستم بەچاومەوە گرد، لاوازی و ڕەقەڵەییەکەم بڕستی لێ بڕیبووم، هەرچۆنێ بوو لەئەمامەتی ئەشکەوتەکان ڕزگارم بوو، وەلێ گرفتێکی ترم تووشیبوو، کە کەوتمە زەمینەیەکی وشك و برینگ، ئەو شوێنەم پێ نەدەزانی، تەنها ڕووەکێکی سەوزی لێنجاوی لێبوو، هەستم کرد بۆم ناخورێت، چوار ڕۆژی ڕەبەق بەو دەشتەدا گوزەرم کرد، زاد بەسەر زمانما نەچووبوو، تیشکی خۆرەکەش وەڕسی کردم، خۆم لەنێوان دوو چیادا مەڵاسدا، لەوێ گوێم لە خورەی ئاو بوو، کنەم کرد، تا دۆزیمەوە، مژم بە ئاوەکەدا کرد، لەم ئانوساتەدا و لەپڕ دەرکەوتەوە، وەك پێشووتر نەبوو، زۆر ناشرینتر هاتە بەر چاوم، ڕوخساری درندەتر و چاوەکانی بەڕقەوە لێی دەڕوانیم، ئیبلیس وەك چۆن خودا لە ڕەحمەتی خۆی نائومێدی کرد، بە چاوە پڕ لەفرمێسکەکانییەوە بینیم، چاوەکانی سوور هەڵگەڕابوون، بەدەم تەماشاکردنمەوە چاوەکانی پڕبوون لەسەرزەنشتی، ئەوەندەی نەبرد زەوی لەرییەوە، دەنگێکی گەورە هات، هەستم بەشنگەلێك کرد، چاوم گرپدا پەناگەیەك بۆ خۆشاردنەوە بدۆزمەوە، هیچ ڕێگایەکی هەڵهاتنم نەبوو، باوتۆزێکی زۆر لەدوورەوە هەڵیکرد، ترسی مردن دووبارە ئامبازم بووەوە، زیاتر خەمی حەوام بوو.

***

# زیندەوەرەکانی خاکی لای خواروو چاوکراوەتر بوون لەوانەی لای سەروو

حەوا دەڵێت:

(( کوڕی خۆم.. بێ زیاد و کەم بنووسە، ئەو شەوە دایکتان بەرەوە بوو، هەموو شتێك لەم خاکەی ژێر پێتان داکەوت، چاوەکانم هێزی بینینیان نەمابوو، لەپێ کەوتم، چۆکم دادا، لەپڕ گوێم لە قامچی وەشاندن بوو، بەر دیوارەکان دەکەوت، لە نائومێدیدا فرمێسکم ڕشت، دەستم بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو نزام لای خودا کرد( خودایە.. منی زەعیفەیەکی تۆ پەرستم، هەر ڕووم لەتۆ کردووە، بێجگە لەتۆ کەسم بە خودا نەزانیوە، ئەی خاوەن هەردوو زەمین و هەرچی تیایە، دڵم لەهەموو شتێك بکە، تەنیا لەخۆت نەبێت، چاوم لەهەموو شتێك بکە لەخۆت نەبێت).

ما بپارێمەوە، هەناسەم سواربوو، لەرز دایگرتم، شریقەی قامچییەکە نەما، بەترسەوە چاوم بە دەورووبەردا گێڕا، هیچ بوونەوەرێکم نەبینی، تەنانەت گڕە سوورەکەش نەمابوو، تەنها ئەشکەوتێکی بەردەڵان و تاریك، دواتر جوانترین شتێك چاوم پێکەوت، (سینوی)ی فریشتەی ڕاسپێردراوم بوو، ئەوەی بەر لە ئادەم هەموو شتێکی فێرکردم لەپڕ هات و دەرکەوت، هەر کەبینیم، هۆشم هاتەوە، بەهەیبەتەوە دەرکەوت و ڕوحی بووژاندمەوە، بەرەو پیری غارمدا، لەوێ ڕزگاری کردم و بردمیە پێدەشتێکی سەوز، لەنێوان خەم و خۆشیمدا پرسیاری (ئادەم)م لێکرد، وەڵامی دامەوەو گوتی:

- ئادەم وەك تۆ سەرفراز بووە.

- هیوادارم ئازاری زۆری نەچێشتبێت، وەك من لەو ئەشكەوتە چێشتم، زۆرم نەمابوو گیانم دەربچێت.
- ئیڤا.. ئەوە هی ئەوە نەبوو ئازارت بدات، بەڵكو ئەوە خەزنەداری ڕوحە خوانەناسەكان بوو.

بەدوودڵییەوە خۆم هێوركردەوە، نەك لەبەر باسی خەزنەدارەكە، ئەوەدەم هەستم كرد ئادەم لە لێواری مەرگدایە، دڵم ئەو هەواڵەی پێ ڕاگەیاندم، وەلێ زانیم هێشتا لەژیاندایە.

***

## ئادەم لەخاكی (دەحنا)ی نێوان مەككەو تایف خۆی گرتەوە، (حەوا)ش لەنزیك جەددە، ئەو خاكەی تا ڕۆژی پەسلان پیرۆز كراوە

ئادەم دەڵێت:

(( سەدان گیانەوەری درندە بەرەو ڕووم شاڵاوایان هێنا، وەختەبوو ڕوحم دەربچێت، ملیان درێژو كەللەشیان لە سەری مار دەچوو، پۆپنەی وەك پۆپنەی كەڵەشێریان هەبوو، ڕێك بۆ خواردنم هاتبوون، بەرپێی ئەوی پێشەوە كەوتم و ئەوی دییان گازی لە لاقم گرت، خۆم گەیاندە دوو كابەرد، لەویش پەلكێشیان كردم، تا خۆم لەپێكانیان بپارێزم، تا هەر هەموویان لێم دوور كەوتنەوە، هەستم كرد ئەوانە لە ڕەوەكەیان دابڕابن، بەو ئاوایەی فریای ڕەوەكەیان كەون لێم دوور كەوتنەوە، لەسەر گازەرەی پشت لێی كەوتم، ئازارێكی زۆرم هەبوو، ئەوە وێڕای خەم و پەژارەیەكی زۆر بەوای حەواوە دایگرتبووم، هەستم كرد چون ئەوەی كەسێك لاقی گرتبم، ئاوڕم لێ

دایەوە، بەوای ڕوحی پاکی ناسیمەوە، فریشتەی نهێنی، بە لاوازییەوە پێمگوت:

- ڕازئێل.. ئەوە گۆڕەکەمانە؟
- ئەی ئادەم.. خودا لە خاك و خوڵی زەوی تۆی خوڵقاند، خودا بۆ خوانەناسەکانی نووسیوە، ئەوەی باوەڕی بەخودا هێناوە، ڕزگاری دەکات و دەیهێڵێتەوە، ئەگەر دڵپاکی خۆت نەبوایە، فەوتابوویت.
- ڕازئێل.. بمبە بۆ لای حەوا.
- بەدەم ڕووبارەکەوە بڕۆ، دەتباتە لای حەوا.
- ئەو ڕووبارەی...

ڕوحم لەخۆی چوو.

***

## گەمژەیی ئەوەیە وابزانیت هەر خۆتیت و شێوەت نییە

حەوا دەڵێت:

(( لەخاکی جددە.. بەدووی پەناگەیەکدا دەگەڕام، گەڕام تا کونە ئەشکەوتێکم لەناوەندی چیایەکدا دۆزییەوە، دوور لە گیانەوەرە دڕندەکان خۆمی تێدا بپارێزم، بەچیاکەدا هەڵگژام، لەودەمەی هەوڵم دەدا بگەمە بەردێك و دەستی پێوە بگرم، هەر کە دەستم بە بەردەکە گەیشت، بەیان بەردەکەوە شتێکم بینی، ڕاچڵەکیم، وەختەبوو بەرەوە بم، لەوێ لای ئەو بەردەی دەستم پێوە گرت، پێی بنیادەمێکم بینی.

سەرم هەڵبڕی تا ڕوخساری ببینم، جەستەیەکی کەتە، دەموچاو جوان، قژەسەری قاوایی، زۆر بە باوەڕ بەخۆبوونەوە ڕاوەستابوو، تەماشای کردم، منیش هیچم بۆ نەوترا.

وەک جنۆکەکانی تر ڕەنگ زەرد نەبوو، ئەوانەی لەبەهەشتا بینیم، ڕێک بنیادەم ئاسا بوو، پێیگوتم:

- تۆ حەوای؟هاوڵەکەت لەدووت دەگەڕێت.

واقم وڕماو بە پەرۆشەوە پێمگوت:

- ئادەم! ئەو لەکوێیە؟ تۆ کێی؟ لەم سەر زەمینە بێجگە لەمن و تۆ کەسی تری لێیە؟

پیاوەکە پێکەنی و گوتی:

- بەڵێ، خودا خەڵقیکردم و لەبەهەشت نیشتەجێی کردم، لەوێ لەپشت ئەو چیایە.

بەسەرسوڕمانەوە پێمگوت:

- بەهشتێکی تر هەیە؟
- بەڵێ لەخاکی (ئەریدۆ)ی بەرفراوان، خودا لەوێ خوڵقاندمی، هاوسەرێکیشی بۆ خەڵقەندە کردم، دواتر ئاگاداری کردمەوە، بنیادەمێکی تری خوڵقاندووە، لە پەراسووەکانم دوو پەراسووی برد و دوو ئافرەتی لێ خوڵقاند، دواتر هەمووانی لەبەهەشتی خواروو وەدەرنا، ئەو دەمەی لەخودا یاخی بوون، خەفەتێکی زۆرم خوارد، دەمزانی ئەمریمەن لێتان ناگەڕێت خۆش گوزەران بن.

لەحەپەساویدا نەمزانی چی بکەم، پرسیاری ئادەمم لێکرد:

- ئادەمت بینی؟
- بەڵێ.. لەوێیە، لەتەکما وەرە تا (لیلیس)ی ئاحەزت خۆی پێ ئەگایاندوویت.

هەر کە گوێم لەناوی لیلیس بوو، دڵم گوشرا، وەلێ گوێم وێنەدا و پرسیم:

- ناوت چییە؟

چاوی تێبڕیم و بەدوو چاوی بەهێزەوە گوتی:

- ناوم (هام)ە.

پیاوەکە لەبەردەکە هاتە خوارەوەو پێیگوتم:

- دوام کەوە، لەوێ لای ئەو گابەردانە ڕێگایەک دەمانباتە لای هاوڵەکەت.

بەدوویدا ڕۆیشتم، نەشمدەزانی کێیە، خۆ ئەگەر ئەو دوای ناوەکەیم بزانیبایە، ڕەنگە لەهەموو شتێك حاڵی بومایە، لەپڕ (هام) وێستاو لای لێ کردمەوەو زەردەخەنەیەکی بۆ کرد، دواتر دەنگی کارەساتێك بەگوێمدا هات، بەترسەوە ئاوڕم لەدوای خۆم دایەوە، چاوم بە بەردێك کەوت بەرەو خوار گل دەبووەوە، ڕەنگە بنیادەم فریا نەکەوێت خۆی لە دۆخی وا ڕزگار بکات، چاوم بەچاوی هام نەوت، دەیڕوانییە بەردە خلووربووەکە، بەردەکە کەوت و جەستەم بوو بەژێریەوە، نەمبینی بەهانامەوە بێت، تا لە مانەوەم دڵنیا بێت، دواتر زانیم ناوی (هام)ی کوڕی (هەیم)ی کوڕی(لامیس)ی کوڕی (ئیبلیس)ە.

***

# جەستەی خۆتان خۆش بوێت، ئەوە موڵکی ئێوە نییە، موڵکی ئەوەیە کە خوڵقاندوویەتی

حەوا دەڵێت:

ڕۆڵەکانم هەستمکرد ئێوە نامبینن، لەودەمەیدا بە پەشۆکاوی لە بەردەکەم دەڕوانی، کە جنۆکەکان بەسەرما بەریان دایەوە، لێ بەزەیی خودا گەورەیە، ئەو لایەی بەردەکە بەسەرما کەوت، لەچاڵێکی ژێر بەردەکە گیربووم، تاریکییەکی نووتەک، هەوای لێ بریم، هەوڵمدا بە هەموو هێزمەوە پاڵ بە چەمکێکی بەردەکەوە بنێم، وەلێ هەوڵەکەم وەك ئەوە وابوو، پاڵ بەچیایەکەوە بنێم، بەترسەوە خۆم لێ گرمۆڵە کرد، بێدەنگی ناوچەکە مانای ئەوەبوو، فریادگوزاریشم بۆ نابێت، نەمدەزانی لەدەرەوە چی دەگوزەرێت، بیرەوەرییەکانم بیر هاتەوە، لەوەشدا نەمزانی بۆچی ئەو بیرەوەریانەم بیر هاتەوە، ئەو ڕۆژانەی بە ئادەم گەیشتم، بەر لەوەی بچینە بەهەشت، بیرمە ئەو ڕۆژە لەلای ڕووباری ئەمری چوارمشقی لێی دانیشتبووین، ئەستێرەکانی ئاسمانمان بە درەوشاوەیی دەبینی، ئادەم تەماشای ئەستێرەیەکی کرد و گوتی:

- ئیڤا گیان.. ئەو ئەستێرەیە دادەگرم و پرچتی پێ دەڕازێنمەوە.

بەقسەکەی خەنیمەوە، تەماشای ئاسمانم کرد و ئەستێرەیەکم دەستنیشان کردو گوتم:

- منیش بەو ئەستێرەیە عاباکەت دەڕازێنمەوە، بڕوانە ئەستێرەکەی من گەورەترە.

ئادەم لەپێکەنینا مرد، ئەوجا بەیەکەوە دیقەتی ئەستێرەکانمان دا، دواتر لێم پرسی:

– ئادەم.. بۆچی ناوی (لیلیس)ت لێنا؟

ئادەم کەمێك بێدەنگ بوو، دواتر گوتی:

– کە یەکەمجار بینیم، شەو بوو، بەلاّم چی وابلێکردی ئەو پرسیارە بکەیت؟

– دەپرسم خودا کێوەی برد؟

– ئەو شەیتانە کاری خۆی دەبات بەڕێوە، پەکی ناکەوێت.

بەدەم ئەو بیرکردنەوانەوە فرمێسك بەچاوانمدا هاتە خوارەوە، زانیم لێرە بە بێ کەسی دەمرم، کاتێکی زۆرم بەژێر گابەردەکەوە بەسەر برد، وەختەبوو لەهۆش خۆم بچم، هەناسەم سوار بوو، گوێم لەشتێك بوو، وەك ئەوەی دەنگی پێ بێت، دەنگێکی تر چون ئەوەی دەنگی بەرد شکاندن بێت، سەبرم نەما، دەنگێك لەدوور ڕا ناوی بانگ دەکردم، برێك بەخۆما هاتمەوە، زۆر بە زەحمەتیش چاوم هەڵدەهێنا، ئەی خودایە ئەوە دەنگی ئادەم دێت.

دەنگی تەقەی پێ و بانگکردنەکە بەرزتر و نزیکتر بووەوە، دەستم بەبەردەکەدا گرتا، بەدەنگێکی کزەوە بانگم لەئادەم کرد، زۆری نەبرد کەوتە وێزەی بەردەکە، بە بن بارانەکەو بە بەردێکی تەور ئاسن دەرکەوت، قژی ژاکابوو، ڕیشی درێژ و چاوە بەسۆزەکانی بەپەرۆشەوە تێبڕیبووم، هەردوو باڵی لێ والاّ کرد، وام بەخەیالاّ هات، باڵەکانی بەکبەرو ئەوبەری دنیا گەیشتبن، بەهەڵەداوان خۆم پێگەیاند، لەباوەشی گرتم، تێرو پڕ یەکمان ڕاموسی، ڕوحمان ئاوێتەی یەك کردەوە، گوێم لەهەناسەی گرد، زەوی لەرییەوە، وەلێ یەکمان بەر نەدا، لێلیدا ڕۆیشتم، بە ڕوحی گەرم و گوڕییەوە

دابیۆشیم، ئەوەی بەسەرما هاتبوو بۆم گێڕایەوە، ئەویش بەسەرهاتی خۆی بۆ گێڕامەوە، ما بەدووی جۆگەلەو کانی ئاودا بگەڕێن، تا ئاوێکمان لێوە دەرکەوت، چووینە ناو ئاوەکەو خۆمان شووشت، هەر کە بەیانی پەردەی ڕەشی تاریکی دامالی، شتێکی شەرمنانە ڕوویدا.

لەدەرەوەی ئاوەکە چاومان بە هەرامەی نێرینە و مێینەی یەکتر کەوت، ڕووت و قووت هیچمان لەبەردا نەبوو، شەرممان لەیەك شکا، کەوتینە گەمە کردن بە ئاوەکەو ئاومان بەیەکدا دەکرد و باوەشمان بەیەکا دەکرد، شەرمەکەمان بە خەنینەوە گوڕی، دواتر لەنزیکمانەوە و لەناو ئاوەکە شەیتانگەلێك تێپەڕین، چون ئەوەی خۆیان نمایش بکەن، ئەودەم بەو نمایشەمان نەزانی، ئەوەی پێمان کرا لەو شوێنە هەڵهاتین و دوور کەوتینەوە. ئادەم دەستی بە دەموچاویەرە گرت، بەدەم مەلەکردنەوە لەخودا دەپاڕایەوە، دواتر لەپشتمانەوە گوێمان لەدەنگێك بوو، گوتی:

– جنۆکەکان ئارمانجیان داوێن پیسی فریو دان و تۆقاندنی ئێوەبوو، وەلێ کەسیان ناتوانن ئازارتان بدەن، کە دەشیانبینن، لێیان مەترسن.

لێل ئاوڕدانەوەمان (ڕازنێل)مان بینی، بەو دیدارەی زۆر دڵخۆش بووین، بۆ خۆم لێم پرسی:

– ئەی فریشتەی فێرکەر، بەهەشتی ڕاست و بەهەشتی چەپ هەیە، بێجگە لە ئێمە بنیادەمی تر هەن؟
– حەوا خان.. شەیتان ڕاست و درۆ تێکەڵ دەکات، ئەریدۆ دارستانێکە هەندێ جنۆکەش تێیدا ئاکنجین، لە ئێوە زیاتر بنیادەمی تێدا نییە، تەنها ئیلیس نەبێت.

دواتر فریشتەکە لێی ڕوانین و گوتی:

- ئەی ئادەم.. خودا فەرمانێکی مەزنی پێکردوویت.

فریشتەکە مۆڵەتی لێ خواستم و دەستی ئادەمی گرت و دوورکەوتنەوە، هەڵبەتە بۆ ئەوەی فەرمانەکەی خودای پێ ڕاسپێرێت، ئادەم گوێی لێ گرد، بەدەم گوێگرتنەوە چاوەکانی زەق وەق کردەوە، ئادەم لێی ڕوانیم و سەرسوڕمان لەچاوەکانیەوە دیاربوو، دڵم کەوتە ختووره، ئەوەی فریشتەکە بە ئادەمی گوت، بڕکۆکەیك لێیان حاڵی بووم.

- ئەی ئادەم خودا فەرمانی ویداوی ژنەکەت بێنیت.

ئادەم لەناحاڵیبوونێکدا بوو، فریشتەکە شنگەلێکی پێ ڕاگەیاند، ئادەم چون ئەوەی حەپەسا بێت، چاوی زەق زەق کردەوە، فریشتەکە پێیگوت:

- ئادەم.. هەر وەك چۆن خودا ڕوحتانی بەیەکەوە شەتەك داوە، لەجەستەشتدا شتێکی خوڵقاندووە بۆ ئەوەی بەیەکتانەوەی ببەستێت، ئەوە شتێکی سرووشتییە، خودا فەرمانی پێکردووی مارەیی ویدەیت، بێ مارەیی لێلیدا جووت نابیت.
- مارەیی؟! وەلێ ئەو لای من بەهای لەهەموو شتێك گەورەترە.
- شتەکە بەقسە نییە، هەوڵبدە ئەوەی خودا پێی بەخشیویت بیکەی بە مارەیی.
- بەڵام خۆ من هەر هیچ شك نابەم.
- لەوێ لەپشتی ئەو چیایەوە خاکێکی دەوڵەمەندە، هەموو شتێکی لێیە، بڕۆ ئەوێ، ئەوەی دەتەوێت و پێویستە بیبە، خودا هەموو شتێکی بەبنیادەم بەخشیوە، تەنها ئاژەڵەکان بێ هیچ بەرامبەرییەك

جووتبوونیان بۆ لواوە، هەولّبدە شتێکی باشت دەست بکەوێت، ئەوە ڕێگات بۆ داهاتوو دەکاتەوەو ئەوەت زۆر دەبێت.

***

## ئادەم ئەو چیا پیرۆزەی بەحەوا ناساند، بە عەرەفە ناوزەدکرا

ئادەم دەڵێت:

خودا دووگیانی لێ پیرۆز کردین، فریشتەکە فەرمانی خودای پێ ڕاگەیاندین بگەڕێینەوە خاکی عەدەن، بەو ئاوایەی بەپیتترین خاکی سەر زەوییە. ئەو ڕۆژە لە عەرەفەوە بەرەو خاکی عەدەن بەڕێکەوتین، بەوای ئازاری (حەوا)وە نزیک ڕووباری ئەردەن پشوویەکمان دا، لە ئەشکەوتێکی نزیک بۆ کۆکردنەوەی مێوە (حەوا)م جێهێشت، لای خۆرئاوا بەرەو ڕووبارەکەی ئەردەن ڕۆیشتم، ئەوەندە بەدوای مێوە گەڕابووم، زۆر پێم قڵیش قڵیش ببوو، بیریشم هەر لای حەوا بوو، کە لەئەشکەوتەکە چاوەڕوانم بوو. ئەو ئازارەی چەند مانگێکی بەسەرا تێپەڕی، نەمدەزانی ئازاری دووگیانی چی لەو ئافرەتە دەکات.

لەناو ئاوەکەی ئەردەن بەپێوە وێستام و دەستم بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو قسەم لەتەک خودای خۆم کرد(( هەر خۆت ژیانت بەم زەوییە بەخشی، هەر لەو خاکەشەوە منت خوڵقاند، لەخراپەکارییەکانمان ببوورە، ئەم نەفسەی ئێمە لەتۆ بەولاوە پەناگەی نییە)) دەستم بەگریان کرد، ماسی و گیانەوەرانی دەریا لەدەورم کۆبوونەوە، تەماشام کردن، لەگردبوونەوەکەیان سەرم سوڕما، لەپڕ هەستم بەدلگوشین کرد، چون ئەوەی ڕوحم ئازاری

پێگەیشتبێت، هۆکاری ئەو دڵگوشینەم نەزانی، ئەوجا ترس ئامبازم بوو، پڕ بەگەرووم هاوارم کرد:

- حەوووووووا.

ئەوەی ئاوێتەی ڕوحمان بوو هەستمان بە یەك دەکرد، بەغاردان بەرەو ئەشکەوتەکە گەڕامەوە، بەرای دووری ئەشکەوتەکە، بەتاو بەرەو ئەشکەوتەکە غارم دا، هەر کە نزیك ئەشکەوتەکە بوومەوە، دڵم زیاتر کەوتە کوتە کوت، وەك ئەوەی هەست بە بوونی کارەساتێك بکەم.

***

## ئەوە دڵەکانە هۆ عەلی، ئەگەر پاك و بێگەردبوون، دەبینن

(عومەری فاروق)

حەوا دەبێژێت:

(( لەناو ئەشکەوتێکی بچووکدابووم، بەدەم ئازارو ژانێکەوە دەمناڵاند، مردنم بەچاوی خۆم بینی، بەوای ئازارەوە بەسەر زەوییەکەدا دەتلامەوە، ئەوە ژانی منداڵبوونم بوو، بەتەنێ بەرەنگاری ئەو ژان و ئازارە بوومەوە، تا دەهات ڕوحم تاریك دەبوو، لەنێو ئازارەکەدا بووم، چاوم بە سێبەرێك کەوت، لێم نزیکەوە بوو، لەناو ژان و ئازار بانگم لێکرد:

- ئادەم.. فریام کەوە خەریکە دەمرم.

جەستەم بۆ لای پشتەوە وەرسووڕا، هەروەڵێن مەڵۆتکە لەم دنیایەدا لەدایکبوو، قریشکەی کرد، هەرچی گیانەوەریوو گوێی لەقریشکەکەی بوو، هەستمکرد دەستێك شانی گرتم، دواتر کۆرپەکە دەستی بەگریان کرد،

هەناسەم هاتەوە، وەلێ نەمزانی چی ڕوویدا، بەوای ئەوەی لەهۆش خۆم چووبووم، تەنانەت چاوم بە کۆرپەکەش نەکەوت، دواتر شتێك بەر تیشکی مانگەشەوەکە کەوت، کەسێکبوو مەلۆتکەکەی هەڵگرتبوو، ئەمریمەن نەبوو، بوونەوەرێکی لێو سووری قژ سووری ڕوحێکی کینەدار و ڕقاوی، ئەویش (لیلیس)بوو.

حەوا دەڵێت:

(( ناو ئەشکەوتەکە هەر خوێن بوو، خوێن بەو ناوە بڵاوبیبوەوە، لەناو ئازار هۆشم لای خۆم نەمابوو، خەونم دەبینی و لێی حاڵی نەدەبووم.. ئافرەتێکم هاتە خەون لەنێو بڕێ زەلام سەمای دەکرد، پاشا بە گرنگییەوە تەماشای دەکرد، پاشا لە (ئادەم)ی دەکرد، سەماکەرەکە لەسەمای خۆی نەدەکەوت، دواتر پاشا پێیگوت.. هەرچییەکت دەوێ لێمی داوا بکە، نیوەی مەملەکەتەکەت وێدەدەم. بەشەرمەوە سەری دانوواندو ڕۆی تا لەدایکی بپرسێت، ئەو شاژنەی لەسێلەی(ئادەم)دا بوو، من نەبووم، ژنێکبوو لە (لیلیس)ی دەکرد.

ما خەونەکان مێشکم هەراسان بکەن؛ بەئاگاهاتمەوە، (ئادەم)م بینی، بەرەو پیرم دەهات، تەماشای کردم، دواتر چاوی بە خوێنە پەرش و بڵاوەکە کەوت، لەچارەکانەوە هەستم بەکارەساتێك کرد، بەنێو ئەشکەوتەکەدا چاوی گێڕدا، چوار پلە گۆشتی خوێناوی ، لێی نزیکەوەبوو، دەستی لێدا، دواتر بە دڵشکستەییەوە پاشەو پاش گەڕایەوە، چارەکانی خوێنیان تیا قەتیس بوو، بەدەم کشانەوەی بەرەوە بوو، ئەوجا هەوڵیدا ڕاستەوە بێت و خۆی بگەێنێتە لام، لەنێو خوێنەکە بەرزی کردمەوە، دەستی بەسەرو قژما هێناو پێیگوتم:

- ئادەم كۆرپەكەم بێنە، ئەوە بوو گریم لەدەنگی نییە؟

هەر کە دەستی نایە سەر شانم، حەپەسام، بەدەستە لەرزۆکەکەی چون ئەوەی هێورم بکاتەوە، دواتر گوتی:

- ڕوحی دەرچووە!

وەك ئەوەی سەنگێکی گەورەیان بەسەرما کێشابێت، نقەم لێ بڕا، تەنانەت لەحەپەساویدا گریانیشم بیرچووەوە، ویستم بەرەو لای کۆرپەکەم بچم، دەمیم بەکراوەیی بینی، سەری بۆ لای پشتییەوە شۆڕ ببووەوە، لەخوێنا نەمابوو، جووڵەی نەبوو، هاوارێکم کرد، دنیا گوێی لەهاوارەکەم بوو.

دنیا لەبەرچاوم کەوت، نە برسێتی و نەیش تینێتیم بیر نەمابوو، ئەگەرچی ئێمە لەخاکی (عەدەن)دا بووین، کە خاکێکی نەمرییە، هەموو ژیانم لەبەرچاو کەوت. دوای ساڵێك سکێکی ترم کرد، ئادەم هیچ شوێنێکی بە ئارام نەدەزانی بۆ نیشتەجێبوون، ئەشکەوتی ڕاسپێردراو نەبێت، دڵنیای کردمەوە، لەدایکبوونی منداڵی دووەم پارێزراو دەبێت، ئاخر ئاژەڵەکانی ئەوێ دڕندە نین، لەو ئەشکەوتە نیشتەجێ بووین، ئادەم بەجێی نەدەهێشتم، منداڵێکمان بوو، پێکەنینەکەی هەموو دنیای دەهێنا.

ڕۆژی دواتر کۆرپەکەم بینی لەسەر دەم کەوتووە، پەلامارم دا و ئەمدیو و ئەودیوم کرد، ئەو دیمەنەم بینی کە شپرزەی کردم، دەمی کرابووەوە، جەستەی بێ جووڵەبوو، ڕوحی تیا نەمابوو، هاوارم کرد و پرچی خۆمم ڕنی، وامانزانی بەوای کەمخۆراکییەوە مردووە، وەلێ دڵم باوەڕی بەوە نەبوو، تا ئەو ڕۆژە هات، کە سکی سێیەمم هەڵگرد، وەلێ سکی سێیەمم سووکتر بوو، وەك دوو سکەکەی پێشوو ماندووی نەکردم، زۆرم لەتەك ئادەمدا گوت، کە ناتوانم ڕۆژێکی تر لەو ئەشکەوتە بەسەر بەرم، داوام لێکرد سکی سێیەمم

لای ئەو گابەردە بێت کە بەسەرما کەوت و هیچ ئازارێکی نەدامو دواتریش بەتۆ شادی کردمەوە.

ئەگەرچی ئەو شوێنە لەدەرەوەی خاکی عەدەندا بوو، ئادەم دەمە دەمی لەتەکما نەکرد، گوێزامانەوەو لەژێر بەردەکە نیشتەجێ بووین، ئادەم هەموو ڕۆژێک دەچووە پێدەشتە نزیکەکەو بەدوای خۆراکدا دەگەڕا، زۆر دوا نەدەکەوت و دەگەڕایەوە، بەتەنێ جێی نەدەهێشتم. ئەو ڕۆژەی ئادەم چووبووە دەرەوە، ئەوەی لەخەیاڵدا نەبوو، چاوم پێبکەوێت، لۆسیفەر بوو، پێیگوتم:

– کۆرپەکەت ناو دەنێیت چی؟

بەتوورەییەوە سیکترم کردو پێمگوت:

– لێرە برۆ.

سەری بەلادا بردو گوتی:

– ئەم کورەت ناو بنێ (عەبدولحارس)، ئەگەر کچیش بوو ناوی بنێ ئومەتی حارس.

ویستم لێی ڕاپەڕم و پەلاماری بدەم، ئەگەر بەو توورەییەی ناخمی دەزانی، نەدەهاتە بەرچاوم، پێمگوت:

– هەی بەنەفرەت بیت، لێمان دوور کەوە، ئێدی ئەوەندە بەدەورمانەوە مەیە، جارێ بەقسەمان کردی لەبەهەشت بەدەرکردنت داین، لاچۆ لەبەرچاوم، ئێتر قەت باوەڕت پێ ناکەین.

لۆسیفەر بە تێڕوانینێک چون ئەوەی بمترسێنێت، لێی ڕوانیم و بەشێوازێکی تۆقێنەر دڵی هەژاندم و گوتی:

– بۆ فریودانت لێرە نیم، فریوم دایت و لەبەهەشتم کردی، بۆ ئەوە لێرەم تا پێتبڵێم.. ناوی بنێ(عەبدولحارس) بۆ ئەوەی نەمرێت،

ئەگەر وانەکەیت، ئەوا دەگاتە کاروانی براکانی و بەچاوی خۆشت مەرگی دەبینیت.

لێل بیستنی ئەو قسەیە متەقم لەخۆم بڕی، لەخۆمم پرسی.. تۆ بڵێی منداڵەکانم دەکوژران.

***

## تۆ بەفەرمانی شەیتان دەخۆیت و بەفەرمانی ئەویش دزی دەکەیت، تەنانەت منداڵەکانیشت بەو دەبەخشیت

ئادەم دەبێژێت:

(( تا سەر ئێسقان تووڕەبووم و گوتم))

- کەواتە(هامی کوڕی هەیم)یش کوڕی تۆ بوو، هەی ناشرین.

ئیبلیس ئاوڕی لە پشتی خۆی دایەوە، من لەبەر دەرکی بەردەکە بە ڕمەدارێکەوە وێستام، کە بۆ خۆم دامتاشیبوو، ویستی قسە بکات، ڕمەدارەکەم لێ ڕاست کردەوە، ئیبلیس گوتی:

- فریشتەی هاوڕێت پێی ڕانەگایاندووی ناتوانیت دەستم لێ بوەشێنیت؟ من جنۆکەی دەمەو چاو سوورەم.

هاوارم بەسەریا کرد:

- هەی نەفرەتی، بۆچی وازمان لێ ناهێنیت؟ بەمشێوەیە دژایەتی هەموو خەڵقەندەکانی خودا دەکەیت، یا هەر دژایەتی ئێمە دەکەیت؟

– بێجگە لەئێوە دژایەتی کەسیتر ناکەم، ئەمە هەقە، چۆن ئێوەم لەبەهەشت وەدەرنا، ئێوەش بوونە هۆی ئەوەی لەفەرماندارێتیم بخەن.

– لەوەتەی خودا خەڵقەندەی کردووین، لە کینە و ڕق و هیچ و پووچی بەولاوە تۆمان لەباشیدا نەبینیوە.

ئیبلیس لەسەرخۆ لێم نزیکەوە بوو، گوتی:

– تۆ جارێ بەتەواوی نازانیت چیت بەسەر هێناوم، ئەگەر بزانیت، سەری خۆت لەو قوڕە دەنێیت، کە لێی درووست کراویت، تۆ منت لەهەموو شتێك کرد، تەنانەت بەر لەوەی هەشبیت.

هاوارم بەسەریا کرد:

– هەی بەنەفرەت بیت باسی چی دەکەیت؟!

ئیبلیس بە ڕقەوە لێی ڕوانیم و گوتی:

– کاتێ ڕوح بەجەستە قوڕییەکەتانا کرا، من کڕنۆشم بۆ نەبردن، وەك ئەوە وابوو کڕنۆش بۆ مەیموون بەرم، خودا لەبەهەشت دەرییەڕاندم.

بە دڵنیاییەوە پێمگوت:

– خودا ئەگەر فەرمانمان وێدات کڕنۆش بۆ مەیموون بەرین، لاریمان نییەو فەرمانەکەی جێ بەجێ دەکەین، ئەمڕۆش بەیەکەوە لێل ئادەم دنیا ئاوەدان دەکەینەوە.

ئیبلیس بەتووڕەییەوە گوتی:

– بوونەوەرێکی ئابڕووبەری وەك ئێوە، کە دەستیان بە نیعمەتی بالاّ ناگات، دەبێت هەر ئەم جۆرە قسانە بکەن.

منیش بەتوورەییەوە وتمگوت:

– هەی بەلاّی ناگەمان لەکۆڵمان بەرەوە، لەفێڵێکی تر بگەڕێ؛ بێجگە لەناوی عەبدولحارس.

شەیتان بەچاوی زەقەوە گوتی:

– ئێمە دەزانین چۆن ئاژەڵ و درندەکان بخەینە ڕاڕاییەوە، هەر منداڵکیشت ببێت، گیانەوەرکان پارچە پارچەی دەکەن.

ئیبلیس ڕۆیشت و دوای خۆی بێدەنگی و دۆشدامانی تیاما جێهێشت. حەوا ئەو بێدەنگییەی شکاندو لەپڕ گوتی:

– بەو ناوەی درگاندی، من ئەم ناوەی لیّ دەنێم.

بەوای تووڕەبوونمەوە، چاوەکانم زەق زەق لیّ کردەوە، دەنگمان لەبەرامبەر یەك بەرز کردەوە، ناچار (حەوا)م جێهێشت و چوومە دیار ڕووبارێکی لەو نزیکانە، ئەمە خوایە هێور ببمەوە، لەپڕ بەرامبەری گرتم، بەڕوویەکی کراوەوە دیقەتی دام، (با) یاری بە پرچەکەی دەکرد، ئەوە لیلیس بوو، ژنی یەکەم و بکوژی یەکەم

***

*** تەواو ***

لویب جگەرەیکی نایە نێوان دووپەنجەی لەرزۆکی و پێیکرد، ما بەسەر دوودڵییەکەیەوە زاڵ بێت، دانی بەخۆیدا گرد و کادووی جگەرەکەی بەسەروچاوی (بۆبی)یدا کرد و گوتی:

– هەی ناجسن، پێمبڵێ بۆچی دەیانەوێ بەم شێوەیە لەسێدارەت بدەن، بۆچی فەرمانی کوشتنت بەوازۆی هەموو ئەندامانی رێکخراوەکەوە دەرچووە، کە بەزووترین کات بکوژرێیت؟

بۆبی بێدەنگبوو، هەر دوو چرکە جارێك برژانگی چاوی هەڵدەفڕی، دواتر تەماشای زەوی کرد و گوتی:

– هەندێ بابەت دەزانم، کە بۆ کەس نییە بیزانێت، ئەگەر لای ئێوە درکاندم، بۆ خۆتان و لەناخی خۆتانا بیشارنەوە، دەنا سەری ئێوەش دەقەبلێنێت.

لویب چاوەکانی لێ کز کردو دوکەڵی جگەرەکەی بەبادا کردو گوتی:

– ئێمە بەتەواوی گوێڕایەڵتین.

بەسەر روخساری(بۆبی)یەوە شتێك لەدوودڵی زسکا و گوتی:

– دەمەوێ شتێکتان پێ رابگەیێنم، کە گێڕانەوەی یاساغەو تەنانەت ئەگەر بەلاتانەوە قسەی سادە و ئاساییش بێت، ئەگەر بڵاوبێتەوە، گومانی خەڵکی لەرووی مێژوویی و جوگرافی و ئاینییەوە دەگۆڕێت، دوور نییە مشتومڕ و دەستوەشاندنیش لەناو خەڵکیدا دابێنێت.

لویب بەمێمنی پێیگوت:

- مەبەستت شوێنی بەهەشتی عەدەنە؟

بۆبی بە بەڵێ سەری بۆ ڕاوەشاندو گوتی:

- دەزانن تەورات کلیلێکی بچووکی بۆ خەڵکی تێدایە، تا بەدوای ئەو بەهەشتەدا بگەڕێن، کاتێ دەڵێت خاکەکەی یەکاوی هەر چوار ڕووبارەکەیە، فورات و نیل و سەیحوون و جیحوون، هەر هەموشیان لەیەك سەرچاوەوە هەڵدەقوڵێن، خاخاکان ناویان ناوە ڕووباری ژیان، بەوای ئەوەی داری ژیان لەکەناریا شین بووە، هەڵبەتە فورات و نیل ناسراون، ئەو دووەکەی تر نامۆن، لەم سەردەمەی ئێمەدا بوونیان بۆ نییە، هەموان لەڕووباری نیل و فوراتدا بۆی گەڕان.

لویب هەرزوو هەڵیداو گوتی:

- ئۆرم دەربارەی ڕاوچیانی گەنجینە بیستووە، کە بەدووی ئەمریدا گەڕاون، هەوڵی ئەوەشیان داوە ئەو دوو ڕووبارە نامۆیە بدۆزنەوە، کە لەسەر چ ڕووبارێکن، وەڵێ بێ ئەنجام بووە.
- بەهەشتی ئەمری ئەو شوێنەیە دایبابمان بەوای یەك هەڵەوە تێیدا دەرکران، ئەوە چ ژیریێژییەکە خاکێکی زانراو بێت و بەوای گوناە و تاوانەکانمانەوە ئەمڕۆ لەسەری نیشتەجێین؟ حەتمەن ئەمە مەحاڵە، بەدەر لەوەش، هەموو توێژەرەکان بە بیردۆزەی خۆیانەوە دەرچوون، ڕایان لەسەر ئەو شوێنە بوو کە بەهەشتی ئەمرییەو ها لەدەوروبەری عێراق و شام و تورکیا، یانی ناوچەی نشێوی دەریای ناوەڕاست، تەنانەت لەنێو بڕیارەکانی

ڕێکخراوەکەشماندا دەق گەلێك بەرز کراوەتەوەو سەرلەبەری هاوکێشەکەی چارەسەر کردو کەسیش پێی نەزانی

لوبیب چاوی لێ زەق کردەوە، بۆبی درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

- دەق گەلێك لە سوونەتی محەمەد پێغەمبەری ئیسلامدا هاتووە، کاتێ محەمەد لەگەشتی (میعراج)دا بووە، دوای حەوت تەبەقەی ئاسمان بەدارێکی مەزن گەیشتووە، ناوی (سدرەی موننتەها)بووە، بەهەشتی مەزنی لەوێ بینیوە، گوایە پیاو چاکان لەوێوە دەچنە بەهەشت، ئەوەی مایەی هەڵوەستە کردنە، ئەو دارە بەسەر ڕووبارێکی مەزنەوەیە، کە چوار ڕووباری لێ دەبێتەوە، نیل و فورات و سەیحوون و جیحوون، بڕوانە لێرەش (تەورات) بەهەشت و دارو چوار ڕووبارمان هەیە، نیل و فورات و سەیحوون و جەیحوون.

لیزبۆڵد بەدەنگێکی کرخنەوە گوتی:

- ئەوە ئاساییە، ئاینەکان لەیەکەوە شتیان دەگواستەوە، ئەوەش بەلگەیە بۆ خەلکانی موسوڵمانان کە بەهەشتەکەی ئادەم دارو چوار ڕووباری تێدابووە، هەر ئەوێشە بەهەشتی ئەو دنیا کە لەبان حەوتەمین تەبەقەی ئاسمانە.

بۆبی دەستبەجێ گوتی:

- ئەوە دەبوو ئەگەر خودی محەمەد لە فەرموودەیەکیدا گوتوویێتی .. لەبەهەشتدا چوار ڕووبار هەڵدەقوڵێت، نیل و فورات و سیحان و جیحان، دەرکەوت باس لەڕووبارەکانی سەر زەوی دەکات، چونکە ئەو گوتبووی نیل لە میسرە، ئەوەش لە قسەکانی محەمەد

ڕامبووە، لەشوێنی خواپەرستییەکەی ئاشکرای کردووە، ئەو ئەو کلیلەبوو، کە مەتەڵەکەی هەڵهێنا.

براکان بێ ئەوەی لێی حاڵی بووبن، دیقەتیاندا، بۆبی گوتی:

- سیحوون و جیحوون ئەوانەی لەتەوراتدا هاتووە، لەسەر نەخشە نین، کەچی سیحان و جیحان دوو ڕووباری گەورەو هاوتەریبی یەکن لە تورکیادان، کە بۆ ناو دەریای ناوەڕاست شۆڕدەبنەوە، ئەو چوار ڕووبارە کە لەبەهەشتی ئەو دنیادا بێت، کەواتە لەسەر زەویش بەهەشت هەیە، ئەویش بەهەشتەکەی ئادەمە.

بەڕوخساری لوبیەوە دەرکەوت بیر لەشتێك دەکاتەوە، گوتی:

- ئەوە ئەوکاتەی لەڕێکخراوەکەدا پێیان دەگوتینەوە(( هەرچی لەسەرەو هەبێت لەژێریشەوە هەیە))، تۆ دەتەوێ بڵێیت ناحاڵیبوونەکە لەوەرگێرانی عیبرییەکەی تەوراتدایە بۆ سەیحوون و جەیحوون کە ناوی ڕاستییان سیحان و جیحانەو لەتورکیادان، وەلێ کێشەکە هەر ماوە، نیل لەمیسرەو فوراتیش لەعیراقەو سیحان و جیحانیش لەتورکیان، مەحاڵە ئەم چوار ڕووبارە لەیەکئاوردا یەك بگرنەوە، پێمناڵێیت ئەوانە لەکوێ بەیەك دەگەن و دەڕژێنە دەریای ناوەڕاست، تەنها فوراتە دەڕژێتە نزیکی.

بۆبی خۆی کڕ کردو لەبەرخۆیەوە بڵمە بڵمی بوو، دەیگوت:

- هەی ئاڕەسەنی ناجسن.. پێمان بڵێ ئەو بەهەشتە ها لەکوێ؟ کوڕە سەیرم نەما.

بۆبی چون ئەوەی دارێکی وشکی ڕەق هەڵاتوو، نقەی لەخۆی بڕیبوو، تەنها چاوەکانی لەسۆسە کردندا بوون، بۆیە بەرسڤی لیۆبۆڵدی نەدایەوە، چون ئەوەی پێی گران بێت نهێنییەکی وا لای ئەم دوو گەمژەیە بدرکێنێت. لیۆبۆڵد بە تووڕەییەوە لەجێی خۆی ڕاستەوەبوو، گوتی:

– لویب.. پێموایە ئەم ئالبارە نایەتە ژێر بار.

لەناکاو لیۆبۆڵد پشتی ملی بۆبی گرت و سەری بەزەوییەکەدا کێشا، بۆبی هاواری لێ هەڵستا، بلەز لویب فریای کەوت و پاڵێکی بەلیۆبۆڵدەوە ناوهاواری بەسەریا کرد و گوتی:

– هەی گەمژە.. دان بەخۆتا بگرە، ئەم گەنجە گۆشەگیرە، نابێت مامەڵەی توندی لەتەکا بکەین.

لیۆبۆڵد بەتووڕەییەوە گوتی:

– خوای ئەکرد شێت دەبوو.

لویب پاڵێکی تری پێوەناو گوتی:

– یانی هزری ئەوەندە ئاڵۆزە کەللەی تۆ بڕی ناکات، کەللەی ئەو گەنجە گەنجینەیەو لەژێر دەستماندایە، هەرچی لێ دەکەی بیکە، وەلێ لەکەللەی بەدوور بە.

لویب بۆ دڵنەوایی کردنی، بەرەو لای بۆبی ڕۆیشت و لەسەرخۆ ڕاستی کردەوە، بۆبی دەستی بەسەر خۆیدا هێنا، چون ئەوەی لەخوێن بگەڕێت، لویب بەزمانێکی شیرین پێیگوت:

- گوێ بەوە مەدە، لەتەک منا قسان بکە، تا قسەمان بۆ بکەیت ئازارت نادەین، لەکۆتاییشدا کە هەموو شتێکت پێگوتین، ئازادت دەکەین، ئێستە پێم بڵێ.. ئەو بەهەشتە ڕێك لەکوێدایە؟

بۆبی فرانك بەرای ئازاری سەریەوە، کە دەستی پێوە گرتبوو، دەمێك بێدەنگبوو، تا سووربوونەوەی دەموچاوی کپ بووەوە، زۆر بە گرانی گوتی:

- ئەو دەستەیەی زانیارییان دەست کەوت، وەك ئەوە وابوو، مەتەڵەکەیان هەڵهێنابێت، زانای ئاینی نەبوون، تەنانەت شوێنەوارناسیش نەبوون، لەوانەش نەبوون کە سەرکێشکەر بن.

بۆبی دەمێکی تر بەرای سەرهەڵدانی ئازاری کەللەیەوە بێدەنگ بوو، لیۆبۆڵد دەمانچەکەی ڕاکێشا، بۆبی گوتی:

- زانای جیۆلۆجی بوون، ئەوان دۆزیانەوە، هەر ئەوانیش گوتبوویان دەریای ناوەڕاست وەختی خۆی خاکێکی ئاسایی بووە، دواتر ئەو چوار ڕووبارەی پێیا تێپەڕیوە، بەکورتی یانی بەهەشتی عەدەن، ئەودەم باخچەیەکی سترانبێژیی بووە، یا باخچەیەکی نێو خاکی ناوەندی دێرین بووە، دواتر هەر چوار ڕووبارەکە لە پێدەشتی عەدەنە یەکیان گرتووەتەوە.

دوا بەدوای ئەو قسەیەی بۆبی، بێدەنگی باڵی بەسەر ژوورەکەدا کێشا، لیۆبۆڵد خۆی گەیاندە کۆمپیوتەرەکەو هەندێ بابەتی بەپەلە نووسی، هەرچی لویب بوو، بێدەنگی هەڵبژارد، بۆبی درێژەی بەقسەکەی داو گوتی:

- کاتێ ئادەم و حەوا لەبەهەشت دەرکران، خۆیان و منداڵەکانیان لە پێدەشتی پان و بەریندا ژیان، کە دواتر بەخاکی عەدەن ناوزەد کرا، واتە خاکی نەمری، دوای ئەوانیش پێغەمبەرەکانی تر تا

سەردەمی نوح ژیانیا تێیا بەسەر برد، دواتر ئەو خاکە بەوای لافاوە مەزنەکەوە هەموو دنیای گرتەوە، کە بەلافاوی نوح بەناوبانگە، ئەو خاکی ناوەندەش کەوتە ژێر ئاوەوە، بوو بەو دەریایەی کە ئێستا بەناوی دەریای ناوەڕاست بەناوبانگە.

لیۆبۆڵد سەری لەسەر کۆمپیوتەرەکە بەرز کردەوەو گوتی:

– لویب ئەم هەتیوە قسەی ڕاست دەکات، هەنووکە دڵنیام دەربەندی چیای تاریق لەسەردەمێکی زۆر کۆندا کلۆم بوو، هەموو ئاوەکەی ناوەند بوو بەهەڵم و خاکەکەی ڕووتەن بوو، دواتر ڕووبارەکان پێیا تێپەڕین و بووژایەوەو سەوز بوو، ئێدی بوونەوەرەکان تیا ژیان، تا لافاوە گەورەکە ڕوویدا، بەناوی لافاوی(زانکلۆن) خاکی ناوەندی داپۆشی و بوو بەو دەریایە.

لویب بەچاوە زەقەکانییەوە گوتی:

– ئەی خودایە.. کەواتە لافاوی زانکلۆن هەمان لافاوەکەی (نوح)ە، ئەوەش هەندێ خاڵی ناڕوونمان بۆ ڕوون دەکاتەوە.

لیۆبۆڵد بەدەم وردبوونەوەی لەکۆمپیوتەرەکە گوتی:

– بەردەوام ـەواڵی گرنگ مانشێتی سەرەکی ڕۆژنامەکانە، ئەوەتا لەمەڕ ونبوونی ئەم نەفرەتییە هەواڵێك دابەزیوە، کە (یاقووب)ی باوك بانگەشەی خەڵاتێکی گەورەی کردووە، بۆ ئەو کەسەی کوڕەکەی دەدۆزێتەوە، لویب چی بەم گەمژیە دەوترێت؟

یاقووب فرانك لەبنەوە داوای کوشتنی کوڕەکەی کردووە و بەئاشکراش خەڵات بۆ دۆزینەوەی دەردەکات.

لویب بەتەلەفیسیەوە بزەیەکی بۆ کرد، کەچی بۆبی فرانك لەخەفەتا ئامی هەڵدەکێشا، چاوەکانی لێ کز کرد، وەك ئەوەی شتێکی خەراپی بیر کەوتبێتەوە، دواتر بێ ئەوەی پرسیار بکات، گوتی:

- شتێکم لەخەڵوەتگەکەی باوکمدا بیر کەوتەوە، زۆر سەرنجی ڕاکێشابووم، لەمەڕ خاکی ناوەندەوە بوو، ئەوە بۆچوونێکی زۆر ترسناکی هەیە لەوەی باسم کرد

دوو براکە بلەز لایان لێکردەوە، ئەویش لەسەرخۆ گوتی:

- خاکێکی تری ژێرئاو کەوتوو هەیە، چەندین ساڵە پشکنەرەکان لەگەڕاندان بۆ دۆزینەوەی، ئەوە خاکێك نییە، بەڵکو کیشوەرێکە بەتەواوی ژێرئاو کەوتووە، ئێوەش بیستووتانەو دەزانن لەکوێیە، دوور نییە ئێوەش سۆسەتان کردبێت، ئەوەی گرنگە لەباسەکەم، ئەوەیە هەر هەموو بۆچوونەکان لەناوچەیەك دەگەڕێن، کە نشێوی ناوەندە.

- ئەتلانتس.

لویب دەستبەجێ ئەوەی گوت، (بۆبی)یش درێژەی پێدا و گوتی:

- بەڵێ.. ئەفلاتوون لەبارەی (ئەتلانتس)ەوە گوتوویەتی.. خاکێکی گەورەیە و دەکەوێتە لای دەریای ناوەڕاست، خاکێکی فرە گەورەیە، چون ئەوەی کیشوەر بێت، دە پاشای مەزن حوکمڕانیان تێیدا کردووە، هەر هەمووشیان کوڕاو کوڕی یەك پاشابوون، ئەو خاکە چوار ڕێڕەوی ئاوی تێدایە، دواتر لافاوێکی گەورە خاکی ئەتلانتسی داپۆشیوە، ئەو سەردەمە کوێرەوە بوو.

بۆبی لەدوو براکەی ڕوانی و گوتی:

- خاکێکی نادیار لەناوەندا، یەکێکیان بەناوی ئەمری ، کە بنچینەی بەشەرییەتەو ئەوی دیش ناویشی (ئەتلانتس)ە کە بنچینەی شارستانییەتە، دە پێغەمبەر لەوێ و دە پاشاش لێرە، چوار رووبار لەوێ و چوار ڕێڕەویش لێرە ، لافاوەکەی نوح لەوێ و لافاوەکەی ئەتلانتس لێرە، سێڵاوەکەی زانکلۆن لەوێ، ئێستا حاڵی بوون؟

لویب جگەرەیەکی پێکرد، بۆبی لەدووکەڵی جگەرەکەی ڕوانی و گوتی:

- لەتەورات لافاوەکەی نوح ڕوویدا، بەوای ئەوەی خودا غەزەبی لە فریشتەکان گرت، کاتێ لەگەڵ کچانی بنیادەمدا هاوسەرگیرییان کرد، لەقسەکانی ئەفلاتوونیشدا، لافاوەکەی ئەتلانتس کە ڕوویدا، لەبەر ئەوەی خوداوەند (زیووس) لەخوداوەندی تووڕەبوو، کاتێک هاوسەرگیری لەتەک کچانی بنیادەمدا کرد، ئێستا حاڵی بوون؟ یا ئەوەتا ئەفلاتوون لەتەوراتی دزیوە، ئەوەش مانای ئەوەیە ئەتلانتس هەر خۆی خاکی عەدەنە، یا ئەفلاتوون و تەورات باسیان لەخاکێکی ڕاستەقینە و شارستانییەتێکی پێشکەوتوو کردوون، کە ڕۆژگارێک لەو خاکی ناوەندە ژیاون.

لویب لەپشتی کادووی جگەرەکەیەوە گوتی:

- شوێنگەلێك هەن خەڵکی وادەزانن ئەفسانەیە، وەلێ دواتر دەرکەوت ڕاستەقینەیە، هەر وەك تەرەوادە و گومرایی مینۆتۆر، لەخەیاڵی خەڵکیدا هەر هەموو ئەوانە ئەفسانە بوون، تا پشکنەرەکان بەدووویاندا گەڕان و دۆزیانەوە، ئەتلانتس لە ڕێکخراوەکە دڵنیایان کردین کە ڕاستییە، وەلێ شوێنەکەیان پێنەگوتین.

بۆبی گوتی:

– عەدەن هەر هەمان خاکی ئەتلانتسە، کە خاکی پێغەمبەرانە و خاکی بەشەرییەت و شارستانییەتە، هەر ئەویش خاکی ناوەندە، کەواتە گوێم وێدەن تا پێتان بڵێم، دەریای ناوەڕاست ئەمڕۆ کە ململانێی هەموو دەوڵەتەکانی لەسەرە، بۆیان دەرکەوتووە، خاکێکی پڕ لەگازی سروشتییە، ئەو گازەش بەوای ترشاندنەوە دروستبووە، شارستانییەتێک بەو مەزنییەوە لە بنیادەم و گیانەوەران بۆ هەزاران ساڵ لەوێ ژیابن، درووست بووە، واشی بێنە بەر دیدی خۆت، ئەو خاکە پیرۆزە، بەتایبەت لەلای هەر سێ ئاینە سەرەکییەکە، بەوای ئەوەی بەشەرییەت لەوێ سەری هەڵداوە، ئەگەر ئەوە ئاشکرابێت، جیهان تووشی کێشەیەکی گەورە دەبێت، ڕەنگە جەنگێك بەرپا بێت کۆتایی بۆ نەبێت.

لیۆپۆڵد بە کەمێك گومانەوە گوتی:

– ئەشکەوتی مەکفیلە.. ئا ئەوە دەرکێکی هەیەو لە (ئیسرائیل)ە و ناویشی ئەشکەوتی(بەتریکان) ە، شوێنێکی پیرۆزە، ئیبراهیم و ئیسحاق و یاقووب لەوێ نێژراون، حیکایەتەکە چۆن دەڵێت لە خاکی نەمری عەدەندا بوو، کە ئەتلانتسە.

بۆبی ئاهێکی هەڵکێشا و گوتی:

– بەراست، خۆ دەرکەیك بۆ ئەشکەوتی مەکفیلە لەفەڵەستینیدا هەیە، لە مزگەوتی (ئیبراهیم)ە، کە مەزاری موسوڵمانەکان و جوولەکەکانە، بەڵام مەکفیلە تەنها ئەشکەوتێك نییە، بەڵکو کۆمەڵێك ئەشکەوتە، لەژێر زەویدا لقیان لێبووەتەوە، لە خاکی ئەتلانتسەوە دەست پێدەکات، تا دەگاتە خاکی شام، لەوێشەوە

تا دوورگەی عەرەب، ئەشکەوت و توونێلێکی زۆر لەژێر خاکی عەرەبستاندایە، کەس نازانێت چۆن درووست بووە.

لیۆپۆلد گوتی:

– هەقی خۆیانە پەرۆشی دۆزینەوەی بن، جارێ لەوە گەڕێ، سەربوردەکەی ترمان بۆ بگێڕەوە، تۆ تا ئێستا دوو گەمەت بڕیوە، بۆبی دەزانیت چی گەمەکانی وروژاندووە؟ تۆ پلەی ڕێکخراوەیی ئێمە نازانیت، ئەگەر شتێکت گێڕایەوە ئێمە دەمانزانی، کۆتاییت دەبێت.

بۆبی کۆمەڵێکی تری لەکارتەکان دەرهێناو بلەز لەسەر مێزەکە ریزیانی کرد و چاویشی لەڕیکۆردەکە نەبڕی، گوتی:

– ئەمجارە من قسە ناکەم، بەڵکو ئەوە قسەتان بۆ دەکات.

لیۆپۆلد خۆی راستەوە کردو دیقەتێکی گوماناوی بۆبی دا و گوتی:

– ئەوە چ گەمەیەکە دەتەوێ بیکەیت؟

بۆبی فرانك بەدەم ورتە ورتەوە، دەستەکانی بەسەر کارتەکەوە دەلەرزی.

لیۆپۆلد بە شپرزەییەوە گوتی:

– ئەم هیچ و پووچە پێدەچێت شتێکی لەژێر سەرا بێت، ئەوە کێیە قسانمان بۆ دەکات.

لوبب راچڵەکی، بۆبی بەدوودڵییەوە گوتی:

– ئەوەی ئەم سەربوردەیە دەگێڕێتەوە، تەنها شەیتان زاتی گێڕانەوەی هەیە، هەموو شەیتانێکیش نا، ئەوە (مولووك)ە دەیگێڕێتەوە.

لیۆپۆلد تەماشای دەوروبەری خۆی کردو گوتی:

– ئەی خودایە، مولووك ئەوەی...

بۆبی ڕستەکەی پێ قاچی و گوتی:

– بەڵێ ئەو.

لەپڕ پانکەی بنمیچەکە لەخولانەوە کەوت، لەکارکەوتنەکەی سرووشتی نەبوو، چراکانیش کوژانەوە، ژوورەکە تاریك داهات، ترس ئامبازیان بوو، مولووك ئامادەبوو، کۆمپیوتەرەکە ڕووناکییەکی کزی خستە سەر کارتەکان، ئەو کارتانەی بۆبی ڕیزیانی کردبوو.

کارتی یەکەم.. وێنەی پیاوێکی گەنمڕەنگ و ئافرەتێکی سوورووسپی بەسەرەوەیە، پۆشاکێکی گران بەهایان پۆشیوە، واش پێدەچێت هاوسەرگیرییان کردبێت، لای خواریانەوە وێنەی دوو منداڵ، یەکیان ڕەشپێست و ئەویتریان سپی پێست، لە گۆشەکانی کارتەکەوە هەندێ وردەکاری قەڵەڕەشێك چون ئەوەی بقیرێنێت و دوو ئافرەت هەریەکەو گۆشەیەکی داگیر کردووە، لەنێو هەر هەمووشیان دەستی شەیتان دیارە، وەك ئەوەی ڕووداوەکان بگێڕێتەوە.

کارتی دووەم.. کارتی برای بێدەنگە، وێنەی گەنجێکی قۆزی بەسەرەوەیە، دانیشتووەو خۆی بەسەر شمشێرەکەیەوە داچەمیوە، پێدەچێت بیر لەکارێکی باش نەکاتەوە.

کارتی سێیەم.. کارتی پیاوێکی هەڵواسراوە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە، لەپێیەکییەوە بە شێوەیەکی نامۆ بەدارێکەوە هەڵواسراوە.

کارتی چوارەم.. کارتی قەڵەمڕەوییە، وێنەی فریشتەیەکی بەهەیبەتی بەسەرەوەیە، بەفەرمانێکی سەخت لە ئاسمانەوە دادەبەزێت.

هەرچی دوا کارتی کۆمەڵەکەیە.. کارتی مەرگە، وێنەی پەیکەرە بەناوبانگەکەی بەسەرەوەیە، کە عابایەکی بەسەرەوەیەو ڕوحەکان ڕاو دەکات.

***

# بەشی سێیەم

## عەدەن لەبری فرمێسك خوێن دەڕژێنێت

## ٦٨٠٠ پێش زایین – ٦٠٠٠ پێش زایین

خەڵکانێکی زۆر کۆبوونەوە، دەستیان بە کەڵەکە کردنی بەرد کرد، پەرستگایەکیان لەسەر شێوەی گوێرەکەیەك دروستکرد، ڕۆژی قوربانی خەڵکەکە حاڵوماڵیان جێهێشت و بڕ بڕ بەرەو نزرگاکە بەنیازی حەج کردن کەوتنە ڕێ، لەدەرگای نزرگاکە کە لەسەر شێوەی دەمی کراوەی گوێرەکەکە دروست کرابوو، بۆ کڕنووش بردن بە سەرشۆڕییەوە چوونە ژوورەوە، لەناوەوە سەکۆیەکی بەرز و بتێکی گەورە، بتێك لەمس دروستکراو، بەدوو باڵی کراوەو سەری کوندەبوویەك، لەناو سەرەکەیش ئاگردانێك بەهەڵکراوەیی، لەچاوەکانی کوندەبووەکەوە ئاگرەکە شەوقی دەدایەوە، ئەو نزرگاو پەیکەرەش بۆ قوربانیکردنی من بوون، تا ڕەزامەندیی منیان پێبگات.

لەتەنیشت پەیکەرەکەوە دەستی بەرزکراوەی بەساڵاچووانی جوولەکە هاواریان بەناوی مۆ وە دەکرد، پیاما هەڵیاندەداو دەیانلاواندەوە، هەر کە ناوم بەمولووك لە لاواندنەکانیانەوە دەهات، ئەو هەموو حەجکەرانە کڕنۆشیان بۆ دەبردم و بەخەجاڵەتییەوە نێرچەوانیان لەزەوییەکە دەنا، تەنانەت هاوارو قیژەی منداڵانیش گوێیان تێکەوتبوو، زۆرێك لەپیاوان ڕەشیان پۆشیبوو، جل و بەرگی منداڵەکانیان لەبەریان دادەکەند و گوێیان بەهاوار و گریانیان نەدەدا، گوێیان لە لەقەفرکێ و خۆڕاتەکاندنیان نەبوو، تا دەرگای ئاگردانەکە واز دەکراو پیاوانی ڕەشپۆش منداڵەکانیان دەهاویشتە

نـاو کـوڕەی ئاگردانەکـە، ئـەوجا کوڕەکـە جۆشـی دەسـەندو لەچـاوانی پەیکەرەکەوە چێژی گڕگرتنەکە بەجۆشتر دەبوو، هاوار و قیژەی پاك و بێگەرد کە یاساو ڕێسای نەفامی گڕی تێبەردان، وای لەگردبوونەوەکە دەکرد ڕوحی خۆیان بەقوربانم بکەن، منداڵەکانیان بۆ دەکردم بەقوربانی.

جوولەکە ئەوەیان دانەمێنا، ئەو شارستانییەتانەی بەر لـەمان و دوای ئـەمان دایانهێنا، تا ڕۆژی پەسلان ئەوە هەر دەکرێت، سەرەتای هەموو ئەوانەش لە نشێوێکی خـاکی پـیرۆز سـەری هەڵدا، پێـی دەڵێن نشێوی دۆزەخ، لـەوێ ئاکانجی بووم، نووکەش هەر لەوێم، ئەو ناوەتان هەر لەبیر بێت، کە کەللـەی بنیادەمەکان لەهەموو سەردەمەکاندا سەرشۆڕم بوون.. مولووك.

***

## بەوە دڵخۆش بووم، کە ڕوحیان گوناهی لێ دەڕژا

لەرەتەی خولقاندنی بنیادەمم بیست و دەیانمبینی لـەتاوا نەمدەزانی چـی بکەم، تا ئەو ئافرەتە سووروو سپییە چـووە خـاکی دەیجـوور، زۆریش دڵنیـا نەبووم کە مارە یا شەڕانگێزترە، ئێمە شێوەی ڕوحەکان دەبیـنین، شـێوەی ڕوحـی ئـەو وەك شـامارێکی شـاخدار دەرکـەوت، چـاوم لێ نـەبڕی تـا بـە بەرزاییەکانی چیای (ئـەکوێلۆ)دا سـەرکەوت. دوای ئـەوەی هـەموویانی شار بەدەر کرد، بۆ خۆیشی نەفی کرا، لەشـەوێکی ئەمووستەچاودا فریشتەکان توورِیان دایە خەرەندی دۆزەخ، خەرەندێکی وشك و برینگ، خاکێك هیچی لێ نەدەڕوا، تەنانەت وەختەبوو لیلیس لەبرسانا بمرێت، دواتـر هـزری شـەیتانی خۆی لێ خستە گەڕ دەستی بەڕاوکردنی گیانـەوەرە بچووکەکان کرد، هـەر

بەزیندوویێتی دەیخواردن، بە خوێنەکانیشیان نوێنێتی خۆی دەڕەواندەوە، بۆیە بەردەوام دەم ولیلی خوێناوی بوو، تەنانەت جل و بەرگەکەشی.

ئەو ئافرەتە بەسەر هەموو وەچەکانی شەیتاندا سەرکەوت، هەموو ڕۆژەکان بەدوویەوە بووم، بینیم وەك قەلەڕەشەکان دەنووك لە خوێن وەردەدات، دوای چەندین مانگ لە سەرەڕۆیی و گەڕاندا، بە ڕوویاری ئەردەن گەیشت، لەوێ ئادەم و حەوای دۆزییەوە، کاتێ بینیبانی ماوسەرگیرییان کردووە، ڕق لەچاوەکانییەوە گڕی دەردەدا، ئیرەیی بردن پێیان وەك دڕکێك بە مەلاشوویەوە چەقی، شەو و ڕۆژ بەدەستیەوە دەتلایەوە، چاوە جوانەکانی لەرقدا سوور هەلگەڕابوون، نەمدەزانی لەیەك کاتدا چۆن ئەو شۆخ و شەنگە تۆقێنەر دەبێت.

هەندێ شەیتان حەزیان بە وەسوەسە و ڕاڕایی و دلپیسیە، بیکە، مەیکە، هەرچی خۆمم لەنێو بنەمالەی(لاقیس)دا حالیببووم نەفسی بنیادەم تا بلێی خراپە، ئەوەی ڕاستییە بیخەرە بەردەمی، سەیرت لێ دێت چی لێ دەکات، هەرچی (لیلیس)ی شەیتانە بەڕیشی سوورمەوە لەبەرامبەر خۆیدا بینیمیەوە، ئەو لەو دەمەدا هزری بەگوناهەکانا ڕۆ کردبوو، بێ هیچ پێشەکییەك هاوارم لێکرد:

– هەی شەیتان لەبەرچاوم ونبە.
– چەند شەیتان درۆی لەگەلتا کردووە؟ درۆ بەخشەندەییە ئەگەر بە ئامانجێکت بگەیێنێت، بۆ خۆت لەبەهەشتا درۆت لەگەلّ (ئادەم)دا نەکرد؟

بەرقەوە بەرەو پیرم هات و گوتی:

- لیلیس تۆ لەهەموومان زیرەکتری، بەڵام زانیارییت کەمە، تۆ حەوا دەبینیت ژانی هەیەو نازانیت چەند ڕۆژێکی تر منداڵی دەبێت، ئەوە بەرهەمی خۆشەویستی ئادەمە بۆی، کە ناوی ئەو و حەوا هەڵدەگرێت.

لیلیس چاوی لەزەوی بڕی، ئەو چاوانەی ڕوحی تاوانیان تێدا دەبینرا، لەو ڕۆژەوە بەردەوام چاودێری حەوا دەکات، هەر کە گوێی لەحەوای دایک دەبوو، لەکاتی منداڵبووندا، چون ئاوازێك دەهاتە بەر گوێی، تا ئەو ڕۆژە هات کە چاوەڕوانی بوو. ڕۆژی منداڵبوونەکە ئادەم لەوێ نەبوو، لیلیس لەتاریکی شەودا چاوەکانی دەبریسکایەوە، منداڵەکەی ڕفاند، لەهیچ شوێنێك فڕێی نەدا، ئەوەی نەشێت بەکۆرپەکەی کرد، هەر بە ددان ونجر ونجڕی کرد، خوێنەکەی خواردەوە، دڵیشی دەرهێنا و دواتر لە ئەشکەوتەکە فڕێی دا.

***

## خۆماکی کوشتن نادیارە تا کوشتن بەئاگای دێنێتەوە

ڕۆیشت و دڵی کۆرپەکەی حەوا بەدەستیەوەو خوێنی لێ دەچۆڕا، تا گەیشتە خەرەندی دۆزەخ، چوومە لای، دڵم لەوپەڕی خۆشیدابوو، بەوای ئەو کارەی کردبووی، پێمگوت:

- بیسووتێنە وەك چۆن ئەو دڵتی سووتاند، ئەوە ئارامی بەهەربووکمان دەبەخشێت.

بەچاوەجوانەکانی کە ڕقی لێ دەباری، لێی ڕوانیم، هەر لەوێ چاوی بۆ بەردەئەستێ گێڕا، تا ئاگری پێ بکاتەوە، دەستم بۆی درێژ کرد و گوتم:

- لێمگەڕێ ئەم دیارییەت وێدەم.

دڵەکەی دامێ، بێ ئەوەی دار بسووتێنم گڕم لەدڵەکە بەرداو گوتم:

- بۆڕوحی تۆ ئەم دیارییەی بنیادەمت پێ دەبەخشم.

ڕوخساریم بینی هاتبووەوە سەر خۆی، ڕوحی شێوەی مارێک تێربووبێت، گوتی:

- ڕەنگە لێ نەبووبێتمەوە، ناوت چییە؟

- مولووك.

- تۆ شوێنکەوتووانی (لووس)ی دراوزێنیت؟

- من وازم لێهێناون و تەنها دووی خۆم کەوتووم.

قسەکەمی پەدڵبوو، نەیەزانی ڕوحی خۆم بەقوربانی پاپیرم دەکەم، ئەستێرەی بەیان لۆسیفەر، ما مار بنیادەم دووی ئادەم و حەوا بکەوێت، ئەوانەی دەڕۆیشتن و بەوای کۆرپەکەیانەوە دڵ و دەروونیان بەخەم کەیل بوو، تا گەیشتنە خاکی عەدەن، لەوێ حەوا سکی دووەمی دانا، لیلیس خەوی ئادەم و حەوای بەفرسەت زانی، منداڵەکەی ڕفاندو خنکاندی و دواتر هەڵات، ئەمجارەیان دڵۆپێك خوێن چییە نەڕژا، بۆ ئەوەی تاوانەکەی ئاشکرا نەبێت، بەوای ئەوەی ئەو دەڤەرە گیاتەوەری درندەی تێدا نەبوو، ئەوەی ڕاستی بێت، لیلیس یەکەم تۆی تاوانی لەسەر زەوی داهێنا.

لەنسێی چیای مەکفیلە چوومە لای و گوتم:

- هێشتا هەر ئادەمت دەوێت؟ وەڵێ ئەو لووت بەرزییەت ڕێت وێنادات.

بەنەفەسێکی تاوانباری گوتی:

- گوێم لێ نییە، تا بەخۆی دێت.
- دێت، وەلێ بەتەماحی باوەڕکردنت بەخودا بۆ لات دێت.

بەتووندڕەوییە مێینییەکەیەوە گوتی:

- کەواتە بەرەو نەمانی خۆی دێت.

هەورەکان بەسەر سەرمانەوە تێدەپەڕین، پێمگوت:

- ئەگەر دەتەوێی دڵی نەیارەکەت بسووتێنیت، شوو بەئادەم بکەو منداڵی لێ بخەرەوە، وریابە لەکوشتنی منداڵەکانی (حەوا)ش نەکەویت.

چاوە هەرماسییەکەی لەڕقا پڕیبوو، زیاتر لەچاوی ئیبلیسی دەکرد، بۆ خۆشم قەسەم بە یەزدان جوانی وا تۆقێنەرم لەژیانما نەبینیوە.

***

## ڕوانین لەمارێکی ژاراوی، ناز بۆ نێرەکەی دەکات، ئەوە شتێکە لیکاو بەدەوی شەیتانا دێنێت

وەک فرینی شەیتان بۆ لای ئادەم فریم، ئەو ڕۆژە لای ڕووباری عەدەن بینیم، خەمی خۆی دەدایە دەم ڕووبارەکە، لەپڕ لیلیس بەو هەموو جوانی و شۆخ و شەنگییەوە لەبەرامبەریدا قیتەوە بوو، ئادەم ڕووی دەمی لێ ناو گوتی:

- لیلیس نێدی پێچوو.

ئیبلیس چاوی لەچاوی بڕی و گوتی:

- ئادەم.. ئێمە بۆ یەك نەخولقاین؟

بەدڵنیاییەوە پێیگوت:

- من لەدارستانەکەدا نەمام، بەدووتا نەگەڕام؟

کەمێك بەنازەوە پێیگوت:

- ئەی بۆچی ئەو ڕەش ئەسمەرەت هەڵبژارد؟

- خودا ڕێی وێنەدام لەتەك خوانەناسێکدا هاوسەرگیریی بکەم.

ڕوخساری تێکچوو، گوتی:

- ئادەم.. لەم خوایە ناگەڕێی بۆچی باوەڕ بەشتێك دەکەیت ناوی خودایە، گشت ئەو ئەرك و یاساغییەی داناوە، ئادەم ئێمە ئازادین.

ئادەم ڕووی لێ وەرگێڕاو گوتی:

- لێل ئەرك و یاساغییەکەی ئەوپەڕی ئازادی دەبینم، دەنا نەفس دەبووە بەندەی شتگەلێکی تر، وەك ئارەزووبازییەکانی.

ئیبلیس وەك مار لێی نزیکەوە بوو، گوتی:

- مەهێڵە کەسێك فەرمانت پێبکات و دواتریش ترۆت بکات.

لای لێ کردەوەو گوتی:

- چۆن کوفر دەکەیت، خودا تۆی لەنەبوونەوە خولقاند، تۆی لەهیچەوە دروستکرد.

ئیبلیس لەجێی خۆی ڕاوەستاو گوتی:

- چونکە من نازانم بۆچی خولقاندمی.

بەملکەچییەوە گوتی:

- وەك ڕەحمەتێك.. ئیبلیس.

بزکانی هەڵبڕی، چون ئەوەی توورەبوویێت، گوتی:

- کام ڕەحمەت؟ بنوارە حاڵمان.

تەماشای جلوبەرگەکەی کرد، وزیو و پیسبوو، ئەو کراسەی لەگەڵی دار چنیبووی زەرد هەڵگەڕابوو، پێیگوت:

- خۆڵێکی بێ ڕوح بوویت و ڕوحی بەبەر کردیت، کردتی بە بوونەوەرێك ببینیت و ببیستیت، نەتیکرد بەگیانەوەرێك، کردتی بەنرۆژ بیر بکەیتەوەو قسان بکەیت، چیت بوێت هەڵیبژێریت.

- بەڵێ.

بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ ئاسمان کرد و گوتی:

- ئەوە ڕەحمەتی ئەوە.

بەدەم ورتە ورتەوە لیلیس دەستی درێژ کرد تا بەر دەستی ئادەم کەوێت، گوتی:

- ئادەم با وابێت، بەخواکەی خۆت بڵێ لیلیس باوەڕی پێت هێنا.

ئادەم دەستی کێشایەوەو ڕووی وەلا نا، بەو ئاوایەی لێی دوور کەوێتەوە، ئەوجا گوتی:

- خودا بەدڵی بەندەکانی دەزانێت.

***

## لێپرسینەوە لەگەڵ دووڕوو بە ڕووە ڕووکەشەکەی بکە، ئەوەی لەناخیدایە.

چاودێری کردنی بنیادەمەکان شتێکی فرە خۆشە، جاروبار بەهەلم دەزانی دڵیانم لەکینە پڕ دەکرد، شەوێك گوێم لەئادەم بوو بەحەوای گوت:

- فریشتەکە ڕێنمایی کردم لیلیس بخوازم.

حەوا بەرسڤی نەدایەوەو خۆی بەشتێکەوە سەرقالکرد، وەلێ لەناخیشەوە هەستی بەهەڵچوونی خۆی کرد، دانی بەخۆیدا گرد، گوێی بەقسەکەی نەدا، لەپڕ گوتی:

- ئەو منداڵەی لەسکم دایە، (عەبولحارس)ی ناو دەنێم.
- ئیڤا ئەوە هەر منداڵی تۆ نییە، تا ناوی غەیری خودای لێ بنێیت.

لەوێوە حەوا هاواری کرد و گوتی:

- ئەوە تۆ نیت ژانی ئەو منداڵبوونەت هەبێت، بەوای ئازاری ئەو منداڵبوونەمەوە، چەند تەمەتای مردنم کرد، دوای ئەو هەموو ژان و ئازارە کوڕیەکەشم بمرێت، قەستەم بەخوا بۆ پاراستنی کوڕیەکەم هەرچییم لێ داوا بکرێت دەیکەم، ئەگەر ناوی عەبدولحارس دەیپارێزێت ، ئەو ناوەی لێ دەنێم، هەرهیچ نەبێت ماوەیەکی تر ناوەکەی دەگۆڕم، ئادەم.. پاراستنی ڕوح لەهەموو شتێك فەرزتر نییە؟

حەوا تووڕەبوونێك تووڕەبوو، بەدرێژایی تەمەنی وا تووڕەنەبووە، بۆ خۆیشی نەیدەزانی بەوای ناوی کوڕیەکەیەوەبوو، یا بەهۆی بڕیاری هاوسەرگیری ئادەم و (لیلیس)ەوە بوو، ئادەم خۆی بۆ نەگیرا، لەحەوا دوور کەوتەوە، بەڕوخسارییەوە خەمێکی قورس دیاربوو، ڕۆژگار هات و تێپەڕی، ئادەم (لیلیس)ی خواست، بەو شێوەیە کوڕەکانی حەوا کچەکانی (لیلیس)یان خواست و کوڕەکانی (لیلیس)یش کچەکانی (حەوا)یا مارەکرد، خودا لەسەر بنیادەم ئەوەی حەرامکرد، کە لەسەر ئێمە حەرامە، ئێمەی جنۆکە حەرامە خوشك لەبرا مارە بکرێت.

لیلیس باوەڕی بەخوای ئادەم هێنا، وەلێ لای خودا دڵی لیلیس شاراوە نەبوو، خودا دەیزانی چی لەدڵدایە لە خوانەناسی و دووزمانی، بەدەر لەڕای جیاوازیان ئادەم حەوای جێنەهێشت، لە دوامانگی منداڵبوونی جێی نەهێشت، تا یەکەم کوڕپەی بنیادەمی هاتە دونیاوە. حەوا بێچگەلەناوی عەبدولحارس ڕازی نەبوو ناوێکی تری لێ بنێت، ئەویش بەوای دەستلێوەشاندنی شەیتانەوە. ئادەم لێی دابڕا، هەموومان بەو دابڕانە دڵخۆش بووین، لۆسیفەری بابام بایەخێکی زۆری بەو کوڕپەیە دا، لێل یەکەم زریکەی کوڕپەکە بەخشرا بەشەیتان، لای ئەو گابەردە منداڵەکە گانگۆڵەی دەکرد، کاتێك عابا بەسەرێك بەرامبەری بووەوە، ئەویش وێستا و سەری بەرز کردەوە، دەموچاوی(لووس)ی بینی و لێی وردبووەوە، منداڵەکە بەدەم شەیتانەوە دەستی بەخەنینەوە کرد، ئەوە هەر هەمان ئەو منداڵەبوو کە گەورەبوو، خانوادەکەی ئەو ناوەیان لێنا کە لەهەموو دونیا بەناوی (کین) ناوبانگی دەرکرد، یا بەو ناوەی کە بە(قابیل) بانگیان لێدەکرد.

***

## ئەو منداڵە تێڕوانینەکەی دەمترسێنێت، بەتایبەت خودی خۆم

کین ژیا، مزری زۆر تیژبوو، هەر زوو فێری قسەکردن بوو، حەوا فێری چنین بوو، لەخوری مەڕومالاتەکە دەستە چلێکی ڕەنگاو ڕەنگی بۆ دروو، ئادەم و حەوا و لیلیس بەرەو خاکی (سایرن) لە ئەتلەنتس کەوتنە ڕێ، بەو ئاوایەی خێرو بێری زیاترەو ئاژەلی مالیشی زۆرترە. مەحالبوو حەوا و لیلیس لەیەك جێگادا کۆ بکرێنەوە، ڕقیان لەیەکبوو، لیلیس ڕقی لەهەمووان بوو، حەوا

ڕقەکەی لە لیلیس بەوای منداڵەکانیەوە بوو، گوێم لێبوو، حەوا دوو بەدوو لێل ئادەمدا دەیگوت:

- منداڵەکانمان کە مردن، جگەرم بۆیان سووتا، هەوەڵێنیان پارچە پارچە کرا، گوتمان دڕندەیەك پەلاماری داوە، ئەوی دووەمیان خنکێنرا، ئەوەش کاری ئاژەڵ نەبوو، کەسیش کاری وای لەدەست نایەت ، ئەو شەیتانە نەبێت، کە تووکە ژنتە، جنۆکە ناتوانن کەس بکوژن، ئەوە ژنەکەتە منداڵەکەی کوشتووم.

بەڕاستی لیلیس پیلانی بۆ کوشتنی منداڵە تازەکەی داڕشتبوو، بەڵام شتێکی سەیر ڕوویدا، لەبەرامبەریدا بەسەرسامییەوە وێستام، لەپڕ گوێم لەهاواریّ بوو، بلەز خۆم گەیاندە شوێنی هاوارکردنەکە، بینیم حەوا پرچی (لیلیس)ی گرتووە، ئەوەندەی بەکێش کرد، وەختەبوو کەللەی بتەقێنێت، ئەوە بۆ یەکەمجارم بوو، لیلیس ببینم ترسی لەحەوا بێت، حەوا پێیگوت:

- قەستەم بەخوا ئەم منداڵەم شتێکی لێ بێت، خوێنت دەخۆمەوەو جەستە قێزەونەکەشت دەسووتێنم، تا گیانەوەرانیش بێز لەکۆشتەکەت بکەنەوە.

لەو ڕۆژەوە لیلیس خۆی لەحەوا بەدوور گرت، تەنانەت دیقەتیشی نەدەدا. ساڵ هات و ساڵ ڕۆیی، منداڵەکە گەورەبوو، کاتێک حەوا دڵی ئارام بوو، ناوی لە عەبدولحارسەوە بۆ کین گۆڕی، ڕۆژگار تێپەڕی، لیلیس سکێکی بوو، کچێکی شۆخ و شەنگی بوو، ناوی (ئەکلیما)ی لێنا، دواتر حەوا کوڕێکی تریشی بوو، ڕوخساری لەجوانیدا وێنەی نەبوو، ناوی (هابیل)ی لێنا، جیاوازی نێوان کین و هابیل زۆر بوو، کین تا بڵێی زیرەکبوو، هابیل دڵپاك و دڵنەرم، چووبووەوە سەر (ئادەم)ی باوکی.

هەموو ساڵێکیان کە بەرێدەخست لەتەمنیان دەڕۆیشت، حەوا منداڵێکی ببوایە لیلیس ئێرەیی پێدەبرد و سکی دەکرد، کۆمەڵگای مرۆڤایەتی بناغەی دانا، ئیدی دەنگی منداڵ ورتکە ئەو ناوەی هەڵگرتبوو. مرۆڤ فێری شت دەبوو، فێری ئەوەبوو قوڕ لەبەر هەتاو بمێنێتەوە، وشك دەبێت، لەوەوە خشتیان دروستکرد، تا یەکەم خانوو لەسەر زەوی بنیاتنرا. لیلیس لەتاوانەکانی ڕەوییەوە، ما منداڵەکانی پەروەردە بکات، (ئەکلیما)ی کچی تا بڵێی جوان و نەشمیلانە بوو، چون ئەوەی شۆخ و شەنگی هەر بۆ ئەو ڕسکابێت، سوور و سپی، چاو خەنەیی، پرچ ڕەش، هەر لەمنداڵییەوە لێل کین و هابیل یاری دەکرد، ئەو دوو برایە زۆر جار لەسەر ئەکلیما بەشەڕ دەهاتن، وەلێ منداڵ دوای شەڕیش زوو ئاشت دەبنەوە، سۆسەی هەرسێکیانم دەکرد، هەستم کرد ئەکلیما لەهابیلەوە نزیکترە. ساڵ هات و ساڵ ڕۆیی، نزیکەی دووسەد ساڵ تێپەڕی، کین و هابیل بوون بە دوو گەنجی بەهێز، کین پرچێکی ڕەشی درێژ لەپشتی سەریەوە دەبیەست، سیمای تیژ و چاوەکانی ڕەش، هابیل گەنجێکی گەنمڕەنگ، پرچی کەوەیی، ڕیشی بەردابووەوە، ئەکلیما پێگەیشت و گۆشتی گرد، تا بڵێی جوان، بەو مانایەی ئامادەگی تێدا بوو بۆ هاوسەرگیری کردن.

ئادەم هەردوو کوڕەکەی بۆ خاکی (سابین) نارد، تا بەدیار مەڕومالاتەکەوە بن، ئادەم شتێکی لەهابیل بەدی کردبوو، زیاتر هۆگری مەڕ و مالات بوو، تەنانەت گیانەوەرە درندەکانیش پەلاماریان نەدەدا، هەرچ کین بوو، زیرەکییەکەی لە بیناسازی و کشتوکاڵدا بوو، ئادەم کارەکانی لەنێوانیاندا دابەشکرد، هەر یەکەو بەرپرسیاری کارێك بێت، لەو کارەشیاندا برا بچووکەکانیان فێر بکەن، هابیل خەریکی مەڕو مالات بوو، کین سەپەرشتی

کشتوکاڵی دەکرد، ساڵ هات و ساڵ ڕۆی، هەر یەك لەو دوو برایە خولیای هاوسەرگیری لەتەك ئەکلیما لەکەلەیانی دا.

ئەوە ئەو سەربوردەیە بوو، هەرچەند بیرم لێدەکردەوە دڵی خۆش دەکردم، ئەویش بەوای ئەوەی بۆ خۆم دابەزیمە ڕوویاری ڕووداوەکان و مەلەی تێدا بکەم.

***

## ئەگەر ئافرەتێك چووە نێوان دوو براوە، شەیتانەکان بۆ تەماشا کردن لێیان گرد دەبنەوە

بیرمە شەوێ هابیل چووە لای ئادەم و داوای هاوسەرگیریی لەتەك ئەکلیمادا کرد، ئادەم تووشی شۆك بوو، گوتی:

- کوڕی خۆم.. (کین)ی برات دەستپێشخەری کردو داوای دەستی ئەکلیمای کرد، ئەو لەتۆ پێشترە بەوای داواکەی.
- باوکە.. پرسیاری لێدەکەین، ئەگەر (کین)ی هەڵبژارد، سوێند بەخوا پاڵپشتیان دەکەم و دەبمە هاوڕێی دڵسۆزیان.

بەرەو لای کین هەڵفڕیم، لای لیلیس دانیشتبوو، لیلیس بە زیرەکییەکەی سەرسام بوو، پێیگوت:

- هاتووم داخوازی ئەکلینای کچت دەکەم، هەرچیشتان بوێت لەخشڵ و ئاڵتوون ئامادەم.
- ئەو کچە بۆ تۆ نییە، هابیل هەقدارترە، ئەویش دڵی ها (بەهابیل)ەوە، بەردەوام باسی (هابیل)م لا دەکات، دڵیان بەیەکەوەیە.

کین دڵشکاوانە لیلیسی جێهێشت و ئیدی چاوی بەبراکەشیدا هەڵنەدەهات.

دوای چەند ڕۆژێك ئادەم چووە لای ئەکلیما و پێیگوت:

- ئەکلیما.. گوێم لێبگرە، کین داواتی کردووە، ئەوەی منیش دەیبینم، کین کوڕێکی باشە.

ئادەم کوڕەکانی خۆی دەناسی، دەیزانی کام لەکوڕەکانی ئەگەر ئەکلیمای بۆ نەبوو، ڕق لەبراکەی هەڵدەگرێت، بۆیە هەوڵی دەدا کین ڕازی بکات، باسی (هابیل)ی لا نەکرد، هەرچەند پرسیاری ڕای لێ دەپرسی، ئەکلیما بێدەنگ دەبوو، وەڵای نەدەدایەوە، دواتر ئادەم پێیگوت:

- کچی خۆم.. (هابیل)یش دەیەوێت بتخوازێت.

ئەکلیما هەر کە گوێی لەناوی هابیل بوو، ڕووی کرایەوە، وەلێ شەرمی ڕەزامەندی نواند، ئادەم گوتی:

- ئەکلیما.. کچە بچکۆلەکەم، هەڵبەتە دەبێت یەکێکیان هەڵبژێریت، ئەگەر لە کوڕەکانی تری حەوا دڵت بەکەسێکیانەوەیە، ئەوا لاریم لێ نییە.
- باوکە چۆنی بەباش دەزانیت وا بکە، کین و هابیل بۆ من وەك یەکن، ئەوەی من دەمەوێت چاوەڕوانی فەرمانی خودام، هەر هەمووشمان بەفەرمانی خودا ڕازین.

ئادەم گەڕایەوە ماڵەکەی لای حەوا، ئەو شەوە نووست و هیچی نەگوت، کە ڕۆژ بووەوە، هەردوو کوڕەکەی (کین و هابیل)ی بانگکرد و پێیانی گوت:

- ڕۆڵەکانم.. لە (ئەکلیما)م پرسی ، بەدەم شەرمەوە ڕەزامەندی نواند، بەوەی خودا چی فەرمانێك بدات، ئەوە دەکات، ئێوەش

هەریەکەتان قوربانی خۆی بەخودا ببەخشێت، بەوەی لەم ساڵەدا دەستتان دەکەوێت، هەر یەکەتان تا دەیەکی ڕزقەکەتان دەربکەن، ئەوەی خودا لەقوربانییەکەی ڕازی بێت، ئەو ئەکلیما دەخوازێت.

هابیل دەستی بەلەوەڕکردنی مەڕوماڵاتەکەی کرد، تا قەڵەو و پێگەیشتووتر بن، کین لەکێڵگەی کشتوکاڵییەکەی تۆوێکی زۆری کرد، مەخابن ئەو ساڵە وشکە ساڵی بوو، بەروبوومی نەبوو، ئەگەرچی هەلێکی زێڕین بوو بۆ هابیل تا قوربانییەکەی ببەخشێت، وەلێ دڵی باشبوو، لەبەر براکەی قوربانی ئەو ساڵەی ڕەتکردەوە، بۆساڵی ئایندە ئەو قوربانییەی هەڵگرت، تا بەروبوومی براکەشی پێبگات. ساڵی دواتر بەروبوومی کین زۆر بوو، تا وەك بەهەشتی لێهات، دەیەکی لەو بەهەشتە هەڵبژارد، بینایەکی گەورەشی لەکێڵگەکەی درووست کرد، بوو بەباخچەیەکی بێ وێنە، کین یەکەم کەسبوو دەستی بیناسازی هەبێت، یەکەم هونەرسازیش بوو، بۆ خۆم تەماشای دەستڕەنگینییەکەیم دەکرد، بەڕاستی بیناسازێکی کارامە بوو، هەرچی هابیل بوو، لەمەڕوماڵاتەکەی دەیەکی هەڵبژارد، چووە لای کین و پێیگوت:

- براکەم.. تۆ بینایەکی گەورە و جوانت درووستکرد، مەڕوماڵاتەکەی منیش ببەو بیخەرە نێو باخەکەت، قوربانییەکە بەیەکە بەخودا دەبەخشین.

کین بەتووڕەییەوە تەماشای کرد و گوتی:

- براکەم.. بڕۆ وەك من بکە، ئەگەر دەتوانی لەمن باشتر بکە، من دڵنیام مەڕو ماڵاتەکەت چی لەبەروبوومی کشتوکاڵییەکەم دەکەن.
- ئاخر دارو درەختەکانت بەرزن، دەمیان پێ ناگات.

کین دەیزانی براکەی سادەیەو سەری لەبیناسازی دەرناچێت، بیرۆکەکەی ڕەتکردەوە، هابیل بێدەنگبوو، بەرەو لەوەڕگاکەی خۆی ڕۆیشت و دەیەکی لە مەڕوماڵاتەکەی بۆ قوربانی جیاکردەوە. ئەو شەوە نووستن، هابیل خەونێکی سەیری بینی، کە بەلای منیشەوە سەیر بوو.

((لەخەونەکەیدا ئافرەتێکی بینی لە ئەکلیما دەچوو، لەسەماکردنەکەی بووەوەو بەرەو لای شاژنی دایك ڕۆیشت، کە لە لیلیس دەچوو، تا ڕای وەربگرێت، گوتی.. دایکە چی لەپاشا داوا بکەم؟))

لێرەوە پیاوێك داچەمییەوە تا بەگوێی شاژندا شتێك بێژێت، پیاوێکی باڵا بەرز و چوارشانە، قژەسەری لوول و درێژ، چاوێکی کوێرو ڕوخساری چوون ماریبوو، چرپاندییە گوێی شاژن، دایکە بەکچەکەی گوت.. داوای لێبکە سەری پیاوچاکێك بپەڕێنێت.

هابیل بەداچڵەکاوی لەخەونەکەی ڕابوو، لەخۆی پرسی.. ئەوە چیبوو هاتە خەونی.

***

## ئەگەر خودا لە پیاوێکی قبوولکرد، لەخۆبایی بوو، ئەوا پیاوێکی باش نییە

بێ هیچ پێشهاتێك بەسەر خاکی (سایین)دا باهۆزێك هەڵیکرد، دارو درەختی (کین)ی لەبن دەرهێنا، بیناکەی لەبناغەوە ڕووخاند، (هابیل)م بینی مەڕوماڵاتەکەی بەرەو ئەشکەوتێك ڕادا، بلەز گەڕایەوە هاوکاری براکە بکات، کاتێ گەیشتە جێ، باهۆزەکە وەختەبوو چاوی دەربکات، بەهەشتەکەی

(کین)ی برای وێران ببوو، دارخورماکان شکابوون، دارو درەختەکان بە بەرەکانیەوە پەرش و بڵاو ببوەوە، بەدووی براکەیدا گەڕا، کە دۆزییەوە بەزەیی بەحاڵیا هاتەوە، پێیگوت:

– براکەم..وەرە بۆ ئەشکەوتەکە، خۆمان لەم باهۆزە بپارێزین.

کین بە تێڕوانینێکی هەڵچوو لە (هابیل)ی برای ڕوانی، دواتر بەسەرشۆڕییەوە ڕۆیشت، کاتێ ئادەم هاتە لایان، وتە سەیرەکەی گوت:

– کوڕی خۆم کین.. خەفەت مەخۆ، خودا قوربانییەکەتی قبوولکرد، بەو شێوەیەی دەیبینین.

کین شاگەشکەبوو، هابیل ئەگەرچی قوربانییەکەی ڕەتکرابووەوە، وەلێ باوشی لەبراکەی دا کە قوربانییەکەی قبوول کراوە، هابیل ئەو پیاوە چاکەبوو، بەو شێوەیە ئەکلیما شووی بەکین کرد، ئەو شەوە بەختەوەرترین شەوی مرۆڤایەتی بوو، هەموو کۆمەڵگای مرۆڤەکان لەچوارسەد کەس زیاتر دەبوون، لە منداڵ و هەرزەکار، هەر هەموشیان بەجلی ڕەنگاوڕەنگ، ئەو شەوە بەژێر تیشکی مانگەشەوەوە ئاهەنگیان گێڕا.

ئەو شەوە ئەکلیما خەفەتبار بوو، وەلێ ڕوخساری خەفەتبارییەکەی وەرشاردبووەوە، ئاخر ئەو دڵی بە (هابیل)ەوە بوو، ڕوحی ئاوێتەی ڕوحی ئەو ببوو. لە چاودێریکردنی کین نەبووبمەوە، زۆر کەیفخۆش بوو، وەلێ لە بووکەکەی وردەوەبوو، ئەوەی من لە ناخی ئەکلیمادا بینیم، ئەویش هەستی پێکرد، لەلایەکی ترەوە سۆسەی (هابیل)م کرد، نیگای لە ئاسمان بڕیبوو، دواتریش (ئیلیس)م بینی خۆی بەسەریا لار کردبووەوە و دەیگوت:

– ئازیزەکەم سەربوردەی قوربانیەکە مەهانە بوو، ئێمە هەر لەسەرتاوە بۆ کین سازاندمان، ئەکلیما ئەوی خۆش دەوێت، هەر

لەمنداڵییەوە وای پێکوتووم، لێ خەفەت مەخۆ، کچی تـرم زۆرن، بـۆ خۆت لێیان هەڵبژێرەو لێتی مارە بکەم.

بە بێدەنگی تەماشای کرد و بەدڵڕەشییەوە تەماشای هابیلی کرد و گوتی:

- دووریش نییە، کین ئەویشت لێ زەوت بکات.

لیلـیس دای لـەقاقای پێکـەنین و ڕۆیشـت، یـەک دوو ڕۆژ تێپـەڕی، منـیش گوێقوڵاغی کین و ژنەکەی بووم، گوێم لە دەنگە دەنگیان بوو، نەمزانی بـاس لەچی دەکـەن، وەلێ بـەوای دەنـگ بـەرز کردنـەوەیان هەستم کـرد گرفتێك هەیە، دواتر زانیم باس لە هابیل دەکەن. ئەو نیوەڕۆیە کین لـەماڵی ژنەکـەی دەرچوو، خێر بەدەموچاویەوە نەبوو، چووە باخەکەی و دەستی بەبژارکردن و ڕێکخستنی دارەکانی کرد، دواتر دەستێکی لەبیناکە وەردا، لەوە دواتریش شتێك ڕوویدا، کین چاوەکانی زەق کردەوە.

لـەپڕ لەناوەنـدی باخەکـەی منـی بینـی، مـن مولـووك کـوڕی لاقـیس کـوڕی ئیبلیس، خۆم خستبووە شێوەی بینراوی بنیادەم تا بمبینێت، بـەو ئاوایـەی منداڵەکانی ئادەم نەیاندەتوانی جنۆکە ببینن، تەنها هەر منی بینی، وامکرد (مامەی کوڕی ئەلهەیم)یش ببینێت، دیمەنێکمان لەبەرامبەریدا زەق کردەوە، وامانلێکرد بکشێنەوەو بە پشتا بەربێنـەوە سـەر زەوییەکـە، لـە گـرێ ملـی (هام)م گرت و بەردێکم بەسەریا کێشا، هام بەرەوە بوو، وا خـۆی پیشـان دا مردووە، ئـەوجا لام لـە کـین دایـەوەو زەردەخەنەیـەکم تێسرواند، ترسـێك ئامبازی بوو، تەماشایەکی دەوروبەری خۆی کرد و دیقـەتی دامـەوە، کەسـی نەبینی. ئێمە پەیامێکمان بۆی هەبوو، پەیامی خوێن.

***

## باوەڕ بەکەس مەکە، ئەگەر بینیت لەبیابان لە پێیەوە هەڵواسراوە

کین لەدڵی خۆیدا شاردییەوە، لەژیانی خۆیدا کوشتنی نەبینیبوو، وەلێ لۆسیفەری بابام گرەوی لەتەکما کرد، ئەو دیمەنە لەخودی(کین)دا دەڕسکێت. ڕێك قسەکەی هاتە دی، بینیمان کە تەنیا دەبوو، زۆر بیری دەکردەوە، بەچاوی پڕ لەقینەوە لە (هابیل)ی دەڕوانی، نەمانزانی ئەوەی لەناخیدا بوو، سەر دەگرێت، وەلێ دڵنیا بووین هەستی پێدەکرد، هەستی بەوەش کردبوو ژنەکەی دڵی ها بەلای (هابیل)ەوە، ڕۆژ بە ڕۆژ کینەی دڵی کەڵەکە دەبوو، تا ئەو ڕۆژە هات، بینیمان بەرەو لای هابیل ڕۆیشت پێیگوت:

- براکەم.. داوای لێبووردنت لێدەکەم لەبارەی ئەوەی سالی قوربانییەکە ئەو بێ ڕەوشتییەم کرد، ئەمهێشت مەڕومالاتەکەت تێکەڵ بە باخ و بیناکەم بکەیت، وەرە با فێری بینا سازیت بکەم.

هابیل خۆشییەکی هاتەوەو دووی براکەی کەوت، لەپڕ گوێم لە هاواری حەوا بوو، بەچاو پرووکاندنێك خۆم گەیاندە لای هاوارکردنەکە، بینیم حەوا لەخەوەکەی ڕاچڵکیوەو بەئادەم دەڵێت:

- ئادەم.. کارەساتێکی گەورە بەڕێوەیە، لەخەونمدا (هابیل)م بینی بریندارەو خوێن بە بالآیا هاتووە، لەخاکێکی وشك و برینگ بەدووی ئاودا دەگەڕێت، (کین)یشم بینی لە پێیەوە سەرەو خوار هەڵواسراوەو لەتوینێتیدا وەختە بخنکێت، کین هاواری لە هابیل کرد.. فریام کەوە، چۆڕێ ئاوم بدەرێ. هابیل ئاوی دەست نەکەوت، لەخوێنی خۆی توینێتی براکەی شکاند، منیش ڕاچڵەکیم و بەخەبەر هاتمەوە.

ئادەم بەو خەونەی حەوا دڵی ختوورەی کرد، هەر زوو دەرپەڕی، تا بەدووی کوڕەکانیدا بگەڕێت، لەلای ئەشکەوتی(مەکفیلە)و لەخاکی سایرن کین و هابیل دوا قسەیان بۆ یەکتر دەکرد، کین گوتی:

- هابیل.. وەرە گەمە بەلقە دارەکان بکەین.
- ئاخر چۆن یاری بەلقە دارەکان بکەین؟
- تۆ باوەش بەدارەکە بکە، منیش دەتبەستمەوە، ئەوجا تۆ هەوڵی ئازاد کردنی خۆت بدە، دواتر گەمەکە بە پێچەوانەوە دەکەین، بزانین کێمان زووتر خۆی ئازاد دەکات.

کین براکەی بەدارەکەوە بەست، تا توانی شەتەکی دا، هابیل دڵی خورپەی کرد، کین بە دەنگێکی شپرزەوە گوتی:

- من هەموو شتێك دەزانم، دەزانم ئەکلیمای هاوسەرم هێشتا مەیلی لای تۆی هەیە، نازانم چۆن کەسێکی وەك تۆی گوناهبار فەرز ئەکاتە سەرم، کە خودا پێی خۆش نییە، دەتکوژم، تا دونیا لەگوناهەکانت پاك بکەمەوە.
- براکەم.. گوێ لەناخی هەڵچووت مەگرە، خودا قوربانییەکەتی قبووڵ کرد، خودا لەباوەڕدارانی قبووڵ دەکات، باوەڕدار ئەو نەفسە ناڕژێت کە خودا حەرامی کردووە.

کین وەڵامی نەدایەوە، چاوەکانی لەڕقا سوور هەڵگەڕابوون، ئەوەی چاوەڕوان نەدەکرا، ڕوویدا، هابیل هێزی وەبەر خۆی دا، دەمارەکانی جەستەی گرژ کردەوە، هێزی وەبر خۆی دا، کین بەدوو دڵیەوە کشایەوە، هابیل لقە دارەکەی پێوەی بەسترابوو، شکاندی و خۆی ئازاد کرد، لەکین نزیك بووەوەو پێیگوت:

- براکەم.. ئەگەر بەنیازی بمکوژیت، من دەستت لێ ناکەمەوە، من لەخودا دەترسم، دەزانیت کە بەرامبەر خودا بووینەوە بکوژ دان بەتاوانەکەیدا دینێت، دەمەوێ بێ تاوان بچمە بەردەمی خودا.

دوور لەچاوان کین داچەمیەوەو دەستی دایە بەردێکی گەورە، بەهەموو هێزیەوە، بەو هەموو ڕقەی لەناخیدا کەڵەکەببوو، دای بەسەر هابیل، گەرماو گەرم بوو، هابیل بەو ئازارەی نەزانی کەللەی شکاوە، کین دڵی پڕبوو، خوێن بەرچاوی گرد، دووبارە بەردەکەی بە کەللەی هابیل دا کێشایەوە، خوێن لەسەری هابیل فیچقەی کرد، کین وازی نەهێناو بۆ جاری سێیەم بەردەکەی بەسەر هابیل دا کێشایەوە، هابیل خۆی بۆ نەگیراو بەرەوە بوو، ما کین تەماشای لاشەی براکەی بکات، ئەوجا جەستەی کەوتە لەرزین، وەك ئەوەی باوەڕی نەکردبێت ئەو کارەی ئەنجام داوە، کە براکەی بکوژێت.

کین ویستی دان بەخۆیدا بگرێت، پریشکی خوێنی کەللەی هابیلی برای پڕژابووە دەموچاوی و کراسەکەیشی پێوە ببوو، لەتەنیشت لاشەی براکەی لەسەر چۆك کەوت و لەرز دایگرت، خودا قەلەڕەشێکی لەجۆری (کاسامی کۆن)ی نارد، کین قەلەڕەشەکەی بینی بەدەنووکی مشکێکی (فلۆریس)ی مردووی هەلگرتبوو، دواتر قەلەڕەشەکە چاڵێکی کردو مشکە تۆپیوەکەی تێنا و بەگەڵای دار دایپۆشی، کین ئەو دیمەنەی بینی، بەخۆی گوت:

- ئای لەخۆم، بەقەد ئەو قەلەڕەشەش عەقڵم پێ ناشکێ، تا تاوانەکەم بشارمەوە، لاشەی براکەم بنێمە ژێرخاك.

لای ئەشکەوتی مەکفیلە چاڵی بۆ لاشەی براکەی هەڵکەند، وەلێ کات زۆر درەنگبوو بۆ شاردنەوەی، ئادەم و حەواو لیلیس و ئەکلیما گەیشتنە سەر کاراساتەکە، حەوا هەر کەچاوی بەکوڕە کوژراوەکەی کەوت، لەسەر چۆك

کەوت، پێکانی بڕستی ڕاستکردنەوەیان نەبوو، بەچاریٚ وێران بوو، بەسەر زەوییەکەدا درێژ بوو، هەرچی ئەکلیما بوو، دەستی بۆ لای (هابیل)ی مردوو درێژ کردو دای لەپرمەی گریان، گریانێك لەباتی فرمێسکی خوێنی بۆ ڕشت، کێن بەدوو چاوی سەرسوڕماوەوەی لە ئەکلیمای دەڕوانی، هەرچی ئادەم بوو، باوەڕی نەدەکرد ئەوەی ڕووی داوە ڕاستی بێت، بۆیە ئەماتبووە سەر خۆی، بێدەنگ دۆش دامابوو.

لۆسیفەر بەچاوی پڕ لەسەرزەنشتییەوە هات، هات و (وازییە)و برێك جنۆکەشی لێلدا بوو، تەماشای کارەساتەکەیان دەکرد، دواتر کوڕەکانی حەوا و لیلیس دیمەنی یەکەم تاوانیان لەمێژوودا بینی.

باران دایکرد، تا زەوی بشواتەوە، گوناهەکان بشواتەوە، ئادەم بەرچاوی تاریك ببوو، حەپەسابوو، نەیدەزانی چی بکات، لەو شوێنەو ئەو گردبوونەوەیە ، لەنێو هەستی مرۆڤایەتی و شەیتانیدا ، فریشتەی خودا بەفەرمانی خوا هاتە خوارەوە، ئەویش (میکائیل)ی فریشتە بوو.

***

## فەرمانی ئاسمان هاتە خوارەوە، کارەسات و بەڵایەکبوو بەسەر هەمووانیدا

هەرچی بکەم وەسپی ئەو فریشتەیەم بۆ ناکرێت، بوونەوەرێکە هەر کە چاوت پێدەکەوێت، دۆشدادەمێنیت، لەجێی خۆت سڕ دەبیت، ئەو فریشتەیە دانابەزێت، مەگەر بۆ کارێکی مەزن نەبێت، قسەکانی مەناوی دەسووتاند، میکائیل گوتی:

- ئەی ئادەم.. ئەوەکانت سێ جار لەسەر ئەم زەویە خوێنیان ڕژاند، دوو بکوژت هەن.

کاتێ گوێم لەوە بوو، لەجێی خۆم سڕ بووم، ئادەم پەشۆکا، فریشتەکە چاوی لەکین بڕی و، گوتی:

- یەکێك براکەی خۆی بە بەرد کوشت.

ئەوجا تەماشای (لیلیس)ی کرد، بڕێك بێدەنگبوو، سەروچاوی (لیلیس)ی بینی زەرد هەلگەڕا، خوێنی تیا نەما، گوتی:

- ژنێك منداڵەکانتی کوشت.

دەتوانم سوێند بخۆم گوێم لەبەرەنسکی هەر هەموو ئامادەبووان بوو، تەنانەت بەرەنسکی خۆیشم، تەماشای (حەوا)م کرد، بەڕوخسارییەوە هەستێکی لێوە دەرکەوت، لەنێوان بەستوویی و هەڵچووندا گیری خواردبوو، هەرچی (لیلیس)بوو، بەترسەوە لەئادەمی دەڕوانی، ئەکلیما حەپەسابوو، نەهاتبووەوە هۆشی خۆی، کوڕەکانی ئادەم تەماشای کارەساتەکەیان دەکرد، دواتر فریشتەکە شتێکی گوت، ئەوەندەی تر گڕی لە ناخیاندا هەڵقرچاند، گوتی:

- خودا شەرعی خۆی داوە، ئەی ئادەم بکوژ بکوژرێتەوە، هەرکەسێك نەفسێکی بێ هۆ کوشت، وەك ئەوە وایە هەموو بنیادەمی کوشتبێت، ئەوە حوکمی خودایە دەبێت بکوژ بکوژرێتەوە.

تەماشای ئادەمم کرد، پێشتر هەرگیز بەو شێوەیە نەمبینیوە، وێستابوو تەماشای فریشتەکەی دەکرد، چۆکەکانی تۆقرەیان بۆ نەبوو، خوێنی

کوڕەکەی بەسەر کراسەکەیەوە، دەموچاویشی یەکپارچە فرمێسک بوو، هەستکردنی بەو بارودۆخە ئەژنۆی شکاندبوو، (حەوا)ش هەروەسا، لەترسی ئەوەی کە بەسەر (کین)دا دێت، کوشتنی (هابیل)یش بەو شێوەیە، بەدیویکیتر ڕقێکی زۆریان بەوای (لیلیس)ەوە تیا کەڵەکە ببوو، فریشتەکە گوتی:

- ئادەم و حەوا.. بۆتان هەیە لەیەکێکیان خۆش بن، ئێوە خاوەن تۆڵەی خوێنن، ئەوەش ڕەحمەتی خودایە، تا کارەسانەکە گەورەتر نەبێت.

ئادەم دەمێك بێدەنگبوو، دواتر گوتی:

- لەکێ خۆش بین؟
- ئەگەر لە(کین)ی کوڕتان خۆشبوون، لەمەڕ کوشتنی براکەی ئەوا لەسزا ڕزگاری دەبێت، ئەگەرەکو لە (لیلیس)ی هاوسەریشت خۆش بووی، لەمەڕ کوشتنی منداڵەکانت، لەسزا ڕزگاری دەبێت.

حەوا بەدەم گریانەوە گوتی:

- بەخودای لەمەو دوا نامەوێ خوێن لەنێو کوڕەکانم بڕژێت، لە کین خۆشبووم، لەبەر ئەوەی کوڕمە، هەرچی ئەو ناوانبارەیە منداڵەکانی کوشتووم، بەخودای لێی خۆش نابم، ئەگەر هەزار جاریش بە بەرچاومەوە بیکوژنەوە دڵم داناکەوێت.

ئەو نیگا تێبڕینەی لیلیس بۆ (حەوا)م لەبیرناچێتەوە، خەمی هەموو دونیای ئەو ژنەبوو، لێرەوە ئەکلیمای شۆخ و شەنگ چمکی کراسەکەی (حەوا)ی گرت و هاتە قسەکردن و گوتی:

- ئەی ژنی ژنان، تکات لێدەکەم لەدایکم خۆش بە، بەخودای ئەو ئێستا چاکە کارە.

ئادەم بە سۆزەوە تەماشای ئەکلیمای کرد، دواتر تەماشای (لیلیس)ی کرد، کە بیری لە هەڵهاتن دەکردەوە، ئادەم گوتی:

- ڕازیم بە سزادانی لیلیس، وەلێ لەکوڕەکەم خۆش بووم.

لەنێو ئاپووڕای گردبوونەوەکە جووڵەیەک درووست بوو، لیلیس چەند هەنگاوێك کشایەوە، وەلێ لەپڕ چاویان بە عابا ڕەشێك کەوت، چون ئەوەی لەنادیارییەوە دەرکەوێت، فریشتەی گیان کێشان بوو، دەستی بۆ گەردنی لیلیس برد، بەر لەوەی دەستی پێبگات، هەر چوار پەل لەگۆ کەوت، سەری بەملاو ئەولادا هێناو برد، وەك ئەوەی خۆی لەخنکاندن ڕزگار بکات، دواتر فریشتەکە دەستی لێ داگرت، لیلیس لەسەر گازەرەی پشت کەوت، فشاری خستە سەر سینەی لیلیس، ئازارەکەی لەوەدا نەبوو خۆی بۆ ڕاگرێت، لەلای سەرییەوە ڕاوەستا و دەستی بەنێوچەوانیدا هێنا، لیلیس بەتەواوی تۆقی و لاقی لەیەك ئالا، چاوەکانی دەرپەڕۆقین و سەری بۆ لای پشتەوە سووڕا، وەك ئەو شێوەیەی بەمنداڵەکانی حەوای دەکرد، دوا شتێك کە ئەو بینی، کاتێ سەری بۆ لای پشتیەوە چەمایەوە، دەموچاوی من بوو، بە ڕیشە سوور و نەرم کەمەوە لەنێو جنۆکەکاندا وێستابووم، دواتر چاوانی بە مەرگدا کرایەوە، منداڵەکان بلەز بۆ لای غاریان دا، ئەوە فریشتەی ڕوحکێشان وەك بەرق، بە ڕوحی (لیلیس)ەوە بەرەو ئاسمان هەڵکشا، لێرەشەوە میکائیل قسەیەکی کرد، وەك دڵدانەوەیان بۆ ئەو کارەساتە:

- هەرچی بکوژەکەی (هابیل)ە، نەفی دەکرێت بۆ خاکێك تا دەمرێت.

لە کچەکانی لیلیس ئەوەی مەیلی لەکێن بوو، لێیان مارە کرد.

دواتر بە نیگایەیکی ترسێنەر لە حەوای ڕوانی و گوتی:

- ئادەم.. ئەم ژنەت گوناهێکی گەورەی کردووە، حەوا ڕوحی ڕاچڵەکی، دیاربوو ئادەم چاوەڕوانی کارەساتێکی تر بوو، فریشتەکە گوتی:
- ئەم ژنەت دوای ئەوەی سکی سێیەمی دانا، هاوبەشێکی بۆ خودا درووستکرد، کە ناوی کوڕیەکەی نا( عەبولحارس) بەندەییتان هەر بۆ خودایە، کەسی تر مەکەن بەشەریکی خودا.

ئادەم دەوی هەڵهێنا، وەڵ فریشتەکە بەر لەوەی ئادەم قسە بکات، ڕووی لەهەمووان کردو دوا شتی باس کرد:

- ئەی ئەوەی جتۆکەو بنیادەمەکان، خودا فەرمانێکی تری بۆ داگرتن، هەر هەمووتان دابەزنە خاکێکی نوێ تر، لەخاکی عەدەن، خاکێك زۆر دوور، هەندێکیشتان بۆ هەندێکی ترتان دەبن بە دوژمن، وەڵ خودا هیدایەتان بۆ دەنێرێت، ئەوەی دوای هیدایەتی خودا بکەوێت، ترسی لەسەر نییە.

هەر هەموو بێدەنگبوون، چاویان لە میکائیل بوو، بەرەو ئاسمان هەڵکشا، کەسمان ئەو ڕۆژەمان بیر نەچووەتەوەو لەبیر ناچێت.

***

## ڕقمان بۆ بنیادەمەکان هەقەو هەموو هەقێکیشمان هەس

لەو کاتەی فریشتە میکائیل دابەزی، هیچ قسەیەکی لەتەک لۆسیفەری بابام نەکرد، ئەو لەبارودۆخێکی ترا بوو، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردبووەوەو لەتەک خودا دا قسەی دەکرد.

لۆسیفەر بەخودای گوت:

- خودایە ئەم بوونەوەرەت فەرز کردە سەرم، وەلێ ئەوان جێی متمانە نین، تا ڕۆژی پەسلان ڕێم وێدە لەڕێیان دەبەم.

خودا ئەوەی پێبەخشی و فەرمووی:

- تۆ تا ڕۆژی پەسلان لە ڕازێنەرەکانم دەبیت.

شەیتان بە دڵی پڕ لەکینەوە گوتی:

خودایە بەچی منت فریودا، واش بۆ ئەوانی دەڕازێنمەوە، سوێند بەناوت هەر هەموویان فریو دەدەم.

بەم وەڵامەی ئەوەندەیتر خودا لێی نارازی بوو، وەک چۆن لەبەهەشت دەریکرد، لەخاکی (عەدەن)یش دووری خستەوە.

- برۆ تیا د ،رچۆ، ناوزڕاو، ڕانراو، لێل هەموو ئەوانەش کە دووت دەکەون، دۆزەختان پێ پردەکەمەوە.

یەکەم خەڵقەندەی خودا لە بنیادەمەکان دەرچوون، ئادەم و حەوا و نەوەکانیان، ئەوانەش کە نەوەی لیلیس بوون، ئیبلیس و وازییە و نەوەکانیان، جنۆکەکان لە نیشتینگەکانیان دەرچوون، کە لە ئەتلەنتس دا بوون، ئەو شارەی چەندین سەدە خەریکی بنیاتنانی بوون، هەر هەموو

لەزەوی بڵاوبوونەوە، لەبەر ئەو هۆیە ئێمەی جنۆکە رقمان لەبنیادەمەکانە، ئەو بنیادەمانەی لەخاکی ئێمەدا بۆ چەندساڵێک دەرکەوتن و بوونە هۆکاری دەرکردنمان لە خاکی خۆمان، لەخاکی ئەتلەنتس، کین و ئافرەتێک لە کچەکانی لیلیس بەناوی(ئیزیس) کە نەفسی وەک کین پیسبوو، هەر ئەویش بوو بەهۆی تەلاقدانی ئەکلیماو دواتر خۆی شووی پێکرد، ئەوان بۆ خاکێکی دوورتر نەفی کران، ئەوانیش چیرۆکێکی سەیریان هەیە، وەلێ ئەمە کاتی گێڕانەوەی نییە. هەرچی ئادەم و حەوا بوون، ئەوانەش کە لێلیاندابوون، لەخاکی هیند دابەزین و تێیدا نیشتەجێبوون. ئادەم خەمبارییەکەی لێی نەدەبووەوە، خودا پەیامێکی بۆ داگرت:

- ئەی ئادەم بەردێکی بەهەشتم بۆ ناردوویەتە خوارەوە، بیکەرە بناغەی خانوویەک، بنیادەمەکان بەدەوریدا بخولێنەوە، وەک چۆن فریشتەکان بەدەوری عەرشەکەمدا دەخوولانەوە، بیکەرە جێگای پەرستنی من، وەک چۆن لەلای عەرشەکەمدا نوێ دەکرێت، ئادەم تا لەژیاندای نوێژەنی بکرەوە، تا دوای خۆتیش نوێژەن بکرێتەوە.

ئادەم کۆچی کرد، حەواو (شیس)ی کوڕی لەتەک خۆیدا لەهیندەوە بۆ بەککە کۆچیان کرد، ئادەم و شیس چاڵیان لەزەوی هەڵکەند، حەوا خۆڵەکەی دەگواستەوە، ماڵی خودایان دروست کرد، بانگەوازێک کرا.. ئەی ئادەم تۆ یەکەم کەسی لەسەر خاکی بەککە خانوویەک بۆ خواپەرستی دروست بکەیت، ئەوە بۆت دەبێت بە ڕێنیشاندەری هەردوو دونیات، ئەوجا فریشتەکان دابەزین، بەدەوریدا دەسووڕانەوەو سڵاوتیان لێدەدا، پیرۆزیان دەکرد، وەک چۆن بەدەور عەرشی خودادا دەسووڕانەوە، ئادەم نوێژی تێدا کرد، دەستی بەرز کردەوەو لەخودا پاڕایەوە:

- خودایە تۆ بەنهێنی و ئاشکراییەکانم دەزانیت، لێبووردنم قبووڵ بکە، خودایە ئەگەر تۆبە بکەم و ڕاستگۆ بم، دەمگەڕێنیتەوە بەهەشت؟
- بەڵێ.. ئادەم دەتگەڕێنمەوە بەهەشت.

ئەم تەنیا وشەیەی بەسبوو، کە ئومێدی وەبەر بێنێتەوە.

ئەگەرچی ئەوەی ئادەم لەهیندبوون، هەموو جارێ لەهیندەوە بۆ بەککە بە پیادە دەڕۆیشتن، بێ ئەوەی سواری پشتی ئاژەڵ بن، تا لەبەر دەرگای ماڵی خودا دەپاڕانەوە، بیست ساڵ بەو شێوەیە تا خودا فەرمانی ویندان بگەڕێنەوە خاکی عەدەن، بەوەی لێیان خۆشبوو، ئادەم گەڕایەوە بەهەشتی عەدەن، تەنانەت ئەوانەی لەنەوەی ئەوبوون و پیاوچاکبوون لێلیاندا بۆ خاکی نەمری گەڕانەوە. خودا ڕێزی لەئادەم ناو هیدایەتی دا و لەنێو نەوەکەی پلەی پێغەمبەرایەتی ویندا و پەرتووکێکیشی بۆ داگرت، باسی لەخودا دەکرد، فێریانی کرد خودا تاك و تەنیایە.

دەتوانیت ئەوە بێنیتە پێش چاوی خۆت، هەستی جنۆکەکان چۆن بووە، کاتێ بینییان ئادەم و نەوەکانی دوای بیست ساڵ گەڕانەوە خاکی عەدەن، کەچی باوەگەورەمان تۆبەی نەکردو خودا نەیگەڕانەوە ، ئەو بەردەوام بوو لەخراپە کاری، ئێمەشی بەخۆیەوە تووش کرد.

***

## خەفەتبارم بەوەی جێندەهێڵیت، وەلێ لەوانەیە لەسەرە مەرگا ببینیتەوە

ئادەم لەخاکی عەدەن تەمەنێکی زۆر ژیا، لەوێ نزیکەی هەزار ساڵ تەمەنی کرد، نیو ملیۆن نەوەی خستەوە، تا بەوای نەخۆشییەوە مەرگ پێشی لێگرت و لەسەر جیوبانەکەی کەوت، منداڵەگەورەکانی لەدەوری کۆبوونەوە، حەوا لای سەریەوە وێستابوو، حەوا دەستی بەرزەوە کرد و گوتی:

- خودایە، ئەو دەردەی ئادەم لەمن کەوێت.

ئادەم بزەخەنەیەکی بۆ کرد، نێوچەوانی ئادەمی ماچ کرد و گوتی:

- ئادەمگیان.. بۆ دەبێت تۆ بمریت، ئەی دوای تۆ من چی بکەم، چۆن بژیم؟
- حەوای ئازیزم..خودا ئامانەتەکەی خۆی دەباتەوە، تۆش بەو زووانە دێیتەوە لام.

بزەیەکی تری کرد، وەلێ بزەیەکی تاڵبوو، ئادەم تەماشای (شیس)ی کوڕی کرد و گوتی:

- کوڕی خۆم.. ڕەگەزی ئێمە بۆ خاك نەخولقاوە، ئەم خاکە بۆ درندەو نێچیروانانە، ئێمە بۆ بەهەشتی ئاسمان خولقاوین، ئەگەر پیاوچاك بین، دەگەڕێینەوە ئەو بەهەشتە.

ئەوجا تەماشای نەوەکەی کردو گوتی:

- ڕۆڵەکانم.. لەناو خۆتاندا ڕێك بن، تێکەڵی منداڵەکانی کین مەبن، ئەوە من ئاگادارتانم کردەوە، ئا پیاوێکی خراپەکار پەیدا دەبێت،

ئەگەر بینیتان لێی دوور بکەونەوە، بچنە خانووەکانی خۆتان و دەرگای لێ مەکەنەوە.

دواجار بەوای ئازارەوە هاوارێکی لێ بەرزەوەبوو، گوتی:

- کوڕەکانم.. بەخوا تامەزرۆی بەروبوومی بەهەشت دەکەم، بڕۆن لەبەروبوومەکەیم بۆ بێنن.

دواتر لای لە حەوا کردەوەو گوتی:

- حەوا.. بچۆرە ناوەندی بەهەشت و لە ناو کرۆکی داری ژیان ڕۆنێک هەیە، لێی دەربهێنەو لەشمی پێ چەور بکە، تا ئازارەکەم کەمکاتەوەو لەناو گۆڕەکەشم ببێت بەنوور.

حەوا بەکوڵ گریا، لێل (ئیدریس)ی کوڕە گەنجەکەی چوونە دەرەوە، ڕاسپاردەکەی لەبەهەشت بۆ بێنن، لەڕێگا ئاژەڵێک ڕێی بە ئیدریس گرت، گیانەوەرێکی کەڵبەدار، گازێکی لەباڵی ئیدریس گرت، ئیدریس مشتێکی پیا ماڵی و دووری خستەوە، دواتر بەوای ئازاری باڵیەوە کەوت، حەوا قیژاندیە سەر ئاژەڵەکەو گوتی:

- ئەی دڕندە، چۆن ویرات دەمت لەخەڵقەندەی خوا بگریت؟

دەنگێك توند و تیر لە پشتییەوە هات، گوتی:

- وەی لەتۆ حەوا، ئەو ئاژەڵە لاسایی تۆ دەکاتەوە، هەرتۆ نەبووی دەمت بۆ شتێکی حەرام برد؟ ئیتر گلەیی لە ئاژەڵێك بۆ دەکەیت، وەك تۆ ڕەفتاری کردووە.

ئەوە گەنجێکی تاکچاوبوو، قژەسەری سپی و خاو، ڕوخساری ڕووبەکی کراوەی بوو، بەگاڵتەجاڕییەوە سەرزەنشتی کرد، ئیدریس بەسەریدا نەڕاندی:

– هێی.. دەست داخەو لێرە دوور کەوە، تا نەهاتووم دەست یەکجارەکی دابخەم، تۆ لەنەوەی (کێن)یت؟

حەوا بەوای قسەکەی ئازاری پێگەیشت، خۆی دایە پاڵ دارەکە تا خۆڕاگر بێت، ئیدریس چووە بن باڵی دایکی، ویستی بچێت بەگژ تاکچاوەوە، دایکی نەیهێشت و گوتی:

– کوڕی خۆم.. ئا ئەمەیە باوکتان لێی ئاگاداری کردنەوە، وەرە با لێرە دوور کەوینەوە.

ئیدریس دوا نیگای لەگەنجەکە بڕی و پشتی تێکرد، هەرزەکارەکە هاواری لێکرد:

– من (جینتون)م.. تۆش ئیدریس ئەم ناوەی منت بیر بێت، بیرت دەخەمەوە...

ئیدریس گوێی بەودوای قسەکەی نەدا، لەتەك دایکیدا بەرەو ناوەندی بەهەشت بەڕێکەوتن.

فریشتە پێشوازی لێکردن و پێیانیان گوت:

– لەکوێوە هاتوون بۆ ئەوێ بگەڕێنەوە، هەموو دەردێك دەرمانی هەیە، تەنها مردن نەبێت.

حەوا ئاهێکی قووڵی هەڵکێشاو لەخەمدا داما، ئاخر وشەی مردن ئاسان نییە، بۆیە بەهەڵەداوان و بەگریانەوە بۆ لای ئادەم گەڕایەوە، دواتر فەرمانی خودا

دابەزی، پێمەردە لەتەك بڕێ فریشتە چوونە ژوورەوە، حەوا بەر لەهەمووان ڕاچڵەكی، خۆی بەسەر ئادەم دا دا، ئادەم پێیگوت:

- حەوا گیان.. ڕێ بۆ فریشتەكانی خودا چۆڵ بكە.

حەوا كەوتە سەرچۆك و نێوچەوانی نایە سەر زەوییەكە و دەستی بەگریان كرد، لەبەرامبەر نەوەكانی ڕوحی (ئادەم)یان هەڵكێشا و بە ئاوی بەهەشت شووشتیان، بەزەعفەران و ناردین كفن و دفنیان كرد، بەڕۆنی دار زەیتوون چەوریان كرد و لە قوماشی كەتانیان پێچا، حەوا هەنیەی لەسەر زەوییەكە بوو، نەیدەویست ئەو ڕوح كێشانە ببینێت، پێمەردە هات و گوتی:

- ئەی حەوا، هەستە، مێردەكەت فەرمانی خودای بەجێ گەیاند.

فریشتەكان هەڵیانگرت و لە ئەشكەوتی(مەكفیلە) لەسیلەی هابیل ناشتیان، تەماشای نەوەكانی ئادەمیان كرد و گوتیان:

- ئەی نەوەی ئادەم.. ئەمە ڕێبازتانە لەمەڕ مردووەكانتان، چۆنمان كرد، ئێوەش هەر وا بكەن.

بەو شێوەیە نووسراوەكانمان كۆتایی هات، گەشتی دەستپێكردنی ژیانی نەوەكانی ئادەم تەواو بوو، وەلێ بەشتگەلێكی تر دەستی پێكرد، جیاواز لەو سەردەمەی ئادەم ڕوویدا.

***

## *** تەواو ***

لەپڕ ئاگرێکی وەکی دۆزەخ هەڵگیرسا، دارو دیوار گڕی گرت، سۆکتی کارەباکە تەقییەوە، لیۆپۆڵد و براکەی ترس دایگرتن، بەترسەوە لەدەوروبەری خۆیا دەڕوانی، لەناشوێنەوە ئاورەکە هەڵیسا، بەو ناوە بڵاو بووەوە، بەرەو پیریان هات، چاویان بەشپرزەییەوە لە بۆبی دەڕوانی، بەو ئاوایەی کەوتبووە باروبۆخێکی تر، چاوەکانی داخستبوو، سەری بۆ لای پشتەوە لار ببوەوە، ورتە ورتی بوو، وەلێ قسەکانی ڕوون نەبوون، ئەوجا چاوی لێکردەوە، ئەو چاوانەی گلێنەی ونببوو، وەك چاوی شەیتان سپی بوو، لیۆپۆڵد سەرزەنشتی کرد، وەلێ بەئاگا نەهاتەوە، هیچی وای دەرنەخست، کەهەستی بەشتێك کردبێت.

بێ ئاگابوو لەوەی ڕوودەدات، ئەو لەودیوی بینینەوە دیمەنێکی دەبینی، ئایەوێ، یا حەز ناکات باسی لێوە بکات(( خۆی لەنێو کۆمەڵێك بەرامبەر شانۆ لەبینای ڕێکخراوی بیناکانی نیۆیۆرك بینییەوە، کە پێیان دەگوت ئەشکەوتی لیلیس، لەسەر شانۆکە پەیکەری ئافرەتێکی ڕووت دەرکەوت، مارێك خۆی پێوە لوول داوە، چاوانی ئافرەتەکە زۆر لەچاوانی مارەکە شەرانگێزتر دیارە، دواتر لەسەر شانۆکە کابرایەکی پرچ درێژ بە جلوبەرگێکی ڕەشەو دەرکەوت، منداڵێکی دەمامکداری بۆ لای پەیکەرەکە پەلکێش دەکرد، ئافرەتێك هات، وەلێ جلو بەرگەکەی سەردەمیانە نەبوو، کەشیشێکی گەورەی ئەشکەوتەکە بوو.

لوییب بەمستە گەورەکەی بەدەموچاوی (بۆبی)دا کێشای، لەهۆشی برد، وەلێ بەوای بێهۆشییەکەیەوە لەو دیمەنە ڕۆ چوو(( لەو شانۆیەدا چاوی بەئامادەبووان گێڕا، خەڵکانێکی بەویقاری تێدا بوون، وەك ئەو پیرەپیاوەو

هاوسەرەکەی، هەر هەموو چاویان دەگێڕا، چون ئەوەی کەس شتێك نەزانێت، چەقۆیەك بەدەست پیاوە پرچ درێژەکەوە دەرکەوت، نایە سەر ملی منداڵەکە، لەیەکڕا بۆ بەقوربانی کردنی بۆ لیلیس سەری بڕی)) هەموو جەستەی بۆبی کەوتە لەرزین، باوکی دەستی نایە سەر دەستی بۆبی کوڕی چون ئەوەی هێوری بکات، بەوەی لەسیلەیدا دانیشتووە، نەترسێت.

خەیاڵ بۆبی بردە دیمەنگەلێکی تر، بیری خستەوە، ئەوەی پیاوماقووڵان و بازرگانەکان و دەوڵەمەندی بانکەکان و سیاسەتمەداران و هونەرمەندان بە منداڵانی شەقامیان دەکرد، شتێکبوو کەس پێی نەدەزانی، کوشتن و لاقەکردن و گەمەکردن بوو، یانەخۆ قوماریان لەسەر دەکرد.

لەپڕ بۆبی لە خەیاڵەکانی بەئاگا هاتەوە، هەناسەیەکی خەماوی هەڵکێشا و چاویشی لەو ئاگرە بڕی، کە لەهەموو لایەکەوە شاڵاوی دەبرد، هاواری کرد:

– نەفرەت.. ئەوە..ئاگری...

بۆبی لەجێی خۆی راپەڕی، بەدەور خۆیدا کەوتە گەڕ، پەلاماری ئامێری کۆمپیوتەرەکەی دا، تا لەئاگرەکەی دوور بخاتەوە، لێوبۆڵە هاواری بەسەریا کرد:

– نەفرەتی شەیتانت لێبێت، بۆ خۆت و ئامێرەکەت، لێرە دەرمان بکە.

بۆبی هەر زوو گوتی:

– مولووکی نەفرەتی.. ئەو شەیتانی حیکایەتخوانە ئەم ئاوردەی ناوەتەوە، ئەوەش مانای ئەوەیە بڕیاری داوە لەناومان بەرێت، تاکو ئەم نهێنیە لێرە کوێر بکاتەوە

براکان بەدڵەڕاوکێوە دیقەتیان دا، بۆبی بەدەنگێکی بەرز گوتی:

– ئەو چەکمەجەیەی ئەوێ بکەتەوە.

لویب بەپەلە چەکمەجەکەی کردەوە، ئاگرکوژێنەوەیەکی تیا بەدی کرد، هەر زوو دەریهێناو زامنەکەی شکاند، دووکەڵێکی سپی بەو ناوەدا بلاوبووەوە، ئاگرەکە چون ئەوەی پاشەکشە بکات؛ کەمێ دوور کەوتەوە، لویب بە ئاگرکوژێنەکەوە ڕوو بەڕووی ئاورەکە بووەوە، تا بەتەواوی کوژاندیەوە،ئەوەندەی نەبرد ئاگرەکە هەڵیسایەوە، وەك ئەوەی لەدیوارەکانەوە دەربچێت، دووبارە لویب بە ئاگرکوژێنەکەوە بۆی چوو، لێی نەگەڕا تا دایمرکاندەوە، بۆبی هاواری کرد:

– لیۆبۆڵد.. ئەو قوماشەی سەر قەنەفەکە لێکەرەوە و بیخەرە ژێر دەرگاکە، کەلێن بۆ ئەو شەیتانە مەهێڵە.

لیۆبۆڵد بەپەلە قوماشەکەی کردەوە، (بۆبی)ش هاوکاری کرد، تا کون و کەلەبەری ژوورەکە بەقوماشەکە بگرن، وەك ئەوەی ڕێ لەهاتنە ژوورەوەی مارێك بگرن، چەند خولەکێك تێپەڕی ، هیچ ڕووی نەدا، لەناکاو دەرگاکە بەر لەققە درا، چون ئەوەی کەسێك لەودیوەوە بیەوێت دەرگاکە بشکێنێت، بۆبی هاواری کرد:

– لیۆبۆڵد.. بەدەست فشار بخەنە سەر قوماشەکە.

لیۆبۆڵد قوماشی ژێر دەرگاکەی زیاتر جێگیر کرد، (بۆبی)ش چاوی بە ژوورەکەدا دەگێڕا، نەبادا کونێك یا کەلەبەرێکیان بیر چووبێت، چەند خولەکێك بێدەنگی هێوری کردنەوە، لویب لەترسا چاوی بەدەورووبەری خۆی دەگێڕا، گوتی:

- هەی گێلەی نەفرەتی هۆشت ما لەکوێ؟

بۆبی بە هەناسەبڕکێوە گوتی:

- ئەو شەیتانە هەندێ بابەتی پیشاندام، نامەوێ بیرم بێتەوە.
- پشتی دەرگاکە بێدەنگییە، تۆ بڵێی ڕۆیشتبێت؟
- بەڵێ ڕۆیشت، بەوای کپبوونی دەنگە دەنگەکەو ئاگرەکە دەبێت ڕۆیشتبێت، ئاخر مولووك لەو چەشنە نییە هێور بێتەوە.

لویب هێور بووەوەو هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشا، بۆبی ڕاستەوە بوو، گوێی لەهێنانەوەی دەمانچەکە بوو، لای لە لیۆبۆڵد کردەوە، دەمانچەکەی ڕوو بەڕووی بۆبی کردبوو، گوتی:

- بۆبی.. ئەگەر شەیتان ڕۆیشت، ئەوا من لەسەر سەرتم، وابزانم گەمە بچکۆلەکەت لەبیرچووە.

بۆبی لەسەرخۆ گوتی:

- لیۆبۆڵد.. ئەم ئاگرە بەس نییە بێدەنگ بێت؟

لیۆبۆڵد ئامانی دەمانچەکەی لابرد و گوتی:

- ئاگری شەیتانەکەت کوێرەوەبوو، وەلێ ئاگری دەمانچەکەی من هەر ماوە، لەوە ڕزگارت بوو، لەمەیان ڕزگارت نابێت، وەك چۆن تۆ باسی (لیلیس)ت کرد، ئەویش هەر وا باسی لێوەکرد، تۆ ئەوەت خستە ڕوو بەڵگەی ترمەن، کە ئەو شەیتانە لەسەر هەقە، ئەو بەڵگە نەفرەتییە چییە؟

بۆبی هەناسەیەکی قووڵی هەڵکێشاوگوتی:

- لیزبۆلد.. بابەتەکە لەنێو عەقڵییەتی ئیمانداران و ئاینەکاندا باوەڕکردنە، کەچی لەنێو پەرتووکەکاندا ئەوە باس نەکراوە.. خودا تەنها حەوای خولقاندووەو هیچ مێینەیەکی تری نەخولقاندووە، بەو ئاوایەش بێت، خوشك و براکان لەنێو خۆیاندا هاوسەرگیرییان کردووە، ئەگەر وابێت، ئەوا بەشەرییەت لە زەواجی حەرامەوە داهاتوون، لیزبۆلد من و تۆیش هەر هەموو مرۆڤەکان تۆی حەرام بووینە، ئاینەکان دەڵێن خوا بەوە ڕازی بووە، دواتر حەرامی کردووە، ئەمە چارەسەرێکی درۆزنانەیە، بەو ئاوایە خودایان خستووەتە ناو کێشەکە، خودایەك بەو مەزنییەی کاری وا دەکات؟، وەڵێ خودا ئافرەتێکی تری لەپاڵ (حەوا)دا خولقاندووە، ئادەم هاوسەرگیری لەتەك ئەویشدا کردووە، ئەمەیان ڕێی تێدەچێت.

لویب گوتی:

- لەوانەشە پیاوێکی تری بێجگە لە ئادەم خولقاندبێت.
- نا..ئادەم تەنیا باوکە، کە لەهەر سێ ئاینەکاندا ناوی هاتووەو ناوی کەسێکی تر نەهاتووە.

لیزبۆلد بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئەی ئەفرەتی لەم فەلسەفانەت گەڕێ، بەڵگەکەمان پێ بڵێ.

بۆبی بەچاوێکی پڕ لەسەرزەنشتییەوە گوتی:

- لیزبۆلد.. ئەگەر تۆ پەرتووکی پیرۆز بخوێنیتەوە، بەو بەڵگەیە دەزانیت، کاتێ دژیەیەکی نێوان(ڕیوایەتی تەکوین)ی یەکەم و دووەمی لەچیرۆکی خولقاندندا هاتووە، لە(تەکوین) یەکەم ئادەم و ژنەکەی لەقوڕ درووستکراون، کەچی لە(تەکوین)ی دووەمدا ئادەم هەر خۆی

دروستکراوەو دواتریش لەپەراسوویەکی چەپیدا حەوا درووستکراوە، کاتێ زانایانی جورلەکە شرۆڤەی ئەو دژ بەیەکەیان کرد، گوتیان.. لە(تەکوین)ی یەکەمدا باس لەئافرەتێکی تر کراوە، حەوا نەبووە، ناویشی (لیلیس)بووە، لەگەڵ (ئادەم)دا نەگونجاوەو لەدەستی هەڵهاتووە، لیلیس تاوانبارە بووە بەکوشتنی منداڵەکانی حەوا، بەڵام هەموو زانایانی جورلەکە و مەسیح ئەم چیرۆکە بە ئەفسانە لەقەڵەم دەدەن، گوایە بوونی هەر نەبووە.

لویب گوتی:

- دەی باشە، ئەی پەرتووکەکانی تری ئاینەکان چی دەڵێن؟
- لە قورئاندا، دوای ئەوەی ناوی ئەو ئافرەتانەی هێناوە، کە پیاو بۆی نییە هاوسەرگیرییان لەتەکدا بکات، وەک دایک و خووشک و کچی خۆی و هەندێکی تر، دوای ئەوەی شەرعی هاوسەرگیری بەتەواوی دیاری کرا، گوتی.. خودا دەیەوێ ڕێبازی سونەتی ئەوانەی بەر لەخۆتان بگرن و هیدایەتان دەدات سونەتی ئەوانەی بەر لەخۆتان لەهاوسەرگیری کە بەسەریاندا فەرز کرابوو بەر لە ئومەتی محەمەد لەسەردەمی ئادەم، هاوسەرگیری لەتەک خووشکدا حەرامە، بەو ئاوایەی لەسەردەمی ئادەمدا حەرام بووە، لەهەموو سەردەمەکانی دوای (ئادەم)یش هەر حەرام بووە. پرسیارەکە ئەوەیە.. ئەگەر هاوسەرگیری لێل خووشک حەرام بێت، کە تەنها یەک پیاویش بوونی بوبێت، چییە. هەموو خەڵک بەپێی قورئان مامەڵە دەکەن، کە لەقورئانیشدا هاتووە((ئەی خەڵکینە باوەڕتان بەخودا هەبێت، کە ئێوەی لەیەک نەفس خولقاندووە)).

لویب گوتی:

- هیچ چارەیەکی تر نییە، دەبێ ئافرەتێکی تر خوڵقابێت.

بۆبی برۆکانی بەرزەوە کرد و گوتی:

- لە ئیسلامدا هیچ بەلگەیەکی وا نییە، وەلێ شتێکی تر هەیە ئەو ڕووداوانە لەیەک نزیک دەکاتەوە، بەتایبەت لەمەڕ (لیلیس)ەوە بە ئالۆزی دەمردن، محەمەد ئەوەی بەیان نەکردووە چۆن دەمرن، محەمەد دەڵێت.. شەیتان بۆ لای حەوا هات، ئەگەر ناوی کوڕەکەی بە (عەبدولحارس) بنێت، ئەوا نامرێت. دوای ئەوەی بەو ناوەوە ناوی لێ نا شەیتان پێیگوتبوو، کوڕەکەی نەمرد و ژیا. لەقورئاندا ئەم چیرۆکەهاتووە، کە ئادەم و حەوا هاوبەشیان بۆ خودا داناوە، بەوای ئەوەی کوڕەکەیان نەمرێت، وەلێ لە سوونەتی محەمەد شەیتان لەغەیب نازانێت، ناشتوانێت بنیادەم بکوژێت، هیچ دەسەلاتێکی بەسەر ئەوەی ئادەم دا نەبووە، تەنها دەیتوانی بچرپێنێتە گویان و ڕارایان بکات. کاتێ ئەو قسەیە دەچرپێنێتە گوێی حەوا، یەقین نەبووە لەمردنی منداڵەکانی، بەڵکو شتێکی تر هەبووە وایکردووە ئەو مردنانە بکەونەوە، کاتێکیش حەوا بە پێی قسەی شەیتان ناوی کوڕەکەی دەنێت بە (عەبولحارس) و کۆرپەکەی نامرێت، ئەوا داوای لە لیلیس دەکات لە کوشتنی منداڵەکانی حەوا بکەوێت و ئیدی نەیانکوژێت، ئەو سەربوردەیەش لەپەرتووکی جوولەکاندا هاتووە.

لیۆبۆلد لوولەی دەمانچەکەی لەکەللەی بۆبی دوور خستەوەو گوتی:

- لەم چەنەبازیانەت بکەوە، لە لیستی نەفرەتییەکەت چیترت هەیە، ئەوەی دێت و باسی لێوە دەکەیت بەم شێوەیە بێت، دوو فیشەگ بە کەلەتەوە دەنێم

لویب دەستی برد و کۆمەڵەی چوارەمی کارتەکانی دەرهێنا، وەڵێ لویب سەری سوڕما کە بینی تەنها دوو کارتی لەخۆ گرتووە، بۆبی گوتی:

– ئەوەی زانیتان لەبیر خۆتانی بەرنەوە، ئەم کۆمەڵەیە لەسەردەمی (ئادەم)ەوە دەمانباتەوە سەردەمێکی تر، وەڵێ بیرتان بێت ئەوەی پێشتر ئاگادارم کردنەوە ڕیوایەتەکەی (ڕازئێل)ە.

لیۆپۆڵد گوتی:

– ئەو پەرتووکەی فریشتە بۆ (ئادەم)ی داگرت، چیبوو؟

بۆبی لێل ئاشکرا کردنی دوو کارتەکە گوتی:

– ئەو پەرتووکە دەستاو دەست گەیشتە پێغەمبەران، لەسەردەمی هـەر پێغەمبـەرێکیش زانیـاری تـازەی خراوەتـە دوو تـوێی پەرتووکەکە.

بۆبی هەر یەك لەکارتەکانی دایە دەست هەر یەك لەدوو براکە، کارتەکانیش کارتی زانست و موڵکداری بوون، بۆبی گوتی:

– زانستی مرۆڤ بەوای پەرتووکی یەکەمەوە پێشکەوت، بەو ئاوایە شارستانیەت دەرکەوت و بڵاوبووەوە تا ئەو سەردەمە هات، هەموو زانستە ئاپارەکان دەرکەوتن، هەموو ڕێکخراوە نهێنییەکان تا ئەمڕۆش پەیڕەوییان دەکەن.

لویب گوتی:

– مەبەستت زانستی مامۆستای (تیوبالکین)ی مەزنی سەردەمی نوحە؟

بۆبی سەری بە ئەخێر ڕاوەشاند و گوتی:

– زۆر لەو سەردەمە پێشووتر، یەك مامۆستای مەزن نەبوو، دوو بوون و لەو سەردەمەی خۆیاندا ڕوو بەڕووی یەك بوونەوە، ئەو ڕوو بەڕووبوونەوەش کارەساتیار بوو.

لویب بە ناڕەزاییەوە گوتی:

– ئەو ڕوو بەڕووبوونەوەیە ڕێك پێمان بڵێ لەکوێ نووسراوە؟

– لەتەختەگڵەکانی زومرد دا نووسراوە.

لیۆبۆڵد هەڵیداو گوتی:

– ئەو تەختەگڵانە لەکوێیە؟

– نووکە بەردەست نین، تەنها یەك تەختەگڵی زومرد بەردەستە، ئەویش نووسراوێکی کورتی بەسەرەوەیە، وەك ئەوەی پەند و ئامۆژگاری بێت.

لویب بەگومانەوە گوتی:

– چۆن ئەودوای نووسینەکان بزانین؟

بۆیی سەری خۆی بەزەوییەکەدا کێشا تا بەرسڤی نەداتەوە، وەلێ دەمانچەکەی لیۆبۆڵد جووڵەی پێکرد و گوتی:

– کێ ئەوەی دۆزیوەتەوە و ئەودوای تەختەگڵە زومردەکان لەکوێن؟

بۆیی گوتی:

– کێشەکە لەوەدایە کێ ئەو دەستنووسەی دەرکرد.

لویب بلەز گوتی:

– کێ بوو؟

بۆبی بێ ئەوەی برژانگی چاوەکانی بپرووکێنێت، گوتی:

– قێزەونترین سیحربازە لەم جیهانەدا، کە خودی (حەزرەد) لەچاویەوە قوتابییە.

براکان بەچاوی پرسیارەوە لێیان ڕوانی، بۆبی گوتی:

– ئەو ئەفرەتییە خاوەن (شەمس ئەلمع...)

لەناکاو ئامێرێکی بەرباخەڵی لیۆبۆڵد زەنگی لێدا، هەر کە دەریهانی، چاوەکانی زەق زەق کرانەوە، دواتر بە تووڕەییەوە لەبراکەی ڕوانی و گوتی:

– لویب.. بەر لەکەمێك لەم ژوورەوە نامەیەکی فریاکەوتن بۆ پۆلیس ڕەوانە کراوە، ئەوەی ناردوویەتی ئامێرێکی لەو ئامێرانەی ڕێکخراوی نهێنی پێیە.

هەردوو براکە تەماشای (بۆبی)یان کرد، کە بەرەو دوا دەکشایەوە و زمانیشی تەتەڵەی دەکرد، بەتەواوی قسەی بۆ نەدەکرا، لیۆبۆڵد شاڵاوی بۆ برد و کەوتە پشکنینی، هەرچی لویب بوو، شتومەکەکانی ناو ژوورەکەی سەح دەکردەوە، دواتر ئامێرێکی چوون ئامێرەکەی لیۆبۆڵدی دۆزییەوە، بۆبی لەناو گوتی:

– ئەو نامەیە لەخۆڕا کراوە، ئەگەر ئەو ئامێرە بەر لەکاتژمێرێك نەکوژێنمەوە، هەر بۆ خۆی نامەی فریاکەوتن دەنێرێت، ئەوەشم بۆ ئەوە کردووە، دوای ونبوونم بمدۆزنەوە.

لویب ددانی لێ جیڕ کردەوەو گوتی:

– ئەی ئەفرەتی.. بۆچی لەسەرەتاوە پێت ڕانەگەیاندین؟

لیۆبۆڵد دەسکی دەمانچەکەی بەسەر (بۆبی)دا کێشا، بۆبی دەستبەجێ لەهۆش خۆی چوو، هەردوو براکە کۆمەڵە کارتەکانیان لەجەنتا ناو کەوتنە پشکنینی چەکمەجە و دۆلاب و هەرچییەك لەژوورەکەدا هەبوو، کە تایبەت بوو بە بۆبی بردیان، ئەو دەمەی لیۆبۆڵد دەگەڕا پێی لەدارێك هەلکەوت، ئاگر سووتاندبووی، لیۆبۆڵد بەشەرمەزارییەوە تەماشای زەویەکەی کرد، دەستی برد و شتێکی ڕاکێشا.

– ئەم نەفرەتییە...

لویب لای لێ کردەوە، بەو ئاوایەی پرسیاری لێبکات، وەلێ بەوای سەرقاڵبوونی گەڕان بەدووی شتە تایبەتەکانی بۆبی، پرسیارەکەی بیرچووەوە، لیۆبۆڵد داچەمیەوە سەر شتێك، وەك ئەوەی کونێك لەزەویەکدا ببینێت، گوتی:

– ئەم نەفرەتییە.. ئەم نەفرەتییە.

لویب چاوی لێ زەق کردەوە، ئێدی وەك سەرسوڕمانێك یا تووڕەبوونێك بۆ ئەو شتەی هاوڵەکەی دەستی برد و لەو کونە کۆمەڵێك دەستنووس و ڕۆژنامەی کۆنی دەرهێنا و گوتی:

– هەی هیچ وپووچ.. ئەمانە دەستنووسی ڕاستەقینەن؟

لویب بەمەڵچوونەوە گوتی:

– پێدەچێت ئەم نەفرەتییە لەگەنجینەی باوکی دزیبێتی، ئێستا زانیت ڕێکخراوی نهێنی بۆچی دونیای کرد بەڕۆژی خۆی، تا پێی بگات و سەری بپەڕێنێت.

لیۆبۆلد هەموو دەستووسەکانی لەجانتا نا، لویب جەستەی بۆیی بەتووندوتیژی بەسەر زەویەکەدا ڕاکێشاو هەڵیگرت، هەردووکیان بە بارەکانیانەوە چوونە دەرەوە، لەو شوێنە دوور کەوتنەوە، نەوەك پۆلیس پێیان بگات.

***

## ڕیوایەتی دێوەکان

بەوای لێدانێکی بەهێز دەرگاکە شکا، پیاوانی پۆلیس خۆیان بەژوورا کردو تیا بڵاوبوونەوە، دوا بەدوای ئەوان پیاوێکی کەتە بە پاڵتۆیەکی درێژەوە چووە ژوورەوە، وەك کەسێکی بە ئەزموون چاوی بەناو ژوورەکەدا گێڕا، جگەرەیەکی پێکرد، دواتر پۆلیسێك هاتە لای و گوتی:

– گەورەم (ڕیکس واتسۆن)ی پشکنەر کەسی لێ نییە، شوێنەواری هیچ لاشەیەکی سووتاویشی لێ نییە.

ڕیکس کادووی جگەرەکەی بەحەوادا کردو گوتی:

– شوێنەواری ئاگرکەوتنەوەکە زۆر تازەیە، پێدەچێت خاوەن ماڵەکە فریای ئەوە کەوتبێت لەئاگرەکە هەڵبێت، ئەوە یەکەم نامەی ئاگادارکردنەوەی ئەو هەرزەکارەیە(بۆیی فرانك) دوای ساڵێك لەونبوونی.

لەوڵاتێکی دوور و لەبەری تۆقیانووس سێ گەنجی ئەمریکی دەرکەوتن، دڵەڕاوکێیان پێوە دیاربوو، گەنجێك بەڕوخسار عارەب لەپێشیانەوە بەشەقامێکدا دەڕۆیشتن، لەسەرگەی شەقامەکە لەسەر تابلۆیەکی شین

نووسرابوو(شەقامی مەواردی)، خەڵکەکە بەرای جلو بەرگەکەیانەوە کە بەلایانەوە بیانی بوو لێیانیان دەڕوانی، گەنجە عارەبەکە پێیگوتن:

- داوای لێبووردنتان لێدەکەم، خەڵکی ئێرە بەخەڵکانی بیانی ڕانەهاتوون، وەڵێ دواتر بەلایانەوە ئاسایی دەبێت، بەڵام ئەگەر بزانن ئێوە بۆچی لێرەن و دەتانەوێ چی بکەن، هەر لەسەر شۆستەی شەقامەکە سەرتان دەبڕن.

لیۆبۆلد پێیگوت:

- تۆ دڵنیایت دەمانبەیت بۆ ماڵی (ئەلبۆنی) جادووگەر.
- بەڵێ.. ئەو جادووگەرە هیچ و پووچە لێرە (میسر) ماوەیەکی زۆر ژیاوە.

گەنجە عارەبەکە بردینە ناو ساختمانێکی زۆر کۆن، کە لەکۆلانێکی تەنگەبەر بوو، بەدەستی ئیشارەتی بۆ دەستە خانوویەك کرد و ئەوانی بەجێهێشت، هەرسێکیان چوونە دەستە خانووەکە، دیوارەکانی داڕزاو و کەل وپەلەکانی ناویشی تۆزیان ئەگرتبوو، پێدەچوو کەسێکی تێدا بژێت، لیۆبۆلد پاڵی بەپشتی (بۆبی)یەوە نایە ناوەندی هۆڵەکە و گوتی:

- دەی ئەفرەتی ئێمە لەچاوەڕوانیدایین، دەمانچەکەم بێزارە لەبەرکارنەهێنانی، بەپەرۆشەوەیە گوێی لەدرۆت بێت، تا کەللەت بەماچێکی سوور برازێنێتەوە.

لویب هەڵیداو گوتی:

- دەستنووسەکانت لێ شاردینەوەو شەیتانێکی ئەفرەتیت ئامادەکرد، وەختەبوو لەناومان ببات، لێل ئەوەش لەگەڵتا بۆ ئێرە هاتووین،

بەقسەی ئامۆیارەکەت سەرپوردەی دواتر کەس نایگێڕێتەوە (ئەلبۆنی) جادووگەر نەبێت، کە چەندین سەدەیە مردووە، لیۆپۆڵد لەدەمانچەکەت گەڕێ، درۆ و فێڵ و تەڵەکەبازی یانی پارچەیەك لەجەستەی ئەم بیقیمەتە بەم چەقۆیە لێدەکەمەوە.

بۆبی چاوی ڕاستی دەفڕی، گوتی:

– درۆ ناکەم، بۆ ئەوە هاتووینەتە ئێرە، چونکە تەنیا ڕێگایە لەئامادەکردنی ڕوحەکان، لەڕاستیدا ئێمە ڕوحەکان ئامادە ناکەین، بەڵکو بۆ خۆمان بۆ لای ڕوحەکان دەڕۆین.

لیۆپۆڵد لەدەموچاوی نزیکبووەوە، گوتی:

– بۆبی بچکۆلە..بۆنی جادوو دەکەم.

بۆبی گوێی ونەداو گوتی:

– ئەگەر دووربینێکی گەرمی پێوی هەستیارمان پێبوایە، لەوێوە تەماشای ناو هۆدە داخراوەکەمان بکردایە، ئەوا چاومان بە بوونەوەری سووربباو دەکەوت، کە لەژوورە خاڵیەکە دەجووڵانەوە، بەهەمان ڕێگا لەم هۆدەیە ئەو کەسانەی تێیدا ژیابوون دەمان بینی لەشوێنی داخراو وزەی گەرمی دەمێنێتەوە، بۆ هەر شوێنێك یادگەیەکی گەرمی لەو بابەتە دەمێنێتەوە، هەر وەك ڕێکۆرد کرابێت.

لیۆپۆڵد گرنگی بەقسەکەی داو گوتی:

– تۆ باس لەتەکنیکی نهێنی دەکەیت، کە هەواڵگری ئەمریکی بەکاری دەهێنن.

بۆبی بەرسڤی دایەوەو گوتی:

- هەوالگری ئەمریکی هەر هەمان بیرۆکە بەکار دەهێنن، وەلێ ئێمە لەرێی جادووگەرییەوە ڕوحەکان ئامادە دەکەین، بەکورتی.. ئێمە خودی(ئەلیۆنی) ئامادە دەکەین، کە لێرە ژیاوە، بەلام...

بۆبی کەمێک بێدەنگبوو، دواتر لەسەرخۆ گوتی:

- پێویست دەکات چل ڕۆژ لێرەبین، هیچ خواردنێکیش نەخۆین، تەنها حەب بەکار بهێنین، کە لەگەدەدا هیچ پاشەڕۆیەکی لێ بەجێ نامێنێت، ئامادەکردنی ڕوح نابێت لەگەدەماندا تۆزقاڵێك خۆراکی تێدا بێت.

بۆبی گوێی لە دەمانچەکە بوو خرایە سەر پێ، لویب هەڵیداو گوتی:

- هەی نەفام.. یەك وشەی تری گێلۆکەبێت، بۆ چل ڕۆژ لەبنمیچی خانووەکە هەڵتدەواسم.

بۆبی هەناسەی هاتەوەو گوتی:

- باوابێت، ڕێگایەکی تر هەیە، بەلام من بەرپرسیار نابم لەوەی ڕوودەدات، دەتوانین شەیتانێکی جوولەکە ئامادە بکەین، بیرەوەری شوێنە گەرماوزەکە ئامادە بکات، بیگێڕێتەوە سەر وێنەو بەچاوی خۆتان بیبینن.

لویب بەتوورەییەوە گوتی:

- هەی هەرماس.. شەیتانێکی تر.

بۆبی بەیەکلاکەرەوەیی گوتی:

- ڕێگایەکی تر نییە، یا چل ڕۆژ ڕێڕەوان دەبن.

لویب پرسیاری لێکرد:

- ئەوە چ شەیتانێکە؟

بۆبی بەشپرزەییەوە گوتی:

- دیبۆک.

لیۆبۆڵد بەسەرسوڕمانەوە قسەی لەتەکا کرد و گوتی:

- دیبۆک.. ئەی ئەفرەتی بەردەوام خەڵکی ئەو دیبۆکە دەردەکەن، کەس ئەو شەیتانە ئامادە ناکات.

دوویراکە لەڕێکخراوەکەدا کاریان لەتەک شەیتاندا دەکرد، دەیانزانی شەیتان ناتوانێت ئازاری بنیادەم بدات، وەلێ هەندێ شەیتان لەبارودۆخی تایبەتدا دەتوانن، وەك ئەوەی ئاگر بنێنەوە، هەرچی دیبۆکە چەشنێکی ترە لەشەیتان.

لیۆبۆڵد گوتی:

- با وابێت، بەڵام ئاگاداری کەللەی سەرت بە، من دەست ناپارێزم، کۆمپیوتەرەکە دەکەمەوە، تا ئەوەی لێرە ڕوودەدات ڕیکۆردی بکەم.

لیۆبۆڵد کۆمپیوتەرەکەی هەڵکرد و کامێراکەی دابەست، هەرسێکیان لە ئامادەباشیدا بوون، بۆبی بەزمانی عیبری کۆن دەستی بەخوێندنەوەی دەقێك کرد، هیچ شتێك ڕووی نەدا، وەلێ گەرماوزە لەو شوێنەدا کەوتە بەرزبوونەوە، تا نێوچەوانی هەرسێکیان عارەقەی کرد، لیۆبۆڵد تەماشای

بینـدەری کۆمپیوتەرەکـەی دەکرد، کەهێشتا ساف نـەببوو، لـەپڕ وێنەکـە بەسەر کامێراکەوە کەوتە لەرینەوە.

بۆبی بەدەنگێکی کزتر گوتی:

– ئەوە ئامادە بوو.

لیۆبۆڵد لەپەخشەکە شتێکی بینـی، لەناوەندی شێواندنی وێنەکـە، ترسـێك ئامبـازی بـوو، تـەماشـای دەوروبـەری خـۆی کـرد، گەرمەوزەکـە خـەریکبوو عـەقڵی لەدەسـت بـدات، تەنانـەت بەرچاویشـی ڕەشکەوپێشـکەی کـرد، وای هەسـت دەکـرد بەوای گەرماوزەکەوە شتەکانی ناو ژوورەکە لـە کەلوپەلـەکان دەبن بەهـەڵم، وێنەکـە بـە بـەر چـاویەوە شـێوا، دواتـر زەویەکـە گـۆڕا، ئـەو زەویـەی ژوورەکـە نـەبوو، هـەموو شـتێك لەژوورەکـە داکـەوت، لیۆبۆڵـد لـەو ژوورە بێجگـە لـە پیاوانگـەلێك بەجلوبـەرگی عارەبییـەوە و مێـزەر بەسـەر قەریاڵغییەکیان دروست کردبوو، هیچی تری نـەبینی، تەنانـەت شـوێنێك بـۆ دانیشـتنی خۆیشـی نـەبینی، بـەدووی بـۆبی و لویـب گـەڕا، کەسـیانی نەدۆزییـەوە، لیۆبۆڵـد لـە قەرەباڵغییەکـەی عارەبـان کـە چـوار مشـقی لێـی دانیشـتبوون، پیـاوێکی ڕیـش چـەرموویان لەپشتی خۆیانـدا شـاردبووەوە، ئـەویش( ئەحمـەدی کـوڕی عـەلی ئـەلبۆنی)بوو، کـە بـەهێزترین جادووگـەری سەردەمی خۆی بوو، بەدانیشتوانەکەی گوت:

– ئەوەی لەزانست هەیتمان، ئەوەیە کە عیسا مردووانـی پـێ زینـدوو دەکردەوە، (موسـا)ش دەریـای پـێ شـەق دەکـرد، تـەنها زانسـتی ڕفتارکردن لەبووندا بە ئەولیاکانە، ئەو زانستەی نادیار دەردەخات.

یەك لەپیاوەکان شتێکی گوت و ئەلبۆنی تەماشای کرد وگوتی:

– ئەو فانییە چی دەڵێت؟

یەکێکی تر گوتی:

- دەڵێت کە لەئادیاری ئازانێت، خودا نەبێت.

ئەلبۆنی بەزمانێکی شارەزا گوتی:

- بەڵێ بێجگە لەخودا کەس ئادیاری ئازانێت، وەلێ بانە ڕۆژ هەموو کەسێك بۆی دەردەکەوێت، ئادیار بانەڕۆژ نییە، تۆ چاك بزانە هەموو شتێك لەزانستی خودادا ڕوویداوە، خودا بانەڕۆژی نییە، هەموو بانەڕۆژێك لای خودا ڕابردووە، کاتێ خواکەت دەڵێت ئادیاری دەزانێت، مەبەستی ئەوە نییە بانەڕۆژ دەخوێنێتەوە، بەلکو ئادیاری دەزانێت، ئەوەش تەنها تایبەتە بەخودا، نهێنی جیهانی باڵای خواوەدی کە بنیادەمی فانی نایزانێت، ئەوە هەر خودا دەیزانێت.

وێنەکە لەبەر چاوی لیۆبۆلد شێوا، دوای کەمێك گەڕایەوە، کۆمەڵەکەی دەوری ئەلبۆنی قەرەباڵغتر بوو، (ئەلبۆنی)ش عاباکەی بەدارەوە کرد، لەپڕ لیۆبۆلد (بۆبی و لویب)ی بینی، وەك بوونەوەری سووربەوی گەردەوزە دەرکەوتن، ئەلبۆنی لەجێی خۆی سڕبوو، ئاوڕی لەسێ کەسەکە دایەوەو گوتی:

- هاتن، مایەی شانازییە لەنێوتانا بوونەوەرێك هەیە دەیناسم.

ئەلبۆنی ڕێك تەماشای (بۆبی فرانك)ی کرد، کە لەپڕ بەزمانی عەرەبی درووست کەوتە قسان، هاوڕێکانی سەریان سوڕما، بە ئەلبۆنی گوت:

- هاتین بۆ لات تا پێشبینی خاوەنی یەکەمین نهێنیمان بۆ ئاشکرا بکەیت، ئەو دووانەی لەتەختەگڵی زومردەکەتا ناویان نوسراوە، ئەوەی خودا تایبەتی کردی بە ئاشکرا کردنیان.

ئەلبۆنی دەیزانی مانای ئەو بوونەوەرە سووریاوانەی گەرمە وزە چییە، هەر بەخۆی ئەو شتەی داهێناوە، بۆ ئامادە کردنی ڕوحەکان، ئەلبۆنی خۆی دایە سەر گۆپالەکەی و گوتی:

– هەموو شتێك لەبووندا بەوشە خولقێندراوە، هەر بەوشەش دەجوولێتەوە، وشەگەلێکی نوورانی و وشەگەلێکی زولمانی، یەکێکیان خێر دەنووسێت، ئەویتر شەڕ، هەرچی تەختەگلی زومردە وشە نوورانییەکانی تیا نووسراوە، کە دەقگەلێکی ژیرانەیەو نهێنییەکی تێدایە لەسەرووی باساکانی بوونگەرایی. ژیاننامەی ئەو دووانەی تێدایە، کە زانستی شاراوەیان لابووە، ڕوو بەڕووبوونەوەیان داستانێك بوو، خامە بۆی نەنووسرا، ڕوحی خۆتانم بۆ ئازاد بکەن، دەچینە جیهانی زومرد.

ئەلبۆنی دەستی بەگێڕانەوەی داستانە سەیرەکە کرد.

***

# بەشی چوارەم

## تەختەگڵی زومرد

## ٦٠٠٠ پێشزایین _ ٥٦٠٠ پێش زایین

(( هەموو زاڵمێك زەواڵێكی هەیە ))

***

وەك كۆتری سپی دەستمان بەفڕین كرد، سۆسەی دەوروبەرمان دەكرد، تا چاو هەتەر بكات بیابان بوو، چیای تێدا نەبوو، گردۆلكەكانی (لم) لەیەكدەچوون، ئەوەی لای ڕاستمان هیچی لەوەی لای چەپمان جیاوازی نەبوو، تا لەناوەندی بیابانەكە شتێكما لێدەركەوت، كە مەحاڵبوو لەو بیابانەدا هەبێت، زەوییەك لە شێوەی بازنە و كۆشككەلێكی تیا بنیات كرابوو، لەناوەوە بازنەگەلێكی تر بینای فرە گەورەی وەك تەلاری تیا بینا كرابوو، لەنێوان هەر بازنەیەك و بازنەیەكی تردا ڕووبارێكی ڕوونی شێنباو، شتێكبوو باوەڕت نەدەكرد لەو سەردەمەدا بینای وا كرابێت، ئەوێ (هینان)بوو، ناوجەرگەی ئەتلانتس، جوانترین شارێك چاوی بنیادەم بینیبێتی.

گرتەكە بە لاری بەرەو خوارەوە دایگرتین، وەك ئەوەی بیەوێ لەناوەندی شارەكە دامانگرێت، چاومان بەشارەكە و بەهەموو وردەكارییەكانی گێڕا،

قووچکەو تەلار و ڕووبار و ناحیەی ناویزان سەرەنجی بردین، دواتر هاتینە ناوەندی شارەکە، کۆشکێکی مەرر لەبەرامبەرماندا قووت بووەوە، دەنگوت لە دوڕ و گەوهەر بینا کراوە، گرتەکە ڕوو بە ڕووی کۆشکێکی تری کردینەوە، ئەوەندە لێی نزیك بووەوە، وەختەبوو بەر کۆشکەکە بکەوین، ئەوجا بۆ لای پەنجەرەیەکی گەورەی کراوەی کۆشکەکە لاری کردینەوە، هەر ئەوەندەی چاو پرووکاندنێك و پیا تێپەڕین، ڕێك خۆمان لەناوەوەی کۆشك بینیەوە، هەموو ناوئاخنی کۆشکەکە بەهادار بوو، لەپڕ گوێمان لە خەنینەوەی پیاوان و ژنان بوو، بە زمانی سریانی قسەیان دەکرد، گرتەکە مێوری کردینەوە، تا لەباڵەکۆنێك کە دەیڕوانییە سەر گۆڕەپانێکی گەورە گیرساینەوە، ژنان و پیاوانی زۆرمان بینی، بەجلوبەرگی سەیرو سەمەرەوە بوون، پێشتر ئەو شێوە پۆشاکەمان نەبینیبوو، یەکێکیان تاجێکی بەنرخی بەسەرەوە بوو، کە بریتی بوو لەدوو باڵی کراوەی بازێك. هەر لەوێ چاومان بە زەلامێك کەوت، دەمانناسی، زۆر چاکیش دەمانناسی، لەنێو ئاپووڕای خەڵکەکە پیرەمێردێك بەلامانەوە ڕوخساری هیچ نەگۆڕابوو، کین.. تاوانباری یەکەم، دیاربوو دڵی زۆر خۆش بوو، لەقاقای پێکەنینی نەدەبڕییەوە، وا دیارە بیرم چوو پێتی ڕابگەیێنم، ئەوێ شارەکەی (کین) سەیرو سەمەرانە بنیاتی کردبوو، کین ئەندازیارێکی بە ئەزموون بوو، ناوەرت نەدەکرد لەبیابانێکی وشك و برینگ و لەخاکی(نوود) کە نەناوی نیابوو نە سەوزایی ئەو شارە درووست بکات، ئەو شۆخ و شەنگەش کە تاجەکەی بەسەرەوە بوو(نیزیس)ی ژنەکەیەتی، بەڵێ (نیزیس)ە، ئەگەر لەبیرت بێت بە کراسێکی سوورەوە لەسەر دیواری پەرستگاکان وێنەیان بۆ کێشاوە

- کین.. برای ئازیزم لەم خەوەت نابیتەوە؟ بەدرێژایی ژیانی خۆم کەسێکم نەبینیوە هەموو ساڵێ ئاهەنگ بۆ ڕۆژی لەدایکبوونی بکات.

دەنگێک وەک فیشکەی مار لەشوێنێکەوە هات، لەشوێنی دەنگەکەمان ڕوانی، لەشێوە و ڕوخساری و جەستەی چاومان ئەبلەق بوو، بالأزراف، پرچێکی سوورباوی درێژ و جەستەی سەرتاپا تووکم، تەنانەت مووی پێستیشی سوور بوو، دیمەنێکی تا بڵێی ناشرین، ئەویش (ست)بوو، یەکێک لەبراکانی کین و کوڕە گەورەی ئادەم و پاشای شاری (شیلۆن)ی باشووری عەدەن، کین بزەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- من یەکەمین زایندەم لەم جیهانەدا، ئەگەر من ئاهەنگ نەگێڕم بەم بۆنەمەوە، کێ دەیگێڕێت؟

ست.. بەدەم بزەخەنەوە گوتی:

- منیش ئەی زایندەی یەکەم بەسوپرایزێکەوە هاتووم.

کین بەچاوی پرسیارەوە لێی ڕوانی، ست.. دەستی بەچەپڵەلێدان کرد، پیاوانگەلێکی بەهێز بەسەر شانیانەوە شتێکی بەهاداریان هەڵگرتبوو، نەتدەزانی سندووقە یا تابووتە، لەسەر زەویەکە دایاننا، کین کەچاوی پێکەوت سەری سوڕما، لەتەختە داری بەهێزو نەخشێنراو بە ڕێڕو چاوێکی بە کل ڕەشکراویشی بەسەرەوە وێنە کراوە. ست بەدەستی خۆی تابووتەکە یا بڵێین سندووقەکەی هەڵدایەوە، ئەرەی لەناوەوە بوو لەدەرەوە جوانتر و دڵگیرتربوو. خودی (ست) بۆ خۆی چووە ناو سندووق و تابووتەکەو بزەیەکی بۆ کین کردو پێی گوت:

- کین.. وەرە بچۆرە ناویو چاوێ بەناویدا بگێڕەو ماسای نەخشێنراوەکەی ناوەوەیم پێ بڵێ.

کبی بەحەپەساوییەوە چەند هەنگاوێك لەسندووقەتابووتەکە نزیکەوە بوو، ئەوجا چووە ناو تابووتە سندووقەکە، چونن ئەوەی بەبالای ئەو درووست کرابێت، هەرچی (ست)بوو بالای کورتربوو. ما کبی لەناو تابووتەسندووقەکە تەماشای نووسراوەکان بکات و دەست بەخوێندنەوەی بکات، هەر کە لەماناکەی حالی بوو، تابووتەکە بەسەریا کلۆمدرا، ئەویش بەوای کارێکی میکانیکی ئاڵۆز و هەستیار بۆ ئەو مەبەستە درووست کرابوو، ئامادەبووانی هۆڵەکە واقیان ورما، گوێت لەمیچ دەنگێك نەدەبوو، تا ست دەستی بەچەپڵەلێدان کرد، ئەوجا پیاوەکانی دەستیان بردو حەنجەری قەدیان هەلکێشاو کەوتنە وێزەی ئەوانەی بەدیار (کبی)ەوە بوون، بەڵێ ئەوە یەکەمین کودەتا بوو لەمێژوودا ، زۆر بەئاسانی و بێ کێشە و بلەزیش ئەنجامدرا، کۆتایی بە پاشایەتی (کبی) هات، کە پاشای شاری (هینان) بوو، ئەوجا سەردەمێکی نوێ لەشەڕانگێزی و لەسەردەمی (ست)دا هاتە کایەوە.

***

## لەم جیهانەدا گۆڕی پاشاکان گەورەترین ئامۆژگارییە

خەڵکی هینار داربازی (کبی)یان بەچاوی خۆیان بینی، لەڕووبارەکەدا چەپ و ڕاست بەدەم ئاوەکەوە دەڕۆیشت، (ئیزیس)ی شاژ بە بێ تاجەکەی سەری و بەدەم گریانەوە دووی داربازەکەی کبی کەوتبوو، کە چاوی بەتابووتەکە کەوت لەم ڕووبارەوە بۆ ئەوی تر دەڕوات و لەشار دەردەچێت، ترسی لەدەستچوونی مێردەکەی بوو، یەك لەپیاوەکانی (ست) کە لەپەلەکۆنەکەوە دیقەتی دەدا، گوتی:

- پاشا.. بۆ ئەویش ناکوژین؟

- با، دەمەوێ کوڕەکانی ببینن کە بێ تاج دوای پاشایەک کەوتووە، کە لەسەر زەوی نەماوە.

بەڵێ.. ئیزیس شاژن و دایەگەورەیان بوو، ئەگەرچی کین بۆ خاکی (نوود) نەفی کرا، وەلێ (ئیزیس)ی ژنی لەتەکیدا بوو، هەر کە کوڕو کچێکیان بوو، بۆ بەفەرمانی خودا لەیەکیانی مارە کرد، تا کوڕو کچەکانی لەیەک مارە بکات، کوڕەکانیشی هەر وەک باوکیان کرد، تا بوون بە سێ ملیۆن کەس، ئەمە لەماوەی نۆسەد ساڵ ڕوویدا، هەر هەموشیان حەرامزادەو لەشاری مینار ئاکانجی بوون. پیاوەکە بە (ست)ی گوت:

- پاشا.. ڕەنگە ئەوان داربازەکە بکەنەوە؟
- لەم سەر زەوییە بەهیچ ئامرازێک بۆیان ناکرێتەوە، وامدرووست کردووە، هەر بۆخۆم دەتوانم بیکەمەوە، بەدەستی خۆم درووستم کردووە.

داربازەکەی کین بەدەم ئاوەکەوە ڕۆیشت، تا گەیشتە دەرەوەی شار، دواتر هەر ڕۆیشت تا گەیشتە یەکتاری گشت ڕووبارەکان، لەوێشەوە دەڕوات تا دەگاتە ئۆقیانووسی ئەتلەنتی.

هیچ کات لەو ڕووبارانە لەمینار بوونیان بۆ نەبووە، کین و منداڵەکانی بیریان لێداوە، تا بەناو گەشتوون، جۆگەلەی بازنەییان بەدەوریدا درووستکردووە، دواتر کەلێنێکیان لە شەم درووست کردووە، ئاوی سوێریان پێ پاڵاوتووە، تا بەو شێوەیە ئاوی سازگاریان دەست کەوتووە. کین عەقڵێکی بێ ئەندازەی هەبووە، وەلێ ئەمڕۆ عەقڵی لەنێو ئەو سندووقە کلۆمدراوە هیچ بڕ ناکات، ناچار بە خواستی ئاوەکەوە بەرەو ئۆقیانووس دەڕوات نومەتەکەی کە هەر هەموویان کوڕو کچی ئەوبوون، بەدووی داربازەکەدا ڕایان دەکرد، ئەوەی لێی ترسابوون، داربارەکە بگاتە ئۆقیانووس، ئێدی تا هەتایە ون دەبێت.

وەختەبوو داربازەکە بەو دەربەندە بکات، کە ئەمڕۆ بەناوی دەربەندی چیای تاریق ناسراوە، ئەو سەردەمە بیابان بووە، دواتر ڕووباری کین پێیا ڕۆیشتووە، وەلێ خودا ویستی داربازەکە لای ستوونەکانی هیرقل لەنگەر بگرێت. داربازەکە لای بەرزاییەکانی تاوێری سەناوبانگی دەروازەی ئۆقیانووس گیربوو، ئیزیس و خەلکەکە لێی کردبوونەوە، ئیزیس نەیدەزانی چی بکات، هەوڵێکی زۆریاندا بیکەنەوە، وەلێ بێ سوود بوو، بانگیان لە کین دەکرد، گویان بەداربازەکەوە دەنا، هیچیان نەدەبیست.

ئەو ڕۆژە بەسەر چوو، ڕۆژی دواتر برێکی زۆر لەخەلکەکە گەڕاسەوە، ئیزیس لەگریانی خۆی نەکەوت، وەلێ داربازەکەی جێنەهێشت، بیری کردەوە کەسێکی زیرەك لەو شارەی تەنیشتیان بانگ بکات، ئەو پیاوە هات، تا لای دیوارەکەی داربازەکەی سەح کردەوە، بەر لەخۆرئاوابوون، پیاوەکە داربازەکەی کردەوە.

***

## هەر کەسێك بوویت لەسەر تەختی پاشایەتی، پێمانڕابگەیەنە تام و چێژی خۆڵی گۆڕەکەت چۆنە

کین لەناو داربازەکەیەوە دەیڕوانی، هیچ پەلێکی نەدەجوولا، ئیزیس بەدیار داربازەکەوە فرمێسکی بۆ دەڕشت، دوای کردنەوەی داربازەکە، پیاوەکان دەستیان بۆ برد لەداربازەکە دەریبهێنن، هەستیان بەو کارەساتە کرد، کە ڕوویدا، سەرتاپای جەستەی کین لەگۆ چووبوو. ست حوکمی کرد و زوڵمیشی کرد، ئەوەی یەکەمی (کین)ی قڕ کرد، ئەوە یەکەمین کوشتاری بەکۆمەڵبوو

لەمێژوودا، بۆ ئەوەش قوربانی کرد، تا کڵدەنای بەسەرا بەکەن، تەنها (کین و ئیزیس)ی هێشتەوە تا چێژ لە زەلیلبوونیان ببینێت.

ئەوە لەدوا سەدەی ژیانی ئادەم و حەوا دا ڕوویدا، وەڵ هینار لێیان دابڕابوو، بەو ئاوایەی ئادەم ئاگاداری کردبوونەوە تێکەڵ بە (هینار)ییەکان نەبن، بەوای ئەوەی ئەوان بەحەرامزادەیی ئەوەیان خستووەتەوە، سەردەمی خوێناوی دوای گەیشتنی (ست) بۆ حوکمی هینار تێپەڕی، ئیزیس و مێردە لەگوچوەکەی خۆیان لەبەر چاوانی بەزەیی کوڕەکانیان شاردەوە، دواتر ئیزیس کوڕێکی بوو، دوای ئەوەی کین چراریەلی لەگو چووبوو، ئەوە دوا ئەوەیان بوو، ئیزیس بەچاوی پڕ لە ئاوات و ئومێدەوە لەکوڕپەکەی دەڕوانی، حوکم لەدەسەڵاتی (ست) بستێنێتەوە.

منداڵەکە ڕوخسارێکی جودای هەبوو، پرچ خەنەیی، چاو کەوەیی، پێستی سپی، دایکی ناوی (جینۆن)ی لێ نا. جینۆن هەڵسوکەوتیشی وەک ڕوخساری جودا بوو، بێدەنگ و کەمدوو، هەست سارد. دووسەد ساڵ لەسووکایەتی تێپەڕی، دواتر ست بڕیاری دا کیم و ئیزیس بکوژێت، پیاوەکانی وەک گورگ هێرشیان کردە سەریان. لەحەساری دەرەوەی ماڵەکە کین پاڵی دابووەوە، پیری و پەککەوتەیی پێوە دیاربوو، کە پیاوەکان دەرکەوتن، بە پێکەنینەوە لێی نزیکبوونەوە، ئەودەم سەرتاپای ژیانی وەک فیلمێک هاتە بەرچاوی، بیری (هابیل)ی کردەوە، فرمێسک بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە، چاوی لێبوو، یەک لەپیاوەکان داچەمیەوەو بەردێکی گەورەی هەڵگرت، کین دڵەکونەی تێکەوت، چاوی لەژنەکەی گرپدا، یا لەکوڕەکەی، کەسی لێوە دیار نەبوو، گوێی لێبوو یەکێ لەپیاوەکان گوتی

- چۆن براکەی بە بەرد کوشت، ئێمەش هەر بە بەرد دەیکوژین

لەنێو سێبەری دارەکان جینۆن وێستابوو، تەماشای دیمەنی شالاویردنەکەی دەکرد، بەو ئارابەش گاڵتەیان بە باوکی دەکرد و تفیان لێدەکرد، بە بەرد دەیانترساند، سووکایەتی بەما پێی ئەکەن، جینۆن لەجێی خۆی نەجوولا، چون بەیەکەرێک جوولەی نەبوو، پیاوەکان (کین)یان بەردباران کرد، سەروگوێلاکی (کین)یان شکاند، خوێن بە بالایدا هاتە خوارەوە، جینۆن هەر نەجوولا، پیاوەکان بەوەشەوە نەوەستان و بەدووی (ئێبزیس)دا کەوتنە گەڕان، تا بەخۆی کەوتە بەردەستیان، ئێبزیس نەیدەزانی چی قەوماوە، جوانییەکەی نەژاکابوو.

یەک لەپیاوەکان گوتی:

- شاژنی قەدو بالا شۆخ و شەنگ، کورپەیە دەبێت لەش و لاری شاژن چۆن بێت؟

وەک گەلەگورگ شالاویان بۆ برد و هەرچی لەبەردا بوو دایاندڕی، یەک بەیەکیان ئەتکیان کرد، ئەم لەباوەشی دەگرت و ئەویتر ڕایدەپسکاند و لەباوەشی خۆی دەنا، تاڵە موویەک چییە لەجەستەی جینۆن قیتەوە نەبوو، دایکە بەرگری لەخۆی کرد، جینۆن ئەمجارە جوولەی کرد، وەلێ بۆ لای دایکی نا، تەواوی شوێنەکەی جێهێشت، زۆری نەبرد خەڵکەکەی کۆبوونەوەو تەماشای کارەسات و خوێن و ئەتک کردنیان دەکرد.

***

# لەگەمەدا کێ یەکەم شوێن بگرێت براوەیە

کۆمەڵێک لە بیابانی وشک و برینگ و شەرنگی ئەمووسنەچاو دوای یەک کەوتبوون و دەڕۆیشتن، لەخاکی (بەککە)وە بەرەو ئەتلانتس بەڕێکەوتبوون، لە زیارەتی ماڵی پیرۆز دەگەڕانەوە، پێغەمبەرێکی پیریان لەنێوەندا بوو، ناوی (یارد)بوو، خۆیان بە ڕۆڵەکانی خودا دەچوواند، خودا پەیمانی پێدابوون، دوای ئەو گەشتەیان بیانخاتە بەهەشتی خاکی عەدەن، کە جێگە لە ڕاستگۆیان و پێغەمبەران کەسی تری تیا ئیشتەجێ ناکات، لەدونیادا کەس وەک ئەوان بەختەوەر نەبوو، ڕوخساریان ڕەزامەندی و خۆشی و ئۆقرەوخۆڵی گەشتەکەیانی پێوە دیاربوو.

لەناکاو ڕۆڵەکانی خودا بەوای دەنگە دەنگێکەوە لەڕۆیشتن وەستان، بەشپرزەیی لەدەورو بەری خۆیانیان دەڕوانی، تا چاو بڕی دەکرد گەردەلول بوو، کارەساتەکە ئەوەبوو، ڕێڕەو بەرەو ئەتلانتس لەکوێوەیە، شەویان بەسەرا هات، ترسیان لێ نیشت، بەوای ئەوەی ئەگەر ڕێگایان ونکرد، لەم بیابانە دەمرن، هەر هەموویان تەماشای ئەو گەنجەیان کرد، کە لەنێوانیاندا بوو

کوڕێکی سپییێست و پرچ ڕەش و بەخۆ، لەمێژوودا وەک عەقڵی ئەو ڕووی نەداوە، گەنجێکی فەرهەنگی لەزانستدا، ناوی(ئیدریس)ە، ڕوخسارێکی هەبوو، هەر کە تەماشات دەکرد، دڵنەوایی دەدایتێ ئیدریس یەکەم حەساوگەربوو، لە زانستی ئەستێرەکان و کەلووەکان، سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوەو لە ئەستێرەکان ڕاما، دواتر گوتی:

- من بێ ئەوەی خۆمتان لا ئاشکرا بکەم، ڕێنماکەرتان بووم، ئەگەر من بمرم، ئێوەش ڕزگار نابن.

پێغەمبەر یاد گوتی:

- ئەی ئیدریس زانست مەشارەوە، تەنها شەیتان زانست دەشارێتەوە.

ئیدریس تەماشای کردن و گوتی:

- ئەی رۆڵەکانی خودا، فریشتەکانی خودا، ئەگەر بە ئاراستەی دەستە راستدا برۆین، ئەوا دەگەینە رووباری فورات، کە لەخاکی (ئەتلانتس)ماندا دەردەچێت.

یەکێکیان گوتی:

- لای راست کوێیە؟

ئیدریس گوتی:

- تەماشای ئەستێرەکانی ئاسمان بکەن، ئەو حەوت ئەستێرەیەی لەسیلەی یەکدان و لە کەوگیری خواردن دەچن، بگەڕێن.

خەڵکەکە تەماشای ئاسمانیان کرد، یەکێکیان هاواری کرد، کە دۆزیویەتییەوە.

ئیدریس گوتی:

- ئەو ئەستێرە پرشنگدارەی بەرامبەر کەوگیرەکە دەبینن؟ ئەوە ئەستێرەی دەستە راستە، تا بەئاراستەی ئەو ئەستێرەیە برۆین، دەگەینەوە رووباری فورات.

خەڵکەکە دەنگیان لێ هەڵبڕی و کەوتنە ستایش کردنی ئیدریس و زانستەکەی، چەند رۆژێک بەدوویدا رۆیشتن، تا شتێک لەناوەندی بیابان رایگرتن، شتێک خستیانە دڵەراوکێوە، دەنگێک لەنەرە و هاوار دەچوو، دەیانناسییەوە، دەنگی(جیجان) بوو، زۆرترین بوونەوەری درندەو ناشرینی ئەو سەردەمە بوو، ئیدریس هاواری لێکردن.. بێدەنگ بن، ئاگاداریشی کردنەوە پشت لەو درندەیە نەکەن، ئەوجا بێ ترس بەرەو رووی ئەو

بوونـەوەرە ڕۆیشـت، کـە کەڵبـەکانی جـیڕ دەکـردەوە، ئیـدریس بەرامبـەری ڕاوەستاو سەری بـەرز کـردەوەو چاوی لەچاوی بـڕی، ئیـدریس سرووشـتی دڕندەکانی دەزانی، ئەگەر پشتی تێبکات، ئەوا حـەزی شـاڵاوبردنی دەبێت، ئەگـەریش بەرامبـەری بگرێـت، دەترسـێت، کـە تەماشـای چاویشـی بکـات، تووشی دڵەڕاوکێی دەکات، ما ئیدریس دەستی بەهاوار کردن کرد و چەپڵەی دەکوتی. بلـەز یـەك دوو هـەنگاوی کـردو پاشەکشـەی لێکرد، ڕێك ئـەوەی لەمێشکی (ئیدریس)دا بوو هاتە دی، دڕندەکە ترسا، پاشەو پێش کشـایەوە، تا لەچاو ونبوو.

ئیدریس داوای لێکردن پـەلـە لەڕۆیشـتن بکـەن، بـوونی دڕنـدەیـەکی وا مانـای ئەوەیـە ڕووبارەکـە نزیکـە، پێیـان لێ هـەڵگرت، تـا لەبەرامبـەریان شـینایی ڕووباری فوراتیان لێوە دەرکـەوت، بەرەبـەیان بـوو، لای ڕووبارەکـە لایانـدا، شوکرانەی خودایان کرد، وەلێ دیقەتی یەکتریان دا، دەبـێ بـەلای ڕاست یـا چەپی ڕووبارەکەدا بڕۆن، تا بگەنە زێدی خۆیان، کەسیان وەڵامیـان نـەبوو، ناچار پەنایان بردەوە لای ئیدریس ڕێنماییان بکات.

***

## خاوەن زانست تا هەتایە دەژێت، وەلێ هەموو زانستێك نا

بەژێر ڕووناکی مانگەشەوەکەوە ڕۆنیشـستبوون، تیشکی مانگەشـەوەکە قـژە سپییەکەی دەبریقاندەوە و دیمەنێکی جوانی وێدابوو، جینـۆنی منـداڵ بـەو ئاوایەی خەڵکی بەوە ئاوزەدیان دەکرد، کە ڕوخساریشـی لەمنـداڵی دەکـرد، کـەس لێـو بـەبزەو پێکـەنین نـەیبینیوە، وەلێ بـەکۆدەنگی خەڵکەکـە گوایـە

خاوەن عەقڵێکی وابووە، لەمینار هاوتای نەبووە، شتی زۆر سەیریان لێ بینیبوو، بەردەوام خەریکی داهێنان بوو، مەخابن تەنها داهێنانی خەراپی دادەهێنا، ئەگەر لەم جیهانەدا کەسێك هەبوایە کە داهێنانی چەك مێی ئەو بێت، ئەوا (جینۆن)ە، ئەو خەنجەرانەی دایك و باوکی پێ کوژرا، داهێنانی ئەو بوو، هاوڕێتی کەسی نەدەکرد، بۆیە هیچ هاوڕێیەکی نەبوو، بەدرێژایی کات بێدەنگی لەناخیدا بایەکی سەرد بوو.

ئەو شەوە جینۆن لە مانگی پڕی چواردە ڕامابوو، لەپڕ و بۆ یەکەمجار لەخولقاندنی جینۆن دا و لەسەر ئەم زەوییە، چاوەکانی بەسەرسوڕمانەوە کرانەوەو هەستیکرد مووی لەشی قیتەوە بوون، گوێی لەدەنگێك بوو، کە هیچ بنیادەمێك ڕۆژێ لەڕۆژان گوێی لەو دەنگە نەبووە، دەنگێکبوو لەهەموو لایەکەوە دەهات.. جینۆن ڕاستەوەبوو، چاوی بەچواردەورا گێڕا، دەنگەکە ناخی هەژاند، تا دەنگەکە خۆی بەناخیدا کرد، فرمێسکی لەچاوی هانی، ئەوە ڕابردوویەکبوو، هەرکەسێك لەخەڵکی هینار بیبینیایە باوەڕی نەدەکرد، جینۆن ئەو باردە سپییە زوقماویە بوو، هەر کەسێك ئەو دەنگەی ببیستایە کە ئەو بیستی، لەهۆش خۆی دەچوو، ئەو گەنجە بنیادەمە بۆ یەکەمجاری بوو لەمێژووی نەوەکانی ئادەم دا گوێی لەمۆزیك بێت.

جینۆن بەدەم ڕێوە گوێی لە مۆزیکەکە بوو، ڕوحی دەبووژانەوە، دەیویست سەرچاوەی مۆزیکەکە بدۆزێتەوە، سەداکە لەهەموو لایەکەوە دەهات، وەختەبوو شێت بێت، تا لەپڕ لەگۆشەیەکی چاویەوە سێبەرێکی بینی، زۆر بەخێرایی ونبوو، جینۆن تفەکەی قووتدا، ئاوازەکەش تا دەهات بەرزتر دەبوورەوە، لەناکاو بوونەوەرێك لەبان دارەکانەوە بەریووەوە بەردەمی، بوونەوەرەکە بنیادەمێك بوو، جینۆن لەپشتەوە بینی و تیشکی مانگەشەوەکە بەسەریا دامات، تەنها تارماییەکی دەبینی، دەنگی ئاوازەکە

دەتگوت لەجەستەیەوە دەردەچێت، بوونەوەرەکە لای لێ کردەوە، جینۆن دەموچاوی بینی و نەیبینی، دواتر تەواوی جەستەی خستە ڕوو، پرچێکی ڕەش و درێژ، دەموچاوێکی سپی کەمێك بەلای گەنمڕەنگیدا دەیڕوانی، نیگاکەی ڕوحی دەبڕی، قامیشێکی سەیری بەدەستەوە، کاتێ دەینایە سەر لێوی، دەنگێکی لێوە دەردەچوو، ناخی جینۆنی دەهەژاند، هەر کە لەدەمی دووری دەخستەوە، دەنگەکەش نەدەما، جینۆن پێیگوت:

- تۆ کێیت؟

پیاوەکە بەرسڤی داوەو گوتی:

- تۆ دەمناسیت، وەلێ نەمتبینیوە، لەوەی فانی کەس منی نەبینیوە.

جینۆن بەزەحمەت تفەکەی قووتدا، دان بەخۆ گرتنەکەی بەوای ئاوازەکەوە لەدەستدا، حەزی دەکرد زیاتر گوێی لەو ئاوازخوانییە بێت، پیاوەکە هێدی هێدی لێی نزیکبووەوە، قسەیەکی چرپاندە گوێی و گوتی:

- ئیبلیس.

هەر ئەوەندەی پێگوت، پێویستی بەوە نەبوو هیچی تری پێبڵێت.

***

## کە شەیتان دەرکەوت، ئەوە کێیە بۆی داناچەمێتەوە؟

جینۆن لە شەیتانەوە شتگەلێك فێربووبوو، بنیادەم لەشەیتانەوە فێری شمشاڵ ژەنین بوو، دواتر جینۆن بۆ خۆی کەوتە دروستکردنی، وەلێ لەبەرامبەر کەس بەکاری نەدەهێنا، هەر لەشەیتانەوە فێری دروستکردنی دۆشاوێك بوو، عەقڵی دەبرد، ناوی (مەی) لێنا، خەڵکی پێشتریش عەقڵ

لەدەستدانیان دەزانی، یا چاکتر وایە بڵێین مەستبوون، ئەویش لەخواردنی گوێزەباوەوە بوو، تامێکی تاڵی هەبوو، وەڵێ مەستی دەکرد. جینۆن دەیزانی شەیتان لەخۆڕا ئەو زانیارییانەی ناداتێ، هەڵبەتە شتێکی بۆ بەرامبەری داناوە، جینۆن جارێ پێیگوت:

- ئەی ئیبلیس بەگەندەڵی ڕازیت؟ خاکی هینار ئەمڕۆ گەندەڵترین ڕۆژیانە، سەردەمی ست سەردەمێکی خوێناویە، چ پێویستت بەمنە؟

جنۆکە بەساڵاچووەکە بەعەقڵی شەیتان بەرسڤی دایەوە.

- گەندەڵی دەسەڵاتداری زاڵم، هەق لەدڵی میللەتدا زیاتر و زیاتر مەزن دەکات، وەڵێ من دەمەوێ هەر هەموو میللەت گەندەڵ بن.

جینۆن بەشتێك لەبیرکردنەوە تەماشای کرد، شەیتانەکە درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

- جینۆن ئێمە دەزانین چی لەناو دڵتایە، تۆ چەکت درووستکرد، چونکە چاوەکانت بە پەرۆشەوەی ئەوەن خەڵکەکە یەکتر بکوژن، حەزت بەخوێن ڕشتنە، بۆیە دەبێت هەر تۆ ئەتڵەنتس بگریتە دەست، پەیمانی من بۆت پەژیوانی تێدا نییە، زانیاری وام لایە دەتگەیێنێتە فڕین بە ئاسمانەوە.

جینۆن کەمێك بیری کردەوەو بەدڵ گوتی:

- سبەی من دەچمە سەر عەرشی ست.

شەیتان بەسەرسوڕماوییەوە تەماشای کرد، ئەو هەرزەکارەی تازە مووی لێهاتووە، بەو پەڕی بڕوا بەخۆبوونەوە قسە دەکات، هەڵەی کرد کە لەم تەمەنە بچووکەیدا هەڵیبژارد؟ جینۆن بە بێدەنگییەکەی دوور کەوتەوە. ڕۆژی دواتر شتێکی سەیری کرد، جینۆن هەواڵێکی لەناو خەڵکیدا

بلاوکردەوە، کوڕێك لە ڕەچەڵەکی کین دەرکەوتووە، ئەوە دوا کورپەتی، هەر ئەو کوڕە بووە چەکی دامێناو و لەناو شاردا تۆڵەی پێدەکرێت، هەندێ لەخەڵکەکە ئەوەیان دەزانی، وەلێ ئاشکرایان نەکردبوو، ئەمێستا هەواڵەکە گەیشتووەتە هەموو گەڕەکێك و کۆڵانێك و تەنانەت هەموو ماڵێکیش، هەواڵەکە گەیشتە ست، ست جەندرمەکانی بەردایە ناو شار، وەك کەمتیار بەدوای جینۆندا دەگەڕان، تا باڵبەستی بکەن و ملی بپەڕێنن. کاتێ خۆر لە ئاوابووندا بوو، جەندرمەکانیش بەوای ماندووبوون و تونێتیەوە شەکەت ببوون، مەیگێڕی کۆشك خواردن و خواردنەوەی بۆ ئامادە کردن. بەر لەتاریکبوون، لەلای کۆشکی پاشایەتی ست گوێی لەدەنگێکبوو، وەك ئەوەی لەبەهەشتەوە بێت، دەرچووە حەساری کۆشکەکەو کەمتیارەکانیشی بەدواوە دەرچوون، تەنها هەرزەکارێکی بینی، عابایەکی ڕەشی بەسەرەوە بوو، لێیان نزیك بووەوەو دەنگێکی لێوە دەردەچوو. ست.. ما گوێ لە ئاوازی شمشاڵەکەی بگرێت، وەك ئەوەی گەمە بەهەستی دڕندەییەکەی بکات، پیاوەکانی دەوری سەرسام بوون، ست سەری باداو بەتووندی تێیخوڕی:

– ئەی غەوارە.. تۆ کێی؟ ئەو دەنگە چییە؟

جینۆن لەپشت عاباکەیەوە دیقەتیدا و گوتی:

– ئەمە دیارییە بۆ گەورەم.

ست.. شمشاڵەکەی لێ وەرگرت و دیقەتی کونەکانی دا، جینۆن گوتی:

– گەورەم.. بیخەرە دوو توێی لێوەکانت و (با)کەی ناوی هەڵمژە، ئەو سیحرەت بۆ دەردەکات.

ست (با) کەی ناو شمشاڵەکەی هەڵمژی، هیچ ڕووی نەدا، جینۆن لەپشت عاباکەیەوە بزەخەنەیەکی بۆ کرد، دواتر گوتی:

- گەورەم بەهەموو هێزتەوە هەڵیمژە.

ست.. تا توانی (با)کەی ناو شمشاڵەکەی هەڵمژییەوە، دەمی داچەقاو چاوەکانی سپی بوون. شمشاڵەکە بێ مۆ نەبوو لەو دۆخەی پاشا تێیکەوت، جینۆن نووکێکی ژاراوی تیائاخنیبوو، نووکە کە لە قورگکی گیربوو، ست بە ئازارەوە کشایەوە، ئەوەندەی دەنگ تیا مابوو، بانگی لەپیاوەکانی کرد، لەهەموو لایەکەوە هاتن، وەلێ هەر هەموویان مەست ببوون و بەلادا دەهاتن، جینۆن شتێکی کردبووە ناو خواردنەوەکانیان، بەو ئاکامەی گەیاندن. ست بەتووندی هاواری کرد، میللەت لە لای شورای کۆشك کردببوونەوە، تەماشای ڕووداوەکەیان دەکرد، جینۆن خۆشترین ئاوازی دەچڕی، خەڵکەکە نەیاندەزانی تەماشای کوێ بکەن، دەسەڵاتێك لە گیانەڵاندایەو ، پیاوەکانیشی لارە لار دەهاتن و دەچوون، منداڵێك لەژێر عاباکەیەوە وای بەسەر هێنان، یا ئەو دەنگە خۆشە کە لەشمشاڵەکەوە دەردەچێت، چ سیحرێکە. دیمەنێکی سەیر بوو، جینۆن عاباکەی لەسەر خۆی لابرد، خەڵکەکە دەستبەجێ ناسیانەوە، گوتی:

- ئەمڕۆ عەرشەکەی کێن دەگەڕێتەوە دەست ئەوەکەی.

ست دوا هاواری لێ بەرزەوە بوو، خەنجەرێکی هەڵکێشا و بەهەموو هێزییەوە پەلاماری جینۆنی دا، جینۆن هەوڵیدا بکشێتەوە، خۆی لەخەنجەرەکەی بپارێزێت، لێ نەیتوانی، خەنجەرەکە بەر چاوی چەپی کەوت. ست هەناسەی لێ بڕاو کەوتە سەر زەوی و ڕوحی دەرچوو، ئەوساتە سەردەمی ستەمکاری سوور تەواو بوو، سەردەمی جینۆنی تاکچاو دەستی پێکرد.

***

# جەنگی عەقڵەکان لە ئەتلانتس دەستی پێکرد

لای ڕووباری فورات تەماشای خاکێکی پڕ لەسەوزاییان دەکرد، لێ وەك خاکی لای خۆیا نەبوو، هیچ خاکێك وەك خاکی خۆیان نییە، (ئیدریس)ی زانا پێیانیگوت:

– هاوڕێیان.. خاکی ئێمە لە خۆرئاوایە.

بەر لەوەی یەکێکیان پرسیاری خۆرئاوای لێبکات، ئیدریس لقەدارێکی هێناو لەناو لمەکەدا چەقاندی، بەوای خۆرەکەوە دارەکە سێبەری بوو، ئیدریس بەردێکی لەسەر نووکی سێبەرەکە دانا، دواتر پێیانیگوت:

– دەمێك چاوەڕوان بن، دواتر وەرنەوە لای لقە دارەکە، دەبینن سێبەری دارەکە جووڵاوە، بەردێکی تر لەنووکی سێبەری دووەمدا دانێن، بەردی یەکەم خۆرئاوایە، بەردی دووەم خۆرهەڵاتە.

ئیدریس بەوای زیرەکی و زرنگی خۆی ئەوە فێرببوو، فێری خوێندنەوەی پەرتووکی (ئادەم)یش ببوو، باوەڕی بەوە هەبوو زانست دەتکات بە مرۆڤ، دەتکات بەگەورەی سەر زەوی. ئیدریس چاودێرییانی کرد، بەردی دووەمیان دانا، بەدڵخۆشییەوە بۆ لای هاتن، ئەوەی فێری دەبێت، دڵخۆشت دەکات، ڕۆڵەکانی خودا بۆ لای خۆرئاوا بەڕێکەوتن، تا گەشتنە خاکی خۆیان، ئەتلانتس، لەدوورەوە بە چیا سەوزەکانەوە ناسیانەوە، بەدەشتایی و گیانەوەرە ماڵییەکانیان ناسیانەوە، گەیشتنە ناو شار، گەورەترین شار لە ئەتلانتس لەو خاکە بنیاتنرا، کە سێ ڕووباری هاوتەریبی لەبەمشتەوە پیا ڕەت دەبوون، هەر یەکە لەو ڕووبارانە لەیەکتر ڕوونتر و سازگارتربوون، خەڵکی شار بەرەو پێغەمبەرەکەیان ڕۆیشتن، حاکمەکەیان کە یارد بوو، دوای ئادەم حوکمی گرتە دەست، لەهەوڵێن گەشتی (بەککە) گەڕایەوە.

کاتــژمێرێك لەشــارەکەدا پشــوویانداو دواتــر بــەرەو چــیای(ماتاریمۆن) بەڕێکەوتن، لەوێ دەمێننەوە تا خودا فـەرمانیان وێدەدات بچنە بەهەشتی عەدەن، ژمارەیان سێ سەد یا زیار دەبوون. چیای ماتاریمۆن چیایەکی بەرز بوو، شاری عەدەن و خاکی (نوودی) لەیەك دابڕیبوو.

کاتێ گەیشتنە ترویکی چیاکە، لـەوێوە تەماشـای خـاکی (نوود)یـان کـرد، شــاری هینــاری سەیروســەمەریان بینــی، خــاکی خــوێن تیــا ڕژاو، بــەوای هاوسەرگیری حەرامەوە، نەیاندەزانی هینار هی (کـێن) نییـە وهی(سـت)یش نییە، ئەوە لاپەڕەیەکی قەمچکراوەو لاپەڕەیەکی ڕەشتری بۆ مەڵدراوەتەوە، لاپەڕەی جینۆن.

(یارد)ی پیرەمێرد لەنێویاندا دەڕۆیشت، گوتی:

- ڕۆڵـەکانم.. مـن پـەیمانم بـە بابـە گـەورە داوە، ئـەمڕۆش بەرامبـەر بـەخودا پـەیمان بـە ئێـوەش دەدەم، تێکـەڵ بـە منداڵـەکانی کـێن مەبن، ئەوان تووشـی بـەدخوویی و بەدڕەوشـتی بوونـە، نـەوەکانی دوای ئەوانیش هەر وا دەبن.

شاری هینار زۆر دوور نەبوو، خەڵکەکـەی دەبینـران، دەهـاتن و دەڕۆیشـتن، ڕۆڵەکانی خودا بەبان چیاکەوە تەماشای شـارەکەیان دەکـرد، پەیمانیشـیان دابوو بۆ ئەو شارە نەچن، لەدوورییشەوە بەهەشت بە دارو درەخت و باڵنـدەو تاڤگەکانییەوە لێیانەوە دیاربوو، کاتی خۆرئاوابوون دەنگێك بەگوێیاندا هات، دەنگێــك ڕوحــی دەبووژانــدەوە، لــەڕووخی چــیاکە وێســتان و تەماشــای خوارەوەیـان کـرد، بـەر لەچـاویان دڵیـان کرایـەوە، لای خـوارەوە کـوڕان و کچانی کێن ڕایاندەبوارد، گەنجێك لەناوەندیاندا، کە ناوی (جینـۆن) بـوو، بە ئاوازگەلێك گوێی وێدابوون، هەندێکی تر بـە ئـامێری ژەبینەکانیانـەوە دووی

ئاوازەکەی جینۆن کەوتبوون، کچگەلێك سەمایان دەکرد، هەمووان لەجۆش و خرۆشدا بوون.

هەر هەموو ئەوانەی سەر چیاکە تیایاندا نەبوو دەوی دانەچەقاندبێت و دەستی نەکردبێت ڕوحی نەکەوتبێتە هەلەکەسەما، ئیدریس لەپشتیانەوە تەماشای هەراو بەزمەکەی لای خوارەوەی کرد، بەوای ئەو ئاوازانەوە سەرتاپای جەستەی لەدوودڵیدا بوو، کە دەیزانییە ڕۆڵەکانی خودا(نێردراوەکانی خودا) چێژیان لەبینین و بیستن وەردەگرت، دواتر تەماشای لای خوارەوەی کرد، ڕێك ئەو گەنجەی بەزمەکەی بەڕێوە دەبرد، سەری بەرز کردەوە، جینۆن بوو، تەماشای ئیدریسی کرد، بزەخەنەیەکی شەیتانی بۆ کرد، ڕوو بەڕووبوونەوەکە دەستی پێکرد.

***

## ئاگری هەوەسبازی خانەکانی عەقڵ گڕدەدات

تا هەنووکە بەدووکەوتوانی تاکچاو لەدێر زەمانەوە بەپێوە دەوەستن و دەستیان ڕادەوەشێنن و یاری بەعەقڵی بێ ئاگایان دەکەن، ئەوەتا تاکچاوی شاری مینار لەخوار ەوەی چیاکە جۆرێك لە ئاواز دەژەنێت، دڵی ژن و پیاوان گڕ دەدات، بەسەرمەستی بەملاو ئەولادا دێن، چاویشیان لە لەش و لار دەگەڕێت. ژن و پیاوەکان فێری زینا و ڕابواردن و مەیخواردنەوە کردووە، داوێنپیسی لەنێوانیاندا زۆر زۆر بووە، تا بەوە گەیشتوون لەتەك دایك و خووشك و کچەکانیشیاندا دەخەوتن، ڕشەی گوناهیان نەدەزانی، تەنانەت کەس کوڕی خۆی نەدەناسییەوە، نەوەکانیان زۆڵاو زۆڵ کەوتبوونەوە.

جینۆن لەپاپنی چیاکە بۆ مەبەستێك كۆیانی كردەوە، قسەی شەیتان لەگوێیدا زرنگایەوە(( ئەگەر مولكی ئەتلەنتست دەوێت، دەبێ ڕۆڵەكانی خودا لەخۆ بگریت)) ئەو شەوە هەرچی بەدڕەوشتەكان بوو لەدەوری خۆی كۆی كردنەوە. ئەگەر چاوت لەژنەكان دەبوو چیان لەبەردا بوو، كراسكەلێك تەنك هەرچی لەشیان بوو بەدەرەوە بوو، بەر لەوان میچێك لە بنیادەمەكان شتی وایان لەبەر نەكردووە، جینۆنی شەیتان فێری هونەری ڕەنگیانی كرد، كە ئەوانەی بەر لەوان لەپێستەی ئاژەڵان بەرگیان دەدروو، فێریشیانی كرد ڕەنگ لەدەموچاویان وەربدەن، كراسكەلێك لەبەر بكەن چێژبەخش بێت، فێری خاڵ كوتینیانی كرد، وێنەو خاڵیان لەسەر ڕانی خۆیان دەكووتی، وابلێكردن لەگەڵ ژەنینی شمشاڵی شەیتان لەش و لاریان دەربخەن. بەسەر چیاكەوە ڕۆڵەكانی خودا لەنوێژ دابڕان، خواپەرستییان لەبیرچووەوە، هەموو شەوێ تا بەرەبەیان لەخوارەوەیان دەڕوانی، چێژیان لەو هەراو زەنایە وەردەگرت، تیایاندابوو ئاوی دەهاتەوە، شەوان بەخەیاڵی هەوەسبازی دەنووستن، ئیدریس هەستی بەوە كردبوو، خۆی گەیاندە لای پێغەمبەر (یارد)و پێیگوت:

- باوكە.. پێویستە ئەم چیایە جێبهێڵین، ڕۆڵەكانی خودا لەنوێژ كردن بوونەتەوە.

یارد پێیگوت:

- كوڕی خۆم.. ئەمە فەرمانی خودایە، ڕەنگە موبتەلایان بكات تا بەسەبر بن.

گەنج ئیدریس چووە ناویان و گوتی:

- ئەی ڕۆڵەکانی خودا.. نێردراوان، تەماشای بەهەشتی خوداتان کرد، شەیتان فریوتان نەدات، وەک چۆن دایبابتان(ئادەم و حەوا)ی فریو داو لەبەهەشت دەریانی پەڕاند.

هەوەسبازی کوێریانی کردبوو، دیقەتی خوارەوەی چیاکەیاندا، چاویان لە(جینۆن) بوو لەتەک بووکەکانی بەوپەڕی بەدڕەوشتییەوە بەلادا دەهاتن، ئاوازەکەش ئەوەندەی تر مەستیانی کردبوو، ئیدریس تەماشای جینۆنی کرد، وەختەبوو مێشکی بتەقێت، ئەوە هەر ئەو تاکچاوەیە کە لەگەشتەکەیدا لێل حەوا بینی، وەلێ دەبێت ئەوە کێبێت؟ بۆچی وا تەماشام دەکات؟ ئیدریس هزری لێ خستە گەڕ.. دەبێت کێ بێت؟ بۆچی وا لێم ورد دەبێتەوە.

ئیدریس بیری لە یەک شت دەکردەوە، چۆن بتوانێت ڕۆڵەکانی خودا لەو کارەساتە بپارێزێت؟ ئەوەندەش کاتی بەدەستەوە نەبوو بۆ بیرکردنەوە. ئەوجا کچانی کین دەستیان بۆ ڕۆڵەکانی خودا بەرز کردەوە، ئیشارەتیان بۆ دەکردن، تەنانەت (جینۆن)یش لەتەکیانا دەستی بەرز دەکردەوە، چون ئەوەی بانگیان بکات بۆ هەراوزەناکە، ئا لەوێوە شتەکە تەقییەوە، دەستەیەک لەنێردراوانی خودا گوتیان:

- ئێمە دەچینە خوارەوە، بۆ لای کچەکانی کین، بەهەشتیش پیرۆزی ئێوەبێت.

یاردی پیرە پیاو بەگژپاڵەکەیەوە ڕۆیشت و گوتی:

- ڕۆڵەکانم.. خودا پەیمانی بەهەشتی وێداون، شەیتانیش پەیمانی ئاگر.

دەستیان بەخەنینەوە کردو پشتیان لەیارد کردو دەستە دەستە شۆڕبوونەوە خوارەوە. ئیدریس بەخەمبارییەوە لێیانی دەڕوانی، مێشکی

هیچ بیرۆکەیەکی بۆ نەدەهات، ئەوجا ئیدریس پشتی لەوان کرد، وەك ئەوەی شەیتان گرەوی خۆی بردبێتەوە، یا کارەکە لەکار ترازا بێت، کەس بەدیارەوە نەما، تەنها یاردی بارکی نەبێت، کە فرمێسك بەچاوەکانیەوە هاتە خوارەوە، ئەو فرمێسکانەی چەند کاریگەرن لەچاوانی پێغەمبەرێکی بەسالا چوو دەڕژێن، ئیدریس بەسۆزەوە ڕووی تێکرد، وەلێ یاردی پیرەمێرد لەنێو فرمێسك ڕژانەکانیدا گیانی لەدەستدابوو.

***

## لەمێژوودا هەر هەموو ئەوانەی خۆیان بەرۆڵکانی خودا دەچوواند، بەدڕەوشتیان کرد

ئیدریس یاردی بەخاك سپارد، دواتر لەترووپکی چیاکە وێستار ڕووی لەئاسمان کرد، کەس بەدەوربیەوە نەبوو، هەرهەموو جێیانهێشتبوو، هەستی بەئازاری دڵی کرد، دەنگێك بەگوێیدا هات:

- ئیدریس...

ئیدریس بەترسەوە ئاوڕی دایەوە، تا بانگدەرەکەی ببینێت، پیاوێکبوو ڕوخسارێکی جوانی هەبوو، پرچ ڕەش و چاوشین، زۆر لەسەرخۆ لێی ڕوانی و ئیدریس گوتی:

- تۆ کێی؟
- زانیاریم لەبارەتەوە بیستووە، هاتووم هاوڕێتیت بکەم.

ئیدریس لەو تەنیاییەیدا پێیخۆش بوو هاوڕێیەکی هەبێت، تا ئەو ڕۆژەی فەرمانی خودای بۆ دێتە خوارەوەو ڕێی پێدەدات بچێتە بەهەشت. ئەو دوو

پیاوە سەرقاڵی نوێژکردن بوون بەسەر چیاکەوە، ئەوەندە شۆڕبیبوونەوە خواپەرستی، ئیدریس هەستی بەماندوویێتی کرد، وەڵێ کە لەهاوڕێکەی دەڕوانی هێشتا بەگوڕەو لەنوێژکردن نەکەوتووە، ئیدریس ئەو نوێژی لەخۆی نەدەبڕی، ئەوجا کە تەواو ماندوویێتی زۆری بۆ هێنا، داوای لێبووردنی لەهاوڕێکەی خواست بۆ دەمێك ، دواتر کەهاتەوە شتێکی هێنابوو بۆ هاوڕێکەی کە بیخوات، هاوڕێکەی تەماشای خواردنەکەی کردو گوتی:

- نا.. قەستەم بەوەی کردتی بەبنیادەم دڵم خواردن نابات.

ئیدریس زۆری لێکرد، پیاوەکەیش لەسەر قسەی خۆی هەر سووربوو لەنەخواردن، ئیدریس لە ڕزقی خودای خوارد، جێوبانێکی بۆ پیاوەکە هانی تا بخەوێت، دواتر بۆ جێوبانەکەی خۆی ڕۆیشت.

ئیدریس خەونێکی سەیری بینی(( پیاوچاکێکی بینی لەزینداندا، دوو پیاو بەجل و بەرگی سەربازییەوە چوونە لای، شمشێریان لێ هەڵکێشاو بێ بەزەییانە کەوتنە وێزەی، خوێن بە باڵای پیاوچاکەکە هاتە خوارەوە. لە دیمەنێکی تردا کەسێکی تاکچاوی بینی لە حینۆن دەچوو، سینییەکی زیوی بەدەستەوەبوو، کەللە سەرێکی سەربڕاوی بەسەر سینییەکەوە بوو، تا پێشکەشی پاشای بکات، کەللە سەرەکە سەری پێغەمبەر بوو))

ئیدریس لەنیوەشەوداو لەخەونەکەی ڕاچڵەکی و خەبەری بووەوە، تەماشای هاوڕێکەی کرد، بینی هێشتا لەنوێژکردندایە، هیچ ماندووبوونێکی پێوە دیار نەبوو، ئیدریس بۆ نێو جێوبانەکەی گەڕایەوە. یەك دوو ڕۆژ تێپەڕی، ئیدریس نوێژەکانی زیاتر کرد، ئەو نە نانی دەخوارد نە ئاو، ئیدریس پێیگوت:

- ئەی هاورێ.. تۆ سێ ڕۆژە لای منیت، زاد بەسەر زمانتدا نەچووە، پێمبڵێ تۆ کێیت؟ یا ئەوەتا لەیەك دادەبڕێین.

پیاوەکە تەماشای زەوییەکەی کرد و دواتر سەری بەرز کردەوەو گوتی:

- قەستەم بەوەی تۆی بەبنیادەم کرد، ناوبانگت لەئاسمان مەزنە، منیش پێمخۆشبوو هاورێت بم.
- تۆ پێمبڵێ کێیت؟

پیاوەکە وەڵامی دایەوە:

- من (ڕازئیل)م.. فریشتەی خواکەتم، دوو هاورێی پێبەخشیوم، یەکێکیان لە ئاسمانە، ئەوەی تریان لەسەر زەوی و بە پێغەمبەر هەڵیبژاردووی.

ئیدریس لەخۆشیدا سەری لەخۆی سوڕما، فرمێسك بەچاوەکانیدا هاتە خوارەوە، گوتی:

- یاخوا خۆشبیت، ئەوەشی هێناوتە بەخۆشی بێت، تۆ خاوەن پەرتووکی پیرۆزی (ئادەم)یت؟

ڕازئیل سەری ڕەزامەندی بۆ نواندو گوتی:

- ئەی ئیدریس.. خودا تەختە لەوحی زومڕدی بۆ ناردوویتەتە خوارەوە، زانیاری و پەیامێك لەخۆ دەگرێت، کە بۆ کەس نەهاتووەتە خوارەوە.

ئیدریس دڵی بۆ خواکەی ملکەچ کرد، گریانێکی زۆر گریا، ڕازئیل گوتی:

- تۆ وەك ئەو پێغەمبەرانەی پێش خۆت نیت، خودا دەتنێرێتە ئەوێ.

فریشتەکە پەنجەی ئیشارەتی بۆ ئەویّ کرد، ئیدریس تەماشای ئەو شوێنەی کرد، دڵی داخوورپا، فریشتەکە (هینار)ی دەست نیشانکردبوو، خاکی داوێن پیسان.

***

## عەقڵێك شەیتان بیبات بەڕێوە، چاکترە لە شەیتانێك عەقڵ بیبات بەڕێوە

ڕووبارگەلێکی شووره نەخشێنراو، ژن و پیاو بەڕووتی مەلەیان تێدا دەکرد، ناوە ناو لەئاوەکە دەردەچوون و بەسەر لمەکەدا پاڵ دەکەوتن و خۆیان دەدایە بەر خۆرەکە، پەیکەرگەلێك لەهەموو لایەکەوە نەك بۆ پەرستن، بەشەرییەت پێش ئەوە پەیکەریان نەزانیوە، ئیدریس نێردراوی خودا بەخەمبارییەوە بەنێویاندا دەهات و دەچوو، بەوپەڕی عەقلی لێ خستبووە گەڕ، لەکوێوە و چۆن دەست پێبکات، بەرەو بازاڕی شار بەڕێکەوت، تا لەبارو دۆخی خەڵکەکە بڕوانێت، لەپڕ دیمەنێکی سەیر مەڵوەستەی پێکرد، ئافرەتێکی شۆخ و شەنگ، کراسێکی وەنەوشەیی پۆشیبوو، بەنێو خەڵکەکە دەڕۆیشت و بەدەنگێکی بەرز دەیگوت:

— ئەی خەڵکی هینار.. تۆبە بکەن، سوێند بەخوا ئەگەر خودا لێتان توورەبێت، بەخاك و خۆڵ و موڵك وماڵەوە وێرانتان دەكات، نە موڵکتان دەمێنێت نەبش ڕووبارەکان.

هەندێ گەنج پێی پێکەنین، شۆخیان پێکردو گوێیان وێنەدا و لێی دوور کەوتنەوە، ئافرەتەکە سەری نەوی کرد، گریان بەڕوخسارییەوە دیاربوو،

ئیدریس بەرەو ڕووی ڕۆیشت، کەوتە دڵدانەوەی، پێغەمبەرایەتی خۆی پێ ڕاگەیاندو پێیگوت.. کە خودا لێی ڕازییە. کە گوێی لە ئیدریس بوو وەك داماوێك لەبیابان گیرۆدە بووبێت، وەك ئەوە وابوو ئاوی لەبیابان دۆزیبێتەوە، فرمێسکی چاوی هاتە خوارەوە، دواتر ناوی خۆی بە ئیدریس ڕاگەیاند، کە (زێلدا)یە. ئیدریس پرسیاری کۆشکی (جینۆن)ی لێکرد، ڕاچڵەکی و گوتی:

- ئەی پێغەمبەری خودا، نەکەی بۆ ئەو کۆشکە بچیت، ئەو شەیتانەی لێیە ، کوشتن و ئاوخواردنەوەی لا یەکە.

ئیدریس سووربوو لە ڕوو بەڕووبوونەوەی جینۆن بۆیە گوێی بە زێلدا نەدا، زێلدا جەختی لێکردەوە :

- تۆ ئەو ئیدریسەی لەشاری عەدەن بوویت؟ تۆ زانایەکی سەرکەوتوویت.

ئیدریس بە بەڵێ وەڵامی دایەوە، ئەوجا زێلدا نهێنییەکی لا درکاند:

- نهێنییەکم لایە، ڕەنگە بەدڵت بێت، قەستەم بەخوا بۆ کەسم نەدرکاندووە.

کاتێ نهێنییەکەی پێگوت، ڕوخساری زەردەوە بوو، دواتر لێبووردنی لەخودا کرد و بەرەو بێشەی تاکچاو بەڕێکەوت. ئەگەرچی عەرشەکەی جینۆن لەخۆی گەورەتربوو، بەو ئاوایەی هێشتا هەرزەکارە، دیمەنی دانیشتنەکەی و ئەوانەیش کە بە ترس و لەرزەوە لەدەوری کۆببوونەوە مایەی هەڵوەستە کردن بوو، ئەگەر چاوی دابگرتایە شتێك دەقەوما، کاتێ پێغەمبەر ئیدریس چووە لای، جینۆن بەسەرسوڕماوییەوە چاوی لێ کزکرد و ئەوەندەی نەبرد ڕوخساری بە بزەخەنەوە چون مارێك دەرکەوت و گوتی:

- ئیدریس.. پێم نەگوتی دیدارێکمان هەر دەبێت؟

ئیدریس گوتی:

- من پێغەمبەری خودام، خودا بەو حاڵەتان تووڕەیە، زینا و مەی خواردنەوەو بەد ڕەوشتیتان، هەر هەموو ئەوانە خودا حەرامی کردووە.
- منیش پێغەمبەری خودام، ئەم خەڵکەم فێری هەموو زانیارییەک کردوون، کە هیچ بنیادەمێك نەیدەزانی، قەواڵەت چییە کە تۆش وەك من خۆت بە پێغەمبەر دەزانیت؟
- تۆ نوێنەری شەیتانێکی ناوی (ئیبلیس)ە، پێغەمبەرەکان جنۆکە دەبینن، ئەوەتا لەسیلەتدا دانیشتووە و نایبینیت، ئەگەر باوەڕیش ناکەی بۆتی ئاشکرا دەکەم.

جینۆن دەموچاوی گرژ کرد، عەقڵی شێوا، دەوروبەرەکەی وایاندەزانی نێردراوی خودایە، جینۆن گوتی:

- ئەگەر شەیتانم پیشان بدەیت، ئەوا تۆ شەیتان پەرستیت، هەر کەسێك هاتوو شەیتانی پیشاندایِن ئێمە بڵێین پێغەمبەرە؟

دڵنەوایی لەچاوانی ئەو خەڵکەی دەوروبەری دەرکەوتەوە، ئیدریس گوتی:

- من لەم شارە نیشتەجێ دەبم، قسە لەگەڵ ئەو خەڵکە دەکەم، وتاریان لەمەڕ دارێنپیسییەوە بۆ دەڵێمەوە، ئەگەر ڕێت لێگرتم ئەوا مانای ئەوەیە تۆ ترسنۆکیت و لەهەق دەترسێیت.
- چی دەکەی بیکە، ناتوانیت تەنها یەکێکیشیان هەڵگەڕێنیتەوە، پیاو لەهینار فێر دەکرێت، ئەوەی لەوڵاتەکەت فێریانتان نەکردوون.

ئیدریس (جینۆن)ی جێهێشت، دەنگێك لەنزیكەوە هات و گوتی:

- فـەرمان بەكوشـتنی بـدە، ڕەنگـە هـەموو شـتێك بەسـەرتا هەڵگەڕێتەوە.

جینۆن تەماشای لای چەپی خۆی كرد، لۆسیفەری بە عابا بەهادارەكەیەوە بینی، جینۆن گوتی:

- نا.. من لێی دەگەڕێم، عەقڵم ڕوو بەڕووی عەقڵی دەكەمەوە.

ئیبلیس بزەیەكی بۆكرد و بێدەنگبوو.

***

## ئەگەر حەكیم چووە دڵی خەڵكەوە .. هیچ شتێك دەری ناپەڕێنێت

ئەگەر گوێڕایەڵی گەلت ویست، متمانەیان بەرەوە، یەكەم كەس كە دەستی پێیان كرد، ڕۆڵەكانی خودا بوو، تـۆی خێریان تێدا مـابوو، وەڵێ شـەیتان فریوی دابوون، زۆربەشیان كە چاویان بە ئیدریس كەوت دەستیان بـەگریان كرد، دەیانگوت پەژیوان بووین لـەوەی كردمـان، ئـەگـەر تۆبە بكـەین خـودا لێمـان خـۆش دەبێـت، وەڵێ بڕێكـی تریـان دەیـانگوت هـەوڵی گەڕانـەوەیان نەدات، ئەوەی بەهەشتی جێهێشت و دوای داوێنپیسی كەوت، هـەرگیز خودا لێی خۆش نابێت، ئیدریس لێلیاندا كەوتـە قسـان و گـوتی.. سـۆز و بـەزەیی خودا بەقەد مەودای نێوان ئەرز و ئاسمان گەورەیە، بەتۆبەكردنیان دڵخۆش دەبێت، ئەوجا بەرەو لای شوێنكەوتووانی زێڵدا ڕۆیشت، ئەو ژنە چاكەی بەر لە ئیدریس قسەی بۆ خەڵكەكە دەكرد، بڕێك لەو خەڵكە هاتنـە سـەر ڕێگای ڕاست، ئەوجا ئیدریس بەتەواوی ڕووی لە خەڵكی هێنار كرد.

سەرەتا ئیدریس وەك پزیشك بەسەر ماڵاندا دەگەڕا، دەردی وای لێ بینین، پێشتر شتی وای نەبینیبوو، لەهاوسەرگیریی حەرام و بەدڕەوشتی و زیناکردن، ئیدریس هیچ دەرد و نەخۆشییەك لەبن دەستی دەرنەدەچوو، بەر لەوەی ببێت بەپێغەمبەر زانستی پزیشکی هەبوو، خەڵکەکە بەو کارەی دڵخۆش بوون و خۆشیانویست، هەر کاتێ یەکێکیانی چاك دەکردەوە، مۆچیاری دەکردەوە توخنی کاری حەرام نەکەوێت، تەنانەت هاوسەرگیری حەرام نەوەیەکی شێواوی لێ دەبێتەوە، ئامۆژگاری کردن لە زینا دوور کەونەوە، ئەو دەرد و نەخۆشییانەیان لەزیناوەیە، ئەو قسەیە لەنێو خەڵکیدا بڵاوبووەوە، ئیدریس بە پزیشك ناوبانگی دەرکرد، شەیتان بە جینۆنی گوت:

– ئیدریس وەك ئەستێرە بەرز و درەوشاوەتر دەبێتەوە.

جینۆن گوتی:

– پەیمانت وێدەدەم هەر ئەو خەڵکە داوام لێبکەن سەری بپەڕێنم.

جینۆن دەستی بەگەمە فێزەونەکەی کرد، جەندرمەکانی دەچوونە ماڵان و چەکیان پێ دەدان تا پارێزگاری لەخۆیان بکەن، خەڵك لەسەر چەك هەڵگرتن ڕانەهاتبوون، لەپڕ خەڵکی هینار بەوای کارەساتێکەوە لەخەو ڕاپەڕین. سیمێۆن.. گەنجێك لەبنەماڵەی بەناوبانگی هینار لەپڕێ ون دەبێت و دەڕفێنـدرێت، تەنها کراسێکی خوێناوی ئەو لەماڵی خانوادەی(شین) دەدۆزرێتەوە، ئەوانیش بنەماڵەیەکی بەناوبانگبوون لەهینار، ئەوەش تەنها یەك مانای هەبوو، کە شەڕێك بەڕێوەیە، بەو پێیەی پێشتر ئەو دوو بنەماڵەیە دوژمنایەتییان پێکەوە هەبووە.

کەس زاتی ئەوەی نەدەکرد خۆی تیا هەڵقورتێنێت، هەستکردن بە هەڵگرتنی چەکی نوێ کاردانەوەیەکی زۆر خەتەر و ترسناکی هەبوو، هەردوو

بنەماڵەکە شوولیان لەیەك هەڵکێشا، خوێن بەجۆگەلەکانی هیناردا سووری دەکردەوە، خەڵکی هاواری ئەوەیان بوو، ئاوێك بەو ئاگرەدا بکرێت، بێ سوود بوو، بۆنی خوێن هیناری هەلگرت، هیچ ئومێدێك نەبوو، تا دەهات خوێنی زیاتر دەڕژا.

شەیتان لەبەلەکۆنەکەوە لەسیلەی جیتۆن وێستا، سەریان خستە سەر یەك و شەیتان گوتی:

- کەی بەتەمایت؟
- چاوەڕێی هەنگاوی دوای ئەوەی دەکەم.

***

## بۆنی خوێن کەپووی شەیتانەکان مەست دەکات

خوێن گۆڕەپانەکانی (هینار)ی سوور کردبوو، تەنانەت چاوی خەڵکەکیش سوور هەڵگەڕابوو، زۆربەی خەڵکەکە خۆیان لەماڵەوە حەشاردا و دەرگایان لەسەر خۆیان کلۆمدا، ئەوانەی شەڕانگێزبوون، وەك گورگ کەوتبوونە ناو کۆڵان و گەڕەکەکان، تا بەرەو قوولەی هینار شۆڕببوبیتایەوە بەیەکاچوونی خەڵکەکە زیاتر بوو. بەوای ئەو بارودۆخە سێ یەکی هینار کۆبوونەوە. چەك بەدەست و جلوبەرگ خوێناوی و دڵپڕ لەقین لەنێو ئەو گردبوونەوەیەدا بڵاوبوونەوە، لەلایەکی قەرەباڵغییەکە ڕێگا کرایەوە، هەر هەموو تەماشای شوێنێکیان دەکرد، ئیدریس بەهەیبەتی پێغەمبەرایەتییەوە دەرکەوت، دڵ و دەروون و عەقڵی خەڵکەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشا، بەوای ئەو ماوە زۆرەی لەهینار مابووەوە، متمانەی خەڵکەکەی بۆ لای خۆی ڕاکێشابوو، خەڵکەکە

ڕێیان بۆ کردەوە، وەك باوکێکی بەسۆز لای لێ کردنەوە، تا بە قوولەکە گەیشت، ئیدریس بۆ سەر قوولەکە سەرکەوت، باڵندەکان بەرەو حەوا هەڵفڕین، بەدەنگێکی بەرز گوتی:

– من (ئیدریسی کوڕی یارد)م، خودا منی بەپێغەمبەرایەتی ناردووەتە ناوتان، ئەو خودایەی منی ناردووە، خودای ئێوەو ئەرز و ئاسمانە، خودایەك ئێوە پشتتان لێکرد و ئاڵکانە ئەم ڕۆژەی تێیکەوتوون، ئەی ڕۆڵەکانی تاریکی، بەو کارە قێزەونانەی کردووتانە ئێوە بەرەو وێرانکردنی خۆتان مل دەنێن، نەوەکانتان تێکەڵ یەکبووە، لاقەی خووشك و دایکتان کرد، ئەوەتا ئێستاش دەتانەوێ یەکتر ببڕنەوە، ڕۆژگار دەتانپلیشێنێتەوەو هەموو نەتەوەکان نەفرەتیتان دەکەن، وەلێ ئەگەر تۆبەتان کرد و ڕووتان لە کرداری چاك کردەوە، وازتان لەو بەدڕفتارییەتان هێنا، لەدونیا و ئاخیرەتدا بەکەسی باش ناوزەدتان دەکەن.

شەیتان ڕووی لەجینۆن کرد و گوتی:

– دەستپێبکە، مەهێڵە ئەو دوای قسەکانی تەواو بکات.

لەو ئان و ساتەدا، کە میللەت گوێیان بۆ قسەکانی ئیدریس شل کردبوو، جەندرمەکانی جینۆن دابەزینە گۆڕەپانەکەو جینۆن بەخۆی لەپێشیانەوە بۆ ناو حەشاماتەکە ملی نا، خەڵکەکە سەریان سوڕما، ملیان بەرەو پێشەوە برد، تەماشای جینۆن و جەندرمەکانیان نەکرد، بەڵکو بۆ ئەوەی بەرامبەر جینۆن بوو، سیمیۆن.. ئەو گەنجە ڕفێندراوەو ونبووە، غاری دەدا و شەیتان بەدوویەوە، کراسەکەی شەڵاڵی خوێن بوو، ئەوجا سیمیۆن تەماشای ئیدریسی کرد و ئیشارەتی بۆ کرد و گوتی:

– ئەی خەڵکی هینار، ئاگاداری ئەم پیاوە هیچ و پووچە بن، ئەم پیاوە منی ڕفاند، بەنیازی کوشتن ڕفاندمی، بەڵام توانیم لەدەستی هەڵبێم و خۆم ڕزگار بکەم.

بەو پیلانەی بۆی دارێژرابوو، سیمێۆن کەوتە سەر زەوییەکە، دواتر سەری بەرز کردەوەو هاواری کرد:

– ئەو هەموو خوێنەی ڕژا، بەوای ئەم پیاوەوە بوو، ئەو کوشتارەش دەستی ئەمی تێدا بوو.

بارودۆخەکە هەڵگەڕایەوە، هەر هەموو هینار بەرەواژ بوونەوە.

***

## هاوارێك لەنێو پیاوانی تووڕە شۆڕش بەرپا دەكات

هەراو زەنا پەیدابوو، خەڵکەکە بەرەو قوولەکە هێرشیان برد، ئیدریس دەستی بە پەرژینی قوولەکەوە گرد، بەتووڕەییەوە گوتی:

– هۆ خەڵکینە هێور بنەوە، دان بەخۆتانا بگرن، بیرتان بێتەوە بەر لە سەد ساڵ پاشاکەتان، باوکتان لەناو داربازێك نرا، بەکەس نەدەکرایەوە، دایکتان بەرەو عەدەن ڕۆیشت، پیاوێکی شارەزای دەستکەوت بۆ کردنەوەی داربازەکە، ژیانی پاشای لەمردن ڕزگار کرد.

ئەوجا بەدەنگێکی بەرزتر هاواری کرد:

– ئەو پیاوە شارەزایە من بووم.

خەڵکەکە هەر کە گوێیان لەو قسەیە بوو، هێور بوونەوە، هەندێکیان هاواریان کرد.. ئەو باس لە ئیدریس دەکات، هات و داربازەکەی کردەوە، ڕووداوێکی گرنگ بوو. ئیدریس تەماشای (زێڵدا)ی کرد، ئەویش بزەیەکی تێسرواند، ئەمە ئەو نهێنییەبوو کە پێمراگەیاندن. لەڕاستیدا ئیدریس ژیانی (کین)ی ڕزگار کرد، وەلێ نەیزانی جینۆن دوا کوڕی (کین)ە.

ئیدریس گوتی:

- ئەگەر بمویستایە لە مەملەکەتەکتانا بەدڕەوشتی بکەم، ئەو زانیارییانەی هەمە لێم دەشاردنەوە، داربازەکەشم نەدەکردەوە، لێدەگەڕام ئەو ڕۆژە پاشاکەتان بمرێت.

تووڕەبوونەکەی خەڵك بەرەبەرە دادەمرکایەوە، تا شەیتان هاواری لەجینۆن کرد:

- ئەم پیاوە لەهەموو ولاتان بەناوبانگ و گرنگە، وەلێ ئەمڕۆ لەخۆباییە، کاتێ بیستی زانستی ڕوحیانەت بۆ هینار کەیفخۆشییە، دڵە ڕەشەکەی هەڵچوو، هاتە ناومان و بەو زانستەی ڕوحمانی دەبووژاندەوە بە بەدڕەوشتی و بەدکاری وەسپی دەکات، لەخۆباییەکەی ئەمڕۆ ئاشکرا بوو، کاتێ بەو ئازارەی لە کوشتنی منداڵەکانمان بۆی کۆبووینەتەوە، هاتووەو باسی پێغەمبەرایەتی دەکات، ئەو گەنجە داماوەش لەناو خوێنی خۆی دەگەوزێت.

گەنجەکە هاواری کرد:

- ئەی خەڵکی هینار.. ڕۆژ ڕۆژی تۆڵەکردنەوەیە لەدرۆزن، بەرلەوەی لەوەزیاترتان لێ بکوژرێت، تۆڵەی خۆتان لەم پیاوە درۆزنە بکەنەوە.

جینۆن دەستی بەرزەوە کرد، چون ئەوەی فەرمان بە جەندرمەکانی بدات، تا هەڵکووتنە سەر ئیدریس و بیکوژن، خەڵکەکەیش هاواریان بۆ کوشتنی ئیدریس کرد، کەوتنە جنێودان، جینۆن بە نیگایەکی گاڵتەجاڕانەوە لە ئیدریسی دەڕوانی، ئیدریس هەناسەیەکی هەڵکێشاو چاوی داخست و سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، برژانگەکانی دەلەرینەوە، چون ئەوەی سرووشی بۆ هاتبێت، جەندرمەکان گەیشتنە دەرگای قوولەکە، دەرگاکەیان کردەوەو سەرکەوتن.

ئیدریس بە چاو داخراوەیی شتێکی سەیری بینی، چاوەکانی زیاتر لێ نووقاند، دەرگای سەرەوەی قوولەکە کرایەوە، جەندرمەکان بەرامبەر ئێدریسیان گرد، خەڵکەکەیش لە جنێودان نەکەوتن، هەڕەشەیان لە ئیدریس دەکرد، وەلێ جەندرمەکانی سەرەوە لەجێی خۆیان ڕەق ڕاوەستان و چاویان ترسی لێ دەباری، شتێکیان لەبەرامبەر خۆیاندا بینی، نە بنیادەم بوو، نەیش جنۆکە، لەمێژووی سەر زەوی شتی وایان نەبینیبوو.

چاویان لێبوو پێی ئیدریس لەزەویەکە بەرزەوە بوو، هەر وەك ئەوەی بفڕێت، چاوەکانی هەر نووچقابوون، سەریشی بۆ ئاسمان بەرز کردبووەوە، زیاتر بەرزەوە بوو، تا خەڵکەکەی خوارەوەش چاویان لەبەرزبوونەوەکەی بوو. خۆ ئەگەر هەرچی مەرەکەبێ کە هەمە لەنووسیندا بەتاڵی بکەمەوە ناتوانم ئەو دیمەنە شرۆڤە بکەم، یەکەم ئایەتی خودا بوو، پیشانی بنیادەمی دا. دەتتوانی گوێت لەترپە ترپی دڵیان بێت، ڕوحیان شڵەژا، ئەو دەمەی ئیدریس بە بەرچاویانەوە بەرەو ئاسمان بەرزەوەبوو، تەنانەت (جینۆن)یش شڵەژابوو، لەترسا کشایەوە، لێل کشانەوەی بەپشتا بەرەوە بوو، ئیدریس چاوی کردەوەو پێیانگوت:

- تۆبە بکەن، چاك بزانن لەسەر ئەم زەوییە پێغەمبەری بنیادەمی هەیەو شەیتانیش لە بنیادەمەکاندا هەن.

بەدەم تێرۆوانینی جینۆن دوا قسەی کرد و گوتی:

- ئەوش بزانن لەم تاکچاوە نەوەیەك دەردەچێت بەدڕەوشت و خراپەکارن، وریاس فریوتان نەدەن، وەك چۆن تاکچاوەکەی باوکیان فریوی دان.

کەس لەخەڵکی هبنار و ئەتلەنتس ئەو ڕۆژەیان لەبیر نەچووەتەوە، پێغەمبەر ئیدریس بەرەو ئاسمان هەڵکێشرا.

*** تەواو ***

ئەلبۆنی دەڵێت :

تەختەلەوحی زومرد بەهەموو فەلەکناسی و پزیشکی و زانست و وشەو فتوحاتی نوورانی لە ئیدریسەوە بۆ قوتابییەکانی مایەوە، دوای گەڕانەوەشیان بۆ عەدەن بە ڕۆڵەکانی زومرد ناوزەد کران، ئەوانیش بۆ پاراستنی‌نەوەکانی دوای خۆیان ڕاسپارد، ئێدی دەستاو دەستی پێکرا، نەوە دوای نەوە. هەموو ئاینەکان و شارستانییەتەکان ئیدریسیان شکۆدار کرد.

لە تەورات بە(ئەخنوخ) ناوی هاتووە، ئەو پیاوەی هەموو زانستەکانی هێناوە، لە لای جوولەکەش سێ ڕیوایەتی هەیە، لای موسوڵمانەکانیش پێغەمبەرێکی مەزن بووە، سی و سێ دەقی دەسنووسی بۆ دابەزیوە، هەرچی میسرییە کۆنەکانە بە خوداوەند چواندوویانەو ناویشی (تحووت)یان

لێ ناوه، ئەوەشیان بۆ دامێناوە کە هەموو زانستەکانی لەسی پەرتووکدا نووسیوەتەوە، ئەو پەرتووکانەش لە پەرستگاو لە پیرۆزی پیرۆزییەکاندا دانراوە، کە تەنها گەورە قەشەکان بەسەریان دەکردەوە، ئەو پەرتووکانەش لە شوێنە هەرە پیرۆزەکان دادەنرا، بەو ئاوایەی لە پەرتووکە زانستە شاراوەکانە، لەسەردەمی فیرعەونەکان هەر بەو پەرتووکانەش قەشەکان پلەی بالآیان بەدەست دەهێنا.

یۆنانییەکانیش وەك خواوەند ڕایانگرتبوو، ناوی(هرمسی خرمسییەکان)یان لێ نابوو، بەو ئاوایەی پەرتووکی فەلسەفەی هرمسییەو لەسی بەرگدا، لەوانەش (کیبالۆن)ەکان و تەختە لەوحی زومرد، کە بەوە ناوبانگی دەرکرد، ڕستەی کورت و لێل عەقڵی نامۆشیار دەدوێت، کەسیش لێی حاڵی نەدەبوو، تەنها ئەوانەی پاك و بێگەرد بوون، زیاتر لەگەڵ ڕوحدا دەدوا، بۆیە هەموو کەس تێگەیشتنێکی جیاوازیان دەبێت لەتەك ئەوانی تر.

لوبیب قسەکەی پێ قاچی و گوتی:

- ئەم بەسەرهاتەی گێڕاتەوە دەربارەی ئیزیس و کوڕە تاکچاوەکەی، هەر هەمان ئەفسانەی ئیزیس و ئۆزیریسی مێردەکەی و (حۆرس)ی کوڕە تاکچاوەکەیانە، هەر هەموانیش دەزانن ئەو حیکایەتە ئەفسانەیە.

ئەلبۆنی بەچاوێکی ترسێنەر دیقەتی دا و گوتی:

- تۆ بۆت نییە لەدانیشتنی زانستدا زمان هەڵێنیت، تا من ئیزنت پێنەدەم.

لوبیب نەیزانی چۆن بەرسڤی بداتەوە، ئەلبۆنی بەچاوی توورەییەوە لەدیقەتدانی نەکەوت و گوتی:

- کـاتێ مـەلای بیسـت و چـوار عیلمـی سـۆفی(زەنوون میسـری) کۆدەکانی زمانی میسری کۆمی کردەوە، ئەوانـەی لەسـەر دیواری پەرسـتگاکان نووسـرابوون، ئێمـەش بەسـەرهاتی (حـۆرس) و دایکیمان زانی، هەی بێ ئەدەب ئەگەر لێت بپرسم میسرییەکان ئەم بەسـەرهاتەیان لـەکوێوە هێنـاوە، هـەی گەمـژە زمانـت هـەر هەڵنەدەهێنا.

ئەلبۆنی بە ڕقەوە لەبێدەنگی (لویب)ی دەڕوانی و گوتی:

- لە نووسراوی میسرییەکاندا هاتووە، کە هەردوو خواوەندی (جیـب) خواوەنـدی زەوی و (نـووت) خواوەنـدی ئاسمـان، کـاتێ (رع) خواوەندی مەزن لێیـان بەقینـدا دەچێت، لێکیـانی دابـڕی، ئـەوجا هاوسەرگیرییان کرد و (ئۆزیریس)یان بوو، کە خەریکی کشت و کاڵ بوو، دواتر (ست)یان بوو. ئـۆزیریس (ئیزیـرس)ی خوشـکی خـۆی مارەکرد، دواتر کەسێك بـەناوی(تحووت) لەسـەردەمی ئەوانـدا ژیـا، پەنای بۆ بـرد، بـەو ئاوایـەی هـەموو زانسـت و پەنـدەکانی پێبـوو، ئەوە ئـەو ڕاستییەیە کـە هـەمان حیکایـەتی (ئـادەم)ە لەتەوراتـدا هـاتووە، کـە دەڵێـت.. ئـادەم (جیـب) و حـەواش (نـووت) هاوسەرگیرییان کردو (کین)یان بوو یـانی (ئـۆزیریس) کـە خـەریکی کشـت و ئـاڵ بـووە، (ئیـزیس)ی خووشـکی خـۆی مـارە کـردووە، ئەوەیەکیان لەو سەردەمە هەبووە بەناوی(ئەخنووخ) هەموو پەند و زانستەکانی پێبووە، ناوی ئەخنووخ (تحووت) بووە.

لویب پێیگوت:

- ئەی (ست) کەوتـە کـوێ، کـە جـەنگی بەرامبـەر (ئـۆزیریس) کـرد، (حۆرس)ی ئاکچاو لەکوێیە، لە حیکایەتەکانی تەوراتدا نایبینم.

ئەلبۆنی گوتی:

- بەدەر لەوەی پەرتووکە پیرۆزە فەرمییەکان باسیان لەهیچ برایەک نەکردووە، جەنگیان دژ بە(کین) کردبێت، وەلێ لەدەستنووسەکانی جوولەکە کە نافەرمین باس لەکوڕێکی تری ئادەم دەکەن بەناوی(تێمنوون)ەوە، کە بەچەکی قورس جەنگی دژ بە کین و کوڕەکانی کردبێت، کە بەسەرکەوتوویی ئەو جەنگەی بردووەتەوە، ناچار ئەوان وڵاتیان جێهێشتووە، ئەوە (ست)ە جەنگەکەی کردووە، هەر لەو دەستنووسانەیاندا هاتووە، کە ئیدریس (تحووت) لەو سەردەمی جەنگی دووبراکەدا ژیاوە.

لوییب لەوەدا بوو باوەڕ بکات، گوتی:

- ئەی حۆرس؟

ئەلبۆنی بزەیەک گرتی و گوتی:

- ئەگەر خودی (ئۆزیریس) هەر کین بێت، کوڕە تاکچاوەکەیش (حۆرس)ە و کوڕی تاکچاو جینۆنە مەواتە (کین)ە، بەسەرهاتی جینۆن لەدەستنووسێکی دۆزراوەدا کە بەعەرەبی نووسراوەتەوە، بەر لەوەی پێغەمبەر محەمەد پێغەمبەرایەتییەکەی بێتە خوارەوە، بە ناونیشانی( ململانێی ئادەم و حەوا و شەیتان)ە، (جینۆن)ی تاکچاو لە شەیتان خەتەرناکتر بووە، لە (کین)ی باوکیەوە زانستی بیناسازی و کشت و کاڵی بۆ مابووەوە، بەدەر لەو خوێن ڕشتنەی هینار لەسەردەمی ئەودا ڕوویدا، زانستیش تێیدا گەشەی کرد، کاتێ جینۆن مرد، قوتابییەکانی ئەو زانستەیان وەرگرت.

لیۆبۆلد زۆر بەگرنگییەوە گوتی:

- ئەی زانستەکان ئیدریس کە بۆ قوتابییەکانی جێهێشت بۆ کوێ چوو؟
ئەی زانستی جینۆن کە ئەویش بۆ قوتابییەکانی جێهێشت بۆ کوێ چوو؟

ئەلیۆنی بێدەنگبوو، تاوێ چاوی لەزەوی بڕی، بێ ئەوەی سەر بەرز بکاتەوە گوتی:

- ئەو کوشتن و بڕینەی دێوەکان و هەرچی و پەرچییەکان نایانەوە، بۆ ئەوەی ئەو زانستەیان دەست بکەوێت، کە لەپەرتووکی ڕۆڵەکانی زومرددا نووسرابوون، باس لەداستانێك دەکات، پاڵەوانەکانی لەبیرکران، ئەگەرچی ئەوان بوون بەهۆی وەك بنیادەم بمێننەوە.

لیزبۆلد کۆمەڵە کارتێکی لەبەرکیدا دەرهێناو بلەز تەماشایەکی کرد، وێنەکانی سەر کارتەکە دڵی گوشی.

کارتی یەکەم.. کارتی بژاردەکردنە، وێنەی پیاوێکی ڕەشتاڵە و یەکێکی تری سپیپێستی بەسەرەوە، بەرەو دارێکی گەورە بەڕێوەن، لەژێر دارەکە سێ گۆڕی لێیە.

کارتی دووەم.. شاسوارێکی ترسناك، خۆی ئامادە کردووە بچێتە ناو قەلایەك.

کارتی سێیەم.. پیاوێکی تیر هاوێژ بە بێ ئومێدی تیرێك دەهاوێت، بۆمبێکی زۆر درەوروبەری دەکێڵێت.

دوایین کارت.. کارتی داڵە- وێنەی داڵێکی بەهێزی بەسەرەوەیە، هەرچی بەرچاوی بکەوێت، دەیخوات.

***

## دێوەزمەکان هەموو خراپەکارییەکیان لێ دەوەشێتەوە

بـەژێر تیشـکی مانگەشـەوەکەوە ڕوخسـاریانم بینـی، کۆمـەڵێکبوون لـە دێوەزمەکان لەتاریکیدا بە بن چیای (ئاریان)ەوە بۆ کارێکی گەورە کۆ ببوونەوە، وەلێ نەمدەزانی ئەو کارە چییە، ما چاودێریان بکەم، یەکێکیان ڕوخساری گرژ بوو، پرچ درێژ ناویشی (ناریمان)بوو، گویم لێبوو دەیگوت:

– دەزانن.. ئەمڕۆ خەونێکی سەیرم بینیوە، لەخەوندا تەختە لەوحێك سەر ئاو کەوتوو، هەندێ ناوی بەسـەرەوە نووسرابوو، تـەنها سێ ناوم لێ خوێندنەوە، سام و حام و یافت.

دێوەزمەیـەکی کەچـەڵ لەسـیلەیەوە ڕاپـەڕی، چـون ئـەوەی تریشـقەی بەرکەوتبێت، گوتی:

– منیش هەمان خەونم بینی، سوێند دەخۆم هەر هەمان خەونم بینی.

ناریمان لێی ڕوانی و گوتی:

– باراکا.. ئەی کەساس، لاسایم مەکەرەوە.

باراکا هاواری کرد:

– سوێند دەخۆم...

دێـوێکیتری لەپشـت دارێکـەوە دەرکـەوت و قسـەکەی پـێ قاچـی، ئـەوە (ماهوای) گەورەیان بوو، ڕەشتاڵە و ڕوخسارێکی ترسناکی هەبوو، پرچێکی درێژ و ڕەش، پێیانیگوت:

– منـیش لـەوەی بینیتـان سـەیرترم بینـی، خـۆم بەسـەر لووتکـەی چیایەکەوە بینی، لەسەرووی هـەورەوە بـوو، چاوم بەچواردەوری خۆمـا گـێڕدەدا، ئیدریسـی پێغەمبـەرم بینـی، لـەنێو هەورەکانـەوە دەرکەوت، دەستم بۆ درێژ کرد، لێ ئەو ڕەتی کردمەوە.

دواتر تەماشای مانگەشەوەکەی کردو گوتی:

– هەمووی خەونی تێکەڵ و پێکەڵی گەمژەکانە، ئەگەر ئیدریس بیزانیبایە ئێمە دەچین بۆ میراتەکەی لەخاکی عەدەن ببەین، دەستی دەخستە دەستمان و تۆڵەی خوێنی نەوەکانی دەکردەوە، ئێستا لەهەموو شتێك گەڕێن، تەنها شتێکتان بیر بێت، کاتی جێبەجێکردنە.

لەپشت دارەکەوە لەرز گرتبوومی، نەدەبوو خۆم ئاشکرا بکەم، دەنا ونجڕ ونجڕیان دەکردم، ئەو نەفرەتییە بەخراپ باسی لە پێغەمبەر ئیدریس دەکرد، منیش ئەو خەونەم بینی، کە پێغەمبەرە، وەڵێ نەمزانی کێیە.

(( بنیادەمێکم بینی پرچ ئاڵتوونی، تەڕو درێژ، جلوبەرگێکی ڕێك و پێکی لەبەردابوو، دەموچاوی لە ڕووناکی مانگەشەو جوانتر بوو، خەڵکی بەدەورەوە، داچەمیەوە سەر لاشەی پیاوێکی مردوو، هەر کە دەستی نایە سەر لاشەی مردوەکە، دەستبەجێ مردووەکە ڕاستەوەبوو)).

لەشرۆڤەکردنی خەون هیچم نەدەزانی، زۆریش گوێم بەوە نەدا، تەنها بەقسەیەك کە (ماهوای) گوتی .. کاتی جێبەجێکردنە، زانیم پیلانێك بۆ کوشتن و بڕین دادەنێن، لەوەی لە شیلۆن گێڕایان گەورەترە، کوشتن و بڕینێك پەیوەستە بە میراتەکەی ئیدریس. شاری عەدەن کارەساتێکی بەسەرا دێت، لەوەی شیلۆن کارەساتبارتر.. هێرشی دێوەکان.

***

# گوڵە جوانەکان بڵاو بکەرەوە بەر لەوەی سیس داگەڕێن

هەموو شتێك لەناخمدا هەڵدێت، کاتم بەدەستەوە نییە، هەر وەك چۆن (شیلۆن)یان وێران کرد (عەدەن)یش وێران دەکەن، بۆیە دەبێت خەڵکی عەدەن ئاگادار بکەمەوە. دەتەوێت بزانیت من کێم؟ وەلێ تکات لێدەکەم ڕقت لێم نەبێتەوە، من دێو( سەهم)م، لەدێوەکانم، وەلێ من و نۆدی تر لە دێوەکان بەو کارە خراپە ڕازی نین، کە (ماموای) ڕەشتاڵە گەورەی دێوەکان سەرپەرشتییان دەکات. نازانم خەڵکی عەدەن بۆ بەرهەڵستی کردن لە هەزاران دێو چییان پێدەکرێت، ئەوەی پێمکرا بیکەم، دێوەکانم ڕازی کرد شاری شیلۆن جێ نەهێڵن، تا هەموو لاشەکان لەگۆڕ دەنێن، ئەگەر وانەکەن گوزەران لەو شارەدا نامێنێت، خۆ ئەگەر تووڕ بدرێنە ناو ڕووبارەکەش ئەوا ئاوەکە بۆگەن دەکات، بەو شێوەیە دوو هەفتە زیاتر دوا دەکەون، هەر هیچ نەبێت دەیان هەزار لاشە هەن.

تەماشای ڕووباری (نیل)م کرد، بە کەناری ڕووبارەکەوە ڕامکرد، ئاسمانم لێوە دیاربوو، هەر سووربوو، پێدەچوو خەڵکی عەدەن ترسا بن، هەڵبەت دەیانزانی ئەو ڕەنگی سوورییە ڕەنگی خوێنە بە ئاسمانەوە، شاری عەدەنم لێ دەرکەوت، چوومە نێو شارەکە، خەڵکەکە ترس دایانیگرتبوو، لەناوەندی شار وێستام، هەموو خانووەکان بە بالای من نزم بوون، گەورەو بچووکیان هاتنە دەرەوە، پاشا (ود)ی مەزن لەپێشیانەوە بوو.

هەموو شتێکم بۆ گێڕانەوە، فرمێسك بەچاومدا هاتە خوارەوە، پێمگوتن شار جێبهێڵن و هەڵبێن، وەلێ بەکاردانەوەی پاشاکەیان سەیرم پێهات، پیاوێکی بەهێزبوو، دەستبەجێ شارچۆڵکردنی ڕەتکردەوە، گوتی.. هەر لێرە دەبێت بمێنین. خەڵکێکی زۆرم بینی پشت پاشاکەیان گرت. ئەو خەڵکە چین؟

دەبێت ئەوەندە سارێلکەو گەمژە بن؟ هەوڵمدا ئەوەی لە شیلۆن بینیم بۆیانی باس بکەم، ئەوان پرسیاری تریان لێکردم:

- چەند کاتمان بەدەستەوەیە؟ ژمارەیان چەندە؟

بە پاشاکەم گوت.. بیست هەزار دێون، بێ شك ئەم شارە دەگرن و خوێنی خەڵکەکەی دەخۆنەوە، تەنها دوو هەفتەتان بەدەستەوەیە، پێویستە میراتی ئیدریس و زانستەکانی لەشوێنێك بشارنەوە، شەیتانیش پێی نەگات. یەك لەپیاوەکانی پاشا هاواری کرد:

- دەبا پەرژینێکی زۆر بەرز بەدەوری شاردا درووست بکەین، نەتوانن بێنە ئەمدیو و ئێمەش لە عەددەن زۆرین، ئەگەر شەو و ڕۆژ کار بکەین، بەچەند ڕۆژێك ئەو بەربەستە درووست دەکەین.

پاشا بە ڕوخساری حەکیمانەوە لێیانی ڕوانی و گوتی:

- زۆر باشە، وەلێ ئێمە شوورا درووست ناکەین، ڕەنگە بتوانن بیشکێنن.
- ئەی چی درووست بکەین؟
- قۆرتێك بەدەوری شاردا درووست دەکەین، پەنجا میتر قووڵ بێت، ئەگەر دابەزینە ناوی، تیا گیر بخۆن.

دەنگێکی بەرزی مێینەیەك لەشوێنێکەوە هات، تەماشام کرد، ئافرەتێکی گەنجم بینی بە پاشای گوت:

- باوکە بمانەوێ و نەمانەوێ لە ڕووبارەکەوە دێن، هەر بەمەلەش دێنە ناومان، خۆت دەزانیت ئەم ڕووبارە لە( شیلۆن )ەوە دێت و بەنێو شارەکەماندا تێدەپەڕێت.

ئەوە خاتوو میر (سواع)ی کچی پاشا (ود) بوو، بەدەر لەوەی سەراسام بووم لە بەرەنگاربوونەوەیان بۆ دێوەکان، زیاتر عەقڵیان سەرسامتری کردم. یەگۆس.. گەنجێکی بەخۆ بوو، پێدەچوو جەنگاوەرێکی چاو نەترسیش بێت، دوای (سواع) هەڵیدا و گوتی:

– ئەگەر بە مەلەوانیش هاتن دەتوانین تیری گەورە گەورە دروست بکەین، بە کەوانەی زۆر گەورە کە چەند کەسێك لەتیروکەوانان رایبکێشن و تێیان بگرن.

یەعووق میری ئاو لەشاری عەدەن کەچەڵێکی چاو شین گوتی:

– ئەوسا دەچنە بن ئاو و لەهەموو لایەکەوە بۆمان دەردەچن، گەورەم تەنها یەك رێگا هەیە، بەری ئاوەکە بگرین.

پاشا بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی. یەعووق گوتی:

– بەڵێ گەورەم.. وابکەین تیمێك هەزار کەسی بەرد لەچیاکەوە بێنن، بە رێك و پێکی لەناو ئاوەکە ریزی بکەن، تا بەری ئاوەکە دەگرێت، ئەوجا لەسەر ئەو کەڵەکە بەردەش شوورایەك دروست بکرێت.

دەنگێکی گاڵتەجاڕ هات، پیاوێکی گەنمڕەنگ و تووکن، خەسڵەتی گاڵتەجاڕی پێوە دیاربوو، بێ گرنگیدان بەدۆخەکە گوتی:

– بەردەکانی بەربەستەکە یەك یەك هەڵدەگرن، تا ڕێڕەوی ئاوەکە دەکەنەوە، وەك ماینی ئاوی لەبن ئاوەکەوە بۆمان دەردەچن.

ئەوجا شووشەیەك مەی هەڵداو دەمی سڕییەوە، بێ زیاد و کەم ئەو کەسە (نەسر)بوو، بەڕاستی پێگەی نازانم، وەڵێ لەبنەماڵەی پاشایە. یەگووس بە تووڕەییەوە پێیگوت:

- کەس ئەما مەیخۆر ڕێمان پیشان بدات.

نەسر شووشەکەی بەرز کردەوەو گوتی:

- ئەم (مەی)ە کە تۆ گاڵتەی پێدەکەیت، هەر ئەمە دەتوانێت ئێوە لەو درندانە ڕزگار بکات.

هەر هەموو چاویان تێبڕی، چون ئەوەی بیانەویٚ لەکەللەی بدەن تا بێدەنگ بێت، وەلیٚ کاتیٚ پیلانەکەی خۆی گوت، تەواو سەریان سوڕما. ئەو (نەسر)ە عەقڵی شەیتانی هەبوو.

***

## هەر شمشێرێکت لەکوێر ڕاوەشاند، درکی پێناکات

- سەهم.. کارت بەسەر ئەوەوە چییە؟

بەرامبەر ماماوای ناحەز وێستام و پێمگوت:

- گەورەم.. بۆ ئەوە بۆ عەدەن چووم، تا بارودۆخی ئەو شارە بپشکنم، ڕووباری نیل بەخوێنی خەڵکی شیلۆن سوور بووە، ئەو سوورایەتییە بەوانیش گەیشتووە، دەترسێم خۆیان تەیار کردبێت بۆ ڕوو بەڕووبوونەوەمان.

(باراکا)ی دەموددان قێزەون گوتی:

- ئای لە گێلی ئەو کورتە بالآنە، وا دیارە عەقڵیشیان وەك خۆیان بچووکە.

بزەخەنەیەکم بۆ ساوێلکەییەکەی کرد و گوێم پیٚ نەداو بەماماوای سەرکردەم گوت:

- گەورەم.. ئەگەر بمانەوێت لەهەوەڵین هێرشبردندا لەناویان بەرین، وای بەچاك دەزانم خۆمان دابەش بکەین، لەهەر لایەکەوە بەچواردەوریاندا بچینە ژوورەوە، نەك لە یەك لاوە شاڵاو بەرین، دوور نییە ئەوانیش لە ئامادەباشیدا بن، شتێکیان داهێنابێت کە ئێمە لێی ئاگادار نین، وەك دەزانن عەدەن شارێکی گەورەیە، وەك شیلۆن بچووك نییە.

ماماوای بڕیاریدا بەگوێرەی پیلانەکەی من بۆ عەدەن بچن. چەند ڕۆژێکی نەبرد و لەشکری دێوەکانی (نیفیلیۆم) بۆ لەناوبردنی هەر بنیادەمێك لەسەر زەوی بەرەو عەدەن کەوتنە ڕێ، نیفیلیۆم.. بەزمانی ئێمە یانی داگیرکەران دێت. لەهەموو لایەکەوە بەرەو عەدەن بەڕێ کەوتین، لەشکرەکە دوو ڕیزی درێژ بوون، لەسنووری عەدەن نزیکەوە بووین، زەوی بەژێر پێیانەوە دەلەرییەوە، هەوەسی خوێن مژین پڕی کردبوون، نەتدەزانی خوێنی بنیادەمە لەگیانیاندا دەگەڕێت یا چی وایلێکردوون بە پەرۆشی ئەو هێرشەوە بن. کاتێ پێیان بەخاڵێکی دیاری کراو گەیشت، نە گەورەیان و نە بچووکیان بەو کارەساتەیان زانی کە تێیکەوتن، نە لەپێش و نە لەدوا بۆیان هاتن، وەڵێ لەژێرەوە بۆیان دەرچوون، بێ هیچ پێشهاتێك زەوی قووتیانی دا.

بیرۆکەی خاتوو مەی. (سواع) بوو، لەسەر پیلانی پاشا (ود) و بیرۆکەکەی (نەسر)ی شەیتان ئەو چاڵە گەورەیەی خەڵکی عەدەن بەدەوری شارەکەوە هەڵیانکەندبوو، بەگژوگیاو قامیش و خۆڵ شاردبوویانەوە، بەو ئاوایەی دێوەکانی تێکەوێت، تەماشای دەموچاوی (نیفیلیۆم)ەکانم کرد لەو چرکە ساتەی کەوتبوونە ناو چاڵەکە، بیرم لەعەقڵی بنیادەمەکان کردەوە کە چۆن عەقڵیان بەسەر هەوەسبازی و خوێنڕشتنی دێوەکان سەرکەوتووتر بوو. لەناو چاڵەکە بەسەر یەکا کەوتبوون، ئەوجا بیرۆکەکەی (نەسر)ی سەرخۆش

هاته ئاراوه، دێوەکان لەناو چاڵەکە هەستیان بە بۆنێکی خۆش کرد، دواتر کارەساتەکە لەسەرەوە بۆ خوارەوە دەستپێکرد، هەزاران مەشخەڵی ئاگر بۆ سەر دێوەکان فڕێدرانە خوارەوە، دێوەکان نەیانزانی چ باسە، وەلێ ئەو شلەیەی زێڕیان کە پێی ڕاهاتبوون لێیان خواردەوە، دواتر ئاگریان تێبەربوو، ئەو شلەیە مەی بوو، کە نەسر پێشنیاری کردبوو.

نەسر شێتی گرتی، لەڕۆژانی ڕابردوو هەرچی ڕەزی تریّ بوو، کۆی کردەوە، هەرچی هەنار و هەنجیر بوو ڕنییەوە، چەندین تەن مەی پێدرووستکرد، فەرمانی بەخەڵکەکە کرد لە بەرمیلی بنێن و لەچاڵەکانی ڕۆکەن، ئەوەندەیان لەچاڵەکە هاویشت، وەك ئەوەی گۆماو درووست بکەن، دوای ئەوەی دێوەکان کەوتنە چاڵەکەوە، خەڵکەکەیش مەشخەڵەکانیان هاویشتە چاڵکە، دێوەکان گڕیان تێبەربوو، نەسر بەگاڵتە جاڕییەوە گوتی:

- هیوادارم (مەی)یەکەی منتان بەدڵ بووبێت، چەندین تەنمان بۆ پێشوازیتان درووس کردووە، ئاخر گەدە پیسەکانتان شایانی گڕ گرتنە بۆ ئەوەی مێرشەکەتان دەرئەنجانی باشی هەبێت، نۆشتان بێت.

هاواری کەسێك لەسووتانا ئازار بەخشە، ئەی چی بەوە دەڵێیت لەیەکڕا هەزاران کەس بسوورتێن؟ لەبەر هاوارو ناڵانەوەیان هەرچی گیانەوەر و باڵندە بوو لەو دەڤەرە هەڵاتن، خەڵکی عەدەن سەرکەوتنیان بەدەست هێنا. وەلێ ئەوە کۆتایی کارەساتەکە نەبوو، هەموو دێوەکان نەکەوتبوونە چاڵەکە، ڕاستە نیوەیان سەریان تیاچوو، ئەوانەی مانەوە جەستەیان نەسووتابوو، وەلێ دڵیان ئاوری گرتبوو، ئەوەش ماتای ئەوەبوو تۆڵەکردنەوەی بەدواوەیە. کاتێ ئاگرەکە دامرکایەوە، گوێمان لە هەنگاو هەڵهێنانیان بوو، بەسەر زەوییەکەدا ڕاپاندەکرد، کە دیقەتم دا، ماهاوای بەرەو چاڵەکە غاری دەدا،

ماهاوای بەسەر چاڵەکەوە قەڵەمبازێکی دا،چاوم زەق لێکردەوە، لەوبەر خۆی گرتەوە، کە دەکاتە خاکی عەدەن، بەهەموو پق و کینەو تۆڵەسەندنەوە هاواری کرد، سەدان دێو، نەخێر هەزاران دێو بەدوایەوە بەسەر چاڵەکە بازیاندا، وەلێ خەڵکی عەدەن هەموو ڕێ و شوێنێکیان بۆ ئەو هێرشە ئامادە کردبوو، دەبوو چاڵەکە پانتر بوایە تا باز بەسەریا نەدەن.

***

## بۆ کوێ بڕۆن مردن لە پێشتانە

دێوەکان کە لەو بەری چاڵەکە خۆیان گرتەوە، هەر هەموویان نەبوون، ئەوانەی کەتەو قەڵەوتر بوون نەگەیشتە ئەوبەری چاڵەکەو کەوتنە چاڵەکەوە، هەندێکی تریان هەر کە دەستی بە قەراغی ئەوبەری چاڵەکە گەیشت، توانی سەرکەوێت و بگات بە ماهاوای، دێوەکان تووڕەیی چاویانی کوێر کردبوو، ئەو خەڵکەی بەردەمیان پلیشاندەوە، خەڵکە بێ ئومێدەکەش بە شمشێر لێیانیان دەدان و لاقیانیان بریندار دەکرد، دواتر بەهەموو لایەکدا هەڵاتن، خەڵکانێکی تر کەوتنە وێزەی دێوەکان، کە دەیانوویست بە قەراغ چاڵەکەوە سەرکەون، لێ دیوەکانی پاڵیانیان نایە چاڵەکەوە، بەژێر پێی دێوەکانەوە فلیقانەوە.

دێو (باراکا)ی کەچەڵی ناشرینم بینی، لەنێو شەڕەکەدا دەستی درێژ کرد و (نەسر)ی پاڵەوانی گرد، خۆزیا دەموچاوی (باراکا)ت دەبینی لەبەرامبەر ڕوخساری (نەسر)ی گاڵتەچی چەند تووڕەبوو. ئەگەرچی نەسر لەژێر چنگی (باراکا)دا بوو، وەلێ نەسر هاواری کرد:

– بەخێر بێی ئەی ددان ناشرین، بمبە هەندێ گرم بدە.

باراکـا دەسـتی بەجەسـتەی (نەسـر) ەوە لـەرەدابوو بیفلیقێنێتـەوە، گـورم بەخۆم دا تا نەسر ئازاد بکەم، وەلێ بینیم نەسر لەبـەرکی خـۆی شووشـەیەك مـەی دەرهێنـا، ئـاگرێکی هاویشـتە نـاو شووشـەکەو ئـەوجا بـۆ نـاو دەمـی (باراکا)ی تێگرد، باراکا دەستی لەنەسر بـووەوە، بـەدەم هـاوارو ئاورەکـەی ناو دەمی ، غاری دەدا، نەسر بەسەر پشتا بەرەوە بوو، برێ جنێوی تایبەت بەخۆی بەدێوەکان دا. نیوەی ئەو دێوانـەی ئاگریـان تێبـەربوو، چـاڵەکەیان بڕی و چوونە خـاکی عـەدەن، دێـو ماهـاوای ئـاوڕی لـەو دیوانـە دایـەوە کـە نەیاندەتوانی بپەڕێنەوە، پێیانی گوت:

- هەی هیچ و پووچانە لەجێی خۆتان مەجووڵێن، نـاتوانن بـۆ خۆتـان پردێك درووست بکەن و بپەڕێنەوە، ئاقێکمـان بەدەستەوەیە، کـە شەومان بەسەردا هات، لەسەر زەوی کوێرمان دەکەینەوە.

مـاهوای ڕووی وەرچـەرخاند تـا بـەدێوەکان بگـات، یەکـەم شـتێك هەسـتی پێکرد، کەس لەناو خاکی عەدەن نەمابوو، لەناکاو دێوەکان چاویان بە تیری بچووك بچووك کەوت، لەشـوێنێکەوە تێیانـدەگرتن، بەتووڕەبییـەوە هاواریـان کرد، چاویان بە بنیادەمگەلێك کەوت لەناو ڕێڕەوی ڕووبارەکەی نیل و لـەناو عەدەن خۆیان مەلاس دابوو، ئەوە دوای ئەوەی سـتێلکیان لـەناو ڕووبارەکـە درووست کردبوو، دێوەکان خۆیان هاویشـتە نـاو ڕووبارەکـە، دوای لابردنـی بـەردەکان سـتێلکەکە شـکا، ئـاو دێوەکـانی ڕامـاڵی، دێوەکـان دوای بنیادەمـەکان کـەوتن، لـەپڕ چـاڵێکی فـرە گـەورە بەڕوویانـدا کرایـەوە، بنیادەمـەکان تێیکـەوتن، ماهـاوای چـون ئـەوەی هەسـتی بەشـتێك کردبێـت هاواری لێکردن:

- هەی گەمژەیل بگەڕێنەوە.

وەڵێ کار لەکار ترازابوو، کەچەڵییەکەی (یەعووق) دەرکەوت، هەردوو چاوە شینەکانی دەرکەوتن و هاواری کرد:

- سەهم هەر ئێستا.

لێرەوە نۆرەی من هات، دەستم دایە گوریسێکی درێژ و ڕامکێشا، سەدان خەڵکی عەدەن لێلمدا ڕایانکێشا. دەزانی ئەو گوریسە چیبوو؟

یەعووق میری ئاو کاتێ بەربەستەکەی دروستکرد، وای دروستکرد چینێك لەبەردەکان خز بن، تا کە گوریسەکە ڕاکێشرا بەربەستەکە برمێت، هەرواش بوو. لەبێ ئاگایی دێوەکان بەربەستەکە ڕووخا، ئاو بەلێشاو هاتە ناو ڕێڕەوی ڕووبارەکە، ئەو چاڵەگەورەیەی خەڵکی عەدەن دروستیان کردبوو، لەناوەندی ڕێڕەوی ئاوەکە تەنگ کرابووەوە، تا بنیادەمەکان بتوان نبۆ قەراخ ڕووبارەکە بڕۆن و لە سێلاوەکە دەربازبن، کەچی لافاوەکە سەدان دێوی بەمل یەکا دادا، لەگەڵ ڕێڕەوی ڕووبارەکە تا دووری دەیان میل ڕاپێچکران، هەر هەمووشیان خنکان، بە مل یەکدا کەڵەکە بوون.

عەقڵی بنیادەم سەردەکەوت، عەقلگەلێك زانستی (ئیدریس)یان تۆش کردبوو، بەو زانستە خۆیان پاراست، لەگەڵ هەر سەرکەوتنێکیاندا شۆڕشی دێوەکان زیادی دەکرد، تا گەیشتە ئەوپەڕی، دێوەکان شمشێریان هەلگرت، هەندێکیشیان قامچیان بەدەستەوە گرد، ما بەدووی بنیادەمەکان بگەڕێن بەوپەڕی دڵڕەقی و تووڕەییەوە، لەهەر شوێنێك خانووی بنیادەمەکان بوو وێرانیان کرد، سوێندیان خوارد تۆڵە لە بنیادەمەکان بکەنەوە.

***

## کە ئەشکەنجە هات، جیاوازی لەنێوان بەدبەخت و بەختەوەر ناکات

هێشتا هەزاران دێو لەڕەگەزی(نیفیلیۆم) لەخاکی عەدەن دەگەڕێن هەرچی بنیادەمە بیانکوژن، تا قڕیان بکەن. لەشوێنێکی دوورەوە دەنگی (سیسارک)ە کەچەڵەکانی (تیراتۆرن)ی زەبەلاح دەهات، دێوەکان تەماشایان کرد، پۆلێک سیسارکە کەچەڵی زەبەلاح بەرەو لایان دێن، دەمیان داچەقا، ئەوان سیسارکە کەچەڵی تیراتۆرنیان دەناسی، وەلێ بەبان پشتیانەوە بنیادەمیان هەڵگرتبوو، هەندێکیشیان بەبان ملیانەوە بوون، خاتوو میر (سواع) بەسەر پشتی یەکەمین سیسارکە کەچەڵەوە بوو.

خودا بەزەیی بە بنیادەمەکان هاتەوە، چەند جەستەیان بچووکتر بوایەتەوە، گیانەوەرەکانیشی بەپێی سەردەمیان بچووکتر دەکردەوە، لێ هەندێکیان وەک خۆیان مانەوە، وەک سیسارکە کەچەڵی تیراتۆرن، کە هەر بەزەبەلاحی لەسەردەمی (ئادەم)ەوە وەک خۆیان مابوونەوە ، بنیادەمەکان لە میراتی زانستەکانی (ئیدریس)ەوە فێرببوون چۆن دەستەمۆیان بکەن و سواری پشتیان بن. سیسارکە کەچەڵەکان بەسەر سەری دێوەکانەوە دەفڕین، وەک ئەوەی هەر نەبووبن، یا بەدووی شوێنێکی تردا بگەڕێن، بڕێ لەدێوەکان ویستیان دووی پۆلە باڵندەکان بکەون، ماماوای هاواری لێکردن:

– لەجێی خۆتان بوەستن، ئەوە پیلانێکی تریانە.

ماماوای قامچییەکی بەحەواوە ڕاوەشاند و گوتی:

– دوویان مەکەون، لەو ڕەگەزە هیچ و پووچانە بگەڕێن، لەکوێ خۆیان شاردووەتەوە دەریانبهێنن، ئەوجا پارچە پارچەیان بکەن.

خاتوو میر سواع پۆلە باڵندەکەی بۆ شوێنێکی تر برد، ئەو چاڵە قووڵەی دێوەکان خەریکی دروستکردنی پرد بوون بەسەریەوە، تا بە ماماوای و

(دێو)ەکانیتر بگەن. دوای هەرسهێنانی ستێڵکەکە ڕاوەستان، لەناو چاڵەکە دەرچوون، ئامادەکارییان کرد لەڕووبارەکەوە تۆڵەیان لێ بستێنن، هەر کە تەماشای ئاسمانیان کرد، پۆلێ لەسیسارکە کەچەڵی تیراتۆرن بەسەریانەوە، فریای ئەوە نەکەوتن دەست بکەنەوە، خاتوو میر سواع فەرمانی بە خەڵکەکەی سەر پشتی سیسارکە کەچەڵەکان دا، تۆڕە گەورەکان بهاونە خوارەوە بۆ سەر دێوەکان، کە هێشتا لەناو چاڵەکە گیریان خواردبوو. تۆڕەکان زۆر گەورەبوون، ئافرەتانی عەدەن هۆنیبوویانەوە، دێوەکان دەستیان ڕادەوەشاند، تا لەتۆڕەکان ڕزگاریان بێت، تا ئەوان زیاتر دەستیان ڕادەوەشاند، تۆڕەکان زیاتر پێیانەوە دەئالاً، لەو ئان و ساتەدا یەعووق دوا فیڵی خۆی لێ خستە گەڕ.

جۆگەیەکی لەنێوان ڕێڕەوی ڕووبارەکەو چاڵە قووڵەکە کردەوە، جۆگەکەی بە بەربەستێکی بچووك گرت، دوای ئەوەی تۆڕەکانیان هاویشتە سەر دێوەکان، کاتی ئەو هات و ئیشارەتی بۆ پیاوەکان کرد، بەربەستەکە بشکێنن، ئاوی ڕووبارەکە هوروژمی بردە ناو ئەو چاڵەی دێوەکانی تێدابوون، دێوەکان هاواریان لێ هەستا و بەوای تۆڕەکانیشەوە نەیانتوانی مەلە بکەن، هەر هەموویان لەناو چاڵەکە خنکان، تەنها ئەوانەی لەدەرەوەی چاڵەکە بوون مانەوە، ئەوانیش لەترسا هەلاٌتن. لەناو شاریشدا دێوەکان بە چەکەوە ناو شاریان کۆنترۆڵ کرد، چەندین کاتژمێر بەدوای خەڵکەوە دەگەڕان، لەم گەڕەکەوە بۆ ئەو گەڕەك، تا بە گەڕەکی (ماتاریمۆن)ی نزیك چیاکە گەیشتن، لەوێ بنیادەمەکانیان بینییەوە، ئەوجا تۆڵە دەستپێکرد.

***

# دوا پەناگەی ڕزگاربوونت ئەو چەکەیە کە بەدەستی خۆت درووستی دەکەیت

ئەوەکانی دوای ئەوەی ئادەم بالآیان لەکورتی دەدا، شارەکان خانووی گەورەیان تێدا دروستکرابوو، ئەوەکانی دواتر خانووە گەورەکانیان ڕووخاند و خانووی بچووکتریان لەشوێنی دروستکرد، ئەوە لەمینار و شیلۆن و لە (عەدەن)یش ڕوویدا، وەلێ خەڵکی عەدەن خانووە گەورەکانی سەردەمی ئادەم و حەوا و پێغەمبەرەکان تا سەردەمی ئیدریس وەك خۆیان هێشتیانەوەو نەیانڕووخاند، بەلای ئەوانەوە نیشتینگەی پیرۆزن، ئەو خانووانەش لە گەڕەکی ماتاریمۆن بوون، ئەو خانووانە وەك خانووی دێوەکان گەورەبوون، لەڕاستیدا هەموو خەڵکی عەدەن خۆیان لەناو ئەو خانووە گەورانە وەرشاردبووەوە، بەو ئاوایەی بەدێوەکان نەدەڕووخان. دێوەکان گەیشتنە گەڕەکی ماتاریمۆن و بینیان هەموو دەرگاکان بە ئاسن کلۆم دراوە، زانیان خەڵکی عەدەن لەناو خانووەکاندا خۆیان شاردووەتەوە، ماماوای هاوارێکی لەدێوەکان کرد، هەریەمووویان بەتوورەییەوە هێرشیان برد، وەلێ بنیادەمەکان عەقڵێکی سەربازیانەیان هەبوو، یەگووس.. ئەو ڕۆژەی کرد بە داستان، شارستانییەتەکان ناویان لێنا (ئەبۆلق). لەپڕ پەنجەرەکان کرانەوە، لەهەر پەنجەرەیەك پێنج زەلام تیروکەوانێکی گەورەیان پێبوو، تیرەکان بەقەد ڕاجەی دار گەورەبوون، تا دێوەکانی پێ تیرباران بکەن، سێ لە پیاوەکان کەوانەکەیان ڕادەکێشاو یەکێکیش تیرەکەی دەخستە بەر کەوانەکە، ئەوی پێنجەم ئاراستەی تیرەکەی بۆ سەر دێوەکانی لەسەر بوو، لەیەکرا پەنجەرەکان کرانەوەو تیروکەوانەکان خرانە سەر پێ و بە ئاراستەی دێوەکان تیرەکانیان هاویشت، ئەوانەی لەپێشەوە

بوون پێکران، تیروکەوانەکان بەردەوام بوون لە تیر هاویشتن. ماهاوای هاواری لەدێوەکان کرد:

- بچنە پشتی خانووەکان و دیوارەکان برووخێنن.

دەستبەجێ بۆ دواوەی بیناکان سووڕانەوە، دەستیان دایە گابەردی زل و بەهەموو هێزیانەوە لەدیوارەکانیان دەگرت، لەبان سەربانی بیناکانەوە دەستەیەکی تری تیروکەوانان لەیەکڕا تیربارانیانیان کردن، تیرەکان ژاراوی کرابوون، بۆ دێوەکان وەك دەرزی ژاراوی وابوو، دەچەقییە لەشیان و لەگۆیانیان دەخست، ئەوە دوا سەنگەری خەڵکی عەدەن بوو. ماهاوای بلەز هاواری کرد:

- بکشێنەوە، هەر ئێستا بکشێنەوە.

دێوەکان بە پەلە پاشەکشەیان کرد و تەماشای بنیادەمەکانیان دەکرد، کە بەتیروکەوانەوە لەسەربان و پەنجەرەکانەوە لە ئامادەباشیدا بوون، یەك لەدێوەکان هاتە لای ماهاوای و گوتی:

- گەورەم.. زۆربەی ئەو دێوانەی خەریکی پرد دروستکردن بوون، تیاچوون و لەڕووبارەکە خنکان، ئەودوای دێوەکانیش هەڵاتن.

ماهاوای لەناخەوە گڕی گرت و گوتی:

- چۆن خنکان؟

دێوەکان بەنیازی قسەی تربوون، ماهاوای بە لێو گەزتنێك قسەکەی پێ قاچی و گوتی:

- ئەوان خۆیان بۆ هەموو شتێك ئامادە کردبوو، دەیانزانی ئێمە هێرشیان بەسەرا دەکەین، هەرچی ئێمەبووین، ئەو ئامادەکارییەمان نەکردبوو، ئەوە خاڵی سەرکەوتنی ئەوان بوو.

ماهاوای هاواری کرد و گوتی

– بەڵام دوای ئەمە وانابێت.

تەماشایەکی خانووەکانی (ماتاریمۆن)ی کرد و لەچاوەکانییەوە ئاگری ڕق دەباری، فەرمانی بەدەستەیەك لە دێوەکان داو گوتی:

– بگەڕێنەوە شارەکەی خۆمان، مەنجەنیقی بەردە ئاگرینەکان بێنن.

دواتر چرۆچاوی گرژ کردەوەو هەموو ڕقی ناخی دەربڕی و گوتی:

– دوا شەویان لێ دەکەین بەدۆزەخ.

***

## ئەگەر درندە زیرەکی تیا ڕسکا، ئاشتەوایی سەر زەوی لەکەمی دەدات

مرۆڤ ئەگەر بیری کردەوە، بیرکردنەوەکەی یا وێرانکارییە یانەخۆ بنیاتنەرییە. مرۆڤەکانی عەدەن هەموو فێڵێکیان بەکارهێنا، تا بەزیندوویێتی بمێننەوە، وەلێ ئەو شەوە دوای هێور بوونەوەو ئارامییەکی زۆری دێوەکان کە داهات، تەنانەت خەڵکی عەدەن وایانزانی بڵاوەیان لێکردووە، لەپڕ ئاسمانی شار چون ئەوەی گڕی گرتبێت، ئاگرباران بوو، بەوای بەردەئاگراوییەکانی دێوەکان دیواری خانووەکان ڕووخان و ئاگر لەخانووەکان بەردرا، دەیان هەزار خەڵکی عەدەن لەحەشارگەکانیان هاتنە دەرەوە، ئەوەی سووتا سووتا و ئەوەی پریشکی ئاوری بەرکەوت و ئەوانەی لەتاو ڕوحی خۆیان هەر هەموو هەڵاتن، تا ڕزگاریان بێت، (یەعووق) هاواری لێیان کردو لایەنگرانی دوای ئەو بۆیان سەندەوە:

– بۆ خانووە ئاساییەکانتان بڕۆن، هۆ خەڵکی عەدەن لە دەشتەوە مەبن، مەترسن ئەو مووشەکە ئاگراوییانە لەکار دەخەین.

لەناوەندی چەرە دووکەڵی ڕەش، ئەو دەمەی هەموو هەر هەڵدەهاتن و لەدێوەکان دوور دەکەوتنەوە، پیاوێک دەرکەوت، پێچەوانەی هەڵاتووەکان ڕوو بەڕووی دێوەکان غاری دەدا، پیاوێك بەریشی چەرمۆوەو لەش و لارێکی ڕێك و پێك، ئەویش پاشا(ود)بوو، ڕاستەوخۆ بەرەو خاکێك ملی دەنا، ڕێك بەرەو یەکێك لەدێوەکان، ئەویش شەیتانی ڕەش ماماوای بوو، ماماوای باوەڕی نەدەکرد ئەوە ڕاستی بێت، دەنا گەمژەییە شاڵاو بۆ ماماوای بەرێت.

لەناو دووکەڵەکە سایەی پیاوێکی بچووك دەرکەوت، ڕوو بەڕووی ڕایدەکرد، ماماوای بیری لەگەمژەیی ئەو کەسە دەکردەوە، پیاوە بچکۆلەکە دوو شمشێری گەورەی دەرهێنا، پاشا وەك بیەوێت مێژوویەك بۆ پاشایەتی خۆی تۆمار بکات، بەدەم غاردانیەوە، زنجیرێکی بەدەمەوە بوو، بەددان گرتبووی، بەرەو لاقی ماماوای بەغاردان ڕۆیشت، هەردوو باڵی لێکردەوە، بەهەر دەستێکیشیەوە شمشێرێکی گرتبوو، شمشێرەکانی دەماری لاقی ماماوای بڕی، هەردوو چۆکی پێ دادا، ئەوەی باوەڕ نەدەکرا ڕوویدا.

پاشا چووە سەر جەستەی ماماوای و شمشێرێکی لەگەدەی ماماوای چەقاند، ئەوجا ماماوای پشتی کۆڕ کردەوە، ئەوە نەبوو ئەو شمشێرە بیکوژێت، دواتر دەرکەوت پاشا (ود) بۆ ئەوە لەگەدەی نەچەقاند بیکوژێت، بەڵکو ویستی شمشێرەکە بکات بە پایەیەك تا سەرکەوێتە سەر پشتی، پاشا زنجیرەکەی هەر بەددان گرتبوو، خۆی گەیاندە سەر شانی ماماوای، هەردوو شمشێرەکەی فڕێداو زنجیرەکەی بە مل (ماماوای)یەوە ئاڵاند، دواتر هاواری کرد:

- تیر!

منی دێو (سەهم) دەرکەوتم و لایەکی زنجیرەکەم گرت و بەهەموو هێزمەوە ڕامکێشاو دوورکەوتمەوە، ئەوسەری زنجیرەکە بە بینایەکەوە شەتەك

درابوو، ماهاوای وەك گوێرەكە هاواری دەكردو هەوڵی دەدا سەری بەرز بكاتەوە، بڕێ لەدێوەكان ویستیان دوام كەون، وەلێ تیری ژاراویان بۆ هات، خولەكێكی پێنەچوو دێوە ڕەشە كەوتە سەرزەوی، پاشا (ود) قەڵەمبازێكی دا، كە بۆ تەمەنی ئەو نەدەبوو.

دێوەكان بێدەنگییەك دایانیگرد، سەركردەكەیان وەك گا كەوتبوو، لەیەكترییان ڕوانی، دێو نەریمان هاوارێكی لێیان كرد:

- هاوڕێیان تۆڵە بۆ سەركردەكەتان بكەنەوە، تۆڵە بۆ هاوڕێكانتان، ئەو جرجانە بكوژن.

شمشێرەكان لەكالآ دەرهێنران، قەمچی و ئەو چەكانەی تر كە لەشارەكەی خۆیان هێنابوویان، دەستەكان بەچەكەوە بەرز كرانەوە بۆ تۆڵەسەندنەوە، هەراو هوریای دێوەكان بەرزەوە بوو.

***

## ئەگەر خەڵقەندەی خودا بشێوێنیت، ئەوا خوڵقەندەی خودا بەسەرتا هەڵدەگەڕێتەوە

**ئیمەی دێو لەكوێوە هاتووین؟**

لەزانستی تێكەڵكردندا كە ئیدریس فێری كردین، وەچەی بنیادەم بەپێی سەردەمەكان بەرەو بچووكی دەچێت، وەلێ (كین) كە سەرپێچی فەرمانی خودای كرد، نەوەیەكی لەهاوسەرگیری حەرام پێكهێنا، بەو شێوەیە وەچەكانیان شێواندنێكی سەیریان بەسەردا هات. هاوسەرگیرییان لەدەرەوەی هیناردا نەدەكرد، تا ڕۆڵەكانی خودا هاتنە ناو شارەكە، لە وەچەی خۆڕسكبوون، كە ئەو دوو وەچەیە تێكەڵبوون، شێواندنێكی تر

سەری هەڵدا، وایکرد خەڵکی هینار بەپێی سەردەم باڵایان لەکورتی ئەدات، ئەوانی تریش هەروەك بە باڵای خۆیـان مانـەوە، لەنـەوەکانی داهاتوودا لێـل کورتە باڵاکـان مشتومڕیان بـوو، ئـەو ڕۆژە ڕەشـە هـات، دێوێکی ڕەشتاڵە سەری هەڵدا و کۆمەڵێك لـەو دێوانـەی لەچیاکاندا دەژیان لـەخۆ گـرت، ئـەو کۆمەڵە ڕێگرە کەوتنە وێزەی خەڵکی هینـار و کورتـەباڵاکانیان لـەناو بـردن، چاویان لەشیلۆن بوو، دواتریش لەعەدەن.

ئەوەتا دوکەڵەکە دەڕەوێتەوەو هەزاران بنیادەم لەبەردەم سێ هـەزار دێـوی چەکدار هەڵدێن، دێوەکان چەکێکیان داهێناوە بۆ قڕکردنـی کورتـە باڵاکـان، وەك ئەو گوریسەی بەدەست ئەو دێوەی لەوێیە، گوریسێك شمشێرێکی تیـژ بەسەرێکی گوریسەکەوە بەستراوە، سـەرەکەی تـری بەدەست دێوەکـەوە، لێل ڕاوەشـاندنی بنیادەمەکەی پارچـە پارچـە دەکـرد. بەڕاسـتی کوشـتن و بڕینێکی گەورەبوو، خەڵکەکە بەرەو خانووەکـان غاریـان دەدا، (یەعووق) و لایەنگرانی هاواریان لێ کردن:

- لەژێر شتومەکی ناوماڵەکانتان خۆتان بشارنەوە.

هەنـــدێکیان هێشـــتا دووکەڵەکـــە بەتـــەواوی دانـــەمرکابووەوە، خۆیـــان بەخانووەکانیان گەیاند، هەندێکی تریان دووکەڵەکە نـەمابوو، هـەوڵیان دەدا بـەخانووەکانیان بگ ەن، هەنـدێکی تریـان لـەخانووەکانیان زۆر دوور بـوون، دێوەکـان کەوتنـە وێـزەی سـێیەمین بڕیـان، ئـەودوای دێوەکـان خـەریکی ڕووخاندنی خانووەکان بوون. خاك خوێنی دەیان هەزار خەڵکی بـێ گونـاهی تیا ڕژا. لەپڕ دەنگی پۆلێك سیسارکە کەچەڵ هات، دێوەکان لایـان لەپشـتی خۆیان کردەوە، خاتوو مێر (سواع) پێشڕەوی پۆلـە سیسـارکەکەی دەکـرد، ئەوجا ڕوو بەڕووبوونەوەیەکی تر ڕوویـدا، وەلێ جیـاوازتر لـەوەی پێشـوو کـە ڕوویدا.

## ئەوەی سیسارکە کەچەڵ دەستەمۆ دەکات، هەموو شتێکی پێ دەستەمۆ دەکرێت

دەستەمۆ کردنی سیسارکە کەچەڵی زل و زەبەلاح لەو سەردەمەدا و لە لایەن خەڵکەوە بۆ چاودێری کردنی دەوروبەریان بووە، ئەویش بەوای ئەوەی باڵەکانی لە ئاسمانا بەکراوەیی ڕادەگرت. لەگەڵ خاتوو میر (سواع) زیاتر لە هەزار سیسارکە کەچەڵ بەئاسمانەوە بوون، بەسەر پشتی هەر سیسارکە کەچەڵێکیش بنیادەمێکی پڕ چەک لەتیروکەوان بەدەستەوە، ئەوەی لەدێوەکان مابوونەوە لەسێ هەزار دێو زیاتر نەبوون. هەر کە هەل بۆ سیسارکەکان دەڕەخسا، چرنووکیان لەپشتیان گیر دەکرد، بەر لەوەش پیاوەکان تیری ژاراویان تێدەسرەواندن، دێوەکان هیچیان بۆ نەمایەوە لە هەڵاتن زیاتر، هەر دێو بوو بەدەم هەڵاتنەوە دەیبۆڕاند، هەر دێو بوو لەپڕ بەردەبووەوە، ئەوەی جێی باسکردنە دەنووکگرتنی سیسارکەکان بەقەد دە خەنجەر کارێگەری هەبوو، ئێدی هەڵای سەرکەوتنی بنیادەمەکان بەرزەوە بوو، تا چاو بڕی دەکرد دێوەکان لەهەڵاتن نەدەکەوتن، سیسارکە کەچەڵەکانیش بەدوویانەوە جەربەزەیان دەدان.

شاری عەدەن ئاهەنگی سەرکەوتنیان گێڕا، ئەو ڕۆژە گەورەترین داستانیان گێڕا، باوەڕ ناکەم ا ‹مێژوودا ئەوە دووبارە بووبێتەوە، ئەو ڕۆژە چاوت لەو شارە بوایە، لەبەر لاشەی دێوەکان جێی پێ نەدەبووەوە، خودا ئەو سەرکەوتنەی نووسیبوو. خۆر بەرەو خۆرئاوا دەڕۆیشت و ئاسمان سووری دەکردەوە. پێنج لە بنیادەمەکان بەو پەڕی خۆشحاڵییەوە لەسەرکەوتنەکەیان دەڕوانی، بەوە زیاتر خۆشحاڵبوون کە بەشەرییەتیان ڕزگار کرد، پێنج کەس بە ئەمەك بۆ نیشتمانەکەیان.. پاشا ود و خاتوو میر

سواع و یەگووس و یەعووق و نەسر، لەڕیزیانەوە منی (سەهم)ی دێو وەستابووم.

***

# *** تەواو ***

ئەلبۆنی دەڵێت:

هێرشی دێوەکان بۆ بەدەستهێنانی میراتەکەی ئیدریس بەهەموو زانستەکانیەوە یەکەم هەوڵدانبوو، ئەگەرچی کوشتن و بڕینێکی گەورەی لێکەوتەوە، وەلێ ئەو پەلاماردانەیان شکستی هێنا، هەردوو شاری شیلۆن و مینار چوونە ژێر حوکمی پاشا (وە)و یەکیان گرت، ئەو زانستەی (ئیدریس)یش لە ئەتلەنتس پارێزرا. لەپەرتووکی یەکەمی (ئادەم)ەوە تا دەستووسەکانی ئیدریس و تەختە بەندی زومرد و دواتریش پەیامەکانی پێغەمبەران و تەنانەت ئەو نووسراوەنەش کە (کین)ی ئەندازیار جێبەجێشتبوون و هونەری زانیاری ناسین کە دامێنەرەکەی جینۆن بوو، هەر هەموو پارێزرا، تا لەسەردەمی (نووح) هەر هەموو خاکی ئەتلەنتس کەوتە ژێر ئاوەوە، گشت ئەو پەرتووک و زانیارییانە بە کەشتییەکەی (نووح) گوێزرانەوە خاکێکی تر، وەلێ لەچاوی شەیتان ون نەبووبوو.

لیۆبۆلد گوتی:

- ئەو شوێنە کوێیە ئەو زانست و پەرتووکانەی بۆ گوێزراوەتەوە؟
- لەلای دوو ستوونەکەی میسرە، لەماوڕێکەت بپرسە، ئەو هەموو شتێك دەزانێت.

دوو براکە تەماشای (بۆبی)یان کرد، ئەوجا لایان لە ئەلبۆنی کردەوە، کە گوتی:

- دوای سەردەمی پێنج داستانگێڕەکان ود و سواع و یەگووس و یەعووق و نەسر، شەیتان هەستیکرد نەوەکانی دوای ئەوان وابەستەی پاڵەوانێتیان دەبن، فریوی دان تا خەڵکەکە پەیکەری ئەمرانیان بۆ درووست بکەن، دواتر فریوی نەوەکانی دوای ئەوانیشی دا، شانازی بەمەزنی ئەوانەوە بکەن، تا وایلێهات کڕنووشیان بۆ دەبردن و دەیانپەرستن، ڕێک ئەوەش لەسەردەمی نووح دابوو.

نەوەکانی نووح نزیکەی هەزار ساڵ ئەو پەیکەرانەیان پەرست، تا لەخوداوە فەرمانێك هاتە خوارەوە، ئاگاداریانی کردەوە، خودا ئەشکەنجەیەکیان دەدات بەسەر هیچ قەومێکدا نەهاتبێت، ئەوەبوو باوبۆرانێکی هەڵکرد، هەموو گۆی زەوی بگرێتەوە، شوێنەوایشیان نەهێڵێت، (نووح)یان بەدرۆ خستەوە، کەس دوای نەکەوت، هەندێ کەس نەبێت. ئەو ڕۆژە هات جەزرەبەیان بدات، لەنێوان ستوونەکانی هێرقل ئاوی ئۆقیانووس بەرزەوە ببوون، هەموو شتێکی لووشدا، کەس ڕزگاری نەبوو، تەنیا ئەوانەی باوەڕیان بە مووح هێنابوو.

شەیتان لێیان نەگەڕا، دوای نووح ئەو پێنج خوداوەندەی بەهەموو شارستانییەکاندا دوای نووح بڵاوکردەوە، تا وایلێهات بەناوی ترەوە دەیانپەرستن، ئێدی بت پەرستی بەردەوام بوو، لای سۆمەرییەکان ناوی پاشا ود بوو بە (ئانوو)، پاشای خوداوەندی سۆمەری(ئەنووناکی)، دواتر لای یۆنانییەکان بوو بە (زیووس)و لای ڕۆمانەکانیش بوو بە (جۆبیتەر)، هەرچی خاتوو (سواع)ە بوو بەخواوەندی( ئینانا )ی سۆمەرییەکان، لای

یۆنانییەکانیش بوو بە (ئەسینا)، لای ڕۆمانەکانیش بوو بە(ڤینۆس)، تیرهاوێژی پاڵەوان (یەگووس) بوو بەخواوەندی (ئۆتوو) لای سۆمەرییەکان، لای یۆنانییەکانیش بوو بە(ئەپۆڵۆ)و لای ڕۆمانەکانیش هەر (ئەپۆڵۆ) بوو، مێری مەزنی ئاو(یەعووق) بوو بەخواوەندی دەریا(ئینکی) لای سۆمەرییەکان، لای یۆنانییەکانیش بوو بە (بۆزیدوون)و لای ڕۆمانەکانیش بوو بە(نیبتۆن)، هەرچی نەسر بوو، لای سۆمەرییەکان بوو بە (تینکاس) خواوەندی مەی، لای یۆنانییەکانیش بوو بە(دیونیسۆس)و لای ڕۆمانەکانیش بوو بە (باگووس). شوێنەواری داستانی دێوەکان لە ئاینی یۆنانییەکان دەرکەوت، ئەوانەی گوتبوویان دێوەکان بابا گەورەی (ئۆلیمپ)ە(زیوس و ئەسیان و ئەپۆڵۆ و بۆزیدوون و دیونیسۆس)، ئەو داستانەش گوایە لەنێوان خوداوەند ئۆلیمپ و دێوەکانی (تایتانین)ڕووی داوە، جەنگێکی داستانی گەورە بووە، ناویشیان ناوە (تیتانوورماکی) خواوەندی ئۆلیمپ، تێیدا سەرکەوتنێکی مەزنیان بەدەست هێناوەو خاکیان لەدەست دێوەکان ڕزگار کردووە. ئەگەرچی ئەو داستانە یۆنانیە و بۆ زۆر کەس لە ئەفسانە دەچێت، بەڵام لەتەک فەرموودەیەکی پێغەمبەر محەمەد تێیدا هاتووە، بنیادەم لەبنەڕەتدا وەك دێو زل و زەبەلاح بوونە، نەوەکانی ئادەم و حەوا وەك دێو بوونە، بالای هەر یەکێکین شەست باڵ و پانین سێ میتر بووە، یانی بەبالای بینیەکی بەرز، دواتر بالایان لەکەمی داوە، تەنانەت ئاژەڵەکانی ئەو سەردەمانەش زل و زەبەلاح بوونە، دیارە ئەوەش حیکمەتی خودای لەسەر بووە، تا بتوانن بەکاریان بهێنن لە سواری و گواستنەوەدا، نەك هەر ئەوەش بەڵکو باڵندەکانیش زل و زەبەلاح بوونە، وەك قەلەڕەش و کاسام و مشکی فلۆریس و جیجانی درندەو سیسارکە کەچەڵی تیراتۆرن. لەم سەردەمەی ئێمەشدا خەڵکی ئێسك وپرووسکی ئەو گیانەوەرانەیان دۆزیوەتەوە، تەنانەت

شوێنەواریشیان، بنیادەمەکان بالآیان لەکورتی داوە، تەنانەت بالآی نەوەکانی نووح لەئێمە کەڵەگەتربوونە، هەندێکیان بەر لە باوبۆرانەکە دەرچوون و بەزەویدا بلاوبوونەتەوە، شوێنەواری کۆنی خەڵکانێك دۆزراونەتەوە کە لە ئێمە کەڵەگەنترن. هەرچی باوبۆرانەکەبوو ئەوانەی راماڵی کە خوانەناس بوون و لە ئەتلەنتس دا بوون، نەوەك هەموو سەر زەوی، ئەو شارستانییەتەی ئەتلەنتس بەوای باوبۆرانەکەوی نووح نوقووم بوو، بۆیە هیچ شوێنەوارێکیان نەماوە، هەر هەموو لەژێر دەریای ناوەڕاست نوقووم بوونە، چاوەڕوانن کەسێك بیاندۆزێتەوە.

لویب بە دەنگێکی تیژ گوتی:

– قسەی قۆڕ، ئەم پیاوە باس لەدیناسۆرەکان دەکات، کە بەر لەملیۆانان ساڵ هەبوونە، هەی بۆبی نەفرەتی ئەم هەموو قسە قۆڕە لەکوێوە هاتووە.

لەپڕ دیمەنەکە سڕبوو، چوون ئەوەی ڕیکۆردەکە وێستابێت، دیمەنە وێستاوەکەیش چاوانی ئەلبۆنی بوو، بە ڕقەوە تەماشای (لویب)ی دەکرد. ماڵەکەی ئەلبۆنی لەرییەوە، وەك ئەوەی زەمین لەرزە بووبێت، هەرچی لەژوورەکەدا بوو لەرییەوە، تەنانەت گەرمای ژوورەکەش بەرزەوە بوو، لویب و ئەوانەی لەتەکیدا بوون ئاوڕیان دایەوە بەو نیازەی شوێنەکە جێبهێڵن، وەلێ جەستەیان لەجووڵە کەوت، ئەلبۆنی لەشوێنی خۆی دیار نەماو هەر لەو ژوورە لەشوێنێکی تر دەرکەوتەوە، سەرقاڵی کاری ڕۆژانەی خۆی بوو، خەریکی کاری قێزەون بوو، وەك جادووگەری، تەنانەت لەدیمەنێکی تردا بینیان کوڕو کچێکی منداڵی سەربڕی و پشتیانی بەیەکەوە شەتەك دا، لویب هاواری کرد:

- بۆبی.. هەی لە شەیتان شەیتانتر، ئەمە چ گەمەیەکی قێزەونە لەتەکمانا دەیکەیت؟

بۆبی لەناو ژاوەژاوی دیمەنەکە وەڵامی دایەوە:

- نەدەتوانی ئەو دەمەت داخەیت، تا لەقسەکەی دەبووەوە؟

لویب زۆر بەناڕەحەتی لەشی خۆی دەجووڵاند: گوتی

- ناتوانم گوێم لەم قسەقۆڕانەت بێت و قسە نەکەم.

بۆبی بەتووڕەییەوە گوتی:

- کام قسەی قۆڕ، هەی کەللەڕەق؟ نزرگای شارستانییە کۆنەکانی پیرۆ و کەمبۆدیات نەبینیوە، کە وێنەی دیناسۆرەکان بە ڕوونی لەسەر دیوارەکانیدا کێشراون؟ ئەوەش مانای ئەوەیە شان بەشانی بنیادەمەکان ژیاون.

لیۆبۆڵد هاواری کرد:

- هەی هیچ و پووچ شتێك بکە واز لە دەمە دەم بهێنن.

بۆبی لەدەوروبەری خۆی ڕوانی، بەسەر ڕوخسارییەوە مۆتەکەی زەردەخەنەیەك دەرکەوت و بلەز ونبوو، کاتێ لەشتە هەڵواسراوەکانی ڕوانی کە بەهێز دەلەرینەوە، بۆبی لای لە دووبراکە کردەوەو هاواری کرد:

- هەوڵدەن بەو شتە هەڵواسراوانە بگەن، بەوەستاندنیان لێرە دەردەچین.

لەسەرخۆ کەوتنە جووڵە جووڵ، بۆبی دیسان هاواری لێکردن:

- پەرداخیك وا نزیك دەبێتەوە نەدەریاتە نەیش ڕووبارتە.

بەلاچارەوە دیقەتیدا، بێ ئەوەی لەدۆخەکە حاڵی بێت، خۆیان بە پەرداخکە گەیاند، دەستیان پێوە گرد. بۆبی هاواری کرد:

- ئاگـاداری پەرداخکـە بـن، لەدەسـتان نـەڕوات، دوا بـەدوای مـن بڵێن((خوداکەت گەورەیە، بیۆ سەروبەریمان بپارێزە))

هـەردووکیان بەیەکـەوە ڕسـتەکەیان بەدڵـەڕاوکێوە گوتـەوە، بـۆبی ئـەو خۆشحاڵییەی بەڕوخسارییەوە خەریکبوو دەرکەوێت، شاردیەوە، دواتر گوتی:

- دوا بەدوای من بەدەنگێکی بەرز بڵێنەوە((پەرداخیەك لەهاوینا نزیك دەبێتەوە وەك دەریا دەرکەوت، پێی مەنێن))

ما دووبراکە بەترسەوە ڕستەکە بڵێنەوە، لەپڕ بۆبی هەر خۆی ڕزگاری بوو، بەڕوخساری ماندووەوەو بەدەنگێکی کزەوە گوتی:

- گەمژەکان.

هەرچی دووبراکە بوو دەستیان بۆ لای پشتەوە لوول بوو، لاقیشیان لەیەك ئاڵاو لەسەر گازەرەی پشت کەوتن، چاویان ئەبڵەقبوو. هـەموو نووشـتەکان کە بۆبی دەیخوێندەوە و داوای لەدوو براکەش دەکرد بەدوایـەوە بیڵێنـەوە، جـادووی پێچـەوانە بـوون، ئەگـەر جـادووی پێچـەوانە خوێندرایـەوە ئـەوە مانایەکی شەیتانی هەیە، تەنانەت جادووگەرەکان بۆ ئـەوەی جادووەکانیـان کاریگەری هەبێت، ئایەتەکانی قورئـان بـە پێچـەوانەوە دەنووسـن، تـا بـانگ لەشەیتان بکەن، نەك دووری بکەنەوە، ئەو جۆرە تەلسمانە کوشندەن.

کاتیۆ بۆبی ئیشـارەتی بۆ پەرداخـەکان کـرد، نووشـتەی کردنـەوەی بەسـەر خۆیدا خوێندەوە(( پەرداخیەك نزیك دەبێتەوە نەدەریاتە نـەیش ڕووبارتـە)) ئەگەر بـە پێچـەوانە خوێندرایـەوە دەبێتە((هـەموو ڕوحـەکان لەکـەنارن بـۆ بالادەسـتی دیبـووك)) کـاتیۆ پەرداخـەکانیان لەدەسـت گـرد، تـا لێیـان بـیۆ سەرویەر نەبێت، تەڵەسمی کفری پێکوتتەوە، کە بۆ پەرستنی شەیتانە.

بۆبی کەوتە خۆی تا لەخانووەکە هەڵبێت، وەلێ لەدوا ساتدا هەڵوەستەی کرد، کاتێ بوونەوەرێکی لە ئاوێنە شکاوەکەوە بینی، بوونەوەرێك بەدوو چاوی کراوەوە، کە پەڵەی ڕەش بەژێر چاوەکانیەوە هەبوو، بوونەوەرەکە لەناو ئاوێنەکە هاتە دەنگ و گوتی:

– دڵنیابیت بە شەیتان دا، تا لێت بگەڕێت هەڵبێیت؟

بۆبی دڵی گووشرا، پەلەز بەرەو دەرگاکە هەڵات و ...

– ئەی بۆبی نەفرەتی، زانیم چیتکرد.

ئەوە دەنگی لیۆبۆڵد بوو، بۆبی بەترسەوە لای لێ کردەوە، لیۆبۆڵدی بینی دەمانچەکەی بەدەستەوە گرتبوو، زۆق لەچاوەکانیەوە ئاوری گرتبوو.

لویب بەدەم ئازارەوە لەسەر زەویەکە ڕاستەوەبوو، دیبۆك ڕەتی کردەوە ڕوحیان لای خۆی بارمتە بکات، ئەوەك بۆبی هەڵبێت. شەیتان ڕۆژێ لەڕۆژان هەوڵی خێری نەبووە. لیۆبۆڵد بەتووڕەییەوە دەمانچەکەی هێنایە سەرپێ، دوو فیشەکی بەمەبەستی کوشتن نا بە (بۆبی)یەوە، لویب بە پەشۆکاوییەوە هاواری لێکرد:

– چاوەڕێبە هەی کەللەڕەق.

دوو فیشەکەکە نیشانەکەی بەوردی پێکا و بۆبی بەرەوە بوو، هەناسەی لەبەر بڕا، خوێنی لەبەر دەڕۆیشت.

شەیتان کۆتایی ئەم سەربوردەیەی بەخوێن نووسی

***

# ڕیوایەتی تاکچاو

ژوورێك ڕووناکییەکی وای تێدا نییە، تەنها گەشانەوەی گڕی مۆمێك و لەپێچی گۆشەیەکی ژوورەکەدا، کچێکی ماتەمبار بە کراسی سپی بووکێنییەوە لەناوەندی ژوورەکەدا ڕاوەستاوەو بە دوودڵییەوە لەئاوێنەی ژوورەکە ڕاماوە، تەنانەت بۆ خۆم گوێم لەترپەی دڵیەتی، لەپڕ درزێك کەوتە دەرگاکەو گڕی مۆمەکە لەرییەوەو دڵی کچەکەیش کەوتە ترپە ترپ. ئەوەی دەرگاکەی واز کردو چووە ژوورەوە من بووم.. دیپۆك.

هەر کەچوومە ژوورەوە پیرەژنێکم بەرچاو کەوت، هەردووکیان خەریکی جادوو کردن بوون، داچەمیبوونەوە سەر زەویەکەو سروشی شکۆدار کردنی شەیتانیان دەخوێندەوە. هەردوو ئافرەتەکە خەریکی جادووی مەستانەکردن بوون. ئێمە ئەو بنیادەمە هیچ وپووچانەمان فێرکرد هەموو شتێك ڕیسوایان بکات، تەنها ئەم جادووی مەستانەییە نەبێت، کەس فێری نابێت، تەنها ئەوانە فێری دەبن کە گرنگییەکی زۆری وێدەدەن، ئەو جۆرە جادووە کە بۆ مەستانەکردنی شەیتانە، بەوە دەست پێدەکات، لەدیمەنگەلێکی ڕابردوو بڕوانێت، کە لەو شوێنە ڕوویدابێت، یا کەسەکان لەو شوێنە ژیابن. هەندێ بنیادەم بەو بەخشینە لەدایك دەبنەوە، هەندێکی تریان بۆ ئەوە نێرچەوانیان دەنێنا گڵ، وەك ئەو جادووگەرەی لەژێر پێمدا کڕنووشی بۆ بردووم. ئافرەتە شۆخ و شەنگەکە لەبەرامبەر ئاوێنەکەدا چاوی نووقادووەو برژانگەکانی لەترسەوە دەلەرینەوە، بێوەژنێکی دەوڵەمەندە، مێردەکەی خۆش دەوێت و دوای ئەویش شووی نەکردووەتەوە، کراسی بووکێنییە کۆنەکەی لەبەر کردووە، پارەیەکی ئێجگار زۆریشی بە ژنە جادووگەرەکە داوە، تا لە ئاوێنەکەوە مێردە کۆچکردووەکەی ببینێت و لەتەکیدا قسان بکات، ئەوەش جادووی مەستانەکردنە.

لە زەلیلی و زەبوونی بنیادەم هەست بەخۆشی دەکەم، لەپشت ئەو ئافرەتەوە وێستام، تا هەستی بەشتێك كرد لەناو ئاوێنەكە دەجووڵێت، دەموچاوی کەمێك نزیك كردەوە، دواتر لەپڕ هەڵچوو، چون ئەوەی کولاژدەم پێوەی دابێت، لەناو ئاوێنەکە وێنەی ڕوخساری مێردەکەی نەبینی، بەڵکو چرچاوی شەیتانی لێوە دەرکەوت، ئافرەتەکە تۆقی و جادووگەرەکەیش هەڵهات، تەنیا من لێلیدا مامەوە، بزەیەکم هات، شەیتان پێناکەنێ مەگەر لە گەمژەیی بنیادەمدا. ئەو چارەی هەمە هەموو شتێك دەبینێت، دیمەنگەلێك لەڕابردوو، تەنها چاوانی من دەیانتوانی ئەو دیمەنانە ببینن. هەموو بوونەوەرەکان لەشوێندا گەرمەوزەیان دەمێنێت، تا بوونەوەرەکان چڕتر بن، مانای ئەوەیە گەرمەوزەکە تازەیە، هەر سەردەمێکیشم بوێت دەیبینم، بڕوانە ئەوەی لەسەردەمی کۆندا و لەهەر شوێنێك ڕوویدابێت، دەتوانم بیهێنمە بەر چاوم، بەوە دەڵێن جادووی مەستانە، بینینی ڕابردوو لە ئاوێنەدا یا بێ ئاوێنە. من (دیبۆك)م سەرکێشی جادووگەران، هەر بۆخۆشم نیم، ئێمە سنفێکی تەواوین لەشەیتانەکان، کێیە ئەوەی ڕوحی دیبۆك ئامادە دەکات، پێی وایە لەکۆڵی دەبێتەوە؟

لەو وڵاتەی لای (نیل)ەوە، خەڵکانێك بانگهێشتیان کردم، سێ گەنج لەوپەڕی دونیاوە بۆ خاکی نیل هاتن و نمایشی ئەم سیحری مەستانەییەیان کرد، تا بە گڵاوترین سیحربازێك بگەن، کە ڕۆژێ لە ڕۆژان بەسەر ئەم خاکەوە تێپەڕیوە، ئەویش (ئەلبۆنی کوڕی عەنابەی جەزائیری)یە، منیش هەوڵەکەیانم لێکرد بەدۆزەخ، تا یەکێکیان چەکێکی پێبوو، ڕوو بەڕووی بچووکترینی نێوانی خۆیان کرد و دووفیشەگی لە ئەژنۆی گەنجەکەدا، کە بەرەوە بوو هەناسەی سواربوو، لەناو خوێنی خۆیدا گەوزا، کەوتمە دوایان، خستیانە ناو ئۆتۆمبیلێکی تایبەت بەخۆیان، بەرەو خانوویەك ڕفاندیان، لەوێ

برینپێچێکیان بۆ هێنا و لەگەڵی گرد، کە برینپێچەکە لە لایان ڕۆیشت، بینیم دەستەسرێکی تەڕیان نایە ژێر لووتی، گەنجەکە کۆکی و هاتەوە سەرخۆی، یەکێکیان گوتی:

– هەی هیچ و پووچ دەم هەڵبێنەوە ئەو دەستنووسەمان پێبڵێ لەمیسر لەکوێیە؟

گەنجەکە بەدەم ئازارەوە گوتی:

– بمکوژن ئەو شوێنەتان پێ ناڵێم.

یەکێکیان دەمانچەکەی نایە بناگوێی و گوتی:

– لویب پێتچۆنە ئەم گوێچکەیەی بپەڕێنم؟

– کات لەدەست خۆت مەدەو گوێی بپەڕێنە، ئەو گوێکەی تری بۆ من دانێ.

لیزبۆڵد دەمانچەکەی خستە سەرپێ و لەگوێی نزیکی کردەوە، گەنجەکە ڕوحی شپرزەی کردو و بەترسەوە گوتی:

– دەمانچەکەت داگرە، قسە.. قسەدەکەم.

لویب کۆمپیوتەرەکەی هەڵکرد و چاوەڕوانی ڕیکۆردکردنی بوو، گەنجەکە گوتی:

– ناتوانین لەو شوێنەی بۆی دەچین، ئەم شتە بەکار بهێنین، وێنەگرتن قەدەغەیە، ئەم ئامێرە بچووکە بگرە، دەتوانیت بەمە ڕیکۆرد بکەیت.

لویب ئامێرە بچووکەکەی لێ وەرگرت و تەماشایەکی کرد و گوتی:

– هەی بەنەفرەت بیت، ئەوە چ شوێنێکە بۆی دەچین؟

گەنجەکە تەماشای زەوی کرد و گوتی:

- (هەرەم)ی گەورەی میسرە.

لیۆبۆلد دەستبەجێ دەمانچەکەی نایە نێوچەوانی بۆبی و گوتی:

- دوو ستوونەکە لەرێیە؟

بۆبی تفەکەی قووتدا و گوتی:

- لەوێ هەموو شتێك دەزانیت.

دووبراکە لەپرسیار کردن کەوتن، بەو ئاوایەی کات بەسەر نەچێت، بە ئۆتۆمبیلەکەیان بەرەو (هەرەم)ەکە بەڕێکەوتن، لویب پەیوەندییەکی تایبەتی لەتەك ڕێکخراودا هەبوو، تا ڕێیان وێدەن بچنە ناوچەی (هەرەم)ەکان، منیش لەنێویاندا خۆم حەشار دابوو.

من ئەو سەربوردەیە دەزانم کە دەیانەوێ سەحی بکەنەوە، ئەوەی زۆر بەلامەوە سەیربوو، زانیارییەکانی ئەو گەنجە بوو، هەموو ئەو ڕووداوانەی لەسەر خاکی میسردا ڕوویدابوو دەیزانی، هەرچەند لەدەوروبەری خۆم دەڕوانی، شتێکم لەو سەربردەیە هاتەوە بیرم و بینیم.

ئۆتۆمبیلەکە بەشەقامێکی قەرەباڵغدا تێپەڕی، بەدەم ڕووباری (نیل)ەوە بوو، چاوم گێڕا، دیمەنێکی ڕابردووم لەم شەقامەدا بینیەوە، ئەویش بەر لەوەی هێرشی فەرەنسا بۆ سەر میسر بکرێت، خاکەکەم بینی گۆڕا، ئەو هەموو بینا و ئۆتۆمبێلانە ون بوون، لەجێی ئەوانە بینای سادە قیتەوە بوون، خەڵکانێك بە جلوبەرگی جیاوازەوە لێرە و لەوێ هاموشۆیان دەکرد، لای بینایەك بنیادەمی زۆر باڵا بەرزم بینی، جوانترین جلوبەرگیان لەبەردا بوو، چەندین عارەبانە ئەسپ ڕایدەکێشان، ئەسپێلێکی سپی، لە یەکێك لەو عارەبانانە کەسێك بەوی تەنیشتی لەعارەبانەکەی لەسیلەیدا دەڕۆیشت، گوتی:

- ئەی هەرەمی گەنجینە شاراوەکەی میسر، ئەو گەنجینەمان بۆ ئامادە بکە، دوای هەزار ساڵ پیاوانی (ڕۆزیکرۆشن) هاتوون دەریبهێننەوە.

ئەوە میر (کاگلیۆستڕۆ) بوو، جادووگەری هەرە پلە باڵاکانی ئەورووپا بوو، خەتەرناکترین پیاوێکیش بوو لەکۆشکەکانی پاشا و لەبنەچەی جوولەکە بوو، دەستی لە ڕووداوەکانی فەڕەنسادا هەبوو، کە جیهانی هەژاند، ئەو پیاوە ئەندامێکی کارگێڕی بوو لە ڕێکخراوی (ڕۆزیکروشن)ی نهێنی.

ئۆتۆمبێلەکە بەو شەقامەدا تێپەڕی، تا لەنزیك (هەرم)ەکە بوەستێت، هەرسێکیان لە ئۆتۆمبێلەکە هاتنە خوارەوە، بۆیی فرانك بەدوو دارشەقەوە پاپشە پاپشە دەڕۆی بەڕێوە. تەنها یەك نیگا کردن بە گۆڕەپانی (هەرەم)ەکان بەو هەموو وردەکارییەی لەخۆ گرتبوو، چاوم کرایەوە، دوو ڕیزی سەدان کەس، بڵێ هەزاران لەمیسرییە کۆنەکان بە جلوبەرگە ئاوبانگەکانیانەوە ڕێڕەوێکیان دروست کردبوو، دواتر هەر هەموویان داچەمینەوە سەر ئەژنۆکانیان، لەپایینی (هەرەم)ە گەورەکە پاشای میسری کۆن (خۆفۆ) دانیشتبوو. هەرەمەکە هەرەمی خۆیەتی، مەملەکەتەکەیشی بەدەستەوەیە، بە ڕەزامەندییەوە تەماشای کردن و دواتر ئاوڕی لەو پیاوەی لای دەستە چەپی دایەوە، کە عابایەکی سووری درێژی لەبەردا بوو، سەروگوێلاکیشی پێ داپۆشیبوو، ئەوە(هامان)ی ئەندازیارو وەزیری بوو. هامان دروستکەری هەرەمی گەورەو یەکە جادووگەری مەملەکەتی میسری کۆن بووە، لەنێو دوو ڕیزی خەڵکەکە پیاوانگەلێك بەشتێکەوە دەرکەوتن، سندووقێکیان هەڵگرتبوو، زۆر بە وریاییەوە دەڕۆیشتن تا گەیشتنە بەرامبەر خۆفۆ و هامان و سندووقەکەیان لەژێر پێیاندا دانا، هامان کە بە(مان) ناوزەدیان دەکرد، گوتی:

– ئەی پاشای مەزنمان.. لەناو ئەم (هەرەم)ە تووونێلێکی شاراوەمان دروستکردووە، مەحاڵە کەس ڕێی پێ بەرێت، هەرچی زانستەکانمانە لەوێ دەیشارینەوە، تا کەس دەستی پێ نەگات.

– گۆڕدزەکان لێی ناگەڕێن و هەر دەیدۆزنەوە.

هامان بزەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی:

– ئەوەندە توونێلی چەواشەکاریمان بۆ دروستکردووە، تا بەگومرایان بیات، ئەو تونێلەش وا دروستکراوە بێجگە لەخۆمان هەر کەسێك منەی کرد، بڕووخێت بەسەریا.

ئەو پیاوانەی سندووقەکەیان هەلگرتبوو، دووی هامان کەوتن، کە بەتوونێلە سەرەکییەکەدا بردنی. لەپڕ هاوارێك ڕایچڵەکاندم، لام کردەوە (بۆبی فرانك)م بینی، لەناو ئازاری پێیەکانی ئۆقرەی بۆ نەبوو، لەتوونێلە سەرەکییەکەی هەرەمەکە وێستا، براکان دەیانوویست بەزۆر بەدارشەقەکەیەوە بیدەنە بەر خۆیان بۆ ناو توونێلەکەی بەرن.

تەماشای لای چەپم کرد، دیمەنێکێتر و لەسەردەمێکیترو لەپاینی (هەرەم)م بینی، (کاگلیۆسترۆ) بەخۆی و کاروانێك لەئەسپی سپی دەگاتە (هەرەم)ەکە و دادەبەزێتە نێو (هەرەم)ەکە، توونێلەکە لەناوەوە تەنگەبەربوو، کاگلیۆسترۆ زۆر بەزەحمەت خۆی پیاکرد، تا بەشوێنێك گەیشت، وەك چاڵێکی گەورە پیاوەکان لەدیواری توونێلەکە دروستیان کردبوو، کاگیلۆسترۆ بە پیاوەکانی گوت:

– خودا ئاگادارتان بێت، ڕێك لەشوێنی دیاریکراودا چاڵەکەتان کرد.

کاگلیۆسترۆ مەحاڵبوو بچێتە ناو چاڵەکە، بەوای تەنگەبەرییەکەوە، وەلێ یەکێ لەپیاوەکانی کە زۆر لەڕ و لاواز بوو خۆی پیا کرد. دەمێکی پێچوو

پیاوەکانی ڕۆزیکرۆشن سندووقێکی گەورەیان دەرکرد، سندووقەکەی هامان بوو، یەك لەپیاوەکان گوتی:

– گەورەم داوای لێبووردن دەکەم، نەدەبوو چاڵەکە لەسندووقەکە زۆر گەورەتر بێت، چاك بوو هەرەمەکە نەڕووخا، ئەوەندە هەیە توونێلی سەرەکییەکە و تووونێلە خەفەکراوەکە بەیەکەوە دەبەستێت، کە (هامان)ی ئەندازیار دروستیکردبوو.

هەر لەو شوێنە و لەناو تووونێلە سەرەکییەکە و لەناو (هەرەم)ەکە بۆبی فرانك لەگەڵ دووبراکە وەستان و ئیشارەتیان بۆ چاڵەکە کرد، کە کاگلیۆسترۆ هەڵیکەندبوو، دەسەلاتدارانی میسر بە ئاسن بانیان گرتبوو، تاکو ئەمرۆش ماوە. هەردوو براکە تەماشای ئاسنە داپۆشراوەکەیان کرد، بۆبی باسی ئەو دیمەنەشیانی بۆ کرد، کە پێش کەمێك بینیم، نازانم چۆن بەو بەسەرهاتەی زانی، باسی سندووقەکەو تووونێلە نهێنییەکەی هامانی بۆ کردن، کە لەدەست کاگلیۆسترۆ و پیاوەکانی شاردبوویەوە، ئەوانەی لەڕێی ڕێکخراوەکەوە شوێنی تووونێلەکەی (هامان)یان زانی، چاڵێکی بچووکیان کرد و سندووقەکەیان لەو چاڵەوە دەرکرد، کە هەموو زانستەکانی تێدا شاردرابووەوە، لویب گوتی:

– ئەمە دڵم خۆش دەکات، (ڕۆزیکرۆشن)ەکان بنچینەی ڕێکخراوەکەمانن، تا بەو شێوەیە دەستمان بەسەر زانستەکاندا گرد، وەلێ خەڵکی چی بەو چاڵە بەتاڵەو بە ئاسن داپۆشراوە دەڵێن؟

بۆبی لەگەڵ ئەوەی دەستی لەسەر ئاسنەکە دانا، گوتی:

– لەکۆتاییدا دەسەلاتدارانی میسر ئەو چاڵەی (کاگلیۆسترۆ)یان دۆزیەوە، تووونێلە نهێنییەکەی(هامان)یش کە لەکۆتایی چاڵەکە دوو

بەردی زل لەقیر بان چاڵەکەی دابوو، پێدەچوو تازە دروستکرابێت، کەس نەیدەزانی کێ دایناوە، بەوای ئەوەی لەو سەردەمەدا قیر نەبووە، ڕەنگە کاگلیۆسترۆ و پیاوەکانی ئەوەیان کردبێت، تا نامەیەك بەجیهان ڕابگەیێنن، کە کەسێك هەبووە ئەوەی دۆزیوەتەوە و ئەوەشی تێیدا شاردرابووەوە دەریهێناوە.

لیۆبۆڵد تاقەتی چوو، پێیگوت:

– بۆچی ئێمەت بۆ ئێرە هێناوە؟

– لەبەر ئەوەی ئەو نهێنییەی دواتر کەس ناتوانێت بۆمانی بگێڕێتەوە، دەبێت بەخۆمان دابەزین و وردەکارییەکانی بەچاوی خۆمان ببینین، دادەبەزینە ژووری پاشایەکی فەرمی ناو (هەرەم)ەکەو لەوێ دەتوانین سرووش بۆ ئامادەکردنی جەستە بکەین، هەر بەوای سرووشەوە دەرچوون لەجەستە ڕابگەیێنین، کە (کا)ی تایبەت بە ئێمە لەجەستەماندا دەردەچێت بۆ ئەو پەنجەرەیەی تایبەتە بە ڕوحەکانی ناو هەرەمەکە.

لیۆبۆڵد بە سەرسوڕمانەوە گوتی:

– ئەو (کا)یە چییە؟

بۆبی کە بەدارشەقەکەیەوە خۆی ڕاگرتبوو، گوتی:

– ئەوە هاوسەنگی ڕوحە لای میسرییەکان، ڕوحی هەرسێکمان یەك دەگرن، دوای ئەوە لەتۆپەڵی (کا)دا یەکێکمان دەبات بۆ ئەو شوێنەی ئەو دەیەوێت. میسرییە کۆنەکان پەنجەرەیەکیان لەسەرووی ژووری پاشاوە لەناو (هەرەم)ەکە داناوە، تا (کا)ی تایبەت بە پاشای لەگۆڕنراو دوای مردن بێتە دەرەوە، ئەوجا جێ

بەجێکردنی کەوتنی تیشکی جەستە لەناو هەرەمەکە ئامادە دەبێت.

دووبراکە لەمیچی تریان نەپرسی و دووی کەوتن، تا هەموویان چوونە ژوورە بچووکە داخراوەکە، بۆبی دەستی بەدارشەقەکیەوە بوو، ئیشارەتی بۆ کردن لەجێی خۆیان دانیشن، ئەوجا گوتی:

– ئەو دوو ستوونەی میسر تەنها سونبوولی میسری سەرو و خواروون، ئەو زانستانە لە ئەتلەنتسەوە بۆ میسر گوێزرانەوە، لەو کاتەی وا بەسەر خاکی میسردا هات و چاوی شەیتانی لەسەر بوو، تا لەدەست پیاوچاکانی دووری بخاتەوە و بیبەخشێت بەوەی دەزانێت چۆن ژیانی خەڵك ڕەشبكات. ڕۆژگار هات و ڕۆی و هامان لەسەردەمی خۆفۆ دەرکەوت، خاوەن پیسترین ڕوحی مرۆڤایەتی بوو، شەیتان ئەو زانستەی بە هامان دا، ئەوکات گەنج بوو، دوای مردنی خۆفۆ هامان بوو بە وەزیری پاشا(دجيد فرع)و دواتریش بوو بەوەزیری (خەفرع). هامان کە بەساڵاچوو، دەبوو ئەو زانستە بدرێت بەکەسێك لە بنیادەمەکان بەو مەرجەی پەیامبەری شەیتان بێت، کەسێکی نەفس پیس و خوانەناس و ڕەشبین بێت، چاوی شەیتان چووە سەر پیاوێك کە ڕێك ئەو کەسە بوو لێی دەگەڕا، ئەویش ئاکچاو بوو.

بۆبی مۆمێکی دەرهێنا و لەسەرخۆ هەڵیکرد، کەشێکی ترسناکی لەناو هەرەمە تاریکەکە پێکرد، سێبەری هەرسێکیان بە دیوارەکەوە سەمایان دەکرد، لویب گوتی:

– هەر تێنەگەیشتین، بیرت بێت، هەر یارییەکی قیزەونمان لەتەکا بکەیت، ئەوا لاشەکەت لەناو هەرەمەکە جێدەهێڵین.

بۆبی بەدڵەڕاوکێوە گوتی:

- ئەمجارە سەربوردەکە بۆخۆم دەیگێڕمەوە، چونکە بۆ کەس ئەو هەلە نەڕەخساوە بچێتە ناو هەرەمەکەو چەندین کاتژمێر لەناو تاریکی هەرەمەکەدا بمێنێتەوە.

لیزبۆڵد گوتی:

- دەی هەتیو، با بزانین نهێنی داهاتوو کە کەس نایزانێت، دەبێت چی بێت؟

بۆبی لەسەرخۆ گوتی:

- باس لەتاکچاو دەکات.

بۆبی کەمێك بێدەنگبوو، دواتر درێژەی بەقسەکەی داو گوتی:

- ئەو تیشکەستێرەیە لە جەستەکەدا دەردەهێنین، تا ڕوحەکانمان ئازاد بکەین، لە تۆپەڵ (کا)دا بەرەڵای دەکەین، کا.. لەو تاکچاوە دەگەڕێت، دەشتوانین بچینە هەر ڕوحێکەوە کە دەمانەوێت و هەر کەشێکیش مەبەستمان بێت، بەو شێوەیە دەتوانین بچینە هەر ڕوحێکەوە و زانیاری لێ وەرگرین، وای بەچاك دەزانم پێشڕەویەکە بەمن بسپێرن، ئەوەش چاك بزانن یاسای زەمان بەسەر ڕوحدا تێناپەڕێت.

لوپیب گوتی:

- باشە لەکوێ دەبین؟

بۆبی گوتی:

- لەمیسری کۆن.

پێنج کارتی بڵاوکردەوە:

کارتی یەکەم.. کارتی(کا)ی فیرعەونە، بەرامبەر بە ڕوحە.

کارتی دووەم.. کارتی جادووگەری فیرعەونی.

کارتی سێیەم.. کارتی گوێرەکەی ئالتوونی، وێنەی گوێرەکەیەکی بەسەرەوەیە، کەللەی مرۆڤە.

کارتی چوارەم.. کارتی خاوەن مارەکە، وێنەی پیاوێکی بەسەرەوەیە یاری لەتەك مارەکە دەکات، وەك ئەوەی دەستەمۆی بکات.

کارتی پێنجەم.. کارتی هەرەمە، وێنەی هەرەمێکی بریقەداری بەسەرەوەیە تیشك دەداتەوەو لەسەریشەوە پیاوێك بە جلوبەرگی فیرعەونی بەرامبەری ڕاوەستاوە.

***

# بەشی شەشەم

## تاكچاو لەخاكی فیرعەونەكاندا

## ٢٥٠٠ پێش زایین _ ٢٤٠٠ پێش زایین

(كا)ی تایبەتەمان بێ ڕێنماكەر كەوتە گەڕ و دەربەڕی، لەگەڵ (با)دا دەهات و دەچوو، شتەكان، دەنگەكان هەر هەموو لەدۆخێكی ڕوونی ڕوحدابوون. دەستەبەركردنی(كا) ئاسان بوو تا پێی هەڵفڕین، بەسەر شارەكانەوە گەڕاین، لەبازارێكی قەرەباڵغدا گیرساینەوە، هەموو شتەكانی دەورویەرمان سەح كردەوە، تەنانەت خاك و خۆڵەكەشی بەسەر كردەوە، لەهەموو شتێكمان ڕوانی، تەماشای بنیادەم و بیناو ڕێگاوبانەكانیشمان كرد، بەوای ئەو سەحكردنەوەیە زانیمان لەكوێین.

چەند ڕوحم بە پەرۆشەوەی بینینی ئەو خەڵكە بوو، كە سەردەمانێك حوكمی میسریان دەكرد، لەدەوروبەری خۆم وردبوومەوە، وەڵێ (كا)ی تایبەتمەندمان نەیدەتوانی بەسەر خاكدا پیادە بێت و بگەڕێت، پێدەچوو دەسەڵاتی هەر بە ئاسمانەوە بێت، بۆیە ناچاربووین بۆ ئەوەی بچینە جەستەی كەسێكەوە بازیدەین، فیرعەونەكان بەتەنیشتمانەوە دەهاتن و دەچوون، ئێمەیان نەدەبینی، زانیم ئەو بازارە بازاڕی جوولەكان بوو، كە بە (ئەبیرۆ) ناوزەدیان دەكرد، خانووەكان لەخشتی قوڕ دروستكرابوون، ڕوخساری خەڵكەكەیش ئاشتیخوازییان پێوە دیاربوو، كەسێك بە شتێك كە لە (كەمان) دەچوو ئاوازی دەژەنی، بەشەقامەكانا میوزەكەكەی بەگوێی خەڵكیدا دەدا، زۆربەی

هەرە زۆری پیاوان بالاپۆشی کورتیان لەبەردا بوو، سنگیان بەدەرەوە بوو، ئافرەتەکان بە جلی شۆڕ و کەمەربەندی ڕەنگاو ڕەنگەوە بوون.

کا.. کەوتە لەرینەوە، چون ئەوەی لەشتێك ئاگادارمان بکاتەوە، کە بتوانین خۆمانی تێ بنێین، بەچاوی ڕوح تەماشام کرد، پیاوێکم بینی لەدەستوپێوەندەکەی نزیکبووەوە، بەهێمنی لەبازاڕەکەی دەڕوانی، زانیم ئەوە پاشایە، بێ هیچ پێشهاتێك لە(کا)ی تایبەتمان نزیکبوومەوە، چوومە جەستەو ڕوحییەوە، لەوێ لە چاوەکانیەوە تەماشام کرد، بەڵێ هەستم بەو ڕوحە کرد کە چووبوومە دووتوێیەوە، ڕوحەکە پێیڕاگەیاندم میری میسرەو ناویشی( سیتکا)یەو زیرای فیرعەونە، کە پاشای هەموو میسرە، تەماشای خەڵکەکەی دەکرد وەك ئەوەی سۆسەی شتێك بکات، ڕۆیشت تا بەبازاڕی کۆیلەکان گەیشت، لەوێ ئێستێکی بۆ کرد و تەماشای پیاوێکی کرد، خاولییەکی بەخۆیدا دابوو، وەك ئەوەی خەڵکی لەسەریانی دەکەن، وەڵێ ڕوخساری خۆی وەرشاردبوو، ئەوە ئەو پیاوەیە کە بەدوویدا دەگەڕێین، ما لەدەموچاوی ورد ببمەوە، وەلێ ڕوخساریم بۆ ڕوون نەدەبووەوە، پیاوێکی لەسیلەیدا بۆ فرۆشتن دابنابوو، ئەو میسرییەی کە چووبوومە جەستەیەوە گوتی:

- ماکارۆ.. ئەمە بەچەند دەفرۆشیت؟(ماکارۆ.. بە میسری کۆن یانی بازرگان)
- گەورەم بە چوارسەد درهەم.

بەوشەی درهەم حەپەسام، ئاخۆ لەسەردەمی میسرییەکاندا درهەم هەبووە؟ میسرییەکە مامەڵەی لەتەکا نەکرد، ماکارۆ تەرازووەکەی دەرهێناو بە بەهای یەك پارچە زێڕی بۆ کێشا، پێدەچوو درهەمی ئەوسا سەنگی کێشان بوو بێت. لەتەك کۆیلەکە کۆڵان بە کۆڵان ڕۆیشتین، بەدەم ڕێوە بە

دیمەنەکان سەرسام بووم، هەرەمی گەورە وەك ئەوەی بۆ یەکەمجارم بێت لەژیانمدا بیبینم، ئەوەی لەبەرامبەرمدا بینیم وەك هەرەمەکەی لای خۆمان زەردباو نەبوو، بەردی سپی بریقەدار بوو، لەوەش سەیرتر ڕووباری نیل لێوەی زۆر نزیکبوو، پەیکەرو نزرگاکان بە بان بەردەوە بوون - بەدەر لەوەی لەگەشتەکەماندا شارستانییەتی گەورەمان بینی، وەك ئەتلەنتس و ئەوانی تر، وەلێ شارستانییەتی ئەو میللەتە شتێکی زۆر جیاواز بوو، هەموو شتێك لەوێدا ئەندازیارییەکی شکۆدارانەبوو.

لەوەسپی ئەو سرووشتە گەڕێ، کە بەچاوی خۆن بینیم، تا وەسپی بکەم کەمە، مەولَمدا لەتەك ئەو کۆیلەیەی کڕیمان، لێل ئەودا بم، بەوای ئەوەی چیرۆکەکەمان بەوەوە دەست پێدەکات، ئەو کۆیلەیە تاکچاوەکەیە، کە هەموو زانستەکانی دەستکەوت، هەموو بەشەرییەتی بەلاڕێدا برد و گومرایی کردن، وەلێ پێناچێت تاکچاویش بێت، بەلکو ڕوخساری تەواوی هەبوو، ڕەنگە ئەو تاکچاوییەی دواتر تووش بووبێت، لێل ئەو کۆیلەیە شتگەلی سەیرمان بینی، تا بڕوام وابوو کە ئەو بێت.

***

## لەم خاکە مەزەندەت لەهەچ کەسێك کرد کە مووسایە، دەبینێت فیرعەونە و بە پێچەوانەشەوە

میر(سیتکا) بەڕێوەبوو تا گەیشتە چیایەکی گەورە، بەردێکی فرە بەبن چیاکەوە پەرش و بلاوەوە ببوو، ئەو کۆیلەیەی کڕیبووی، بانگی لێوە کرد و گوتی:

– ئامەویٚ زۆر ماندووت بکەم، تەمەنیشت گەورەیە، وەلێ فرمانی شتێکت وێدەدەم، ئەو بەردانە بۆ ئەو شوێنەی ئەولاتر بگوێزەرەوە، تا لەبیناکردندا بەکاری بهێنین، پەلەش لە گوێزانەوەی مەکە، چەند کاتت دەوێت بە ئارەزووی خۆت کار بکە، منیش هیچ پەلەم نییە.

ژمارەی بەردەکان زۆربوون، ئەو شوێنەش کە دەبوو بەردەکانی بۆ بگوێزێتەوە نزیک نەبوو، جیمانهێشت، کاتێ ژمێرێکیش نەدەبوو جێمانهێشتبوو، بەردەکانیش شەش زەلامی دەویست لە ڕۆژێکدا بیگوێزنەوە، کاتێ هاتینەوە بۆ لای، ڕاچڵەکین، بینیمان هەموو بەردەکان گواسترابوونەوە، کۆیلەکە بەردێک چییە جێینەهێشتبوو، سەری سوڕماو تەماشای کۆیلەکەی کرد، وەك ئەوە وابوو لە لای تەماشای سیحربازێك بکات، گوتی:

– هۆ کابرا.. تۆ کارێکی زۆر سەیرت کرد، وەلێ من کارێکم بەدەستەوەیە دەبێت بڕۆم، لەو بەردانەی گواستووتەتەوە هەندێ بناغەی دیوارم لەملاو ئەولادا بۆ درووست بکە، دەمەوێت حەسارێکی تیا درووسا بکەم.

تەنها یەك ڕۆژ جێ انهێشت، دوای ئەوەی گەڕاینەوە، هەموو دیوارەکانی بەنەخشێنراوی بنیات نابوو. لەدڵی خۆمدا گوتم ئەوە بنیادەم نییە. میر (سیتکا) زۆر حەپەسا، وەختەبوو مێشکی بوەستێت، پێیگوت:

– بەناوی خودا سوێندت دەدەم.. کردەت چییە؟

بەو سوێندەی خودا سەیرم لێهات، ئاخر ئەو لەمیسرییە کۆنەکانە، لەوەش گەڕام، کۆیلەکە وەڵامی دایەوە:

- هەر ئەو سوێندە منی بەکۆیلە کرد و بووم بەکۆیلەی تۆ.

میر بەقسەکەی سەرسام بوو، وەڵێ بەقسەیەکی تری کۆیلەکە منیش سەرسام بووم کە گوتی:

- من خدرم، لەم وڵاتە گوێت لەناوی بووە؟

میر (سیتکا) هیچی نەگوت، دەیزانی خدر کێیە، پێغەمبەری ئەو سەردەمەیە کە...

خدر بواری نەدام قسەکەتان بوو تەواو بکەم گوتی:

- داماوێک لەو بازارە هاتە لام و داوای سەدەقەی لێکردم، سوێندەکەی لەڕێی خودا دابوو، هیچم نەبوو بیدەمێ، خۆمم وێدا بمفرۆشێت و پارەکەی بۆ خۆی ببات، ئەی سیتکا ئەگەر کەسێک لەڕێی خودا داوای لێکردی و ڕەتت کردەوە، لەو دونیا پێستت هەڵدەوەرێت و دەکەوێت.
- ئەی پێغەمبەری خودا بمبەخشە، من تۆم ئەشکەنجە دا، هەرچیت دەوێت لە ماڵ و منداڵەکانم ببیە، یا لێمگەڕێ ئازادت بکەم.
- خۆشحاڵ دەبم ئازادم بکەیت، تا خوداپەرستی خۆم تەواو بکەم.

میر سیتکا دەستبەجێ ئازادی کرد، بەر لەڕۆیشتنی ئاوڕی لە میر دایەوەو گوتی:

- ڕووداوێکی گەورەو مەزن ڕوودەدات، ئەگەر سەروماڵیشت تێبچێت لای هەق بگرە.

میر سیتکا چاوەکانی ئەبڵەقبوون. (کا)ش لێی جیابووەوە، بەرەو حەوا بەرزەوە بووین، من نەمدەزانی بەر لەکەمێک لەچیم دەڕوانی، سەرقاڵی قسەی نێوان فیرعەون و باوەڕکاری ماڵپاتی فیرعەون بووم.

***

# ئەگەر پێغەمبەر مووچیاری ڕووداوێکی مەزنی کردیت، چاوەڕوانی مردن بە

ڕوحمان بلەز هاتە خوارەوە، چون ئەوەی هەستی بەشتێکی گەورە کردبێت، لەخوارەوەی خۆمم ڕوانی، لەناو خانووە قوڕەکان هاوارو نالێنی پیاوان و ئافرەتان دەهات، سەربازەکان بەنێو خانووەکاندا لەپشکنیندا بوون، دەرگایان دەشکاند، لەپیاوانیان دەدا، پالیان بە ژنانەوە دەنا، کارێکی دڕندانەیان دەگێڕا، کاتێ ڕوحمان چووە ڕوحی یەك لەو تاوانبارانە، ڕوحێکی تاریکبوو، کەسەکەی ڕوحمان تیا نیشتەجێبوو، چووە خانوویەکەوە، بەدووی کۆرپەکان دەگەڕا، تا کۆرپەیەکی نێرینە ببینێ، کۆرپەکەی برد و چەقۆیەکی دەرهێناو کۆرپەکەی پێ سەربڕی، هەر وەك ئەوەی چۆلەکەیەك سەربڕێت، دواتر لەسەر زەویەکە تووڕی داو جێیهێشت، هەستمکرد (کا) بەرەوە بوو، لەجەستەی تاوانبارەکە دەرپەڕی و بەرەو حەوا هەلکشا، لەهەموو لایەکەوە خوێنی لێ دەتکا، تەنانەت بۆنی خوێن بەلووتما هات، لە گەروومدا تامی خوێنم کرد.

وێنەی ڕاستەقینەی فیرعەونەکانی ئەو سەردەمم بینی و بۆم ڕوونەوەبوو، منداڵانی جوولەکەکانیان سەردەبڕی، فیرعەونی گەورە فەرمانی دەرکرد، هەرچی منداڵی نێرینەی جوولەکەیە سەربپڕدرێت، بەوای ئەو خەونەی کە بینیویەتی، گوایە منداڵێك گەورە دەبێت و کۆدەتای بەسەرا دەکات. نەمدەزانی بەو شێوە دڕندانەیە ڕفتار دەکەن، ئەوەی من بینیم تەنها یەك دیمەن بوو، ڕوحمان بەدەور خۆماندا خولایەوە، دونیا بەرەو تاریکی دەڕۆیشت، هەموویان بەرەو نادیارییەك ملی ڕێگایان گرتبووە بەر، هەریەکەو منداڵێکی بە باوشەوە بوو، لەناو فەرمانی فیرعەونی گەورە هەلدەهاتن، خۆمان بەڕوحی یەکێکیانا کرد، ویستم لەڕوحی ئەوەوە لێیان حالی ببم بۆ

کـوێ دەچـن و بـەنیازی چـین، وەڵێ بـەوای مانـدووبوونی ڕوحیـان و دڵەڕاوکێیانـەوە، هیچیان بەدەستەوە نەدا، لەپڕ هـەمووماں بـە شـوێنێك گەیشتین، بیابانێکی ڕووتەن، هیچی تێدا نەبوو، یەکێکیان گوتی:

- ئـاخر کـێ دەتـوانێ منداڵەکـەی لێـرە جێبهێڵێـت، کـە تاقـەتی گانکۆڵێشی نییە، ئەمە شێتی نییە؟

ژنێکی تر بەرسڤی دایەوەو گوتی:

- کوفر مەکە، پێغەمبەر خدر پێی نەگوتین خودا دەیانگرێتە خۆی، خۆ ئەگەر لەماڵەکانی خۆشماندا بووینایە هەر سەردەبڕان.

ئافرەتـەکان داچـەمینەوەو منداڵـەکانیان لەسـەر لمەکـە دانـا، دواتـر جێیانهێشتن، دڵیـان بـەئازاراوە دەتلایـەوە. کـا.. هەڵچوو، لـەو ئافرەتـە دەرچوو، ئەوجا بازیداو چووە ڕوحـی کۆرپەیەکەوە، لەچاوە زیتەکانیـەوە هـەموو ئـەو ئافرەتانـەم بینـی تـا لەچـاو ونبـوون، دەڕۆیشـتن و ئاوڕیـان دەدایەوە، تا لەچاو ونبوون، کۆرپەکە زۆر بەزەحمەت سکەخشکێی بۆ کرد، گوێم لەمنداڵانی دەورووبەرم بوو، دواتر لە ئاسۆگەوە شتێکی سەیرمان بینی، لەشکرێك لـەپیاوانی سـپی پێسـت بـەرەو ڕوومـان دەهـاتن، جلـی سـپییان لەبەردابوو، ژمارەیان هـەر زۆر زۆربوو، لەهەموو لایەکەوە هەر ئـەوان بـوون و دەهاتن، منداڵەکان پێدەکەنین، ئاخۆ ئەوانەی وا دێن ئـەوان؟ ئـەوە عـەقڵ هەڵیدەگرێت ئەوانگەل بن؟

ئەوانـە فریشـتە بـوون، دەسـتیان بـەڕێزکردنی بـەرد کـرد، وەك ئـەوەی منداڵەکان بۆ لای بەردەکان بێنن، دەی منداڵـەکان دەستیان بۆ بـەردەکان بـرد، کەوتنـە مـژینی بـەردەکان، وەك ئـەوەی شـیری لێ بخـۆن، هـەبوو هەنگوینی لەبەردەکـە دەمـژی، خـودا بـەزەیی بەئـەوەی جوولەکە هاتـەوە،

منداڵەکانی ڕزگار کرد، وەلێ مووسا لەنێویاندا بوو، باوەڕم نەدەکرد، چونکە مووسا چیرۆکێکی تری هەبوو.

بەرای یاسا و ڕێسای ڕوح کە دادوەرێکی بەسەرەوە نییە، سەردەمێکمان بەچەند خولەکێك بەسەرا تێپەڕی، منداڵەکان گەورەببوون، دیمەنەکان وەك زنجیرە بەدوای یەکدا دەهاتن. دایکەکان دەهاتن و چاودێری منداڵەکانیان دەکرد و دواتر بلەز خۆیان ون دەکرد، بەو ئاوایەی کەس نەیانبینێت. خانووچکەمان بینی دروستکرابوو، منداڵەکانی لەخۆ گرتبوو، تا دەساڵێك تێپەڕی و منداڵەکان هەراش ببوون، لەناو ڕوحی یەکێکیاندا بووین، تەماشای خانووچکەیەکم کرد، شتێکم تێدا بینی، زانیم ئێمە بۆچی لێرەین. منداڵێکی جەستە بەمێز و پرچ ڕەش و لوول لە یەکێك لەو خانووچکانە هاتە دەرەوە، زۆر بە باوەڕ بەخۆبوونەوە بەرێوە دەڕۆیشت، ئەوانی تر ئەو شێوازەی ئەویان نەبوو، لەپڕ ئەو منداڵە تەماشای کردین، لەتێڕوانینەکەی سڵمان کرد.

چاوێکی تێکچووبوو، نە گلێنەی هەبوو، نەیش سپییاتی، ئاوێکی سەوزی تێدابوو، دڵم ختوورەی کرد و زیاد دەیترپاند، منداڵەکە لەجێی خۆی وێستاو تەماشای کردین، بۆ خۆم تا ئەو دەمە منداڵی وام نەبینیوە ئەو تێڕوانینیەی هەبووبێت، ئەوجا ڕوو بەڕوومان هات، ئەو منداڵەی چووبووینە ڕوحیەوە لەترسا کەوت، منداڵە ڕوخسار ترسناکەکەش بزە مۆنەکەیەکی بۆ کرد. ئەی خودای ئاسمان ئەوە ئەوبێت؟

هەموو شتێك لەودا دەڵێت ئەوە، تاکچاوییەکەی، دیقەتدانەکەی، تا دەهات زیاتر لێمان نزیك دەبووەوە، تا زیاتر لێمان دەهاتە پێش زیاتر ڕوخساری دەردەکەوت. ئەو منداڵەی چووبووینە ڕوحیەوە پاشەو پاش گەڕایەو و

مەڵهات، تەماشای دواوەم کرد، منداڵە تاکچاوەکە بەدوومانەوە ڕادەکات، گوێمان لەدەنگێکی مێینەبوو، هاواری لێ کرد:

- میخا!!!!!!!!

منداڵە تاکچاوەکە ئاوڕی دایەوە، دایکی بینی دەستی بۆ ڕادەوەشاند، ئەوجا چون دوا نیگاکردنێك دیقەتی داین، بەرەو لای دایکی گەڕایەوە، ئەو منداڵەی لەڕوحیدا بووین لەنێو دارەکان خۆی وەرشارد، دەترساو دەگریا، ئەوجا دوو دەنگ بەگوێمدا هات، دیاربوو لەنزیکمانەوە بوو، لام لێکردەوە، دوو پیاو بوون، یەکێکیان دڵەڕاوکێ لەچاوەکانی دیاربوو، جلوبەرگێکی جادووگەرانەی فیرعەونی لەبەردابوو، ئاور لەچاوییەوە دەباری، بە بەرامبەرەکەی گوت:

- ئەوە ئەو منداڵەیە، بیبەین؟

دەنگەکەی بەرامبەری کە لەفیشکەی مار دەچوو، عابایەکی بەسەرەوە بوو، هەموو دەموچاویشی پۆشی بوو، گوتی:

- نا.. لێی گەڕێ، هێشتا نیشانەکانی تیا دەرنەکەوتووە.

لەپڕ خاوەن دەنگە فیشکەی مارەکە ئاوڕی لێ داینەوە، ترس ئامبازم بوو. کا.. دەستبەجێ هەڵهات و لەو شوێنە دوور کەوتینەوە، نەمزانی بۆچی هەر هەموویان بەو شێوە دیقەتیان دەداین.

***

# تاریکی چۆن داهات و مرد، هەرواش ڕۆژ دادێت

(کا)کەی تایبەت بەخۆمان لەهەوادا دەسووڕایەوە، گوێمان لەدەنگگەلێك بوو، چون خۆشی دەهاتە بەر گوێمان، تەماشای ئەملاو ئەولامکرد، کۆشکەکەی (فیرعەون)م هاتە بەرچاو، شتێك بەتەنیشت کۆشکەکەوەبوو، ڕوحەکە هێدی هێدی دابەزی، هەراوزەنای خۆشی بەرزەوەبوو، دیمەنەکە ڕوونتر دەرکەوت، تابوورێکی گەورە خەڵکی لەکۆشکەکەی فیرعەونەوە تا ناو شاری (جاسان) درێژ بوو، ئەو شارە ئەوەی جوولەکەکان تێیدا نیشتەجێبوون، هەر هەموو ئەوانەی لەتابوورەکەدابوون لەشتێکیان دەداو بەدوو ڕیزی ڕێکوپێك بەرامبەر یەکیان گرتبوو، چون ئەوەی ڕێ بکەنەوە. (کا)کەی تایبەت بەخۆمان شۆڕبووەوە ناو ڕوحی ئەو پیاوەی لێل کۆمەڵێك لەپیاوان و لەناوەندی ڕێگاکەی نێوان دوو ڕیزەکە دەڕۆیشت، ئەو پیاوەی لەڕوحیدا دامانکووتی، لەتەك چەند پیاوێکی تر کەژاوەیەکیان بەسەر شانەوە هەڵگرتبوو، دیاربوو شتێکی پیرۆز بوو، نەمدەزانی چییە، وەلێ زۆر بەوریاییەوە هەڵیانگرتبووبوو، تەپڵی فیرعەونی لێدرا، دەست بەگوڵبارانی کرا و سترانێکیشیان بۆ میری بەختەوەر چڕی، کە دونیا لەخۆ دەگرێت.

گەیشتنە کۆشکی فیرعەون، لەوێ ئافرەتێك بە جلوبەرگی زۆر بەهادارەوە وێستابوو، ڕوخساری دڵی دەکردەوە، چوومە هزری ئەو ڕوحەی خۆمان تیا شاردبووەوە، هەر کە لێی حاڵیبووم موچرکێکم پیا هات، ئەو تابوورە بۆ گواستنەوەی ئەو منداڵە بچووکە جوانەی کە شاژن لای ڕووبارەکە دۆزیبوویەوە، دوای تەواوبوونی لای شیردایانی ئەو شارە بۆ کۆشکی فیرعەون گواسترایەوە. دەڵێن ئەو منداڵە بەخشینی خواوەند(بس)ە بۆ فیرعەون، ئەوەش دوای چاوەڕوانییەکی زۆر کە منداڵی نێرینەی نەدەبوو. شاژن لەدەروازەی کۆشك چاوەڕوانبوو، ئەویش شاژن(ئاسیا)بوو، شاژن

منداڵەکەی لەناو کەژاوەکە دەرهێناو لەباوەشی گرد، مزرم قووڵکردەوە.. تۆ بڵێی ئەو منداڵە مووسا بێت؟

تەماشای منداڵەکەم کرد، منداڵێکی گەنمڕەنگ و لەمنداڵانی جوولەکان نەدەچوو، کە سپی پێستن، شاژن ئاسیا بەدڵخۆشییەوە منداڵەکەی بردە لای فیرعەون، ئێمەش بەدوویەوە بووین.

چاوم بەفیرعەون کەوت، دەموچاوێکی هەبوو لەهیچ پەیکەرێکی نەدەچوو، بۆخۆم زۆربەی خوێندنم لەسەر پاشاکانی ئەو سەردەمە خوێندبوو، ریشێکی درێژ و دووچاوی بچووکی هەبوو، شاژن منداڵەکەی لەباوەش فیرعەون نا، منداڵەکە دەستی بەرز کردەوەو ریشی فیرعەونی گرت و رایکێشا، هەرچی لەوێ بوو لەجێی خۆیان سڕ بوون. دەستوپێوەندەکەی گوتیان:

– ئەو منداڵە بەخششی خواوەند نییەو بەخششی نیل(موو–سا)ش نییە، وەك ئەوەی ناوتان لێناوە، ئەوە رق و کینەو غەزەبە، کە تەخت و تاراجی پاشایەتی لە فیرعەون دەبات.

فیرعەون چرچاوی بەیکا هات و چون ئەوەی پێوویست بە بیرکردنەوە نەکات گوتی:

– بیکوژن.

شاژن ئاسیا بلەز خۆی گەیاندە سەر دەستی فیرعەون و گوتی:

– گەورەم (با _ فەرعا) ئەوە منداڵێکەو نافامێت، دوو پشکۆی ئاگر و دوو دەنکە گەوهەری لەبەردەمدا دانێن، ئەگەر دەستی بۆ گەوهەرەکە برد و لە پشکۆکان گەڕا، ئەوە بزانە دەفامێت،

بیکوژن، ئەگەر پێچەوانەکەشی کرد، ئەوە مانای ئەوەیە فامی نییە.

فیرعەون چاوی لێ کز کردو دەستبەجێ فەرمانی بەو تاقیکردنەوەیە دا. ئەو پیاوە لەزمانەوە بیر دەکاتەوە. دەستوپێوەندەکەی دوو گەوهەرو دوو پشکۆ ئامادەی تاقیکردنەوەکە دەکەن و لەبەردەم منداڵەکەی دادەنێن، بەدوو چاوی ساوێلکانەکەی دەستی بۆ پشکۆکان برد، دڵی گرگرتووی پیاوەکان دامرکایەوە.

کا.. ئەوێی جێهێشت و بردنی بۆ شوێنێکیتر.



## منداڵێك فریشتە پەروەردەی بکات باشترە یا فیرعەون پەروەردەی بکات

دوای پانزە ساڵ...

تاریکی کۆڵانەکان ڕوحمانی داپۆشیبوو، چووینە ڕوحی منداڵێکەوە، کە فریشتەکان سەروکاری پەروەردەکردنی بوون، هەنووکە منداڵ نییە، گەورەبووەو لەتەمەنی هەرزەکاری دایە، منداڵەکانی تریش هەراش بوونە، دوور لەچاوانی پیاوانی فیرعەون دزەیان بۆ ماڵەکانی خۆیان دەکرد، ئەوەتا وام لەناو ڕوحی یەکێکیان، لەکۆڵانێکی شاری (ساجان) جاگرتەیە، بیرم لەوە دەکردەوە کە چارم پێکەوت، ئەو منداڵەی فریشتەکان بەخێویان کرد، بۆ سەر بەشەرییەت دەبێتە کارەسات، ئەو منداڵەش کە فیرعەون بەخێوی کرد، دەبێتە پێغەمبەر و بڕیاردەری یەکەمی وڵات و حوکم دەکات. لەگەڵ

پێشتنم بەکۆڵانەکان بیرم دەکردەوە، دەنگێك لەبیرکردنەوەی بردم و وریای کردمەوە، خەڵکی بەدەم بانگەوازەکەوە هاتنە دەرەوە، بانگەوازکەرەکە دەیگوت:

- هۆ ئەوەی ئیسرائیل منداڵەکانتان بشارنەوە، هەواڵی زۆربوونی نەوەکانی ئیسرائیل گەیشتووەتە فیرعەون، بەربەیان سەربازەکانی فیرعەون دەگەنە سەرتان.

ژنان بەدەم سنگکوتانەوە منداڵەکانیان لەخۆ گرت، ئەگەر سەربازەکان چاویان بەمنداڵەکان بکەوێت و بیانگرن، هەر بەتەنها منداڵەکان ناکوژن، خانوادەکەشی لێلدا دەکوژن. پێدەچوو ئەو گەنجەی تیا جاگرتەببووین، هەتیو بوو، یا دایکی لای فیرعەونەکان دەستبەسەر بوو، بردمان تا لەسەربانی خانوویەك بیشارینەوە، ڕوحمان دەلەرزی، تا ڕووناکی بەربەیان تاریکی ڕەوانەوە، سەربازەکان کەوتنە ناو شارو خانوو بەخانوو دەیانپشکنی، یەکێکیان هاواری کرد:

- ئەی عیبرانییەکان.. سوێند بەخواوەند و پادشامان(بافەرعا) ئەگەر ئەمڕۆ چنگمان لەهەر منداڵێك گیر بێت، نایکوژین، بەڵکو لەکرشتن خەراپتری بەسەر دێنین، بڕواننە ئەوێ، ئەو خانووە دەبینن لەخشتی قوڕ درووستدەکرێت، لەبری خشت منداڵەکەتان پاڵدەخەین و بەخۆشتان واتان لێدەکەین دیواری بەسەرا بچنن، تا ئێسك و پرووسکی دەشکێت.

دڵم هەڵچوو، بیرکردنەوەم سڕبوو، هەر هەموو ئەوانەی لەوێ بوون بەحەپەساوییەوە لەخانووە قوڕەکەیان دەڕوانی، گەنجێك لەپەنگەکەی هاتە دەرەوە، زۆر شکۆمەندانە بەڕێوە دەڕۆیشت، دیاربوو تەواو باوەڕی بەخۆی

بوو، تەماشای هەموو سەربازەکانی کرد، گەنجێك جەستەی پتەو و بەهێز، پرچی بە بەستراوی بۆ پشتەوە هەڵداوە، چاوێکی وەك دەنکە تری دەرپۆقیوە، زۆر لەسەرخۆ و بە هەیبەتەوە بە بەرچاویانەوە دەڕۆیشت.. ئەوە (میخا)یە. سەربازێك دەستی بۆ چەکەکەی برد، وەلێ بەر لەوەی دەستی بەچەکەکە بکات، میخا شالاوی بۆ برد، بەو دەستە پۆلاینەی ناقرگەی سەربازەکەی گرت، هەر وەك ئەوەی منداڵێکی بەرزەوە کردبێت، تا توانی هەڵیدا، ئەوەی دوای ئەوە ڕوویدا لەعەقڵ نەبوو.

شمشێرەکان لە کالان دەرهێنران، وەلێ میخا لەجێی خۆی نەجوولا، بەهێز پاڵیان پێوە نا و بەریاندایە سەر زەویەکە، میخا زۆری لێ کوشتن، پێم مەڵێ گەنجێك چۆن توانی ئەوە بکات، بەلام بەچاوی خۆم ئەوەم بینی، هەر کە دەستی دەگەیشتە ناقرگەی سەربازێك ئێسك و پرووسکی دەشکاند، دەبوو گەلەکۆمەی لێ بکەن تا باڵبەستی بکەن، تا لەبری خشتێکی قوڕ بەسەر دیوارەکەوە پاڵی بخەن، هەرچۆنێ بوو بەگوریس کۆتیان کرد، تا لەو کاتەدا چاوم لەدوو کەس بوو وێستابوون، تەماشای دیمەنەکەیان دەکرد، دوو کەسەکە یەکێکیان جادووگەرەکەیە و ئەوی عابای دابووە سەر سەری خۆی، نووکەش بەشێك لەڕوخساری خاوەن عابا بەسەرەکەم لێوە دیارە، تۆ بڵێی شەیتانی کۆن لۆسیفەر بێت؟ مەحاڵ نییە، هەموو شتێکمان لەم بارودۆخەدا بینی، تەنها ئەو ماوە، بەلام لێرە چی دەکات؟ ئەو جادووگەرەی تەنیشتی کێیە؟ ناتوانم گوێم لەقسەکردنیان بێت.

سەربازەکان (میخا)یان بەگوریس باڵبەستکرد، دواتر بەسەر دیوارە قوڕەکەوە پاڵیانخست، بەهەر هەموویانەوە خشتێکی گەورەیان بەرز کردەوە، خۆ ئەگەر خشتکەی بخەنە سەر ئێسك و پرووسکی پان دەکاتەوە، لێی نزیکبوونەوە، زۆر بەزەحمەت بەردەکەیان هەڵبڕی، ئیبلیس و هاوڕێکەی

لەدوورەوە تەماشایان دەکرد، دایکی گەمجەکە هاواری لێکردن، وەلێ کەس بەدەنگیەوە نەهات.

- ڕاوەستن.

دەنگێک لەلای ڕاستەوە هات، هەر هەموو ڕوویان بۆ لای دەنگەکە وەرچەرخاند، گەنجێك بە جلوبەرگی بەهادارەوە دەرکەوت، گەنجێکی گەنمڕەنگ و ڕوخسار جوان، پاڵێکی پێوەنان و بەردەکەی بەرەوەدا و هاواری بەسەریانەوە کرد، سەربازەکان بەڕێزەوە سەریان بۆ نەویکرد.. ئەمە کێیە؟

زیاتر و قووڵتر بەناخی ئەوەی چووبووینە ڕوحیەوە شۆڕبووینەوە، تا زانیارییەکی لێ وەرگرم، ڕوحم حەپەسا، ئەوەی (میخا)ی ڕزگار کرد، کوڕی فیرعەون بوو، ئەو گەنجە گەنمڕەنگە (مووسا)یە.

***

## هەندێکجار گوێرەکەکان عەقڵی پیاو دەگۆڕن

هەر کە مووسا خۆی لەکێشەکە هەڵقورتاند، هەموو شتێك گۆڕا. مووسا بەرە ناوبانگی دەرکردبوو فریادگوزاری داماوانە، بەتایبەت نەوەکانی ئیسرائیل. خۆمان لەڕوحی گەنجەکە مەڵاسدا تا بزانین چی ڕوودەدات، بینیمان دوو پیاوەکە بلەز بۆ لای میخا ڕۆیشتن، یەکێکیان مالوومی جادوگەر بوو، ئەو پلەو پایەی جادووگەرییەی هەیبوو کەس نەبوو لەبەرامبەریدا بوەستێت، تەنانەت ئەگەر (میر)یش بێت. جادووگەرەکە گوتی:

- دەستخۆش مووسا.. بەخششی نیل، ئەم گەنجە لەگەڵ خۆماندا دەبەین، خواوەند پاراستی، دواڕۆژێکی باشی دەبێت.

هەمووان تەماشای جادووگەرەکەیان دەکرد، کە گوریسەکەی لە میخا کردەوە، ئەوە ئەو هەلەیە دەبێت لەڕوحی ئەو گەنجە دەربچین و بچینە ڕوحی جادووگەرەکە، بەوشێوەیە هەموو شتێك دەزانین. کا.. گواستینیەوە ڕوحی جادووگەرەکە، وەلێ...

چنگێکی بەڕوحماندا کرد، وەك ئەوەی هەزار چنگمان لێ گیر بووبێت، ئەو ڕوحەی تیا ڕۆ چووین دەبێ چیبێت؟ لەچاواتی جادووگەرەکەوە گوزارشتێك دەرکەوت، دواتر بە گوزارشتێکی تر گۆڕا، چون تۆڵەکردنەوە، وەك ئەوەی هەستی پێمان کردبێت چووینەتە ڕوحیەوە، سەری بۆ ئاسمان بەرزەوە کرد.. ئەی خودایە ئەم پیاوە زاڵە بەسەر ڕوحماندا، لەجەستەیدا بەرزبووینەوە، وەلێ ڕۆی کردینە خواری ناخیەوە.. دەی باشتر زانیاری زیاترمان دەستبکەوێت، تا لێی حاڵیتر دەبین، زیاتر بەترسا ڕۆ چووین، ئەو زانیارییانە هی بنیادەم نین، لەپڕ پڕمەیەکی بۆکرد و تووڕی داینە دەرەوەو بەسەر زەویەکەدا گلۆر بووینەوە، خۆمان دوور خستەوە، چووینە ڕوحی گیانەوەرێك. پیاوەکانم بینی دوور دەکەوتنەوەو (میخا)یان لەتەکا بوو، میخا لای لەگیانەوەرەکە کردەوە، کە بەڕوحیدا ڕۆچووین.

گوێرەکەیەك بە پێدەشتی میسردا دەمانیگێڕا، لێرەو لەوێ بەدووی لەوەڕ دەگەڕا، هەرچەندمانکرد تیا دەربچین نەمانتوانی. ساڵان ڕۆیی هیچمان پێ نەکرا، هیچ شتێك نەبوو هەستی بوروژێنێت، هەر کە بێزاریش دەبووین، دەگەڕاینەوە بۆ ئەو بابەتەی چی لەڕوحی جادووگەرەکە فێربووین، ئاخر زانست لەتەك ئەوانکەل ئەوپەڕی زانستە، لەپەرتووکی (ڕازئێل) تا (لەوحی ئیدریس)، بۆ زانستی ئەندازیاری و فەلەکناسی کە هەر بەخۆیان

دایانهێنابوو، سەیر نییە ئەوان بیّ ململانیّ دامێنەری شارستانییەتەکان، وەلیّ ئەمە کۆتایی گەشتەکەیە؟ دەمانەوێت لەم شتە دەربچین.

لەبەدبەختی رۆژی رەشمان لەناو روحی گوێرەکەکە خەونێکمان بینی، بۆمان شرۆڤە نەدەکرا(( پیاوێکی پرچ ئالتوونی روخساری جوانیمان بینی، تەختەلەوحێکی گەورەی لەسەر پشت هەلگرتبوو، بەنێو خەلکدا دەرۆیشت، هەندێك لەو خەلکە گالتەیان پێدەکرد، هەندێکی تریان بۆی دەگریان، لەنێو حەشاماتەکە پیاوێکم بینی دلی بەداماوییەکەی خۆش بوو، بزەخەنەی هات، پیاوێکی تاکچاو رێك لە میخا دەچوو)).

ئەو تاکچاوە لەخەونەکانماندا دەمانبینی، لەپڕێ دەموچاوی بەرامبەرمان دەرکەوت، نەك هەر ئەو بەلکو دەموچاوگەلێکیتریشمان لێدەرکەوت، یەکێکیان بزەخەنەی بۆ کرد و گوتی:

- تۆ بلێی دواکەوتبێتین؟

لەتەك خۆیاندا بردیان، خۆ ئەگەر بۆ کەسێك ئەوە بگێرمەوە باوەڕ ناکات، ئێمە لەناو گوێرەکەیەکداین و لەسەر سەکۆیەکی حەساری پەرستگایەك دانراوین، هەزاران کەس بەدەور پەرستگاکەوە دەخولێنەوە، هەر هەمووشیان شتێکیان دەکرد، وابزانم دەیانپەرستین، ئێمەش هەر لەناو روحی گوێرەکە(ئەبیس) داین، ئەوی لەخاکی میسردا بەدوویدا دەگەڕان، گوێرەکە رەشەکە نیشانەی سێگۆشەیەکی سپی بەتەختی نیوچەوانیەوەبوو، هەر کە دۆزیانەوە، هێنایان و لەپەرستگاکە دایاننا، تێگەیشتم بوونمان لەناو ئەم گوێرەکەیە رێکەوت نەبووە. سالانێکی زۆر دوای ئەوە بینیمەوە، هەر ئەوبوو، لەسیلەمدا وەستاو سروشی پەرستنی گوێرەکەکەی دەخوێندەوە.

ئەمڕۆ ئەو بووەتە (مالوم)ی مەزن بۆ گوێرەکە پیرۆزی (ئەبیس) بەوناوایەش گەنجێکی بەخۆیە، ڕوخساری سەرکردەیەکیشی پێوە دیارە.

بەوای زانستەکەیانەوە هەموو شتێك فێریبوو، بەدەر لەوەش شتگەلێکی تریشیان فێر کردووە، بەڵێ چاوەڕواتی بوون. لەدیقەتدانی نەکەوتم، چاوم لێبوو سەری گوێرەکەکە بە پەڕۆیەکی ڕەش داپۆشرا، بردیانین بۆ ناو پەرستگاکە.

پیاوانگەلێك بەدەورمانەوە وێستابوون، هەریەکەو دەمامکێکی بەسەرەوە بوو، دەمامکی ڕەشی ڕێویان بەستووە کە لەگورگ دەچێت، ئەوان کەشیشی مۆمیا کردنن، بەر لەوەی حاڵی بین کە چی ڕوودەدات، چەقۆیەکی تیژ ملی گوێرەکەکەی سەر بڕی، ڕوحی دەرپەڕی و بەرزەوە بوو، ئێمەش لێلیدا بووین، بەر دیواری نەخشێنراوی پەرستگاکە کەوتین، یەك لە کەشیشەکان دەمامکەکەی دوور خستەوە تا بڕوات، هەر ئەویوو خاوەن چاوەدرپۆقیوەکە، کە بەردیش سڵی لێ دەکردەوە.

کەسێك لێرە دوورمان بخاتەوە.

***

## لەمرۆڤدا سێ چاو هەن، دیتن و ڕوح و چاوتیژی

دوای پێنج ساڵی تر...

لەڕوحی کەشیشێکی فیرعەونی خۆمان مەلاسدا، پێدەچوو ڕوحێکی دووڕووی هەبووبێت، زانیم ڕوحی کەشیشێکە بەناوی(یانز)ەوە بوو، لەبەلەکۆنەکەی کۆشکی فیرعەوندا بینیم، وێستابوو، تەماشای تەلارەکانی دەکرد، دواتر هەستی ورووژا، کاتێ دیمەنێکی نامۆی لەدەرەوەی کۆشك بینی، دوو پیاو

یەکێکیان گەنمڕەنگ و دارعاسایەکی بەدەستەوەبوو، ئەوی دی کەمێک لەو دەچوو، هەردووکیان لەکۆشک نزیک بوونەوە، ڕوحی کەشیشەکە پێیڕاگەیاندم ئەوەی دارعاساکەی بەدەستەوەیە (مووسای)ە، دوای ئەوەی پیاوێکی لەماڵپاتی فیرعەون کوشتبوو، لەکۆشک هەڵهاتبوو، وەڵێ چی مێناویەتیەوە، لەمەرگی خۆی دەگەڕێت؟ ئەی ئەوەی لەتەکیدایە کێیە؟

چەند شێرێك باسی دەروازەی کۆشکیان دەکرد، تا ئەوەی لەکۆشك نزیك دەبێتەوە پارچە پارچەی بکەن، شێرەکان کەوتنە نەڕاندن، پیاوانی کۆشك ئەوانەی سەرپەرشتی شێرەکانیان دەکرد، هەوڵیاندا شێرەکان هێور بکەنەوە، مووسا و هاوڵەکەی لەجێی خۆیان وێستان، کەشیشەکە بلەز بۆ لای فیرعەون غاریدا، تا ئەو هەواڵەی پێڕابگەێنێت:

- ئەی فیرعەون.. کوڕە هەڵاتووەکەت مووسا هاتەوە.

فیرعەون لەسەر عەرشەکەی هەستا و گوتی:

- چۆن وێرای بێتەوە؟ ئەی سەربازەکان و شێرەکان لەکوێن؟ بیکوژن.

هەموورا چڵەکین، دواتر گوێمان لەنەڕەیەکبوو، لەمۆڵەکە نزیك دەبووەوە، ئەوە سرووشتی نەبوو، هەرهەمووومان بەحەپەساوی لەدەرگای مۆڵەکەمان دەڕوانی.

لەدیمەنێکی شکۆداردا مووساو هاوڵەکەی و شێرەکان هاتنە ژوورەوە، مووسا وێستا، هێز و پەیامبەری پێوە دیاربوو، گوتی

- ئەی فیرعەون.. من و هاروونی برام نێردراوی لای خواکەتین، تا بێیتە سەر ڕێگای ڕاست، واز لە ئەشکەنجەدانی نەوەی ئیسرائیل بێنە، کوڕیان سەردەبڕیت و لاقەی ژنەکانیان دەکەیت، ئەگەر

ڕێگـای ڕاسـتت گرتـه بـەر، ئـەوە ئشـتەوایی دەبینیـت، ئەگـەر نەهاتیتە سەر ڕێگای ڕاست، ئەوا خودا ئەشکەنجەت دەدات.

فیرعەون بەچاوە کلاویەکانیەوە گوتی:

- ئەوە کامە خودایە؟ ئیمە نەبووین ئەوەندە ساڵە تۆمـان پـەروەردە کرد؟ دوایی بۆچ هەڵهاتی، نووکەش هاتوویتـە و دەڵێیت نـیردراوی خودای؟ ئەی خەڵکینە بنوارنە ئەم پەیامبەرە شێتە.

مووسا بەتووندی گوتی:

- گومرابووم کە ئەوەمکرد، کـە هەڵیشهاتم لەترسی ئێوەبـوو، خـودا پێغەمبـەرێتی پـێ بەخشـیم، خـوداش.. خـودای ئـەرز و ئاسمانـە، هـەموو شـتێك ئـەو خوڵقاندوویـەتی، ڕێگـای ڕاسـتی بـۆ هـەموو بەندەکانی داناوە.
- ئەی مووسا.. ئەگەر بێجگە لەمن خوایەکی تر بـۆ خـۆت دابهێنیـت، ئەوا تەنها زیندان جێگات دەبێت، دەبا خواکەت لـەو زیندانـەی مـن دەرتبهێنێت.

مووسا کەمێك بێدەنگبوو، دواتر گوتی:

- چی دەڵێی ئەگەر نیشانەیەکت بۆ بخەمە ڕوو؟

فیرعەون بەر لەوەی لەمانای ئـەو قسـەیە حـاڵی بێـت، مووسـا دارعاسـاکەی فڕێ دایە سەر زەوییەکە و هەموران چاویان تێبڕی، دەبێـت چـی ڕوو بـدات، ئـەو دارە چییە مووسـا هەڵیدایـە سـەر زەویەکـە، ئـەوجا دیمەنـە سـەیرو سەمەرەکە دامات، ئەو دیمەنەی وای لە(کا)ی تایبەتمان کرد هەڵبێت و خۆی بە بنمیچەکەوە بگرێت، دارەکـە کەوتـە جووڵـە جووڵ، وردە وردە شێوەی

دارەکە گۆڕا، تا بوو بەمارێکی فیشکەدار، مارەکە بەرەو لای فیرعەون کشا و دەمی لێ کردەوەو زمانە دووڵەتەکەی دەرهێنا، گوێم لەترپە ترپی دڵی فیرعەون بوو.. ئەوە چ خواوەندێکە لەسەر عەرشەکەی لەگۆ چووە، وەلێ یەك لەپیاوەکانی فیرعەون هەڵیداو گوتی:

- دووری بکەرەوە.

مووسا دەستە گەنمڕەنگییەکە لەباخەڵی ناو دواتر دەریهێنا و دەستی بۆ لای مارەکە درێژ کرد، هەموو دۆشدامابوون، بەوای ئەوەی دەستی مووسا سپی بوو، دەستبەجێ مارەکە لەجێی خۆی وەستا، بەرەو لای دەستە سپییەکەی مووسا ڕۆیشت، دواتر سەری بۆ لای مووسا بەرز کردەوە، هەر کە بەردەستی کەوت، بووەوە بە گۆپاڵەکەی دەستی مووسا و دەستە سپییەکەشی گەنمڕەنگییەکەی لەخۆ گرتەوە.

هەموو ئەوانەی لەوێ ئامادەبوون، لە گەورە پیاوانی ماڵپاتی فیرعەون بوون، فیرعەون ئەگەر شتێك نەکات مانای ئەوەیە عەرشەکەی بەرەو فەنابوون دەڕوات، ئەوێك خۆی بە خواوەند و پاشاو زانستکار دەزانێت، چۆن گرەو لە مووسا بباتەوە.

***

## چاو کە ڕووناکی دەبینێت پێی دەزانێت، ئەگەر لەسەر شێوەی ماریشدا بێت

بەحەراوەبووین، دوای پەرجووەکەی مووسا کە بینیمان، ما لەو بێدەنگییە ڕابمێنین، دواتر فیرعەون لەسەر عەرشەکەی ڕاستەوەبوو.

هەندێ کات هەن کەسایەتی مێژووییەکان بەسەر بکەیتەوە، بەڕاستی لەجێی خڕیەتی ئەو هەموو هەراوزەنایەی بۆ بنرێتەوە، فیرعەون.. بەڕاستی فیرعەون بوو، کە لەعەرشەکەی هەستا، بەهەنگاوی شکۆمەندانە بەرەو مووسا ڕۆیشت، کە وەك شاخێکی مەزن وێستابوو، فیرعەون بەدەم ڕێوە تەماشای دارعاساکەی مووسای دەکرد، لەپڕ گوتی:

- ئەمەی بەر لەکەمێك کردت، هونەری جادووگەری (هێکا)یە، تەنانەت ئەو جادووگەرەش دەناسم کە فێری کردوویت، ئەوە (ئۆباینەر)ە.. وانییە؟

مووساو هاروونی برای بە دیدگای پرسیار ئامێز لەفیرعەونیان ڕوانی، فیرعەون درێژەی بەقسەکەی داو گوتی:

- سەربوردەیەکی بەربلاو لەولاتەکەماندا هەیە، حیکایەتی خۆفۆ و جادووگەر، با بیرتی بخەمەوە، کاتێك خەڵکەکە بەرامبەر پاشا خۆفۆ کۆبوونەوە، باسی جادووگەری گەورەیان کرد، یەك لەو گێڕانەوانە دەربارەی جادووگەر ئۆباینەر بوو، کە تیمساحێکی لەشەم درووستکرد و دواتر بوو بەتیمساحێکی ڕاستی.

فیرعەون ئاوڕی لەخەڵکەکە دایەوەو گوتی:

- ئەم مرۆڤە جادووگەرێکی بەتوانایە، وەلێ دەیەوێت بەجادووگەرییەکەی لەم ولاتەی خۆمان دەرمان بکات، بەلام ئەوەی ئەو لێی حالی نەبووە، خودی ئەم خاکەمان خاکی جادووگەرانە، وای بەباش دەزانم دەستبەجێ بیکوژین.

پیاوێك دەرکەوت، دەمناسی، لەسەرەتای سەربوردەکە بینیبوومان، سیتکا زڕ برای فیرعەون، بێ ترس گوتی:

- پیاوێك دەكوژن هەر لەبەر ئەوەی دەڵێت خودای ئەو ئەللایە؟!

مووسا گوتی:

- من پەنام بردە لای خودای خۆم، ئێوەش باوەڕتان بەو خودایەی من نییە.

فیرعەون بەتوورەییەوە گوتی:

- ڕاتان چییە ئەوەی من دەیبینم، لێمگەڕێن ئەم بنیادەمە بكوژم.

یەكێكیان هەڵیداو گوتی:

- كوشتنی دەیكات بە پاڵەوان، لەناو خەڵكیدا بەو فێڵانەی خۆی دەرخستووە، با ئەو جادووەی خۆی دەربخات، ئێمەش جادووی خۆمان دەردەخەین، ئەوەش بە بەرچاوی خەڵكییەوە بێت، جادووەكەی شكست پێدێنین، ئێمە (میخا)ی جادووگەرمان هەیە، كەشیشی مەزنی گوێرەكەی( ئەبیس).

مووسا سەرسامییەك دایگرت، یەكەمجاری بوو میخای جولەكە بناسێت، كە ڕێگای جادووگەریی گرتووەتە بەر، تەنانەت بووە بەگەورەی سیحربازان.

فیرعەون دەستبەجێ گوتی:

- با سیحرەكەت بەسیحری خۆمان تاقی بكەینەوە، ڕۆژێك دیاری بكە.

مووسا بلەز وەڵامی دایەوە و گوتی:

- ڕۆژی ڕازاندنەوە.

فیرعەون دەموچاوی تێكچوو، ڕۆژی ڕازاندنەوە ڕۆژی گردبوونەوەیە.

ڕوو بەڕووبوونەوەکە بۆ ڕۆژی ڕازاندنەوە دیاری کراو جۆبلاویان لێکرد، جادووگەرەکە بۆ لای میخا میری جادووگەران ڕۆیشت، لێل ساحیرەکە چوونە پەرستگای گوێرەکە (ئەبیس) لە (مەمفیس). گۆڕەپانێکی گەورە لەکۆتاییەکەیدا پەیکەرێکی گەورەی گوێرەکە، لەژێر پەیکەرەکە پیاوێك وێستاوە، پیاوێکی تاکچاو، ئەو پیاوە ترسناك نییە، وەلێ دەتحەپەسێنێت، نیگاکردنی چاوەکانی لەرزت لێدێنێت، وەك ئەوەی تاوانبار بیت. ئەو پیاوەی لەڕوحیدا بووین بەتووڕەییەوە باسی لە مووسا و مارەکەی دەکرد.. پێوویستە ساحیرەکانمان کۆ بکەینەوە. دوای ئەوەی لەقسەکانی بووەوە، تاکچاو گوتی:

- کەس بەسیحر ناتوانێت بێ ڕوح ڕوحدار بکات، ڕەنگە سیحری لەچاوتان کردبێت.

پیاوەکە ویستی درێژە بەقسەکەی بدات، تاکچاو ڕایگرت و ئیشارەتی بەدەستی کرد و گوتی:

- ئەو پیاوە فێری سیحرێك بووە، کە لەم ولاتەی ئێمەدا درکیان پێنەکردووە، با ڕۆژی ڕازاندنەوە ڕۆژی بەرەنگاربوونەوە بێت، ئەگەر حەزی بەفێڵی مارە، ئێمەش سیحرمان دەبێت.

تاکچاو شووشەیەکی ڕادەستی پیاوەکە کرد، ئاوێکی سپی تێدابوو، قسەیەکی پێگوت سەری خولاندمەوە.. ئەمە چ شەیتانێکە؟!

***

## ڕۆژی ڕازاندنەوە داهێنەرانی ئەو ڕازاندنەوەیە ئاشکرا بوون

ڕۆژی گردبوونەوە هات، (یانن)ی ساحیر ئەوەی لەڕوحیدا نیشتەجێبووین لەماڵەوە دەرچوو، میسرییەکان بە جوانترین پۆشاکیانەوە لەخانووەکانیان بەدەرکەوتن، هەندێکیان لەسەر لێواری نیل کۆبوونەوە، بەلەمی ڕەنگاو ڕەنگیان ڕازاندەوە، ئەوڕۆ ڕۆژی ( واج و تحووت)ە و ئاهەنگ بۆ (ئۆزێریس) و هەموو مردووەکان دەگێڕن، زۆربەی پیادەکان بە پەلە بۆ گۆڕەپانە گەورەکەی فیرعەون ڕۆیشتن. کاتی نمایشی سیحربازەکان هات.

ستوون و پەرستگاو تەلارەکان بەنەخشی ڕەنگاو ڕەنگ و گوڵبارانی شەقامەکان بەڕێوەچوو، تا گەیشتینە گۆڕەپانی گردبوونەوەکە، فیرعەونمان بینی لەتەك داروودەستەکەی دانیشتبوون، ئاسیا.. بەدڵەڕاوکێوە لەبەلەکۆنەکە وێستابوو، گوێمان لەهات و هاواری خەڵکەکەبوو، ئەودەم مووسا دەرکەوت.. ئای لەشکۆ و هەیبەتی ئەو پیاوە سیمای پێغەمبەرایەتی پێوە دیاربوو، دارعاساکەی هەر بەدەستەوەبوو، لەپڕ هەراو زەناکە بۆ ئەوبەر گواسترایەوە، مرۆڤێکی تر دەرکەوت، میخا بە پرچە لوول و درێژەکەی و چاوە دەرپۆقیوەکەی عابایەکی بەسەرەوەبوو، بەلای ڕاست ڕوانی، دەیان سیحرباز بەدوویەوەبوون. ئەو پیاوە هەر کە دەیبینیت دڵت دەگووشرێت، واماذانی (یانن)ی ساحیر بەرەو ساحیرەکان دەڕوات، وەلێ بۆ لای مووسا ڕۆیشت.

(یانن)م بینی شووشەیەکی بەدەستەوەبوو و شەرابی سووری تێدابوو، دوور نییە گیراوەیەکبێت لە ژاری ماری کوشندە، بەرەو لای مووسا ڕۆیشت، کاتێ پێیگەیشت سەری لەبەر نووشتاندەوەو شەرابەکەی خستە بەردەستی و گوتی:

- گەورەم فەرموو، سلاوی بەخێرهاتنی فیرعەونە.

مووسا تەماشای شووشەکەی کردود دواتر نیگای (میخا)ی کرد، لەو شووشەیەی نایە سەرەوەو مووساش شووشەکەی وەرگرت و نایە سەرەوە، دڵم گووشرا.. ئەی خودایە ! ژارەکەی خواردەوە، مووسا گوتی:

- برۆ بۆ لای ئەو کەسەی ئەمەی درووستکرد، پێی بڵێ ژار کار لە خزمەتکارانی خودا ناکات.

یانز ڕوحی کەوتە لەرزین، بڕواشی تێکووروژا، وەلێ دانی بەخۆیدا گرت و بەرەو لای میخا ڕۆیشت. نمایشەکە دەستی پێکرد، ساحیرەکان دارەکانیان فڕێدایە سەر زەوییەکە، دارەکان جووڵەیان تێکەوت، بەرەو پێش دەچوون، سەریشیان بەرزەوە کرد، نیگای وردم تێبڕین.. ئەی ئاسمان ئەمانەش مارن؟ وەلێ دارەکەی مووسا بوو بەمارێکی گەورە، دەیفیشکاند و هێرشی کردە سەر مارەکان و هەر هەموو مارەکانی لووشدا. خۆمان لەسەر زەوی بینییەوە، بە شێوەیەکی تر ئەوە کەڵلەی یانز بوو دانەویە سەر زەویەکە، سەرەتا نەمزانی بۆچی کەڵلەی یانز دابەزییە سەر زەویەکە، ئا ئەو پیاوە کڕنۆشی برد، هەر هەموو ساحیرەکانم بینی کڕنۆشیان برد، تەنها هەر ئەو لەناویاندا مایەوەو کڕنۆشی نەبرد، هەر وەك ئیبلیس لەنێو فریشتەکانا کە کڕنۆشی بۆ ئادەم ،ەبرد، بەڕاستی ئەو دیمەنەی لە مووسام بینی دیمەنێکی شکۆدار بوو، شکۆی پێغەمبەرێك بوو.

***

## لەنێو هەموو هەرەمەکاندا هەرەمی تاکچاو مەزنترینیان بوو

ناخۆشترین شتێك کاتێ دەچیتە ڕوحێکی شەکەت و ماندوو، لەو دۆخەدا وەڵامێکی کتوپڕت بۆ نابێت. ئەمڕۆ لەڕوحی کرێکارێکی زەبەلاحی میسری داین، ئەوەندە ماندووە، دەڕوات و بیر ناکاتەوە، تاکچاوم لێوە دیارە، لەسیلەی (هامان)ی پیرەدا بەڕێوە دەڕوات، لەتەك یەکدا گفتوگۆ دەکەن، هەڵبەتە باس لەشتێکی گرنگ دەکەن، ویستمان دەماری کرێکارەکە بگرین، تا هەنگاوی گورجتر بنێت و لێیان نزیك بێتەوە، وەلێ سوودی نەبوو، لەتەنیشتمانەوە جۆگەیەکی گەورەی ئاو هەبوو، جۆگەکە لەخشتی سوورەوە کراو دروستکراوە. دەیان کرێکاری بیناکردن گوریسێکیان بەدەستەوە گرتووەو بەردی گەورە لەجۆگەکە ڕادەکێشن، هەر بەردەو بە چەرمی پڕ لەبا دەوردراوە، تا سەر ئاو بکەوێت، خەریکی دروستکردنی هەرەمی مەزن بوون، هەرەمی فیرعەون (با فەرعا) کە بەرزترین هەرەمە لەسەر زەوی، تەنانەت لە هەرەمی (خۆفۆ)ش بەرزترە. ئەو کرێکارەی لەڕوحیداین، لەتەکمانا نەرم و نیانترە، هەستیم ورووژاند، هەنگاوی پەلەتری دەنا، تا لە تاکچاو نزیکەوە بوو.

– تۆ عیبرانیت، لەوانیت، باوەڕیان پێتە.

هامان ئەوەی بەتاکچاو گوت، تاکچاو تەماشای کرد و گوتی:

– دەبێت فیرعەون بەمە ڕازی بکەیت، ئەمە تەنها ڕێگاچارەیە بۆ دۆزینەوەی نهێنی ئەو جادووەی بەسەر ساحیرەکانماندا زاڵبوو.

گەیشتینە هەرەمی مەزن، لەبیناکردنیدا بوون، لێرە سەیرترین شتی ئەندازیاریم بینی، بۆچی فیرعەونەکان بەسەر هەمواندا سەرکەوتوو بوون، ئەوەی ڕۆژێ لەڕۆژان ئەوەت خوێندووەتەوە چۆن چۆنی بیناسای

هەڕەمەکانیان درووستکردووە، ئەوە لەبیر خۆت بەرەوە، ئێمە شتێکی تر بەچاوی خۆمان دەبینی.

هەر کە هەموو بەردەکان بۆ کۆتایی ڕێڕەوی ئاوەکە گواسترانەوە، ما بەردەکان بەرز بکەنەوە، تا بگاتە لووتکەی هەڕەمەکە، بەردەکان لەیەك ڕیزدا و لەناو ئاوەکە ڕیز کران، ڕێڕەوی ئاوەکە بەرزەوە بوو، بۆ بەرزایی هەڕەمەکە، وەك ئەوەی لوولەکێك بێت و بە بەردی خشتی سوورەوەکراو کلۆم درابێت.. وەلێ ئاوەکە چۆن بەرزەوە دەبێت؟ ئەوا ئاوەکە بەرزەوەبوو، ئەدی ئەو بەردە قورسانە چۆن بەرز دەبنەوە؟ لەکۆتایی ڕێڕەوی ئاوەکە ستێلکێك بەرزەوە بوو، ئاوەکە بەفشاری سەر لوولە بەردینەکە هەموو بەردەکان بەرزەوە بوون، بابەتەکە وەك ئەوە وایە شووشەیەکی لارەوەبوو ئاوی تێدا بێت، شتێك دەخەینە ژێریەوە، یەکسەر ئاوەکە بەرز دەبێتەوە.. ئەوە چ عەقڵێکە؟ گشت ئەوانە بۆ ئەندازیاری مەزن مامان دەگەڕێتەوە، تاکچاو پێیگوت:

- تۆ دەزانیت فیرعەون گفتوگۆ لەم بابەتە ناکات، (ئاسیا)ی ژنی فیرعەون باوەڕی بەمووسا هێنا، فیرعەون بە مێخ زنجیر بەرامبەر بەخۆر بەستیەوە تا پێستی داماڵرا، تا ئەمرۆش بەو مێخە بەستراوە، (سیتکا)ی براکەشی کە پێدەچێت باوەڕی بە مووسا هێنابێت، بەر لەوەی فیرعەون دەستی پێبگات هەڵات و دوورکەوتەوە.
- گوێ بەوە مەدە تەنها وەك باوەڕدارێك خۆت بخەرە ناویان، نهێنی زانستەکەیان بێنە بەنیازی چین.

تاکچاو دوا بڕیاری خۆیدا، لەو شوێنە دوور کەوتەوە، بەدوودڵیەوە بەرەو لای قەومەکەی مووسا ڕۆیشت.

# شەیتان بەر لە عەقڵەکان.. دڵەکان بۆ لای خۆی ڕادەکێشێت

**دوای دەساڵ...**

ئەو بۆ ئارامی و کپبوونی دەنگەکانیان، چون لەشکری لەیەکدابڕاو و دوور لەیەکەوە دەڕۆیشتن، هەر تیمێك کاتژمێرێك دواتر لەوەی پێشی دەکەوتە ڕێ، نەوەك کەس بیانبینێت، شەش سەد هەزار ژن و پیاو و منداڵ وەك لەتەوراتدا هاتووە مووسا داوای لێکردن بەفەرمانی خودا لەوڵات دەربچن، هەموو شتێکیان جێهێشت و دەرچوون، هەر هەموشیان نەوەی جوولەکە بوون، ئەوانەیش کە جوولەکە نەبوون لەگەڵیاندا لەترسی فیرعەون دەرچوون.

تا چووینە ڕوحی یەکێکیانەوە زۆر زەحمەتمان کێشا، هەر هەموویان نەیاندەزانی بۆ کوێ دەچن، تەنها مووسا دوای خودا دەیزانی، لەو تاکچاوەم ڕوانی، کە بەتایبەت بۆ ئەوە هاتبووین دووی کەوین. دەساڵ لەناو قەومەکەی مووسادا مایەوە، لەنێو نەوەکانی جوولەکاندا خەریکی دووزمانی بوو، تا بەپلەو پایەیەکی باڵادا گەیشت، وایان لێ دەڕوانی چون ئەوەی لەساحیرێکی بەئەزموون و زیرەکی تۆبەکار بڕوانن، هەیبەتی خۆی لەدەست نەدا، بگرە دوای باوەڕهێنان بەمووسا هەیبەتی زیاتری بوو، هیچ هەواڵێکیانی بەفیرعەون نەگەیاند، متمانەیان پێکرد، تەنانەت پشتگیریشیان کرد ببێت بە(سامی) و سامریش لای جوولەکان یانی جێی باوەڕ و سەرڕاست، دەیانتوانی پارەو خشڵ و ئاڵتوونی لا دابنێن. تاکچاو بوو بەسامری و پارەو ئاڵتوونەکانیان لا دادەنا.

ئەو شەوە بینیم، هەوڵی دەدا بەهەج ڕێگایەك بێت، بزانێت ئاراستەیان بەرەو کوێ دەبێت، تا هەواڵەکە بە فیرعەون بگەیێنێت. بەڕێگایەکدا

دەڕۆیشتن، لەپڕ دەوێستان و ڕێگایەکی تریان دەگرتە بەر، ئەوجا دەگەڕانەوە بەڕێگایەکی ترا دەڕۆیشتن، ئەوە باش نەبوو، دەبوو ڕێگاکە ئاشکرا بوایە، تا لەبەر چاوان زوو بە زوو خۆمان بشاردایەتەوە، وەلێ ئەوە ڕووی نەدا، ڕووناکییەکەی شارمان هێشتا لێوە دیاربوو، هەر ئەملاو ئەولامان دەکرد، مووسا وەستا و بەساڵاچوانی قەومەکەی کۆکردەوەو گوتی:

– یا ئەوەتا ڕێگامان ون کردووە، یا ئەوەتا ئەم ڕێگایە بۆ ئێمە گونجاو نییە.

یەك لەساڵا بەچووەکان گوتی:

– ئەی مووسا.. پێغەمبەری خودا یوسف بەر لەوەی بمرێت متمانەی لێ وەرگرتین، ئەگەر خودا لەم کێشەیە ڕزگاری کردین و لەم خاکە دەرچووین بۆ خاکی بەڵێندراوی خۆمان، خاکی پیرۆز، داربازەکەی لەتەك خۆماندا ببەینەوە.

مووسا گوتی:

– خودا هیدایەتمان نادات تا وەسیەتەکەی یوسف جێ بەجێ نەکەین، داربازەکەی لەکوێیە؟

هەمووان بێدەنگبوو ن، پاشای بەدکار (نیکا) دوای مردنی پاشا (زووسەر) خۆشەویستی میسر و یوسف تابووتەکەی شاردەوە، کەس شوێنەکەی پێ نازانێت. ئەلیاس دزەی کردە ناو دڵی پیاوەکان، تا یەکێکیان گوتی:

– ئەی مووسا.. ئەو تابووتە کەس شوێنەکەی نازانێت، تەنها پیرەژنێك لە (حەبروون) ئەویش (سارح کچی ئاشەری کوڕی

یاقووب)ە دەیزانێت، ئەو ژنە لەسەردەمی (یوسف)ەوە تا ئێستا لەژیاندا ماوە.

شەش سەد هەزار بنیادەم وێستان، دڵیان لەترسا ئۆقرەی بۆ نەبوو، چاوەکانیشیان لەسۆسەی ئەملاو ئەولادا نەدەکەوت، گشتیان چاوەڕوانی پیاوێك بوون، مووسا ناردبووی پیرەژنەکە لەخاکی فیرعەون بهێنێت.

***

## کەشیشی مۆمیاکەر، لە مانای نەمری تێدەگات هەرکە چاوی پێدەکەوێت

کۆمەڵە خەڵکێکی زۆر بەوریاییەوە دەڕۆیشتن، بەیانییان بەسەرا هات، دوو لەو خەڵکە پیرەژنێکیان بەکۆڵەوەبوو. ئەو پیرەژنە شوێنی تابووتەکەی پێنەگوتن، تا پەیمانی لەمووسا وەرگرت، کە لەبەهەشتا لێل مووسا بێت، خودا ئەو پەیمانەی بۆ مووسا نارد خوارەوە. مووسا و هاروون و میخای سامیری تاکچاومان لەتەکدا بوو، لە باکووری میسرەوە بەرەو باشوور ڕێمان گرتە بەر، گەشتەکەمان چەند ڕۆژێکی خایاند، نەوەکانی ئیسرائیل لەدەرەوەی شار خۆیان وەرشاردبوو، چاوەڕوانی فەرمانی خودا بوون. پیرەژنەکە تا دەریاچەیەکی گەورە بردنی، ئەو دەریاچەیە دواتر بە دەریاچەی قاروون ناوبانگی دەرکرد. پیرەژنەکە ئیشارەتی بۆ دەریاچەکە کرد و گوتی:

- ئەو ئاوە وشك بکەن.

خەڵکەکە سەریان سوڕما و لەیەکتریان ڕوانی، چۆن ئاوی ئەو دەریاچەیە وشك بکەن؟! گوتیان.. ئەو پیرەژنە تێکچووە، لێ مووسا پرسیاری لێکرد:

- شوێنی تابووتەکە لەناو دەریاچەکە ڕێك لەکوێیە؟

پیرەژنەکە دەستی بۆ ناوەندی دەریاچەکە درێژ کرد، مووسا لەلێواری دەریاچەکە نزیکبووەوە، دارعاساکەی بەرزەوە کرد، ئەوجا دارعاساکەی لە ئاوەکە نا، ئاوەکە شەقی برد، لەو دەمەدا گوێم لەبەرەنسکی سامری بوو، گوتی:

- ئەوە ئاسمانە دەریاچەکەی شەق کرد، ئەوە ئەفسانەیە کە ئێمە لەناو خەڵکیدا باسمان دەکرد، دەشمانزانی قسەی پڕوپووچە.

یەك لە پیاوەکان گوتی:

- بەڵێ بیرمە بەو حیکایەتانە مێشکیان پڕوپووچ دەکردین، (داداماں)ی سیحرباز کە ئاوەکەی شەق کرد، ئەوە لە حیکایەتی (خۆفۆ)دابوو، کاتێ کەنیزەکەی پاشا ملوانکەکەی کەوتبووە ئاوەکەوە تا بیدۆزێتەوە، شوکر بۆ تۆ خودایە کە ئەو ئەفسانەیەت بەڕاست کرد، ڕادەستی پێغەمبەریشت کرد.

تەماشای خاکی دە یاچەکەمان کرد، سەوزایی بوو، پیرەژنەکە پەنجەی بۆ خاکی ناوەندی دەریاچەکە درێژ کرد و گوتی:

- ئەوێ هەڵکەنن.

پیاوەکان دەستیان بەهەڵکەندن کرد، تاکچاو لەتەکیانا چاڵی دەکرد، بەو سەوزایەش سەرسام بوو، تەنها ئەو شوێنی دەریاچەیە سەوزی دەکردەوە،

ئەگەر نەخشە بوایە، وەك خاڵێكی سەوز بەسەر (نیل)ەوە دەردەكەوت، تا ئەمڕۆش هەر وا سەوزە.

سامری لەسەر چۆك كەوت و دەستی بەخۆڵەكەدا گرت، لەتەك خۆیدا قسەی دەكرد، وەلێ نەمدەزانی چی دەڵێت، وەك ئەوەی عەقڵی لەدەست دابێت، ئەو زەویە بەوای تابووتەكەی (یوسف)ەوە سەوز بوو.

چاوم لێبوو پیاوەكان لەدەرهێنانی تابووتەكە ورتە ورتیان بوو، سامری خۆی پێیان گەیاند، ئەو شتێكی تری كرد، دەستی لەخۆڵی دەور تابووتەكە وەردا، گەردی خۆڵەكە بەو ڕەنگە جیاوازەی لەگەڵ خۆڵی ئاسایی گەلێك پێی سەرسام بوو، سامری چنگێك لەخۆڵەكەی نایە ناو توورەگەكەی و شاردیەوە، تەنها من ئەوم بینی كەس ئاگای لێ نەبوو، منیش بەوای چاودێری كردنییەوە ئەوەم بینی.

پیاوەكان تابووتەكەیان دەرهێناو نایانە سەر شانیان و هاتنە دەرەوە، سامری بەدوویانەوە مێشكی لەپرسیار پڕببوو، ئەوەی شاردیەوە گەورەترین دووزمانی خستە نێو مێژووی نەوەكانی (ئیسرائیل)ەوە، نەخێر لەهەموو جیهان ئەوەی نایەوە، شوێنەوارەكە.. شوێنەواری پێغەمبەربوو.

***

## بەدكاری لە بنیاتنانی هەر هەرەمێكدا

شەوداهات، نەوەی ئیسرائیل تابووتەكەیان هەڵگرتبوو، بەوای تیشكی ئەستێرەكانەوە ڕێگایان دەبینی، كەس گوێی بەتاكچاو نەدەدا، بەوەی خۆی لەدراوە دەیوویست ون بكات، وەلێ ئێمە سۆسەمان دەكرد و دەمانبینی، هەر ئێمەش دووی كەوتین، ئەو پیاوە شتێكی بینی دونیای لا گۆڕا، بلەز

بەرەو شار غاری دا، ئەو جەستەیەکی بەهێزی هەبوو، ئێمەش دووی کەوتبووین، کاتێ گەیشتە شار وامانزانی بۆ لای فیرعەون دەڕوات، تا هەواڵی شوێنی نەوەی ئیسرائیلی پێڕابگەیێنێت، وەلێ بۆ شوێنێکی تر ڕۆیشت، دوور لەهەموو کەسێك، بۆ لای هەڕەمی مەزن ، کە تازە بیناکردنەکەی تەواو ببوو.

گەورەترین هەڕەمی میسرەو بەرزترین لووتکەشە لەجیهان، بەشەو وەك گەوهەر دەدرەوشێتەوە. تاکچاوم بینی لەدەرگایەکەوە چووە ژوورەوە، بەوای پەلە پەلییەوە بیری چوو دەرگاکە دابخات، ئێمەش دوا بەدوای چووینە ژوورەوە، لەبەرامبەر ڕووناکییەك وێستابوو، جەستەی وەك سێبەرێکی درێژ دەرکەوت، چاوم لێبوو دەستەکانی بەرز کردەوە، شتێکیش لەناو دەستەکانیدا بوو، لەپڕ بەوەی لەناو دەستیدا بوو دەستەکانی داگرتە سەر سنگی، هەستم بەدەنگێك کرد جەستەی بڕی، ئەو پیاوە شتێکی لەخۆی چەقاند.

ئەوەی کاتی خۆی پێمان نەزانی، ئەو پیارە چەقۆیەکی ناو بۆشی نا بەسنگی خۆیەوە، ئەو بۆشییەی سەر چەقۆکەیش ئەو خۆڵەی لە خۆڵی دەور تابووتەکەی یوسف چنگێکی لێ هێنابوو، لەخۆی ڕۆکرد، دیاربوو پێشتر لە چەند شتێکا تاقیکردبووەوە، ئەو شتە دەژیایەوە، لێی فڕێ دەدایە سەر بەرد سەوز دەبوو، ئەو شەوە تاکچاو بڕیاری خۆی دا، ئەو شتە کە خۆڵەکەیە بەناو دەمارەکانی خۆیدا ڕۆ بکات، تاکچاو هاوارێکی لێ هەستا، لەهەموو کون و کەلەبەری هەڕەمەکە دەنگی دایەوە، داچەمیبەوە، هەڵچوونێك هەڵچوو هەموو جەستەی دەیزریکاند.

بەو هەڵچوونەی دڵم خورپەی کرد، پێدەچوو هەموو هەستەوەرەکانی کرابنەوە، لەپڕ لای کردەوە، تەماشای ئەو شوێنەی کرد، کە ئێمە خۆمان

تیا مەڵاس دابوو، ئەگەرچی چرکەشمان لەخۆمان بڕیبوو، خەنجەرەکەی سەر سینگی بەرەوە بوو، چاوم لێبوو بەرەو لای ئێمە دێت، ئەگەرچی چوار میترێک لێمانەوە دوور بوو، لەچرکەیەکدا بەرامبەرمان وێستا، هەر لەچرکەیەکیشدا دەستی بەخەنجەرەکەیەوە لەمل ئەو پیاوەی تیا جاگرتە بووین ڕاگرت.

ئەوشەوە بەهەچ شێوەیەک بێت هەوڵی هەڵهاتنماندا، نەمانزانی ئەو تاکچاوە دوای ئەوەی خەنجەرەکەی بەو خۆڵەی دەوور تابووتەکەی یوسف لەخۆی چەقاند، بەو ئاوایە ئیدی نەپیر دەبێت و نەیش دەمرێت، تیژڕەوییەکەیشی وەک بەرق وابوو، بەرچاویشی تەواو ڕوون و کراوەتر بوو، بەچەشنێک نە جنۆکە و نە ڕوح ئەو خەسڵەتیان هەبوو. کا.. تایبەتمانی گرت، وەک ئەوەی ببیبینێت، بەدەستی فلیقاندیەوە، دیمەنەکە لەبەر چاومان ونبوو، دەنگەکەیش دوور کەوتەوە، تا هەموو شتێک تاریک بوو، هەموو شتێک تەواو بوو.

***

## *** تەواو ***

(کا)ی تایبەت بەخۆمان بلەز دەرپەڕی و خۆی بە هەرەمەکەدا مالی، هەر وەک داڵێک خۆی بە نیچەرێکدا بکێشێت، خۆی بەتونێلەکانی ناو هەرەمەکە ناو تا بەژووری پاشایەتیدا گەیشت، لەو ئانوساتەدا گەردی سەر زەویەکەمان بەرکەوت، هەریەکەو ڕوحی گەڕایەوە لای خۆی، هەرسێکیان هۆشیان هاتەوە، لویب بە واقوڕماوییەوە گوتی:

- برا ئـەم مۆمـە بەدرێـژی خـۆی ماوەتـەوە، وەك ئـەوەی یـەك دوو خولەكێكمان پێچوویێت.

لەگەڵ سەمای لەرینەوەی ئاگری شەمەكە، بۆبی گوتی:

- لەزانستی ڕوحەكانـدا سـاڵەكان چـون چركەیەكن، یا چركەكانیش وەك سـاڵەكانن، ئەگـەر ئـەوەی دەیبینێـت و لەتـەكتا درێژخایەنـە وەلێ بەخۆشی و بەختـەوەری ئـەوا ڕوحیشت بەختـەوەر دەبێت، ئەگـەرەكو ئـەوەی دەیبینێـت مۆتەكـە ئاسـابوو ئـەوا ڕوحـت لـە ئەشكەنجەدا دەبێت.

لیۆبۆلد بە پرسیارێكی ڕاستەقینە گوتی:

- چۆن ئەو هەمووەت زانیوە؟ ئێمە ئەوەندە دووت كەوتووین تا لێت تێبگەین.

بۆبی كەمێك بێدەنگبوو، دواتر گوتی:

- تۆتیزم.. ئەو توانا تایبەتەی دەخرێتە سەر مێشك، تواناكانی من لە ئەزبەركردنی كتێبدایە، بەڕاسـتی كتێبـەكانی كتێبخانەكـەی بـاوكم وان لەناو مێشكمدا.

لویب گوتی:

- یاقووب فرانك هەموو شتێكی فێركردوویت؟

بۆبی هەناسەیەكی قووڵی هەڵكێشاو بۆ دوور ڕوانی، ئەوجا هاتـە قسـەكردن، قسەگەلێك پێشتر نەیكردبوون، گوتی:

- دیمـەنێكم لـەبیرە، هـەرگیز لـەبیرم ناچێتەوە، ئـەو ڕۆژەی لەتـەك باوكمـدا یـاقووب فرانـك لـەژێر بـەرزترین باڵەخانەیـەك لەشـیكاگۆدا

وێستابووم، بینای پەرستگای ماسۆنی (Masonic Temple) کە بەوای بەرزییەکەیەوە لەهەورا ڕۆچووبوو، وەك لەباوکمەوە بیستبووم، تایەفەیك هەبوون خۆیان بە ماسۆنی ناوزەد کردبوو، لە بەرزترین نهۆمی باڵەخانەکە کۆ دەبوونەوە، کە پشتی شووشەبەند بوو، لەوێوە تەماشای شاریان دەکرد، بەو ئاوایەی کە حوکمی دەکەن، ئەودەم بەهۆی تەمەن بچووکیمەوە ئەو قسانە بەلامەوە قسەی پڕوپووچ بوون، هەرگیز باوەڕم بەو قسانە نەبوو.

تەمەنم بیست و چوار ساڵ دەبوو، لەوەدابووم دوای ساڵێ زانکۆ بەبڕم، ئەوەی ڕاستی بێت، هەر هەموو ئەو شتانەی فێری بووم، لەو بینایەدا بوو، سەرەتا وامزانی ڕەشبینن، وەلێ کە چوومە نێویانەوە وبینیانم لەوپەڕی ئومێددابوون، خەڵکانێکی ڕێکپۆش و ڕەوتار جوان بوون، دوکتۆر و پارەێزەر و بازرگانەکانی شار بوون، هەوەڵێن کۆبوونەوەم لەتەکیاندا بۆ پیرۆز کردنی خوداوەند بوو، زانیم خوداوەندێك دەپەرستن بەناوی (نیهوشتان)ەوە، ڕێك وەك ئەوەی ئیسرائیل کە ماری ئاڵتوونی (نیهۆشتان)یان دەپەرست، کە لەتەوراتیشدا باسی لێوە کراوە، مووسا بۆ قەومەکەی خۆی دروستی کرد. باوکمیان بەنازناوی (کاجیلۆستوو) ناوزەد دەکرد، لەبەر ئەوەی کوتومت لە (کاجیلۆستوو)ی جادووگەری فەرەنسی دەچوو. دوای ئەوەی زانستی میسری کۆنی دۆزیەوە، گەڕایەوە فەرەنسا و چەندین ئەنجوومەنی ماسۆنی دروستکرد. پرسیاری ئەو ماسۆنیەم کرد، کە باوکم لایەنگری بوو، دەیویست بیگرێتە خۆی، هەمووی لەو بینایە حاڵی بووم، هەموو زانستەکان لەدوو جێگادا لەچاڵنرابوون، یەکەمیان لە بن مزگەوتی (ئەقسا) و دووەمیشیان لەناو هەرەمی گەورە.

هونەری سیحربازی هارووت و ماروووت لە پەرتووکی ڕەش کە شەیتانەکان بەناوی (سلێمان)ەوە نووسیبوویان لە ژێر مزگەوتی (ئەقسا) لەچاڵنرابوو، سوارچاکانی پەرستگا دەریانهێنا، دوای ئەوانیش ڕێکخراوێکی شەیتانی کە سەرەتای دامەزراندنی هەموو ڕێکخراوەی نهێنییەکانی جیهان بوو( ڕۆزیکرۆشن) یا خاچی پەمەیی، کە دواتر ماسۆنییەتیان لێ جیاوەبوو، ئەوجا پیاوانی ڕۆزیکرۆشن توانیان ئەو زانستە شاراوەیە و جێگای دووەمی لە هەرەمی گەورە بدۆزنەوە، ئەوەش ڕیوایەتی ڕازێیل و زانستی پێغەمبەرە یەکەمەکانی ئەتلەنتس و بەردە لەوحی زومردی ئیدریس و زانستەکانی میسری کۆن بەهەموو نەوەکانیەوە، کاجلیۆستوو گرنگترین ئەندامی ڕۆزیکرۆشن بوو، ئەو یەکەم کەسبوو کە پەیوەندی نێوان ڕێکخراوە نهێنییەکان لە لایەك و میسرییە کۆنەکان و هەرەمەکان لە لایەکی تر ئاشکاری کردن. دوای ساڵانێکی زۆر ماسۆنییەکان هێما و نهێنی میسرییە کۆنەکانیان هەڵگرت، هەرەم و ئەو چاوەی لەناوەندیدایە وەك هێمایەك هەڵیانبژارد، ئێستا دەزانن بۆچی ماسۆنییەکان ئەو هەرەمە بۆچ پیرۆز دەکەن؟ زۆرجار ئەو پرسیارەم لەباوکم دەکرد، سوودی ئەو زانستە شاراوەیە چییە، چۆن واین لێدەکات لە غەیری ئەوان بەرتر بن. ئەوەی دەیزانم و ئاشکرایە هەموو زانستە تازەکان کە لەم جیهانەدا پێشکەوتنی بەخۆیەوە بینیوە، لای خەڵك و بەتایبەت لای توێژەرەکان شتێکی ئاساییە. باوکم قسەیەکی فێر کردم، ئەو قسەیەم لەبیر ناچێتەوە، پێیگوتم.. خاوەن زانست گەورە دەبن و ئەودوای خەڵکی دووی دەکەون، زانست بریتیە لە زانیاری، بۆ نموونە ئەگەر زانیت خاکێك هەیە ئاڵتوونی تێدایە، ئەوە پێیدەوترێت زانست، بەوە تۆ گەورەتر دەبیت، چونکە تۆ یەکەم کەس دەبیت کرێکاری بۆ دەگریت، تا ئاڵتوونەکە دەربهێنن. لەوەوە تێگەیشتم

شارســتانییە کۆنــەکان بــە ئەتلّــەس و ئــەو لقانــەی لێیبوونەتــەوە لــە شارستانیەتی میسـر و هـەموو جیهـان لەپێشکەوتندا بوونـە، پێشـکەوتنێك عەقڵ هەڵی نەدەگرت، لەو زانستە شاراوەیەی کە (تۆ)ی زۆربەی هەرە زۆری زانسـتە نوێکـانی کـە ئـەمڕۆ شـەپلی شـەپانی پێـوە دەکـەین، ئـەو گـەورەو ناودارانەی بەخۆیان خاوەن کۆمپانیان و دەستیان دەڕوات، لەڕاسـتیدا ئـەم جیهانە دەیانتوانی زیاتر و بە پەلـەتریش ئـەو زانسـتەیان دابهێنایـە، ئەگـەر ئەوان نەیانشاردایەتەوە. بیرتان نەچێت تەکنەلۆژیا بـۆ تـەنها جارێك نییـە، هەموو ساڵێ شتێکی تازەی بۆ دادەهێرێت، تـا دەسـتکەوتەکانی زۆرتـر بـن، زۆر بابەتی تر هەن لای خـەڵکی دەمـە دەمـی لەسـەر دەکرێـت، ئـەو گـەورە پیاوانـە ڕاسـتییەکە دەزانـن، وەڵێ دەیشـارنەوە، تـا لـەکات و سـاتی خۆیـدا دەرکـەوێت، کاتێـك لـە ئـان و سـاتی خۆیـدا دەردەکـەوێت ئـەوە مانـای گەندەڵییەکی ترە.

وشەی (Annuit Coeptis) کـە لـەیان دروشـمی وڵاتـە یـەکگرتووەکانی ئەمریکا بەفەرمی دانراوە، ئـەوەش مانـای (گاورە مەزنەکە)یە، یـا میسـری مـەزن (سـامری)، ئـەو هەڕەمـەش کـە بەسـەر دروشمەکەوەیـە هـەڕەمی (خۆفۆ)ی گەورە نییە، بەڵکو هـەڕەمی تاکچاوە، کـە دوای سـێ هەڕەمەکـە دروستکرا، لەهەر هەمووشیان گەورەترە.

لویب دەستبەجێ گوتی:

– ئەو هەڕەمە ڕێك لەکوێی میسردایە؟

بۆبی بەرسقی دایەوە:

– بۆ ئەوەی جێگای هەڕەمی تاکچاو بزانیت، دەبێت بزانیت فیرعەونی مووسا کێیە، چونکە فیرعەونی مووسا بوو فـەرمانی بینـاکردنی دا،

بۆ ئەوەی لەمێژوودا بەرزترین لووکە بێت، ئەو هەرەمە بەناوی فیرعەونی مووسا نووسراوە، نەك بەناوی تاکچاو، کە کەشیشێکی گەورە لەتەك (هامان)دا ئەندازیاری ئەو هەرەمە بوون، ناوی هەرەمەکان بەناوی کەشیشەکانەوە مەنووسە، بەناوی پاشاکانەوەیە.

لویب پرسیاری لێکرد:

- فیرعەونی مووسا کێیە؟بەقسەکانت بێت دوو پشت دوای خۆفۆ بووە، وەلێ ئەوە لەگەڵ هەموو ڕاکان نامۆیە کە دەیزانم.

بۆبی بەدەم گەمەی دەارشەقەکەیەوە گوتی:

- پشتبەستن بەتەورات وای لە مێژوونووسان کرد، تووشی مشتومڕ بن، چونکە باسی لەپاشایەك نەکردووە لەنێو پاشاکانی میسردا، کەچی لە قورئاندا هەموو شتێکی تێدا نووسراوە.

دووبراکە دەنگیان لەخۆیان بڕی، بەوای ئەوەی گوێیان لە شتێکی تازە بوو، حەپەسان، بۆبی گوتی:

- قورئانی موسوڵمانەکان باس لەپیاوێك دەکات، پلەی بەرزەو ناویشی (ھامان)ە، یارمەتیدەری فیرعەون بوو، خودا لە قورئاندا دەڵێت(( فیرعەون و هامان و سەربازەکانیان بەهەڵەدا چووبوون)) بەو شێوەیە دەرکەوت هامان بەرپرسی کاروباری بیناسازی بووە، فیرعەون داوای لێکرد بینایەکی بەرزی بۆ درووست بکات، لەقورئاندا هاتووە(( ئەی هامان لەخشتی سوورەوە کراو قەلایەکم بۆ درووست بکە، بەڵکو بەخوای مووسا بگەم)).

ئەوەی لەمێژووی میسری کۆن ئەو هەموو خەسڵەتانەی هەبوو (هێمینۆ) بوو، وەزیری خۆفۆ و ئەندازیاری هەرەمی گەورە، بەرزترین قەڵای ئەندازیای لە جیهاندا درووستکرد، ئەوەش ڕەنگە مانای ئەوەبێت خودی خۆفۆ فیرعەون بووبێت، یا پاشایەك دوای فیرعەون هاتبێت، لەسەردەمی هامان هاتبێت. ئەم حوکمە کەمێك دوادەخەین.

قورئان کە باس لەبینایەکی زۆر بەرز دەکات، لەخشت درووستکرابێت، یا پەیوەندی بە قوڕەوە هەبێت، وەڵێ هەر سێ هەرەمەکەی میسر لەبەردە تاوێری گەورە درووستکراوە، تەنانەت سواخ کردنی بەردەکانیش بەقوڕ نەبووە، بەڵام دوای ئەوەی شێوازی کەڵەکە کردنی بەردەکان و درووستکردنی هەرەمەکان دەرکەوت بەقوڕ ڕاگیراوە. میسرییەکان بەر لەوەی هەرەم درووست بکەن، دەبوو تۆڕێکی ئاڵۆزی ڕێڕەوی ئاو بەخشت درووست بکەن، تا ئاوی پیا ڕەتبکەن، ئەو ڕێڕەوە بۆ سەرووی هەرەمەکان بەرز کرایەوە، تا بەردەکانی بۆ سەرەوە بگوێزنەوە. بۆیە بەر لەدرووستکردنی هەرەمەکە ئەو ڕێڕەوی ئاویە درووست دەکرا، ڕێك قسەکەی فیرعەون ڕاستبوو، کە گوتی(( لەخشتی سوورەوە کراو قوولە یا قەڵایەکم بۆ درووست بکە)) کە لای خۆشمان خشتی سوورەوە کراو مانای قوڕەو لەکورە نراوە. نەیگوتووە لەقوڕ قەڵایەکم بۆ درووست بکە، بەو ئاوایە شتێك هەیە لەقوڕ درووست دەکرێت کە خشتە، دواتر قوولەکەی پێ درووست کرا.

لویب بەدوودڵیەوە گوتی:

- ڕاستە ئەوەی دەربارەی فیرعەون خوێندوومانە زۆر لەسەردەمی خۆفۆ دوور بووە، ڕەنگە ڕەمسیسی دووەم بێت، ئەوەش دوای خۆفۆ زیاتر لەهەزار ساڵ دەبێت.

بۆبی لێوی خۆی گەست و گوتی:

- ئەو بیرۆکەیە لەڕووی مێژووەوە پووچەڵ کرایەوە، وەڵێ بێجگە لەبیرۆکەی قوڕ و هەڕەم ڕێگایەکی تر هەیە، زۆر بەوردی سەردەمی (مووسا)مان بۆ دەخاتە ڕوو، پەرتووکە ئاینەکان دەڵێن پێغەمبەر یوسف بەر لەمووسا بەماوەیەکی کەم بووە، تەورات بەدڵنیاییەوە یوسف بە ٦٤ ساڵ پێش مووسا بووە، قورئانیش ئەو ماوە کورتەی نێوان (مووسا و یوسف)ی باسکردووە، کاتێ باوەڕدارێکی بنەماڵەی فیرعەون بۆ فیرعەون و قەومەکەی کە بەڕوون و ئاشکرا گوتوویەتی((یوسف بەڵگەکانی بۆ هێنانەوەو هەر گومانتان هەبوو، تەنانەت گوتتان دوای ئەویش کەسی دی وەك پێغەمبەر نایەت)).

لویب گوتی:

- ئەگەر سەردەمی مێژوویی (یوسف)مان زانی، ئەوا مێژووی (مووسا)ش دەزانین.

بۆبی گوتی:

- بەڵێ لەمێژووی میسری کۆنداو بەر لەسەردەمی خۆفۆ بە شەست ساڵ پاشایەك بەناوی(زووسەر) هەبووە، لەسەردەمی ئەودا گرانییەك هاتووەتە ئاراوە، لەبەردەنووسی فیرعەون لە بەردەنووسی برسێتی نووسراوە، باس لەحەوت ساڵ قات و قڕی دەکات، ڕێك ئەوەش لەگەڵ چیرۆکەکەی یوسف لەتەوراتدا یەك دەگرنەوە، ئەو گرانییە حەوت ساڵی خایاند، ئەوەش لەگەڵ خۆشەویستی میسردا کە لە قورئاندا هاتووە، یوسف خەونەکەی پادشای هەڵهێناوەو گوتوویەتی(( حەوت ساڵ تۆو بکەن،

حەوتساڵ بارانتان لێ نابڕێت، دوای ئەو حەوت ساڵە حەوت ساڵی قات و قڕی بەسەر وڵاتا دێت، تا دەتوانن کەم بخۆن، ئەوەی دی پاشەکەوت بکەن)).

لویب گوتی:

- ئەوە ڕێک ئەو ڕاستییەیە کەلەنێوان تەورات و مێژووی فیرعەونەکاندا هاتووە.

بۆیی گوتی:

- شتێک نییە ناوی فیرعەون بێت، بەڵکو ناویان میسریە کۆنەکانە، وشەی فیرعەون لە لایەن لێکۆڵەرێکی جولەکەوە ئەو ناوەی داهێناوە، دەیویست فیرعەونی تەورات و میسری کۆن بەکبخات، ئەوە ناوێکی شایەستە نییە لە وەسپی شارستانییەتێک بەو مەزنییەوە بدرێتە پاڵ پیاوێکی گێلەوەی وەک فیرعەونی لێ بنرێت، بەدەر لەوەش سێ بەڵگەمان هەیە کە دڵنیامان دەکەن ئەو پیاوە کە بەفیرعەون ناوزەدکراوە زۆر نزیکە لەسەردەمی خۆفۆ و ناوی (هامان)یش لە قورئاندا بە بەرپرسی بیناکردی قوولە بەرزەکەوە هاتووە، کە ڕێک لەتەک (هیمینۆ)دا لەبیناسازی هەرەمی بەرز یەک دەگرنەوە. بیرۆکەی جۆگەلەو ڕێڕەوی ئاو بەخشتی سوورەوە کراو بۆ هەرەم دروستکردن، بیرۆکەی یوسف و گرنییەکەی سەردەمی(زووسەر)ە، وەلێ بەڵگەی چوارەمیشمان هەیە، کە فیرعەون لەسەردەمی حۆفۆدا دەرنەکەوتووە، لە قورئانی موسڵمانەکاندا هاتووە، کە خودا بیناو پەرستگاکانی فیرعەون و قەومەکەی لەناو بردووە، وەلێ دوای خنکانی فیرعەون ئەوەی

نەکرد، بەڵکو ماوەیەکی زۆر دوورو درێژ دوای فیرعەون بوو. دوای ئەوەی ئەوەی ئیسرائیل لەخاکی پیرۆز و لەسەردەمی سلێماندا لەناوی بردن، یانی خودا بیناکانی فیرعەون و قەوەمەکەی دوای هەزار ساڵ لەمردنی مووسا لەناوی بردن. خودا دەڵێت(( هەموو خاکی رۆژهەڵات و رۆژئاوا وێدان، یانی جوولەکەکان، دوای ئەوەی بینیمان فیرعەون و قەومەکەی چییان بەعەرشی دەکرو هەموویمان وێران کردن)) مێژووی میسری کۆن، هەموو هەرەم و بیناکانی میسری کۆن وێران کران، بەتایبەت دوای بنەماڵەی سێیەمی خۆفۆ تا بنەماڵەی هەژدەهەم، هەزار ساڵ لەوێرانکاری بۆ هەموو ئەوەی میسرییەکان کۆن بنیاتیان نابوو، تا بنەماڵەی هەژدەهەمین لە میسرییە کۆنەکان هاتن، کە لەمێژوودا بەناوی وڵاتی نوێ ناسراون، ئەوان دەستیان بەبیناسازی و پەرستگا دروستکردن کرد، کە تا ئەمڕۆ شوێنەواریان ماوە.

لیۆبۆڵ گوتی:

- ئەی بەنەفرەتبیت، ئەو هەزار ساڵەی وێرانکردنی شوێنەواری فیرعەونەکان کێبوون وێرانیان کرد؟

بۆبی گوتی:

- لە قورئاندا باسکراوە ئەو شوێنەوارە لەیەک کاتدا هەمووی وێران کرا، گرکانی (سیرا)ی یۆنانیی بوو، کە گەورەترین گرکانبوو لەمێژوودا، زۆر لەشوێنەواری میسری کۆنی گرتەوە، ئەوەش (ئەحمەس) یەکەم پاشای خانوادەی نوێی بنەماڵەی هەژدەهەمین خودی خۆی وای گێڕاوەتەوە.. زریانێک هەڵیکرد، هەرچی

شوێنەوارە بەر لەخۆیان وێران بوو، هەوڵی نۆژەنکردنەوەی هەندێکی داوە.

- ئەوەی جێی سەرنجە ئەو وێرانکارییە دوای هەزار ساڵ لەسەردەمی خۆفۆ بەدواوە ڕوویداوە، لەقورئانیشدا هاتووە.. خودا تەخت و تاراجی فیرعەون بەقەومەکەیەوە لەناوبرد، دوای ئەوەی جوولەکەی لە خاکی پیرۆز نیشتەجێکرد یانی سەردەمی پێغەمبەر سلێمان، سەردەمی سلێمانیش هەزار ساڵ دوای مووسا بوو.

لەڕاستیدا هەرەمی خۆفۆ هێشتا ماوە، هەرەمی (خەفرەع) و(مەنقەرەع) لەبنەماڵەی سێیەم مەحاڵە کەسێکیان فیرعەون بێت، وەلێ هەرەمێك هەیە هی (با فەرعا)یە، یەك لەکوڕەکانی خۆفۆ ناوی هەرەمی گۆشەی (عەریان)ە ئەو هەرەمە تەواو وێرانبووە، لەبنچینەدا دەردەکەوێت خۆی لەهەرەمی خۆفۆ بدات، ڕەنگە بەرزتریش بووبێت.

بەڵگەی پێنجەم.. لەسەردەمی خۆفۆدا (زەلێکی) بەناوبانگ هەبووە، ناوی زەلی (وەستکار) بووە، با فەرعا و ئەو دوای منداڵەکانی خۆفۆ چیرۆکی سیحربازەکانی ئەو سەردەمە دەگێڕنەوە، لەوانە حیکایەتی ئەو سیحربازەی ڕووباری بەگۆپاڵەکەی شەق کردووە، سیحربازێکیتر تیمساحی لە شەم درووستکردووە و بووە بەتیمسایکی زیندوو، لەوەشدا لێکچوون لەنێوان چیرۆکی مووسا و سیحربازەکاندا هەیە.

بەڵگەی شەشەم.. دیسان وشەی (با فەرعا) بەزمانی میسری کۆن (فەرعا) یانی خاوەن هێزی خوداوەندی، بەفیرعەون ناسرابوو، کە بانگەشەی خوداوەندی دەکرد، کاتێ گوتی(( من خودای باڵای ئێوەم)) گوتیشی ((ئەی خەلکینە بێجگە لەمن خواتان نییە)) بەوشێوەیە وشەی فەرعا گۆردرا بە

فیرعەون و بەهەمان شێوە وشەی (فورا) لەتەوراتدا گۆڕدرا بە (قارون) کە لەقەومی مووسایە.

لەزمانی قورئان دەردەکەوێت وشەی فیرعەون ناوی کەسێکە نەک خەسڵەت، چونکە دەبینین لە قورئاندا پێناس ناکرێت بەوای ئەوەی ناوەو بیانییە.

بەڵگەی حەوتەم.. (بافەرعا) لەمێژووی میسری کۆندا کە هاتووە نەوەی نەخستووەتەوە، لەقورئانیشدا کە بەیانکراوە فیرعەون کوڕی نەدەبوو، کاتێ ئاسیای خێزانی کۆرپەکەی بۆ هێنا، بۆیە ڕازی بوو مووسا پەروەردە بکات.

لەوەوە دەردەکەوێت فیرعەون هەر (با فەرعا)یە و خاوەنی هەرەمی گۆشەی(عەریان)ی وێرانە.

لەپڕ لیۆپۆڵد گوتی:

– هەی هیچ و پووچ بۆ کێ قسان دەکەیت؟ قسەکانت بۆ ئێمە نییە.

بۆیی پشتگوێی خست و پێڵوی چاوی نەدەپرووکاند و گوتی:

– لەو سەردەمە تاکچاو لەدایکبوو، هەروەک چۆن جینۆن لە ئەتەنتس سەرەتای توخمی گڵاوی هاوسەرگیری بوو، هەروەها ئەو هاوسەرگیریە گواسترایەوە ناو هەندێ پاشای میسری کۆن، بەشێك لەو پاشا و کەشیشانە هاوسەرگیرییان لەتەك دایك و خوشکی خۆیان دەکرد، تا خوێنیان نەچێتە جەستەی دەرەوەی بنەماڵەکەیان.

دوای ئەوەی تاکچاو لەشوێنەواری تابووتەکەی پێغەمبەر گڵەکەی لەجەستەی خۆی وەردا، ئێدی هەرچی بوونەوەری نادیاریش بوو لەجنۆکەو شەیتان دەیبینی، تەنانەت ئەو فریشتانەش کە بۆ ئاسمان بەرز دەبوونەوە،

ڕوحی لەخۆبایی لەخۆ گرت، وەلێ ئەوەی لەناخیدا شاردەوە، خۆی گەیاندە ناو نەوەی ئیسرائیل کاتێ لەشار وەدەرکەوتن، تاکچاو وایدەزانی فیرعەون و سەربازەکانی دوا بەدوای ئەوان دەردەچن و دەیانگرن، خۆدی خۆی شوێنی دەرچوونیانی بەفیرعەون ڕاگەیاندبوو. ما تاکچاو لەتەك نەوەکانی ئیسرائیل دەربچێت، تا ڕووبارێك ڕوو بەڕوویان بووەوە، فیرعەون و سەربازەکانی لەدوایانەوە دەرکەوتن، مووسا دارعاساکەی بەرز کردەوەو لە ئاوەکەی پێدا، ئاوی ڕووبارەکە شەق بوو، وەك ئەوەی ڕێگا بۆ مووسا بکاتەوە، نەوەکانی ئیسرائیل بەڕێڕەوی شەقبوونی ڕووبارەکە تێپەڕین، سەریان بەخواکەی مووسا سوڕما، فیرعەون و سەربازەکانیشی بەدوویانەوە، تا لەوێدا شتێکی سەیر ڕوویدا، کە سەیرترین ڕووداوە لەمێژوودا.

ئاوەکە هاتەوە یەك فیرعەون و سەربازەکانی ژێر ئاو کەوتن و خنکان، کەسیان دەرباز نەبوو. ئەو جێگایەی مووساو باوەڕدارانی پێدا تێپەڕین تا گەیشتنە ئەوبەری ڕووبارەکە، تاکچاو سامری ئەوەی بەچاوی خۆی بینی، مێشکی وروژابوو، لەو ئان وساتەدا واقی وڕمابوو، شتێکی بینی کە وایکرد ڕووبارەکە شەق ببات، جبریلی فریشتەی بینی بەسواری ئەسپێکەوە لەبەردەمیان دەڕۆیشت و ئاوەکەش فەرمانی جبریلی جێ بەجێدەکرد. ئەگەرچی ئەو کردارە حەپەساندبووی وەلێ لەوەش سەیرتر کە تاکچاوی خستبووە ڕاڕابی، ئەوەی ئەو دەیبینی هیچ کەسێك لەنەوەی ئیسرائیل نەیاندەبینی، چاوی بەزەویەکە کەوت بەژێر پێی ئەسپەکەوە سەوز دەبوو، خۆی دواخست تا لەدوا دوای هەموویانەوە بێت، ما لەو خۆڵەی سەوز دەبوو لێی بخاتە توورەگەکەیەوە. ئەوە شوێنەواری شوێنێکی تربوو، کارێگەری لەوی پێشووتر زۆر زیاتربوو، مێشکی هەراسان ببوو، تا وای لەتاکچاو کرد ڕەوتی ژیانێکی تر بخوازێت.

دوای ئەو دەرچوونە، دوای ئەوەی ئیدریس دیار نەبوو، تاکچاو ئەوەی ئیسرائیلی تێگەیاند پەیکەرێك لە ئاڵتوون بۆ گوێرەکە (ئەبیس) دروست بکەن، تاکچاو خۆڵی شوێن پێی ئەسپەکەی جبریلی بەکارهێنا، وای لەخەڵکەکە گەیاندبوو، ئەو گوێرەکەی (ئەبیس) تەنها پەیکەرێك نییە، بەڵکو ئەوە خواوەندێکە توانای جووڵەشی هەیە. بەوای فێڵێکی دەنگی لەزانستی ئیدریس توانی بۆڕە بۆڕی گوێرەکەکە دابهێنێت، خەڵکەکە وایانزانی ئەو پەیکەرە ئاڵتوونیە زیندووە و قسانیش دەکات. بەوای مانەوەی زۆری ئەوەی ئیسرائیل لەمیسرداو کارێگەرییان لەپەرستنی گوێرەکە (ئەبیس) کە بینیان گوێرەکەکە دەجووڵێت و قسانیش دەکات، سەریان سوڕما، بۆیە هەر هەموویان کڕنۆشیان بۆ برد.

کاتێ مووسا گەڕایەوە، بە کردەی قەومەکەی زانی و چۆن تاکچاو فریوی داون، وەختەبوو شێت بێت، لێ خودا ناسنامەی تاکچاوی پێڕاگەیاند، کە خودی دژە مەسیحە مووسا قەومەکەی لێ ئاگادار کردبووەوە. مووسا بەتاکچاوی گوت بڕوت، ڕۆژێکی هەیە لەناو بدرێت. تاکچاو سەرەڕۆیانە لە زەوی ونبوو.

اویب گوتی:

– ئەی تاکچاو سەرچاوەی زانستەکەی کە (هامان) داینابوو لە هەرەمە گەورەکە بۆچی لێل خۆی نەیبرد؟

بۆبی چاوەکانی هەڵدەفڕین، گوتی:

– پێویستی بەوە نەبوو بیبات، ئەو لەمێشکی خۆیدا کۆپی کردبوو، کە بەدونیادا گەڕا زانستی تریشی لەمیشکیدا کۆکردبووەوە.

لیۆپۆڵ گوتی:

- هەر ئەوبوو پیاوەکانی (ڕۆزیکرۆشن)ی مووچیار کردەوە لە شوێنەکەی تا دەریانهێنا؟

بۆبی سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

- بەڵێ.. تاکچاو بڕیاریدا سەرچاوەی ئەو زانستانە لەجێی خۆی دوای مردنی (هامان) بەجێ بهێڵێت، تا بەدەستی کەس نەگات، تەنها ئەو بنیادەمانەی کە بڕوایان بەخۆی دەبێت، بەفەرمانی ئەو و شەیتان دەجووڵێنەوە، باشترین و دڵسۆزترین ئەو کەسانە لەگەورە پیاوانی ڕۆزیکرۆشن بوون.

لەسەر ئەو قسەیەی مۆمەکە کوژایەوە، دڵی هەر هەموویان خورپەی کرد، لیۆبۆڵد گوتی:

- ئێرە شنە باشی نییە، کێ ئەو شەمەی کوژاندەوە؟

بۆبی لەنێو تاریکییەکەدا گوتی:

- هەموو شتێك ڕوحی هەیە، زەوی، هەرەم، تەنانەت ئەو مۆمە بچووکەش.

لویب گوتی:

- ئەی نەفرەتی مۆمەکە داگیرسێنەوە، یا ئاگر لەکەللەت بەردەدەم.

بۆبی بەدەنگێکی نەوی گوتی:

- تاریکی ڕوحەکان ئامادە دەکات، وەك چۆن لەتاقیکردنەوەی دەرچوون لەجەستە سەرکەوتوو بوون، (کا)ی تایبەتتن دەتوانێت گوێبیستان بێت.

لویب گوتی:

- کام گوێبیستی...

بۆبی قسەکەی پێ قاچی و گوتی:

- ئەو تاکچاوە سەربوردەیەکی مێژوویی هەبوو، کاتێ پێغەمبەرێك لە پێغەمبەرەکانی خودا پێویستی بەو زانستەی لای تاکچاو بوایە، ئەوا ڕوو بەڕووبوونەوەیەکی سەیر لەنێوان پێغەمبەرەکەو تاکچاودا ڕووی دەدا، ناتوانین ئەو سەربوردەیە بزانین، تا گوێ نەخەوێنین، پاش کەمێکیتر لەمەبەستەکەم حالی دەبن، پێویست ناکات کارتەکانیتر بخەینە ڕوو، من هەموویانم ئەزبەر کردووە.

کارتی یەکەم.. کارتی دادە، وێنەی پاشایەکی پۆشتەو جوانی بەسەرەوەیەو لەسەر عەرشەکەی دانیشتووە.

کارتی دووەم.. کارتی کەشیشی دێرە، وێنەی کەشیشێکی بەسەرەوەیە، عابایەکی بەسەرەوەیەو دەموچاوی پێ داپۆشیوەو گۆپاڵێکی بەدەستەوەیە.

کارتی سێیەم.. کارتی دادگەرییە، وەلێ ئەمجارە وێنەی شەیتانێکی بەسەرەوەیە، لەسە ِ عەرشەکەی خۆی حوکم دەکات.

ڕوحی هەرسێکیان بەرزەوەبوو بۆ بان سەریان و دادەگیرسا، ئەودەم گوێبیستی دەستپێکرد.

***

# بەشی حەوتەم

## ئەهریمەن فەرمانڕەوایەتی دەکات

## ١٦٥٠ پێش زایین

***

ئەو ڕۆژە دڵمان ختوورەی کرد، کاتێ زەوی لەژێر پێماندا لەرییەوە، ترس دایگرتین، دەنگی بەرد کوتان چون دەهۆڵ بەگوێمانا دەهات، دەنگەکە لەهەموو لایەکەوە دەهات، دەنگێکی بەهێزبوو، لەگەڵ نزیکبوونەوەی دەنگەکە هەستمان کرد دەنگی تەنها شتێك نییە، بەڵکو سەدان شتە کە دەنگی دەدایەوە.

ئێمە کرێکاری ڕەنگ تاریك بووین، بژێوی ژیانمان بە شان و بازووی خۆمان پەیدا دەکرد. ترس دەستی پێ لەکار هەڵگرتین، دەنگەکەمان ناسیەوە، شتی وامان زۆر بینیوە، فێرببووین ئەو جۆرە دەنگە مانای کۆتاییمانە، دەمانزانی ستەمکارەکان لەجێی خۆیان وەدەرکەوتوون، ڕەنگە چەند خولەکێك نەبات و بەزۆر پێوە بمانفلیقێننەوە، دەبوو هەڵبێین، وەلێ هەراو زەنای دەنگەکە ئەژنۆی شکاندبووین، بارە قورسەکانمان تووڕ دایە سەر زەوی و هەڵاتین. خۆزیا ڕوخساری ترس و تۆقینەری ئێمەتان دەبینی، ئەگەرچی کرێکاری کارە هەرە سەختەکان بووین، هەر یەك لە ئێمە سەنگی پەنجا جار لەسەنگی خۆی پێ هەڵدەگیرا، وەلێ ئەو ستەمکارانە شتێکی تربوون، شتێکی زۆر سامناکبوون.

من لەکرێکارەکان جیابوومەوە، هەوڵمدا بەبەردەکانا هەڵگژێم و لەبەرزییەوە هەواڵێکم دەست بکەوێت، ئاخر ئەوە کاری من بوو، من لەو سەردەمە پیرۆزەدا و لەسەر خاکی پیرۆز کە سەردەمی هەزار ساڵ دوای مووسا بوو. دەی بە بەردەکانا سەرکەوتم، لەسەرەوە تەماشای هاورێکانی خۆمم کرد، شاژنم بینی لەرز گرتبووی، سەربازەکانیش بەدەوریەوە بوون.

دەبوو ئەو بۆنی (فۆرمۆن)ەی دوای خۆمان بەسەر زەویەکەوە دەرشت، ئاسانکاری بێت و لەگەڕانەوەماندا بۆ ناو خانووەکانمان ڕێگا هەڵە نەکەین، وەلێ هەلاتنمان بەوای تیژڕەوی ئەوانەوە، هی ئەوە نەبوو بتوانین لەدستیان هەڵبێین، ئەوان سۆزیان نەبوو. هەر کەچاوم پێیانکەوت لەشکرێك بوو ئەوسەری دیار نەبوو، لەشکرێك پێشڕەویان شەیتان و کۆتاییەکەشیان هەر شەیتان بوون، گیانەوەری هەرە زەبەلاحیان پێبوو، لیك بە کەڵبەکانیاندا دەهاتە خوارەوە، ڕەوێ سیسارکە کەچەڵ ئاسمانیان تەنیبوو، دەرفەتی هاوار کردنیشم نەبوو، زۆر تیژڕەوانە دەهاتن، هاوارم لە هاوڵەکانم کرد:

- هەڵبێن.. هەڵبێن، بۆ ناو خانووەکانتان هەڵبێن، لەپشت گابەردەکانەوە خۆتان بشارنەوە.

کەس تاقەتی هەلاتنی نەبوو، زۆربەی هەرە زۆرمان لەجێی خۆمان سڕ بووین، چاومان لێ ئەوقاند. ستەمکاران بێ ئەوەی درکت پێبکەن دەتکوژن، بەدەم کاری بژێویەوە دەمرین، بەو ئاواتەی لەڕیزی شەهیداندا بین، تەماشای چاوانی ستەمکارانم کرد، هیشك و بێ بەزەیی بوون، تەنانەت جلوبەرگەکانیشیان ترسناك بوو، دواتر شتێك ڕوویدا، کە لەمێژووی جیهاندا ڕووی نەداوە، ستەمکاران لەیەکڕا وێستان، هەموو سوپا و درندەکانیان و باڵندەکانیان وەستان، تەماشای لای ئێمەیان دەکرد. دیمەنەکە نامۆ بوو،

سوپایەك لەستەمكاران لەسیلەی یەك ویستان، تەماشای كۆمەڵێك كرێكاری لاواز و بێ دەسەڵاتیان دەكرد، هاوارم لە هاوڵەكانم كرد:

- دەربەڕن، فریای خۆتان بكەون، دەنا تێكوپێكمان دەشكێنن، بە ڕێڕەوی(فۆرمۆن)ەكە هەڵبێن.

لەپڕ ڕیزەكەیان دوورخستەوە، پیاوێكی مەزن لە ئەسپەكەی هاتە خوارەوەو بەرەو لای ئێمە هات.. ئەی خودایە دەمانسووتێنن؟ هەنگاوێكی بەرامبەر سەدان هەنگاوی ئێمەبوو، وەلێ ئەو پیاوە ڕێك ڕوو بەڕووی ئێمە نەهات، زیاتر مەبەستی لای من بوو، بە بزەخەنەوە بۆ لام هات، لەترسا لەجێی خۆم وشكبووم، بینیم سەری بۆ ئاسمان بەرزەوە كرد، دیاربوو نزای دەكرد، ئەوجا تەماشای كردمەوەو دەستی بۆ درێژ كردم و لەتەكما قسەی كرد. ئاخر ئەوە مەحاڵبوو، ئەوان لە ئێمە تێناگەن و ئێمەش لەزمانی ئەوان حاڵی نابین، وەلێ بەلای ئەو پیاوەوە سەیر نەبوو، من مێروولەیەك بووم، ئەویش سلێمان بوو.

***

## هەركەسێك وابزانێت گیانەوەران گەمژەن، بەخۆی گەمژەیە

بوونەوەرێكبووم بەسەر ئاوی فوراتەوە، لەهەموو شتێكم دەڕوانی، لەمەملەكەتی سلێمان بە ژێر خۆرەتاوەكەوە گەرمم دەبوووەوە. هیچ زیندەوەرێكم لەو مەملەكەتەی (سلێمان) بەو مەزنییە نەبینیوە، لەوخاكی پیرۆزەی دەكەوێتە نیوان (نیل و فورات)ەوە، مەزنی ئەو مەملەكەتەش

لەفراوانی خاکەکەیدا نەبوو، بەڵکو لەو دوو بەندەییەدا بوو، هەر هەمووشی ئەمڕۆ بە ئامادەگی حەزرەتی سلێمان حەشر دەکرێن. بەسەر تەختەیەکی سەر ئاو کەوتوو، سۆسەی هەموو شتێکم دەکرد، تا ڕیزەکانم بینی هاتن، ئەگەر دڵێکی پۆڵاینم نەبوایە، بەو دیمەنی ئامادەبوونی گیانەوەران دڵم دەوەستا، چەندین ملیۆن بنیادەم ڕیزیان بەستبوو، دەیان ملیۆن لە جنۆکەو شەیتانەکان، سەدان ملیۆن لەگیانەوەر و باڵندە و درندە ڕیزیان بەست، بەفەرمانی سلێمان بە ڕێکوپێکی دەڕۆیشتن، ژمارەیان ئەوەندە زۆر بوو بەری ئاسۆیان گرتبوو، تەنانەت بەری چیاکانیشیان گرتبوو، هەر گیانەوەرێ سەرۆکەکەی پێشڕەویان بوو، سوپای پڵنگ پڵنگێك پێشڕەویانی دەکرد، لەشکری فیل پێشڕەوەکەیان (فیل)ێك بوو، سوپایەك لە شەیتان پێشڕەویان شەیتانێك بوو، بەو ئاوایە ئەوانەی تریش بە پێشڕەوی لە ڕەگەزەکەیان ئامادەبوونیان هەبوو.

سلێمان هاتە نێو گۆڕەپانەکە، پیاوێکی سوورو سپی شکۆمەندبوو، تەماشای عەرشەکەی خۆی کرد، چی وەك عەرشی سلێمانە، لەکۆتایی گۆڕەپانەکە دانرابوو، سلێمان بەرەو عەرشەکەی ڕۆیشت، ئەو عەرشەی بە دوڕو یاقووت و گەوهەر نەخشێنرابوو، لای ڕاستی شێری ئاڵتوونی و لای چەپیشی داڵی ئاڵتوونی دانراوە، لای پێشەوە سێ پایەبوو، سلێمان چووە سەر پایەی یەکەم، شێرە ئاڵتوونیەکان جووڵەیان کرد، دەستیان پان کردەوە، دواتر چووە سەر پایەی دووەم، داڵە ئاڵتوونییەکان باڵیان کردەوە، لەپایەی سێیەمدا عەرشەکە لای کردەوە و ڕێك و ڕەوان ڕاوەستا، بەدەوریەوە بەیکەرگەلێکی ئاڵتوونی، سلێمان لەسەر عەرشەکەی دانیشت، ئەوەی ڕوویدا لەهیچ شارستانییەتێك ڕووی نەدابوو.

یەك لەداڵە ئاڵتوونییەکان لەدیواری پشتەوەی عەرشەکە تاجێکی مەزنی هەڵگرت و لەسەر (سلێمان)ی دانا، بەحەواشەوە بڕێ کۆتر میسك و عەنبەریان بەسەر سلێماندا پڕاند، ئەوجا ستوونێك لەبەردەم کورسییەکەی بەرزەوە بوو، کە تەوراتی بەسەرەوە بوو، تا سلێمان بیخوێنێتەوە، وەلێ ئەوڕۆ بۆ خوێندنەوەی تەورات نەبوو، بەڵکو بۆ ڕۆژی گردبوونەوەکەبوو، سلێمان پەیمانی لەهەموو جۆری زیندەوەرەکان و گیانەوەر و باڵندەکان وەرگرت، تەنانەت لەشەیتان و جنۆکەکانیشی وەرگرت، پەیماننامەی سلێمانی بۆ خوێندنەوە، قسەگەلێك بوون لە زکری خودا، کە تهێنی هێزی پتەوکردنی ڕوحی زیندەوەرەکان بەیەکەوە شەتەك دەدا، تا ئازارت نەدەن.

ڕەنگە ئەمێستا لەخۆت بپرسیت من کێم؟ چاك بڕوانە ئەوەی ها بەسەر تەختەی سەرئاوەکەوە قسە دەکات، چاك لێی وردبەرەوە ، دەمبینیت؟ ئەو زانستەی لەژێر عەرشەکەی (سلێمان)دایە، باوەڕ ناکەم دوای خۆی کەس پێی بگات، ڕەنگە سەردەمێك بێت، خەڵکی کە لەتەنەکان زۆر وردبنەوە، شتگەلێکی سەیر ببینن دەجوڵێتەوە، ڕەنگە ئەودەم شتێك لەو زانستە حاڵی ببێت، کە هەموو تەنێکی دەوروبەرت بێ ڕوح نییە، هەموو تەنێك لەدەوروبەرت زیندووە و قسەدەکات و نزاش دەکات و دەبینێت و دەبیستێت، ئێستا زانیت من کێم؟

بەڵێ ئەوە منم..کە سەرپەرشتی گۆڕەپانی سلێمان دەکەم، وەلێ سلێمان تووڕەیە، هەموو گیانلەبەرەکان بۆ پەیماننامەکەی ئامادە بوونە، تەنها یەك بوونەوەر نەبێت، ئەویش پەپووە.

***

## هەموو شتێك بەسەرتەوە شایە تحاڵە، پێستت، پەنجەكانت، تەنانەت ئەو زەوییەی بەسەریەوە دەڕۆیت

هەموو شتێك تیاتا گوزەر دەكات و هەموو شتێكیشت تێدایە، سەرەتایەكی نووسراو و كۆتاییەكی مۆركراو، تۆ لەنێو هەر هەموو ئەوانەدایت و لەڕووبارەكە مەلە دەكەیت. سەربردەی پەڕووەكەت بۆ ناگێڕمەوە، چونكە لەمنداڵییەوە ئەو بەسەرهاتە دەزانیت، وەلێ شتێكی ترت بۆ باس دەكەم، كە كەس بۆتی نەگێڕاوەتەوەو جارێكی تر نایبیستیتەوە، من كێم؟ من ئەو كەسەم بەدەورتا دێم و دەچم، تۆش لەناخمدا دەگەڕێیت، ڕۆژێ لەڕۆژان لێمتێنەگەیشتی و نەتبینیوم، وەلێ من لەوێم، تۆش ئەوە چاك دەزانیت، من (كات)م، تەنها وشەیەكە ئەگەر بەهەچ ڕێكایەك شرۆڤەی بۆ بكەیت شكست دێنیت، وەلێ ئەوە گرنگ نییە، من ئەمڕۆ قسەیەكم كرد، كەس نەیكردووە.

سلێمان و سەربازەكانی لەبیر خۆت بەرەوە، بە زەمەندا دەتگێڕمەوە.. سلێمان بەر لەوەی ئەو هەموو دەسەلاتەی پێبدرێت، مرۆڤێكی ئاسایی بوو، ئەوەتا لەوێیە، تەماشای بكە وابەسەر كورسییەكەیەوە دانیشتووە، كە بەرامبەر عەرشی پشایەكی ئاساییە، خودا ژیری و زانایی پێبەخشیوە، بۆ ئەوەی لەنێو خەڵكا دادپەروەر بێت، خودا بابەتێكی گرنگی پێداوە، كە هۆكاربوو هەر شتێك لەسەر خاكی پیرۆز تا كۆتایی زەمان ڕووبدات، خودا فەرمانی وێدا مزگەوتێكی مەزن درووست بكات، كە شایەستەی ئەو مەملەكەتە مەزنە بێت بۆ ئاشتەوایی، ئەویش مزگەوتی (ئەقسا) بوو، تا ببێتە شوێنێكی پیرۆز لەهەموو لایەكی ئەو مەملەكەتە و ڕووی لێ بكەن، كە شام و عیراق و بەشێك لەمیسر دەگرێتەوە، وەلێ شتێكی سەیر لەمەڕ ئەو مزگەوتەوە هەبوو، خودا فەرمانی بە سلێمان دا ئاسن لەبیناكردنیدا بەكار

نەمێنێت، مینبەر(دوانگەی)ئاشتی بێت، نابێت شتگەلێك بەکاربهێنرێت کە لەشەڕوشۆڕەکاندا بەکار دەهێنرێت، ئەوەش کارێکی سەختبوو.

سلێمان پیاوێکی بانگ کرد ناوی(ئاسف کوڕی بەرخیا)بوو، ئاسف چووە ژوورەوە، پیاوێکی زۆر قۆز بوو، نهێنی پارێزی سلێمان بوو، زانا لەبواری زانست و پزیشکی، ئاسف گوێی لەداواکارییەکەی سلێمان گرت، چاوی نووقاند ما بیر بکاتەوە، بەداوای لێبووردنەوە گوتی:

– شتێك لەسەر زەوی نییە ئەوەی پێبکرێت تەنها زیندەوەرێك نەبێت.

سلێمان بە چاوی پرسیارەوە لێی ڕوانی، ئاسف گوتی:

– گەورەم کرمێکە لەکرمەکانی زەوی، خودا کە درووستی کردووە، هێزێکی وێداوە بەرد دوولەت دەکات، هەروەك چەقۆ وایە ناویشی (سامری)یە.

– لەهەرکوێیەکە بۆمی بهێنە.

– ئەی پێغەمبەری خودا ، ئەوە کە ناوی سامری لێنراوە، کەس بەزانستەکەی نازانێت تەنها پیاوێك کە مووسا پەنای بۆ بردووە، تا جلوبەرگە کەشیشەکان کە بە ئاڵتوون ڕووپۆش بکرێت بۆی جێ بەجێ کردووە، بەوەی ئەو مێرووەی بەکارهێناوە لە پارچە پارچە کردنی ئاڵتوونەکە، بەو ناوەی (سامری)یەوە ناونراوە.

سلێمان لەسەر عەرشەکەی ڕاپەڕی و گوتی:

– مەبەستت سامری مووسایە، تاکچاو؟

– بەڵێ ئەی پێغەمبەری خودا، لەسەر زەوی خۆی ون کردووە، کەس شوێنی پێ نازانێت، یانەخۆ...

کاتێ پێغەمبەر هات ڕوحم هەڵبکێشێت، ڕێم پێنەدا، گوتی ئەوە فەرمانی خودایە، بەگوێم کرد، دەزانیت بۆچی ڕێم پێنەدا؟ دەمزانی ئەوەی لە قوڕ دروست دەکرێت، خوێن بەسەر پشتی منەوە دەڕژێت، فریشتەکە وایگوت، کە خودا پەرستی دەکرد و سەلاواتی لێدەدا، بەخۆم گوت(( ئاخۆ ئەوە لەشەیتان خەراوترە؟)) ئەوەی ڕاستی بێت، ئەوەی لەشەیتان بینیم لەهیچ ڕەگەزێکی تر نەمبینی، ئا ئەوەتا ئەمڕۆ چیرۆکێك دەبیستم، من کە زەوییەکی جێگرم لەو چیرۆکەی سلێمان لەرزم لێهاتووە. ئەو ڕۆژە بینیم بەدوای پیاوێکی تاکچاودا دەگەڕا، تەنیا من دەمزانی لەکوێیە. لەوەتەی مووسا بەرەڵای کردووە، دەزانم چ ڕیسواییەك دەگێڕێت. سلێمان نەیدەزانی چۆن دەستی لێگیربێت، تا (ئاسف) پێیگوت.. کەس شوێنی سامری پێ نازانێت، تەنها شەیتان و جنۆکەکان نەبێت.

سلێمان بەدارستانێکی چڕوپڕا دەڕۆیشت، لەجۆرێك جنۆکە دەگەڕا، ئەودەم خودا دەسەلاتی بەسەر جنۆکەدا وێنەدابوو، ئەویش وەك ئەودوای پێغەمبەرەکان جنۆکەی دەبینی. لەو دارستانە چڕوپڕەدا شەیتان دەرکەوت، کە بەدوویدا دەگەڕا، ڕوخسارێکی ناشرینی هەبوو، عابایەکی بەسەرەوە بوو، ئەبیزی.. ئەهریمەن لەسەردەمی مووسا دا دەژیا، هەر ئەو بوو دڵی فیرعەونی کردبووە بەرد، وایلێکردبوو دوای نەوەی ئیسرائیل بکەوێت، کەس وەك ئەو شارەزا نەبوو، شوێنی سامری تاکچاوی پێ بڵێت. ئەبیزی.. بزەخەنەیەکی بۆ کرد، خۆی لەسلێمان دزییەوە، سلێمان بۆی دەرکەوت (ئەبیزی) شوێنی تاکچاو نازانێت، ئەبیزی گوتبووی.. ئەو سامری تاکچاوە بەرەو باکوور ملی ناوە، ئەو زانیارییە بەر لە هەزارساڵ بوو، بۆیە ئەو زانیارییە هیچی نەدەگەیاند، وەلێ ( ئەنسیگۆس)ی ئەهریمەن ڕەنگە شوێنەکەی پێبزانێت، بەوای ئەوەی لەباکوور دەژێت.

ڕۆژ هات و ڕۆژ ڕۆیی سلێمان تا ئەوپەڕی سنووری مەملەکەتەکەی لەباکوور گەڕا، ئەنسیگوس بەپرچە سپییەکەی و ڕوخسارە ناشرینەکەیەوە دەرکەوت، زەمانیشی لەڕوخساری جوانتر نەبوو، پێیگوت:

- ئەی سلێمان.. چاك بزانە ئەو (ئۆرشەلیم)ەی لەژێر دەسەڵاتدایە، دوای تۆ پاشاکان داگیری دەکەن و دەیکەن بەوێرانە، بەو وێرانەییە تا ڕۆژی پەسڵان دەمێنێتەوە.

سلێمان بەهیچ نەگەیشت، بێئومێد بۆ لای عەرشەکەی گەڕایەوە، بەدەم ڕێگاوە بوو شتێکی لێدەرکەوت، شتێکبوو لە چیلکەی قامیش دەچوو دەفڕی، چیلکەکە کەوتە بەرپێی سلێمان، گوێی لەدەنگێکبوو گوتی:

- ئەی سلێمان کە دەمریت هیچ لەگەڵ خۆت نابەیت، تەنانەت بەقەد ئەم چیلەکەیەش نابەیت، ئەو خاکەی لەڕۆژهەڵاتیەوە تا ڕۆژئاوا کە نووکە موڵکی تۆیە، تەنها چوار گەز خاك نەبێت ئەویش تێدا دەنێژرێیت هیچت بەرناکەوێت.

سلێمان گوتی:

- تۆ کێی؟
- ئەی تۆ کێیت تا وەڵامت بدەمەوە، من لەئاگر خوڵقێندراوم، تۆش لەقوڕ خوڵقێندراویت، ئەستێرەکەم لە ئاسمانە و بەناوی ئەوەوە دەمپەرستن، ناوم (ئەشمۆدای)ە، ئەی سلێمان تۆ بنیادەم و باڵندەت خستووەتە ژێر دەسەڵاتی خۆت و تێر نەبوویتە، دەتەوێت جنۆکەش بەریت؟

- هیچم لەنێوە ناوێت، دەمەوێت مزگەوتێك بۆ خودا لەخاكی پیرۆز درووست بكەم، (سامری)م بۆ ئەو مەبەستە دەوێت، كەسیش شوێنی ئەو سامرییە پێنازانێت تەنها نێوەی جنۆكە نەبێت.

ئەشمۆدای گوتی:

- لە پەپوو بپرسە، ئەو باڵندەیەكی گەڕۆكە، هەر ئەویشە جنۆكە دەبینێت، ئەگەر پەپوو نەزانێت، خۆت ماندوو مەكە بۆی مەگەڕێ.
- كام پەپوو، زەوی پڕە لەو باڵندەیە؟

ئەشمۆدای لەبەرچاوی سلێمان ونبوو، وەك ئەوەی زەوی قووتی دابێت.

***

## ئەی پەپووی دێوانە.. شوێنی تاكچاوی گەڕۆكمان پێ بڵێ

كە دەمانبینن بە ڕەر چون پەپوولەی زەبەلاح بە باڵی ڕەنگاو ڕەنگ هەڵدەفڕین، تیژڕەویمان لە ئاسماندا چون تیژڕەوی ئەسپ و پڵنگە، ئەوسا وابووین منیش لێل ڕەوەكەیاندا بووم، پەپوولە لەگەڵ كۆمەڵێك پەپووانداا بەحەواوە بەرەو باشوور لەدەست زمستان هەڵهاتبووین، هەروەك چۆن هەموو ساڵێك ئەو گەشتەمان دەكرد، وەڵێ ئەمساڵ گەشتنەكەمان بەرەو باشوور باش نەبوو، ئەوەی ڕاستی بێت لەو گەشتەدا من باش نەبووم، تەنها من هەموو شتێكم بینی.

دوای ئەوەی لەخاكی پیرۆز بۆ خاكی (كۆش) نیشتینەوە، ئەو خاكە بنیادەمی ڕوخسار مەیلەو ڕەش بوون، دەبوو دەریا بەرەو (سەبەء)ببڕین،

لەناوەندی دەریاو لەدوورگەی (حنێش) بۆ پشوو لاماندا، دواتر کەوتینەوە ڕێ، حنێش بنیادەمی تیا جاگرتە نەبوو، وەلێ هەموو ساڵێ شتێکی سەیرمان دەبینی، وەك شت.. شت نەبوو، بەڵکو کەسێك بوو لەسەر یەکێك لەو دوورگانە دەژیا، هەندێ جار لەسەر دوورگەکە دەمانبینی و هەندێ جاریش دیار نەدەبوو، کابرایەکی گۆشەگیر بوو، لە (دێر)ێکی گەورەی ڕەشدا ژیانی بەسەر دەبرد، قوولەکانی نادیاربوون، تەنها و تەنها بەعابایەکی ڕەشەوە دەمانبینی یا عابایەکی سووری بەخۆیدا دەدا، (دێر)ەکەی لەپەرستگای جوولەکەکانی دەکرد. بەسەر دوورگەی ئەو پیاوە نامۆیە نیشتینەوە، وەلێ ئەومان نەبینی، چەند ڕۆژێك ماینەوە، دواتر ڕەوەکە بڕیاری گەشتەکەی بەرەو (سەبەو) دا، من لەڕیزی دواوەدا بووم، پەپوورەکان دەستیان بە گەشت کرد، دڵم سۆزی بینینی (دێر)ەکەی وێدام، ئەوجا ئەو نیگاکردنە ڕسکا، کە هەموو بابەتەکە لەوەوە دەستی پێکرد، ئەو دەرگایەم بینی کرایەوە، پیاوە نامۆکە بەعابا ڕەشەکەیەوە دەرکەوت، وەلێ ئەمجارەیان سەری خۆی پێ دانەپۆشی بوو، یەکەمجارم بوو سیمای ببینم، ڕوخسارێکی تیژ و پرچێکی لوول و ڕەش و درێژی هەبوو، جەستەی بە بن عاباکەوە دەرکەوت.. پیاوێکی بەهێزی بالآزراف، ڕەنگە بەهێزترین جەستە بێت لە ژیانمدا بینیبێتم. لەڕەوەکە دواکەوتم، لەپشت دارێکەوە خۆم بۆ مەلآسدا، پیاوەکەم بینی لەلێوار دەریاکە وێستا، تەماشای پەپوورەکانی دەکرد، ئەوجا بەرەو دەریاکە بەڕێکەوت، ئا لێرەدا ئەوەی ڕوویدا حەپەساندمی، ئەو پیاوە بەرو ناو دەریاکە نەڕۆیشت، بەڵکو بەسەر ئاوی دەریاکەوە هەنگاوی دەنا، لەناوەندی دەریاکە وێستا، باوەڕم بەو دیمەنە نەبوو، وەلێ دواتر هەردوو باڵی لێکردەوە، ئەوجا (با)یەك بەدەوریدا هەڵیکرد، ئەگەر کەسێك لەسەر ئەم گۆی زەوییە پێیبگوتمایە کەسێك

دەتوانێت (با) بجوولێنێتەوە باوەڕم پێ نەدەکرد، تەنانەت باڵندەکانیش لێکەوتیان لەتەک (با)دا هەیە، وەلێ (با) ناخەنە گەڕ، هەرچی ئەوەبوو بەوای دەستەکانییەوە جوولەی بە (با)کە دەکرد، (با)کەی دەوروبەری گێژاوێکی لە ئاوی دەریاکە دروستکرد، بۆ خۆیشی لەناوەندیا وەک جنۆکە وێستاوە، تا جنۆکەکانیش ئەوەیان پێ ناکرێت، ئێمەی پەپوو دەیانبینین و دەزانین چەند بڕشتیان هەیە.

لەپڕ لەقووڵایی دەریاکەوە کەللەسەر و جەستە دەرکەوتن، چاو و دەموچاو شینباو، جنۆکەی بن دەریا بوون، لەدەوری کۆبوونەوە، هێشتا باڵی کراوەیە، ئەوجا ئەوەی سەرسامی کردم، سەری هەڵبڕی و شتێکی کرد، هەرگیز لەو باوەڕەدا نەبووم، بەخۆمم گوت ڕەنگە ئەوە خەون بێت دەیبینم، ئەو پیاوە بەرزەوە بوو، پەڕوباڵی نەبوو تا بەرەزەوە بێت، ئەوە نە لەبنیادەم و نە لەشەیتان و نەیش لەگیانەوەران ئەوە ڕوویداوە، (با)کە بەفەرمانی ئەو پیاوە دەجوولێت، فەرمانی وێداوە بەرزی بکاتەوە. نەمزانی ئەوەی بینیم جیاوازییەک لەم جیهانەدا دروست دەکات.

***

# ئەگەر بینیتان پیاوێك بەسەر ئاودا دەڕوات و لەحەوادا بەرز دەبێتەوە، پێی هەڵمەخەڵەتێن، تا ئەو بابەتەی دەخەنە بەر پەرتووك و سوونەتەوە

( شافعی )

ئەوەی بنیادەم فێری نەبوو، فێری بووم، هەموو زانستەکانی بنیادەمیش فێربووم، لەتەك (سلێمان)دا بۆ هەموو شوێنێك دەچووم، ناوم (ئاسف)ە، ئاسفی کوڕی بەرخیا، پێغەمبەری خودا کردمی بە پارێزەری نهێنییەکانی، ئەوەی زانستی هەبێت بەشەریشی هەس. هەموو زانستەکان لای ئێمە پارێزراوە، وان بەژێر عەرشەکەی (سلێمان)ەوە، پێغەمبەر فەرمانی پێدام لەژێر کورسییەکەی هەڵکۆڵم و توونێلێکی گومرا درووست بکەم، بەو ئاوایەی هیچ بنیادەمێك بە زانستەکەی نەگات، پەرتووکی هەرە کۆنی تێدایە، دەستنووسەکانی مووسا و ئیبراهیم و تەنانەت زانستەکانی خودی (سلێمان)یشی تێدایە، هەموو زانستەکانمان لە سندووقێك نا چون تابووت تا لەچاوانی بنیادەم و شەیتانی بشارینەوە.

سلێمان چەندین دامێنانی زانستی تری دامێنا. ئەو ڕۆژەی لەگەشتێکدا لەتەکیدا بووم، بەدووی سامری دەگەڕا، تا فەرمانەکەی خودا بەجێ بگەیێنێت و مزگەوتەکەی پێدرووست بکات، بەچاوی خۆم بینیم لەتەك باڵندەکان قسان دەکات، پرسیاری پەپوویان لێدەکات، پێیگوتم.. باڵندەکان پێیانگوتووە پەپووەکان کۆچی گەرمیانیان کردووە، پاشی مانگێك دەگەڕێنەوە، وەلێ سلێمان سووربوو بەدووی پەپوودا بگەڕێت، ئەو ڕۆژە پێیگوتم:

- ئاسف.. خەونێکم بینیوە، بۆمی شرۆڤە بکە.

پێمگوت هەوڵدەدەم، پێیگوتم:

((پیاوێکم بینی زۆر قۆز و جوان، پیاوێکیش تاکچاوی ناشرین، پیاوە قۆزەکە دارێکی قورسی هەڵگرتبوو، بەنێو خەڵکەکەدا بەرەو مەرگی خۆی دەڕۆیشت و سەربازەکانیش قامچیان لەپشتی دەدا، پیاوە ناشرینەکەیش وێستاوەو شۆخی لەچاوەکانیەوە دەردەکەوت، پیاوە قۆز و جوانەکە وەستا، پیاوە ناشرینەکە پێیگوت (دەی بڕۆ، خۆت دوامەخە) پیاوە قۆزەکە پێیگوت(من لەکۆتاییدا دەحەسێمەوە، وەڵێ تۆ لەسەر گۆی زەوی دێوانە و سەرەڕۆ دەبیت) زۆری نەبرد سەربازێك کێشای بە بنەگوێی تاکچاوەکەو پێیگوت( تۆ وەرە دارەکەی لەتەکا هەڵبگرە، تا بەمەرگی خۆی بگەیێنین) پیاوە ناشرینەکە دارەکەی لەتەکیدا هەڵگرت و لەسیلەی پیاوە قۆزەکەوە بەڕێکەوت)).

بە گێڕانەوەکە سەرسام بووم و بەسلێمانم گوت:

- نازانم، وەڵێ شتێکی باش ڕوو نادات.

لەنێو گەلاکانا ڕرخساری دەرکەوت، وێستاین و تەماشامان کرد، پیاوێك چاو جوان، پێدەچوو لە مەملەکەتەکە نامۆ بێت، سلێمان پێیگوت:

- ئەو پیاوە کێیە؟
- کاتت هەیە لەپێدەشتەکانا بگەڕێیت و ناوی خەڵکی بپرسیت و موڵکەکەیشت نەمابێت.

سلێمان تووڕە بوو، گوتی:

- باسی کام موڵك دەکەیت؟ من لەسامری دەگەڕێم.

چاوانی پیاوە قژزەکە خەمیان پێوە دیاربوو، گوتی:

– ئەی سلێمان.. ئەو (سامری)یەی بەدوویدا دەگەڕێیت لەسەر کورسییەکەت دانیشتووەو حوکم دەکات.

هەردووکمان حەپەسساین، هەستمکرد سلێمان دەموچاوی تووڕەبوونەکەی ڕەوییەوەو ئارام داهات، پیاوە چاوجوانەکە بەردەوام بوو لەقسەکردن و گوتی:

– ئەی پێغەمبەر.. سامری فیتنەیی ناوەتە ناو قەومەکەت، وەک چۆن ناو قەومەکەی (مووسا)ش ئەو دووزمانی و فیتنەییەی خستەوە.

ما سلێمان تەماشای بەرپێی خۆی بکات، هەستێکی خەمبارانە دایگرت، چون ئەوەی لەخەونەکەی خۆی حالی بوویێت، پیاوەکە گوتی:

– ئەی سلێمان.. سامری بەهەموو فرت و فێڵی سەیرەکانیەوە چووەتە ناو خەڵکەکەوە، کۆمەڵێك لەپیاوماقوولانی نەوەی ئیسرائیل لەدەوری کۆبوونەتەوە، قسەیانی بۆ کردووە، گوتوویەتی (سلێمان ساحیرەو خوانەناس، کفر و سیحر و جادووەکانی لەناو شتومەکی ماڵەکەیدایە) دەرکەوت لەسەر هەقە، خۆ ئەگەر کەسێك لەنەوەی ئیسرائیل بتبینێت لەملت دەدات.

دڵمی هەژاند و گوتم:

– هەی بەنەفرەت بیت، ئەو قسانە چییە باسی دەکەیت؟

پیاوەکە چاوەکانی نووقاند و دواتر بەخەمبارییەوە چاوەکانی هەڵهێنایەوەو گوتی:

- ئەی سلێمان.. پەیکەرگەلێك بۆ خواوەندەکانی میسر و بابلی لە ماڵی ژنەکانتا دەرکەوت، وەك چۆن بۆ قەومی مووسا گوێرەکەکەی دەرهێنا، دەستنووسی جادووگەریشی لەژێر کورسی عەرشەکەتەوە دەرهێنا، خەڵکەکە لێت تووڕەن ، نەك هەر ئەوە بەڵکو سامری خۆی بەمەسیح ناوزەد کردووە، ئەو ئێستا لەسەر عەرشی داوود دانیشتووە.

پیاوەکە بەدووچاوی ترساوەوە لەپشتی سلێمان دیقەتی دەدا، دواتر ونبوو، کە ئاوڕیان دایەوە، پیاوانگەلێك لەمەملەکەتی پیرۆزەوە چاویان ئاگری لێ دەباری و تەماشای (سلێمان)یان دەکرد، بەرقەوە لەکەسێکیان دەڕوانی وایاندەزانی پێغەمبەرە، دواتر بۆیان دەرکەوت خوانەناسە.

***

# یەك ستایش خودا قبووڵی بکات، خێرترە لەوەی بەماڵپاتی داوود دا هاتووە

قەدرم لای قەدرگە.انە، پیاوچاك بێت یا پیاوخەراپ، نەهریمەن بێت یا پەیامبەر، من کێم؟

بۆ بێ دەسەلات پشت و پەنام، بۆ بەهێزیش چەکم، بۆ منداڵیش مەمکەمژەم، بۆ پێغەمبەریش ئایەتم، خۆی پێوە دەگرێت و ڕانەکەی پێ دەرەوێنێتەوە، تا ئەوەتا زانیت، من ئەو گۆپاڵەم، منم لەسەر دەرباری پاشا چاکەکان ژیاوم، نووکەش لەناو قوڕدا دەتلێمەوە، خوێنی خاوەنەکەشم کە

خوێنی پێغەمبەر (سلێمان)ە بەسەرما دەچۆڕێت، قەومەکەی گەلەکۆمەیان لەخۆی و هاوڵەکەی کردووە، ئاخر چۆن لەپێغەمبەر دەدرێت و بەخوانەناس تاوانبار دەکرێت؟ هەستم بەڕوحی کرد، نە تووڕەبوو نەیش هەڵدەچوو، بەڵکو ملکەچ، ملکەچی تۆبەکردن بوو. ئاسف کوڕی بەرخیا بە برینداری ڕاستەوەبوو، دانی بەخۆیدا گرت، سلێمان دەستی گرت و گوتی:

- ئاسف.. لێمگەڕێ و بگەڕێوە ماڵی داوود، بڕوانە ئەو سامرییە چی ئەکات، هەواڵەکەم بۆ بێنەوە.
- ئەی پێغەمبەری خودا.. ئەی تۆ؟
- خودا تووشی کردم، ڕەنگە گوناهێکم کردبێت، یا زوڵمم لەکەسێك کردبێت، لێمگەڕێ لەتەك خودای خۆم دا بم.

ئاسف جێیهێشت ، لێل سلێمان ڕۆیشتم، من گۆپاڵەکەی پاشام، واملێهات لەسەر شۆستەکان و بەندەری ڕاوچیاندا دانرێم، بەکاری دەهێنام بۆ لەوەڕاندنی ڕانە مەڕ تا بژێوی پەیدا بکات، بەردەوام دەموچاوی خۆی دەشاردەوە، سۆسەی هەواڵی مەملەکەتەکەی دەکرد، چ گوناهێکی کردووە خودا وای بەسەر هێناوە؟، هەر کاتێك هۆشی دەڕۆیشت هاواری بۆ خودا دەکرد(ئەی وەهاب). شەوێك بەسەر خاکی مەملەکەتەکەیەوە ڕاکشابوو، منیش بێ گوێدان پێی لەسیلەیدا کەوتبووم، پیاوێکی بەهەیبەت و جلوبەرگی سەوزەوەم بینی، گۆپاڵێکی بەختەوەری بەدەستەوە بوو، تەماشای (سلێمان)ی دەکرد، ئەوجا گۆپاڵەکەی بۆ سلێمان درێژ کردو نەقیزەیەکی پێوە نا، سلێمان هەر کەبینی دەستی بەگریان کرد، بەپەرۆشەوە بووم بزانم ئەو پیاوە کێیە. سلێمان گوتی:

- ئەوە تۆی؟

پیاوەکە بە بەڵێ سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

- ئەی سلێمان.. ئەوشەوەت بیر دێت کە سەرت بەرز کردەوەو گوتت بەسەر هەموو ژنەکانتا بگەڕێیت و هەر یەکەیان منداڵێکی ببێت، جەنگاوەر لەپێناو خودادا خەبات بکەن.

سلێمان قسەی نەکرد، وەڵێ کۆمەڵێك پرسیار لەچاوەکانیەوە قەتیس مابوون، پیاوەکە درێژەی بەقسەکەی داو گوتی:

- ئەوا پێتدەڵێم هیچ کامێکیان سکی نەکرد، تەنها یەکێکیان نەبێت، ئەویش زۆر بەسەختی منداڵەکەی بوو، دواتر ئەو کۆرپەیەش مرد، مەبەستەم بەوەی ڕوحمی بەدەستە، ئەگەر بەر لە داواکەت بەخواستی خودات بکردایە، ئەوا هەر یەکێکیان منداڵێکی دەبوو، بەڵاکە لای تۆوە نەبوو، لای ژنەکانتەوە بوو، لەماڵەکانیاندا پەیکەریان داناو بەگوێی درۆزنیان کرد.

سلێمان لەترسی خودا دەستی بەگریان کرد، پیاوەکە گوتی:

- ئەی سلێمان چاك بزانە هەموو پێغەمبەران نزایان لای خودا ڕەت ناکرێتەوە، دوعا بکەو بگەڕێرەوە سەر ماڵ و حاڵی خۆت، پشت بەخودا ببەستە

پیاوەکە پشتی تێکرد تا بڕوات، سلێمان پێیگوت:

- ئەی خدری زیندە دوعاکەی تۆ چی بوو بۆ خودا کە کردت؟

پیاوەکە بەسلێمانی گوت:

- خودا فێری زانستی کاتی کردم، هەچ کاتێکم بوێت بۆ دەگەڕێمەوە، کات و سەردەمی خەڵك لەدەورمە، وەك خۆی دەمێنێتەوە، ئەوە

واملێدەکات زەوی بکێڵم و سەوزی بکەمەوە، لای خەڵکی وایە ئەو کارە چەند خولەکێکە، لەچەند هەفتەیەکدا بینا دروست دەکەم، لای خەڵکی وایە چەند چرکەیەکە، زانیاریم لەسەر پاپڕ یا دیوار هەیە، کە لای خوڵکی وەك چەند ساتێکە.

بێ هیچ قسەیەکی تر خدری زیندە پشتی تێکردەوەو ڕۆیشت، سلێمان دەستی بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، بەدڵ گریا و گوتی:

- خودایە بمبەخشە، موڵکێکم پێبدە بۆ کەسی دوای خۆم نەبێت، هەر تۆ بەخشێنەریت.

پێگەی پیغەمبەران لای خودا مەزنە، هەر کە دوعایان کردبێت ، دەستبەجێ دوعاکانیانی قبووڵ کردووە، خودا بۆ سلێمان موڵکی دانەگرت، وەڵ هەموو شتێکی لەسەر زەوی بۆ دەستەبەر کرد، (با)ی خستە بەر دەسەڵاتی، شەیتانەکانی خستە بەر فەرمانی، بەڵای سیحری ساحیرەکانی هەڵگێڕایەوە. سلێمان گەڕایەوە ، وەڵ گەڕانەوەکەی ترسناکبوو، بەزەیی بەکەسدا نەهاتەوە.

***

## لەوانەیە بە یەك وشە موڵك لەدەست بچێت و بە وشەیەکیش دابێتەوە

بەر لەوەی خۆر هەڵبێت سەرەڕۆیانە بە زەویدا هامووشۆم دەکرد، هەموو کەسەم دەبینی وەڵ ئەوان نەیاندەبینیم، خەڵکانێکم بینی کاریان دەکرد، خەڵکانێکی تر کرێۆشیان دەبرد، هەرهەموو دوای بژێوی ژیان کەوتبوون،

پاشا و شارستانییەکان لە ڕۆژهەڵات و ڕۆژئاوا، کەسێکم وەک ئەم گەورەییەی خۆم نەبینی، لەناو گلێنەی چاویدا لەکەیەکی باریکم بینی، لە تێڕوانینی نەدەکەوتم.

هەرکەسێك چاوی پێکەوتبێت لە بنیادەم و جنۆکەکان باوەڕیان پێ هێناوە، بۆ خۆم لەجنۆکەکانم، چیت لەدەست دێت کاتێك کەسێك دەبینیت بێ پەڕوباڵ لەزەوی بەرز دەبێتەوە، بەفەرمانی ئەو باران دادەکات و هەر بەفەرمانی ئەویش بارانەکە دەوەستێت، لە (با) تیژڕەوترە، بەر لەوەی لای لێبکەیتەوە ئەو بە ئاسۆگە دەگات، ئیسرائیلییەکان ملیان بۆ کەچ کردبوو، شەیتانەکانیش لێی نزیکبوونەوە، مەملەکەتەکەی سلێمان کە لە (نیل)ەوە بۆ فورات بوو حوکمی دەکرد، کەرەتێك لەسیلەیدا وێستام و تەماشی ڕوخساریم دەکرد، هەموو شتێك لەودا بەهێز دیاربوو، لەپڕ لە ئاسۆگەی دوورەوە هەستم بەشتێك کرد، هەر من نەبووم هەستم بەو شتە کردبێت، هێزێکی ڕوحی بەرز لەویوە دەهات، دەمزانی ئەو هێزە چییە، ، تاکچاو لەنێو ستوونەکانی کۆشکەوە تەماشای ئاسۆگەکەی دەکرد، لەپڕ شەیتانی هەراڵەکان لەچاوییەوە کارەسات دەرکەوت، لەگەڵ قسەکردن چاوەکانی هەڵدەفرین:

– ئەوا.. ئەوا سلێمان هاتەوە.

گوێمان لەدەنگێکی بەرزبوو، چوون ئەوەی بە ئاسن لەزەوی بدرێت، دەنگەکە تا دەهات نزیکتر و بەرزتر دەبوو، شەیتان گوتی:

– گەورەم ئەوە.. وەك وشتر ڕایاندەکێشێت.

ئەو وزە ڕوحییەی هەستم پێکرد، ئەوە هێزی مەزنمان لۆسیفەر بوو، وەڵێ بۆچی... لەپڕ ئەو دیمەنە کە سەرەتای ئەشکەنجەدانە دەرکەوت، زنجیری

هەرە گەورە بەر زەوی دەکەت، حەوت زنجیر بوو، هەر حەوتی یەک بنیادەم بێ ئەرک ڕایدەکێشا، کۆتایی هەر زنجیرێکیش کارەساتەکە بوو، زنجیرێک بە گـەردنی (ئیبلـیس)ەوە و (ئیبیفـاس)ی ڕوخسـار دابەشـکراو بـە زنجیرێکیترەوە، زنجیرێک لـە پێـی جنۆکـەکانی چیای حەوتـەم بەیەکـەوە بەستراون، هەر هەموو ئەوانە سلێمان بەکێشی دەکردن، ئونگورستیلەیەکی سەیر بە دەستییەوە، گرفتەکە ئەوەیە هەر هەموویان بە بەرچاوی خەڵکەوە دیاربوون، دوای ئەوەی لەسەرتای خەڵقەندەییەوە بە بەرچـاوی بنیادەمـەوە نادیاربوون. ئەمڕۆ سلێمان بە ئایەتێک لای خوداوە ئەو دیمەنـەی دەرخسـت، خەڵکەکە دووی کاروانەکە کەوتن، کە بە ڕیسوای بەدووی سلێمانەوە بـوون. سـلێمان بنیـادەم و جنۆکـەی فێـری پەیامبـەری دەکـرد، تـا بـزانن پێغەمبەرایەتی چییە. نـەمتوانی ئـەودوای دیمەنەکە ببیـنم، لەبـەر ئـەوەش نەبوو هەڵهاتم، بەڵکو هەستمکرد ئاورێک لە قـوڕگم بـەربووە، دەسـتەکانم بـۆ لای پشتمەوە شۆڕ بوونەوە، وەک ئەوەی کۆت کرابم، هـاوارمکرد، کرێکـارە بنیادەمەکان کە بەدەورمەوە بوون، لـێم وردبوونـەوە.. ئـای خودایـە منـیش لای خەڵکی دەبینرێم؟ هـیچ قسـەیەکی تـرم بۆ نـەکرا و بـە دەممـا بـەرەوە بـووم، چـاوێکم بـە تاکچـاوی گەورەمدا هـەڵبڕی، کـە بەسـەر کورسـییەکەی سلێمانەوە دادەنیشت، لێ تاکچاوم بەسەر کورسییەکەوە نەبینی، بـەپێوەش نەبوو، کورسییەکە بەتاڵبوو، دیاربوو سامری هەڵهاتبوو.

***

# که پێغەمبەر هات درۆزن هەڵهات

سلێمان داری لە جنۆکەشەیتانەکان هەڵڕی و بە ئاور و ئاسن ئەشکەنجەی توندی دان، وەك ریسواکردن دەست و پێیانی بەزنجیر بەستەوە. کەس شوێنی سامری پێ نەگوت، بەوای ئەوەی کەس شوێنەکەی پێ نەدەزانی، تەنها ئیبلیس دەیزانی، ئەویش دەست و پێی لەزنجیردا بوو نە قسەی بۆ سلێمان کرد، نەیش بۆی داچەمییەوە، ئەوێك فەرمانی خودای لەکڕنۆش بردن بۆ بنیادەم رەتکردەوە، بۆ (سلێمان)یش داناچەمێتەوە، ئەگەر تەماشای چاوەکانیت کردبا، رقێکی زۆری بەرامبەر سلێمان تێدابوو، لێل خودی خۆی سوێندی خواردبوو ناوی سلێمان بزرێنێت، ئەو مزگەوتەیش کە دەیەوێ بنیاتی بنێت، بۆ دوا ڕۆژ وێرانەی بکات. شەیتانەکان لەتاو ئازار هاواریان بوو، تا لەپڕ چاویان بەسێبەرێك بەسەر زەوییەوە کەوت، لای پەنجەرەیەکی نزیکەوە دەرکەوت، لایان لەسێبەرەکە کردەوە، بەوپەڕی بچووکییەوە وێستابوو، ئەویش پەپوو بوو.

هەردوو باڵی لێ کردەوەو هەڵفڕی و لەسەر دەستی سلێمان نیشتەوە. تەنها سلێمان لەزمانی باڵندە دەگەیشت، پەپوو هەموو هەواڵێکی بۆ سلێمان دەهێنا، ئەوەی پێڕاگەیاند کە لەدوورگەکە بینیوویەتی، شوێنەکەی پێگوت، لەرەسپی پەپووەوە سلێمان شوێنی سامری پێ زانی.. ئاخۆ هەر لەو دوورگەیە ماوەتەوە، یا لەترسی گیانی خۆی هەڵهاتووە؟ پەپوو گوتی:

- ئەوەی هەواڵی بەتەواوەتی دەزانێت جنۆکەکانی ژێر ئاون و هەر ئەوانیشی بینیوە لەدوورگەکە بەدەوریەوە بوون، ئەوان ناتوانن لەسەر وشکایی بژین.

لەو دوورگەیەو رێک لەوشوێنە نهێنییەی، تاکچاو لە (دێر)ەکەی خەریکی کۆکردنەوەی شتومەکەکانی بوو، تا لەو دەڤەرە دوور بکەوێتەوە و بەسەر زەوییەوە سەرەڕۆ بێت. تاکچاو لەتیژڕەوی خۆی دڵنیابوو، تەنانەت ئەگەر سلێمان شوێنی دوورگەکەش پێ بزانێت، ئەوا خۆی و سەربازەکانیشی بە مانگێك پێی ناگەن، وەلێ ناتەواوی دڵ ناتەواوی عەقڵە، نەیزانی ئەو رفتارە لەتەك پێغەمبەردا دەكات، ئەگەر ئەو ئاراستەی(با)و زانستەکانی فێربووبێت، وەلێ بێ ئاگایە لەوەی خودی (با) بەفەرمانی سلێمان دەجووڵێت، بۆ کوێی بوێت هەڵیدەکات و دەیگوێزێتەوە. تاکچاو ئاگای لەوە نەبوو لەپڕێ دەیان پیاوی چوارشانەو بەهێز و بازوو ئەستوور (دێر)ەکەیان بڕی و سلێمان و ئاسفی کوڕی بەرخیاشیان لەتەکدا بوو، پیاوەکان بلەز باڵبەستیان کرد و لە (دێر)ەکەی هێنایانە دەرەوەو لەبەر پێی سلێمان پاڵیانخست. تاکچاو بە گاڵتەجارییەوە لەسلێمانی ڕوانی و گوتی:

– ئەی سلێمان پێغەمبەرایەتییەکەت فێری نەکردی دەسەڵاتت بەسەر مندا نابێت، مووسا ئاگاداری نەکردییەوە؟

سلێمان بە ڕقەوە تەماشای کرد، دەیزانی مووسا بەفەرمانی خودا بوو نەدەبوو ئەو تاکچاوە بکوژرێت، تا کاتی خۆی دێت، سلێمان پێیگوت:

– ئەی دڵ نابینا.. ئەوەی پێتی دەکەم لەمردن ناخۆشترە.

ئاسف کوڕی بەرخیا لە (دێر)ەکە هاتە دەرەوە، قابلەمەیەك قورقوشمی پێبوو، کرمگەلێکی گەورە لەناویدا ئەمدیوو و ئەودیوویان دەکرد، گوتی:

– ئەی پێغەمبەری خودا.. ئەمە سامرییە.

سلێمان بە بەڵێ سەری بۆ ڕاوەشاند. ڕاستە سلێمان سامری نەکووشت، وەلێ شتێکی زۆر توندو تیژی لەتەکا کرد، نایە ناو داربازێك لەقورقوشم، بۆ

دوایینجار لێی ڕوانی و دواتر سلێمان داربازەکەی بە زنجیر و قوفڵ کڵۆمدا، تابووتەکەی هاویشتە نار قوولایی دەریاکەوە و نقووم بوو، جنۆکە ژێرئاوییەکان بەحەپەساوی تەماشایان دەکرد، دواتر پشتیان تێکرد و لێی دوور کەوتنەوە. مرۆڤایەتی سەردەمێکی لە ئاشتەواییدا و بێ دووزمانی بەسەر برد.

***

## *** تەواو ***

بۆبی فرانك ئەو مۆمەی هەڵکرد کە لەناو هەرەمەکەدا بوو، سووك لە لای دەستە ڕاستی خۆی ڕوانی، لیۆپۆڵد و لویب لەسەر گازەرەی پشت کەوتبوون، چون ئەرەی ڕوحیان بەدەستەوە دابێت، بزەخەنەیەك لەسەر لێوی بۆبی درووست بوو، داچەمییەوە تا ڕیکۆردەکە لەدەست لیۆپۆڵد دەربهێنێت، بەکەمێك ترسەوە گوتی:

- کەس نییە لەجەستەی خۆی دەربچێت و ڕوح بە بەرخۆیدا بێنێتەوە، لێرە ڕاکشێن، شتەکان نەفرەتیتان بکەن.

بۆبی زۆر بەزەحمەت بە دارشەقەکەیەوە ڕاستەوە بوو، ویستی بەو توونێلەی بەرەو دەرەوەی دەبات سەربکەوێت تا دەرباز بێت، کاتژمێرێکی برد تا جەستەی خستە سەر توونێلەکە، جەستەی شەلالی عارەقە ببوو، کونی دەرچوون زۆر دوور بوو، وەلێ شتێك دڵی گوشی، لەبەر کونەکە سێبەری(دیبۆك)ی بینی، چاوی نووقاندو لە پەیماننامەکەی سلێمانی خوێندەوە. خۆ ئەگەر خەڵکی بیانزانیبا چ مێژێك لە زکری خودادا بۆ بنیادەم هەیە، هەرگیز لەزیکر کردن نەدەکەوتن چاوێکیتری بەدەور خۆیدا

گرِدا، بەوای هەڵاتنی شەیتانەوە دڵی کرایەوە، بۆبی فرانک بەرەو ئازادی دەرپەڕی.

* * *

لەکامێرایەکی نیمچە کوالێتی ڕیکۆردکردن، وێنەکەی شێواو دەبێت، وەلێ کەمێك ڕوونی پێوە دیاربوو. دەموچاوی بۆبی فرانك لەگرتەکەدا دەردەکەوێت، نەخۆشی پێوە دیارە، کامێراکەی ڕوو کردبووە خۆی و بەدەنگێکی گۆشەگیرانەوە دەیگوت( ئەمە (بۆبی فرانك)ە، ئەمەش دوا گرتەکانمە، ناهێڵن بەردەوامی بە ژیانی خۆم بدەم، گوێم لێبگرن دەمەوێت شتێکتان پێ بڵێم.. ئەم گرتانە لەمێشکی خۆتان ئەزبەر بکەن، هەرچییەکی تێدا هاتووە لەبیری مەکەن.

هەموو ئەو گوێبیستیانەی کە ڕوحمان لەسەربوردەی پێغەمبەران مووسا و سلێمان بیستمان دەنووسمەوە، تۆ بەردەوام تێبینی دەکەیت بەشتگەلێك لە چیرۆکی پێغەمبەر (سلێمان)دا و لەهەر کۆمەلەیەك لە نهێنییە قووڵەکاندا هەیە، ئەو گرنگترین کەسایەتییە لە هەموو ڕێکخراوە نهێنییەکاندا، زۆربەی تەمەنیان لەپێناو شێواندنیدا بەسەر برد.

هەموو ئەو زانستانەی سلێمان دوای خۆی بۆ جیهانی جێهێشت، گۆڕدرا بە پەرتووکی جادووگەری، شەیتانەکان بەسەر خەڵکیدا دەیڵێنەوەو سلێمان بەدرۆ دەخەنەوە، وەك چۆن هەموو پێغەمبەرانیان بەدرۆ خستەوە، پەرتووکی ئادەم بە ڕیوایەتی ڕازئێل گۆڕدرایەوە، کە پڕە لەسیحر، بەردەنووسی ئیدریس بە (هێرمەتیکای هرمس)و زانینەکانی (تحووت)ی جادووگەر گۆڕدرا، دەستنووسەکانی ئیبراهیم بە (فیدا)ی ئەفسانەیی هیندۆسی گۆڕدرا، زانستەکانی سلێمان بۆ(٢٠) پەرتووکی جادووگەری گۆڕدرا، یەکەمیان بەناوی(Hygromanteia)ی سلێمانی، کە هەموو

وردەکارییەکانی جۆری سیحر و تەڵسم و ئامادەکردنی ڕوح و زانستی ئەستێرەناسی تێدایە، سیحری ڕەش کە دواتر بەجیهانا بڵاویووەوە، پەرتووکی دروەمێتی، هەرچی پەرتووکی سێیەمە، پەرتووکی سلێمانی مەزن و چکۆڵەیە، ئەوانەش هەموو وردەکاری جۆرەکانی شەیتان و دەسەڵاتەکانیان و چۆنێتی ڕاهێنانیانی تێدایە، گشت ئەوانەش درایە پاڵ سلێمان، هەرچی زانستە ڕاستەقینەکەیەتی دوای خۆی بەدەستی کەس نەگەیشتووە.

ئەگەرچی زانستی سلێمان مەزنبوو، وەلێ تەنیا کەسێك لەمەملەکەتەکەی زانستێکی جودای لەزانستی سلێمان داهێنا، ئەویش خدری زیندەی پێغەمبەر بوو، هەر ئەویوو بەچاوپرووکاندنێك عەرشی(بەلقیس)ی لە (یەمەن)ەوە بۆ شام بۆ لای سلێمان هانی، ئەویش بەوای ئەوەی پەرەجووەکەی خدری زیندە دەیتوانی یاری بەکات بکات، زانستی کات نە لەپێشی خۆی و نەیش لەپاشی خۆی بەکەس نەدراوەو نادرێت.

بەخۆم باوەڕم بەخودا هێنا، لەسەر ئاینی محەمەد(د.خ) لەسەر بێت موسڵمان بووم، بۆ خۆم لەدنیادا لە ژیانێکی بەرز دەژیام، ئەوەی لای تۆ خەیاڵە من تێیدا ژیاوم، هێزی ئەزیەرکردنم بەوای گۆشەگیریمەوە بوو، ئەگەرچی تەمەنم مندالبوو، باوکیشم پلەو پایەیەکی لەناو ڕێکخراوی ماسۆنیەتدا هەبوو، ئەوەش پلەیەکی بەرزی لەناو ئەو ڕێکخراوەدا پێ بەخشیم، لەڕاستیدا بچووکترین ئەندامی ڕێکخراوی ماسۆنییەت بووم، وەك باسیان لێوەدەکردم پەرەجووبووم، باوکیشم پاڵپشتی لێدەکردم، تا لەناو ماسۆنییەتدا کەسایەتییەکی گەورە بم، هەندێ لەوانەی بە پارێزەری شارستانییەت و ڕووناکی و نهێنی دابنێین، وەلێ ئەوانەی زانست دەکەن، کاری خراپەش دەکەن.

من موسوڵمان بووم، ئەوەش شتێکی سەیر نەبوو، ئەوەی دەچێتە قووڵایی گوناه و درۆ و گەندەڵکارانەوە، ئەوە هەوەڵێن کەسێکە دەزانێت هەق لەکوێیە، وەك چۆن لێل ساحیرەکانی فیرعەوندا ڕوویدا.

فەرموودەکانی محەمەدی خۆشەویست ڕاستن، سەریان پێ سوڕ کردم، هەر شتێك پەردەپۆشمان دەکرد، یا دەمانشاردەوە ، فەرموودەکانی محەمەد(د.خ) ئاشکرای دەکرد، یانەخۆ قورئان بەدرۆی دەخستنەوە، هەق دەبێت بگوترێت، هەرچی فێڵ و تەڵەکەبازی بوو کردمان، یا هەندێ لەفەرموودەکانی پێغەمبەرمان شاردەوە، وەلێ بابەتەکە مەحاڵبوو سەر بگرێت، نەك بەوای هێزی بیری موسوڵمانەکان، بەڵکو موسوڵمانەکان سیستەمێکی ئاڵۆزیان بۆ بەدوادا چوون داهێنابوو، تەنانەت هەرکەسێکمان واڵیکردبێت درۆ بەدەم محەمەدەوە بکات، دوای چەندین سەدەش بووبێت ئەو سیستەمە ئاڵۆزە ئاشکرای کردووە، بۆیە بەو پێیە خەڵکیان ئاگادار کردووەتەوە، سیستەمێکی ڕێکوپێك و تەراو یان داهێنانبوو، ناویان لێنابوو زانستی وتو وێژ و زانستی پیاوانگەل.

هەرچی ئێمەین بەندەی شەیتانین، هەموو پێشبینییەکانت، خەیاڵەکانت لەمەڕ بەندەی شەیتان ئەوانەی عابای ڕەش لەبەر دەکەن، لەبیری خۆتی بەرەوە، ئەوانە کۆمەڵێك شێتۆکەن و ڕەشبین پەرستن، ئەوەش هەر لەبیر خۆت بەرەوە، ئەو جادووگەرانەی لە ئاواییەکەت بە جلوبەرگی داڕزاوەوە دەسووڕێنەوەو لەشوێنە پیس و قێزەونەکاندا نیشتەجێن و جنۆکەو خێو و دێوەزمە ئامادە دەکەن، ئەوانە تەنها جنۆکەی شەقامەکان بەسەریاندا زاڵن، وەلێ بەندەی شەیتانی ڕاست شتێکیترە، شەیتان پارەت وێدەدات ئەگەر بیپەرستیت، ئارەزووەکانت دێنێتە دی، دەمانبینیت لە توێژێکی باڵای کۆمەڵگادابین، سەرووی حکومەتەکان، ئێمەین قەرز بەحکومەتەکان دەدەین،

بە سوود و سەلەم لێیان وەردەگرینەوە، ئێمە خاوەن بانکەکانین، خاوەن کارو کارگەکانین، خاوەن ڕۆژنامەگەریین، هەر ئێمە گەورەی دەوڵەتین، ئەوەش بەوای چاکەی خۆمانەوە نییە، ئەوە کار و دەرئەنجامی شەیتانە دەیگێڕێت.

شەیتان چی لەهیچ وپووچەکان بکات، ڕەش لەبەر دەکەن و لەپەرستگاکان وەك شێت سەما دەکەن، ئەو شەیتانەی کە من ناسیم، ئازیزەکەم ئەوە ئەستێرەی بەیانبوو، گەورەی هەموو دنیا، شوێنکەوتووانیشی بە گەورەی دنیا ناوزەدیان دەکرد، ملك و ماڵ و دەسەلأت و یاری کردن بەچارەنووسی گەل بەدەستی ئەو بوو.

هەرچی خۆمم موسوڵمان بووم، وەلێ ئەو موسوڵمانێتییەم لەدڵی خۆمدا شاردەوە، تا دزەی ناو ئەو گۆماوە بکەم کە کەس پێی نازنێت، ئاگادارت دەکەمەوە بەر و پشتی نهێنییە، با من پەیامەکەی خۆم بگەیێنم ئەوجا با هەر بمکوژن.

دوای مردنی سلێمان شەیتانەکان ئازاد بوون، ئیبلیس ڕاوکەرانی لە گەنجینەیەکی ناو دەریادایە ئاگادار کردەوە، تابووتەکەیان دەرهێنا، کە بە قورقۆشم تەنرابوو، کردنەوەی سەختبوو، وەلێ بۆ ئیبلیس کردنەوەی سەخت نەبوو، کاتی کردیانەوە، هیچ گەنجینەیەکیان تێدا نەبینی، بەڵکو کارەساتێك ڕوویدا، کەوتنە وێزەی یەك و یەکتریان بڕییەوە، هەرچی تاکچاو بوو دیوانە بەسەر زەوییەوە دەسووڕایەوە، تا ڕۆژێك لە چیرۆکێکی سەیرو سەمەردا دەرکەوت، چیرۆکێك بخەینە بەر باس، پێویستە ئەو دەستووسانە دەربهێنین کە پێی دەوترێت(ئیسووریگا).

بۆیی بەرامبەر کامێراکە و هەندێ دەسنووسی بەرگکراوی زۆر ڕێکوپێکی بەرز کردەوەو دەستی بەقسانکرد.

تۆ نازانیت شەیتانیش دەستی نووسینی هەیە، ئیسووڕیگا دەسنووسی شەیتانە و بەدەست و خەتی خۆی نووسیویەتەوە، ئا لەم لاپەڕانەدا، ڕێك لێرەدا داستانی شەیتانی نووسیوەتەوە، سامری دەورێکی بالآی تێدا هەبووە.

پێنج کارتمان هەیە شیاوی داستانەکەیە، لەبەرامبەر کامێراکە بۆتی بەرز دەکەمەوە، تا بەجوانی ببینیت.

کارتی یەکەم.. کارتی کوشتارگەیە، شەیتانێکی بەسەرەوەیە، بەچاوی دڕندانەوە لەشتێك دەڕوانێت.

کارتی دووەم.. کارتی هەرەمچاوێکە، هەرەمی شەیتانەو چاوێکی جوانی تێدایە، کە هەموو شتێك دەبینێت.

کارتی سێیەم.. کارتی خودی شەیتانە، وێنەی شەیتانێکی بەسەرەوەیە، دەستێکی بەرز کردووەتەوە و دەستەکەی تری نزم کردووە، ئەویش وێنەی نیکرای هۆشی شەیتانە.

کارتی چوارەم.. کارتی ئیمپراتۆرە و وێنەی ئیمپراتۆرێکی لەتافی لاویدای بەسەرەوەیە، پێدەچێت دڵخۆشیش بێت.

کارتی پێنچەم.. کارتی جۆبیتەرە، خواوەندی ئاسمان، وێنەی جۆبیتەری خواوەندی ڕۆمانی بەسەرەوەیە، گۆپاڵە بەناوبانگەکەی بەدەستەوەیەو تاجێکیشی بەسەرەوەیە، پێدەچێت حوکمێکی توند و تیژ بەسەر کۆمەڵێك خەڵکدا بسەپێنێت، کە وەك مردوو بەژێریەوە کەوتوون.

# بەشی هەشتەم

## جەنگی شێتی

## ١٠٠ دوای زایین _ ١٥٠ دوای زایین

سالێك لەساڵە هەرە شووم و پەشەکانی ڕۆژگار بوو، مەملەکەتەکانی جنۆکان کەوتنە وێزەی یەکتر کوشتن، لەجیهانی ئەواندا دۆستایەتی و ئاینەکانیان و ڕێبازەکانیان هەر هەموو شتێك بەریەك کەوتن، هەرچی یاخی و شەیتان بوون بەشێوەیەکی ناشرین دەرچوون، مێژووش باسی لەوە کردووە، بۆ جەنگێکی خوێناوی دەرچوون، تەنانەت خودی خۆشیان لە پەرتووکەکانیاندا باسیان لێوە کردووە، ناوی دوا جەنگی شێتیان لێنا. سەدەی دووەمی زایین بوو، شەیتانەکان بە بازووی بەهێزیانەوە مەملەکەتەکانی جنۆکەکانیان وێران کرد، دەچوونە هەر شارێك ئەوەی ڕوحلەبەر بوو لەناویان دەبرد.

شاری (ڤالهالا) کە کەوتبووە باکوور نەگبەتترین شاربوو کە تەواو خاپوور کرا، دووکەڵی سوور و لاشەی تواوە بەسەر زەوییەوە بڵاوببووەوە، جنۆکە شەیتانەکان بەدووی هەر ڕوحلەبەرێك دەگەڕان، سێ شەیتان بە جلوبەرگی ڕەشەوە دەرکەوتن، چاویان ئاوری لێ دەباری، هەر شتێکیان دەکرد بجووڵێتەوە سۆسەیان دەکرد، لەپڕ گوییان لەدەنگێکی کزۆڵە بوو، دووکەڵەکە ڕوونتر ببووەوە، ئەوانەی خۆیان وەرشاردبووەوە دەرکەوتن، پیاوان و ژنان و منداڵان لەوەدا بوون خۆیان بشارنەوە، لێ جنۆکە

شەیتانەکان ئەوانەیان دۆزییەوە کە دەویان لیکاوی قێزەونی دەردەدا، دەوریاندان، دوایین گەمەی ژیانیان بەخوێن و مەرگەساتەوە لەتەکیاندا کرد.

شەیتانەکان بۆیان چوونە پێشەوە، داماوەکان جەستەیان گرژەوە کردبوو، وەلێ لەپڕ یەك لەشەیتانەکان وێستا، وەك ئەوەی شتێك لەگوی خستبێت، دواتر بەرەو دوا کشایەوە، هاوڕێکانی حەپەسان، دەنگێك لە ڕارەشاندنی قامچیدا ئاسمانی تەنییەوە، سێبەری بوونەوەرێك دەرکەوت، لێ ڕوخساری دیار نەبوو، دیاربوو بوونەوەرێکی بەهێز و تیژڕەوبێت، شتێکی درێژی بەدەستەوە گرتبوو، دەنگی لاشەکان لەلای یەکێ لە شەیتانەکانەوە هات، هاوڕێکەی ئاوڕی لێ دایەوە، بینی سەری هاوڕێ جنۆکە شەیتانەکەی لەجەستەی بووەتەوە، دوایین شەیتان کشایەوە، نەیدەزانی چ کارەساتێك دەقەومێت، ئەو شەیتانە هەردوو لاقی بەیەکەوە نووسان و بەسەر دەمما بەرەوە بوو، پێیەکی بەهێز لەسەر کەللەی گیریوو، دەیفلیقاندەوە، داماوەکان ڕوخساری خۆشیان بۆ گەڕایەوە، لەو بوونەوەرە فریادگوزارەیان دەڕوانی، هێدی هێدی ڕوخساری دەرکەوت، بەتەواوی دەموچاوی ئاشکرابوو، پرچێکی درێژی ئاڵتوونی، دوو چاوی پڕ لە متمانەیی، تەنانەت خۆشیان بە جلوبەرگەکەیشی دەهاتەوە، جلکێکی ڕەش بەلای خاکرەنگییەوە دەیڕوانی.

نیگاکردنێکی گاڵتەجاڕانەی هەبوو، ترسناکبوو، قامچییەکی درێژی بەدەستەوەبوو، بەناولەپی دەستەکەی تری قامچییەکەی سەح دەکردەوە، ئەوانیش دڵیان ئەوەندەی نەمابوو لەژێر کراسەکانیانەوە دەرپەڕێت، ئەو یەکێکبوو لەسەربازەکان، وەلێ نەیاندەزانی بۆچی هاوڕێکانی خۆی کوشت، دواتر درکیان بەوە کرد، لەچاوەکانییەوە بەوەیان زانی، ئەو چەکەیش کە بەدەستییەوە بوو، وەك شێت کەوتبووە کوشتن، چون ئەوەی دڵ

ڕەقییەکەی بەوە دابمرکێنێتەوە، ئەو سەربازە بۆ ئەوە هاوڕێکانی خۆی کوشت تا هەر بەخۆی بمێنێتەوەو بکەوێتە کوشتنی ئەو داماوانە، دووریش نییە شێتبووبێت، ناڵەو هاواریان لێ بەرزەوە بوو، ئەویش قامچییەکەی بەحەواوە ڕادەوەشاند، تا هەر هەموویانی بێدەنگ کرد، پاشەو پاش گەڕانەوە، وەلێ بێسوود بوو، بەری پشتیان گردۆلکە بوو، بەر لەوەی لەشتێك حاڵی بن، ئەو هەنگاوەکانی پێیان گەیشت، قامچییەکەی بەسەر سەریانەوە ڕاوەشاند، ئیدی لە ژن و پیاو ئەوەی قامچی بەرکەوت بەرەوە بوو، منداڵەکان زێڕەیان لێوە هەستا، چەند خولەکێکی نەبرد خوێن ئەو ناوەی هەڵگرت، شریقەی دوایین قامچی بەمانای ئەوەی بەدەوریەوە بوون کوژران.

لەناوەندی وێرانکارییەکە و بێدەنگبوونەکەدا، دەنگێکی کزۆڵە لەخانوویەکی ڕووخاودا هات، دەنگی چیڕەی کردنەوەی دەرگایەکبوو دەکرایەوە، لەو دەرگایەوە منداڵێکی چکۆڵەی بێ ئاگا هاتە دەرەوە، بەرەو دەرەوەی خانووکە چەند هەنگاوێکی هاویشت، تەماشای لاشەکانی دەورووبەری خۆی کرد، خاوخێزانەکەی و دەرودراوسێ و هەر کەسێکی ناسیبێت لەناو خوێندا گەوزابوون، درکی بە گەورەیی کارەساتەکە نەکرد، پێدەچوو سەری لێ شێوابێت، نەیدەزانی کێوە بڕوات، وەلێ چاوی بەسێبەری پیاوێك کەوت لەپشتیەوە ڕاوەستاوە، منداڵەکە ئاوڕی لێ دایەوە، بەو چاوە منداڵانەی چاوی بەڕوخسارێکی جوان و سوورو سپی کەوت، پیاوەکە بەدەستی خۆی هەردوو ناوشانی منداڵەکەی گرت و داچەمیەوە لای گوێی و چون ئەوەی بەگوێیدا بچرپێنێت، سەرەتا ڕوخساری منداڵەکە ترسی تێکەوت، دواتر دەموچاوی گۆڕا و بزەخەنەیەك گرتی، پیاوەکە سترانی دەگوت، گۆرانییەکەی گاڵتجاڕانە بوو، دوای ئەوەی پیاوەکە لەدۆخی چەمانەوەی

ڕاستەوەبوو، منداڵەکەی جێهێشت و ڕۆیشت، منداڵەکە بەنێو ڕووباری خوێندا هەنگاوی دەنا و تەماشای لاشەکانی دەکرد، ئەوەندەی ئەبرد شریقەی قامچییەک مات و منداڵەکەی پێکا و ڕوحی دەرهێنا، ئەویش لەپاڵ تەرمەکەی ڕاکشا، لەو شوێنەدا پیاوێکی سوورو سپی بەهۆزی شێتێک گۆرانی دەچڕی، شەیتان بوو.

***

## نوفووسی کەمتیارەکان و دڵی شەیتانەکان

عەمرۆی کوڕی جابر.. شەیتانێکە لەجنۆکەکانی باکوور و پیاوێکی چوارشانەی قژزەو دڕندەیی شەیتانی تێدایە، پیاوێکی خوانەناسە. ڕۆژێ لە ڕۆژان باوەڕی بەهیچ ئاینێکی جنۆکەکان نەهێناوە، لەهیچ مەملەکەتێکیان جاگرتە نەبووە، وەلێ لە دوا جەنگی شێتی سەربازە ڕەشەکان لەخۆیان گرت، بەرامبەر بەوەی زێڕ و زەوی و زارێکی زۆری وێبدرێت. لە دواین ڕۆژی جەنگەکە عەمرۆی کوڕی جابر لەدەرەوەی گۆڕەپانی جەنگەکە بینرا، لاشەیەکی زۆر بەدەورییەوە شی بیوونەوە و لەناو خوێنی خۆیان کەوتبوون، عەمرۆ هەر خۆی نەبوو، لەشکرێکی سەربازی لە پاسەوانانی ڕەش بەدەوریەوە بوون، زنجیریان بەدەستەوەبوو، لەمەچەکیان نابوو، بەدووی خۆیاندا ڕایاندەکێشا. ئەنجوومەنی باڵا بڕیارێکی دەرکرد.. دوای ئەو جەنگە عەمرۆ کوڕی جابر کە بۆ سەر ڕێکخستنی جنۆکەکان خەتەرناکبوو، بەو ئاوایەی باوەڕی نە بە ئاینەو نەیش بە پاشاکن هەیە، بەهۆی ئەوەش کە ماوڕێکانی بۆ چێژی کوشتن کوشتووە، بۆ چەندین ساڵ لەزیندان بنرێت، تا دنیای جنۆکان هێور دەبێت و جنۆکەکانیش ئارام دەبن. گشت ئەو

ڕێکخستنانانە بەدەست پاشا (لۆسیفەر)ەوە بوو، حوکمی شاری جنۆکانی بە ئاور و ئاسن دەکرد، برێکی کەمیان نەبێت کە لۆسیفەر لەهەقیان نەدەهات.

لەزیندانێك شیشەکانی ئاسنی سوورەوە کاروەن، چوارمشقی لەسەر زەویەکە دانیشتووە، قژە سەری دەموچاوی داپۆشیوە و ڕیشێکی درێژیشی بەرداوەتەوە، خەراپترین شتێك لەبەردەمیدا ئەوەیە عەمرۆی کوڕی جابر لە ئازادی بکەیت. عەمرۆ دڵی زۆر پربوو، ڕق و تووڕەییەکەی وایلێکردبوو بیر لەوە بکاتەوە چۆن دیواری زیندانەکە بەسەر زیندانیاندا بڕوخێنێت، وەڵێ ئەوڕۆ سەردانیکەرێکی تایبەتی هەبوو، تەنانەت پاسەوانی زیندانییەکە باوەڕی نەدەکرد چاو بەچاو دەیبینێت، پاسەوانەکە بەرامبەری ڕاوەستا، بەڵێ خۆیەتی لەوەی لەداستانەکاندا هاتووە لەوەش توند و تیژ و بەهێزتر دیارە، ئەوە ئەو کەسەیە نیوەی بنیادەمەکانیش لەو سەردەمەدا دەیانپەرست، قوربانیان بۆ سەردەبڕی و کڕنۆشیان بۆ دەبرد، کردبوویانە پاشای خواوەندەکان و خودای ئاسمان، ئەو شەیتانەی توانی دەسەڵاتی بەسەر پاشاکانی ڕۆماندا بسەپێنێت، تەنانەت دەگوترێت زۆربەی یاسا و ڕێساکانی مەملەکەتی ڕۆمانییەکان ئەو دایناوە. ئەو هەنووکە بە بەردەمیدا تێدەپەڕێت، جۆبیتەر خواوەندی ئاسمان.

پاسەوانەکە نەیدەزانی جۆبیتەر خواوەندی ئاسمان چی لەپیاوێکی زەندیق دەوێت، نەشدەبوو بزانێت چی لێ دەوێت.

لەپڕ شیشە سوورەوە کراوەکانی زیندانەکە لەبەرامبەر دەستی جۆبیتەر ونبوو، عەمرۆ هەر وەك خۆی دانیشتبوو، جۆبیتەر بەوپەڕی هەیبەتییەوە بەرامبەر عەمرۆ ڕاوەستا، وەڵێ عەمرۆی کوڕی جابر تەنانەت سەریشی بەرز نەکردەوە، تا بیبینێت، لەپڕ شتێکی تووڕ دایە سەر زەویەکە، قامچییەکەی عەمرۆ بوو، عەمرۆ تەماشای قامچییەکەی کرد، ئەوجا سەری بەرز کردەوە

تا بروانێتە ئەوەی بەرامبەری وێستاوەو بزانێت کێیە، دەموچاوێکی ڕۆمانی بینی، خاوەن جەستەیەکی زل شەیتانی بەمێزبوو، جۆبیتەر لەتەک مەزنی خۆی بەدەنگێکی نەرم گوتی:

– کاتی ئەوە هاتووە خاوەن قامچییەکە ئازادی خۆی بەدەست بێنێت.

لەناکاو عەمرۆی کوڕی جابر قامچییەکەی ڕاکێشاو لەجێی خۆی بەرزەوە بوو، قامچییەکەی لەگەردن جۆبیتەر ئالاند و گوتی:

– تۆش دەبیتە یەکەمین گەڕانەوەم بۆکارە پیرۆزەکەم.

پاسەوانەکان لەجێی خۆیان سڕبوون، درکیان بەوەش نەکرد کە دەبوو بجووڵێن و جۆبیتەری دێو لەقامچییەکەی بپارێزن، لێ جۆبیتەر گۆپاڵەکەی بە زەویەکەدا کێشا، عەمرۆ بەحەواوە برووسکەی بەرکەوت و بەر دیواری زیندانەکە کەوت، بەرەوەبووە سەر زەویەکە و بەحەپەساوییەوە لە جۆبیتەری ڕوانی:

– ئەی هیچ و پووچ بە فەرمانم بکە تا لێرە دەربازت بکەم، یا ئەوەتا لێرە جێتدەهێڵم، ئەوسا بەحەسرەتەوە دەبیت.

عەمرۆ نیگا گاڵتەجاڕەکەی تێبری و گوتی:

– خواوەندی ئاسمان چی لەمن دەوێت؟ ئەی خواوەندی جیهان پاسەوانی تایبەتت دەوێ؟

– ئەوەی من دەمەوێ هاوتەریبە بەقەبارەی هاتنم بۆ ئێرە، تۆش یا ڕەزامەند دەبیت بەوەی هەرچییەك من دەیڵێم، یانەخۆ لێرە جێتدەهێڵم پیش بخۆیتەوە.

چەند خوولەکێکی نەبرد عەمرۆی کوڕی جابر لە زیندانەکە ئازاد بوو، لەتەک جۆبیتەر خواوەندی ئاسمان لە زیندانەکە بەدەرکەوتن. ئەوش هەڵبەتە کارەساتێکی بەدواوەیە.

***

## ئەو خواوەندەی لەهەچ شارستانییەتێکدا دەیبینیت، هەر هەموویان شەیتانن

لەشوێنێکدا هەڵهاتنی شەیتان و خۆمەڵاسدانی جنۆکەی تیا یاساغ کراوە، عەمرۆی کوڕی جابر و جۆبیتەر بەیەکەوەو سووك سووك بەسەر ئاوی دەریاوە دەڕۆیشتن، ئەگەرچی عەمرۆ دنیادیدەبوو، باروودۆخێکی زۆری بینیبوو، وەلێ ئەو شوێنە ڕایچڵەکاند، شوێنەکە لەدەریای (بەرمۆدە)دابوو، لەوێ دوو ڕیز کە ئەوسەری دیارنەبوو، لەجنۆکەی پاسەوان وێستابوون، عەمرۆ و جۆبیتەر بەنێوەندیانا دەڕۆیشتن، شوێنەکە ئەوەی لێتەوە دیارە بە ئاسۆگەی چەپ و ڕاستدا هەر جنۆکەبوون، ئەگەر سەرت بۆ ئاسمان بەرز بکردایەتەوە، دوو شتی وەك ئەستوون لەنێوان زەوی و ئاسماندا قیتەوەببوو، دەرکەوت گەردەلوول نییە، بوونەوەر گەلێکبوون چوون فریشتە بەرز دەبوونەوەو دەهاتنە خوارەوە، وەلێ واشنەبوو، دەرکەوت جنۆکەی گوێقوولاغ بوون، عەمرۆ هەر هەموو ئەوانەی بینی، جۆبیتەریش هەر لەسیلەیدابوو، عەمرۆ ئەو شوێنەی دەزانی و بیستبووی ئەو شوێنە لەناوەندی دەریای (بەرمۆدە) دایە، وەلێ بەرەی نەدەزانی ئەوێ عەرشەکەی بێت کە بەسەر ئاوەوەبوو، ئەوێ شوێنی میری (نوور)ی ڕووناکیی پیرۆزە، شوێنی سێگۆشەی بەرمۆدە پیرۆزگەی لۆسیفەر بوو.

لەپڕ عەمرۆ وێستا، وەك ئەوەی كە بینی نابێت لەتكیدا بڕوات، وا چاكترە بووەستێت و لێی بڕوانێت، چاوی بە گەورەترین و بەرزترین بینای بەسەر ئاوەكەوە بینی، هەرەمێكی فرە بەرز نە مرۆڤ و نەیش جنۆكە بەبەرزی وانەگەیشتوون، وەلێ ئەوەش نەبوو عەمرۆ تەماشای دەكرد، شتێكی بەسەر هەرەمەكەوە بێنیبوو، دڵی خستبووە خووڕپە كردن.

بینای هەرەمەكە تەواو نەكرابوو، چون ئەوەی سەرتۆپەكەی برابێت، بەسەر ئەو هەرەمەشەوە هەرەمێكی بچووكتر ، وەك ئەوەی سەرتۆپی هەرەمە گەورەكەی پێ داپۆشرابێت، هەرەمێكی تر لەپشتییەوە بەڕووناكییەكی مەزنەوە، وەك ئەوەی خۆری بەپشتەوە بێت، وەلێ هیچی لە زەوی و ئاسمانی دەوروبەری خۆی ڕووناك نەدەكردەوە، بەسەر هەرەمە بچووكەكەشەوە چاوێك هەبوو، ڕێتە نەبوو بۆی نەخشێنرابێت، هەلكۆڵراوێكی ئاساییش نەبوو، بەڵكو چاوێكی زیندوو بوو، چاوێكی جوان و برۆی بەسەرەوە، لەكوێشەوە دیقەتد دابا ڕووی تێدەكردیت، لەپڕ چاوەكە كزەوەبوو، عەمرۆ دڵی خووڕپەی كرد، وەلێ دانی بەخۆیدا گرت، جۆبیتەر پێیگوت:

– ئەی خاوەن قامچی دەبینم گزڕایت.

عەمرۆ بەتووڕەییەو ، گوتی:

– چیتان لەمن دەوێت ئەی...

لەپڕ عەمرۆ بەژێر پێیەوە هەستی بەشتێك كرد، بەڵكو شتگەلێك لەقووڵایی دەریاكەدا مەلەیان دەكرد، دواتر بۆ سەر ئاوەكە بەرزەوەبوون، عەمرۆ لەجێی خۆی سڕ بوو، ئەوانە جنۆكەكانی ژێرئاوبوون، جەستەیان شینباو، دەوری عەمرۆ و جۆبیتەریان دا، جۆبیتەر گوتی:

– مەڵێ چیت لێمدەوێت، بڵێ چیتان لێمدەوێت، مێر چاوەڕوانتە.

جنۆکەکانی ژێرئاو بێدەنگبوون، عەمرۆ و جۆبیتەریان دایە بەر بۆ ناو هەڕەمەکە، جۆبیتەر گوتی:

– هەیکەل.. ئێمە بۆ ئەم مەبەستە لێرەین، هەر بۆ ئەمەش تۆم لەزیندانەکە ئازاد کرد.

– کام هەیکەل؟

– هەیکەلەکەی سلێمان

بە بێدەنگی عەمرۆی جێهێشت تا لەبیرکردنەوەدا بێت، دواتر دنیا وەك كلی چاو تاریکبوو.

***

## چاوی شەیتان کینە بەسەر مزگەوتەکانەوە دەکات

عەمرۆ بەوای ئەو تاریکییەی لەپڕ داهات، بەسەرسوڕمانەوە دیقەتی دەدا، دواتر تاریکییەکە ڕەوییەوەو هەموو شتێك بۆ دۆخی خۆی گەڕایەوە، ئەو چاوە زیندووەی سەر هەڕەمەکە نووچقابوو، دنیاش تاریکبوو، دواتر کە چاوەکە کرایەوە دنیاش ڕووناکەوەبوو.. تۆ بڵێی ئەو چاوە دەپرووکا؟ کات لەوە زیاتر بواری بیرکردنەوەی نەدا و گەیشتە سەر هەڕەمەکە. ئەو هەڕەمە بەشێوەیەکی ئەندازیاری زۆر سەیر بنیاتکرابوو. هەڕەمەکە بە هۆڵێکی حەوت دەروازەیی دەستی پێکرد، بڕ بڕ جنۆکە دەچوونە ژوورەوەو دەهاتنە دەرەوە، دیوارەکان بەکەللەی کەسایەتی بەناوبانگی جنۆکەکان نەخشێنرابوون، ئەوانەی لۆسیفەر شکستی پێ هێنابوون، هەندێکیان

لەپاشاکان بوون، هەندێکی تریان لەپیاو چاکان بوون، لۆسیفەر چون کۆنی سەردەمەکان تەمەنی هەیە، سەدەکان کۆتاییان پێ هات ئەو هەر ماوە.
لەبنمیچەکەوە دەرگایەک کرایەوەو جنۆکە زێرناوەکان دەستیان بەرز کردەوەو بەحەوادا هەڵگەڕان، عەمرۆ و جۆبیتەریش بەدوویانەوە، بە پلیکانییەکدا سەرکەوتن، دەرگاگەلێك کرانەوە، سیانزە پایەی پلیکانێ تا دەگەنە دوا پایەکە بەرزەوبوون، کۆمەڵێك جنۆکە لەسەر شێوەی دوو لای سێگۆشەیەکی بێ لای بنکە بەرەو سەری سێگۆشەکە ڕۆیشتن، جنۆکەکان دوور کەوتنەوەو ڕێیان بۆ چۆڵکردن، لەدەرگای مەزن ئاودیو بوون، چوونە ژووری (عەرش)کە و کەڤاڵێکی مەزنی بێ چوارچێوە بەدێژی وپانی لادیوارەکە وێنە کێشرابوو، باس لەمێژووی میری کۆن دەکات، زۆربەی شرۆڤەکە تابلۆی جەنگی بوون، خودی میر لەشکرێك بەڕێوە دەبات، کەڤاڵی سیریالی باس لە لووت بەرزی و هەوادارانی ژنی ڕووت دەکەن، لەهەر هەموو تابلۆکانیش باس لەڕیسوایی مرۆڤ دەکەن. لەوپەڕی هۆڵەکە دەرگایەکی تر کرایەوە، خودی سێبەرەکەی میر دەرکەوت. هەموو شتێك بەو شێوەیە کە دروستکراوە، بۆ سەرسامی سەردانیکەران کراوە. لۆسیفەر چەند هەنگاوێك بەرەو پێش ڕۆیشت، تا ڕووناکییەکە بەر دەمووچاوی کەوت، عەمرۆ هەرگیز ڕوخساری وای نەبینیوە، چاوێکی پێوەیە لەتەك تەماشاکردنی هەست بە دڵەڕاوکێ دەکەیت، جۆبیتەر وەك ڕێزلێنانێك لەسەر چۆك بۆی داچەمییەوە، تەماشای عەمرۆشی کرد تا وەك ئەو بکات، وەلێ عەمرۆ لەجێی خۆی نەجوولا، خۆی بۆ هیچ کەسێك دانەچەماندووەتەوە، لۆسیفەر تەماشای کردەوەو چەند هەنگاوێك لێی نزیکبووەوەو پێیگوت:

– گەورەم.. وەك چۆن فەرمانت پێکردم، ئامادەم کرد.

لۆسیفەر لە عەمرۆ نزیکبووەوەو تەماشای چاوی کرد، بەدەر لەوەی دڵی عەمرۆ ترس مانای تێدا نەبوو، وەڵێ هەستی بەدڵەڕاوکێ کرد، لۆسیفەر بیری عەمرۆی خوێندەوەو گوتی:

– ئێستا زانیت بۆچی بۆ ئێرەم هێناویت ئەی کوڕی تواسا دی دانان؟

عەمرۆ ئەمجارە بەراستی ترس ئامبازی بوو، ئەوە ناوی هۆزەکەیەتی لەجنۆکان بەو ئاوایەی کە لەو هۆزە بێت، هێزێکی پاشایەتی ئێرلەندییە، لێیان دابڕاو سەرەڕۆ بەزوویدا دیوانە بووە، چەندین سەدە خۆی شاردەوە، مەحاڵبوو کەسێك شوێنەکەی پێ بزانێت، تەنانەت لە (سەبەو) ژیاو ناوێکی عارەبی لەخۆی نا. ئەم بوونەوەرە هەموو شتێك دەزانێت، لەڕوخساریدا دیارە دەزانێت بنیادەم بیر لەچی دەکاتەوە، عەمرۆ دانی بەخۆیدا گرت و گوتی:

– پێیانگوتم.. دەمزانی بۆ ئێرە دێم!

لۆسیفەر نیگای بۆ لای جۆبیتەر گواستەوەو پێیگوت:

– ئەی خواوەندی ئاسمان هەستە ئەم هاوڵەمان حاڵی بکە.

جۆبیتەر بە هەیبەتی ڕۆمانییەکەیەوە بەرامبەر لۆسیفەر دابەزی و گوتی:

– کوڕەکەی جابر دەزانیت سێیەکی بنیادەمەکانی ئەم سەرزەمینە سەلاواتی شوکرانەم بۆ دەکەن، لەجەژنەکانیشدا قوربانیم بۆ دەکەن و درووشمەکانم لەجەنگەکاندا بەرز دەکەنەوە، عەقڵی ئیمپراتۆرەکانم حستووەتە گومڕاییەوە، کە زەوی شارستانی مەزنی وەك ئەوانی نەبینیوە.

عەمرۆ نیگای بێ بایەخی دەرخست و جۆبیتەر درێژەی بەقسەکانیدا:

- هەموو جیهان بەهەموو کیشوەرەکانییەوە ئێمەی جنۆکە دەپەرستن و بەخواوەند ناوزەدمان دەکەن، پەرستگاو پەیکەرمان بۆ درووست دەکەن، وەلێ دوو کۆمەڵە لەم جیهانەدا هەن خودای تاك و تەنها دەپەرستن، خودای ئەرز و ئاسمان، ئەوانیش جوولەکەو مەسیحییەکانن.

عەمرۆ قسەکانی بەهەند وەرگرت و لەجۆبیتەری ڕوانی و گوتی:

- هەرچەندە خودایەکی تاك و تەنها دەپەرستن، وەلێ لەنێو خۆیاندا وەك شەو و ڕۆژ ڕایان جیاوازە، پیرۆزترین شوێن لایان شوێنێکە لە باکووری بیابانی عەرەبدا و بەخاکی پیرۆز ناوزەدی دەکەن، ڕێك لەکێویەکە پێیدەڵێن کێوی پەرستگا، ئەویش بەوای ئەو پەرستگایەی سلێمان درووستی کرد، ناوی (هەیکەل)ی لێنا، مەبەستیش لێی مەزنکردنی خودای ئاسمانەکانبوو، قوربانیشیان پێشکەش دەکرد، وەك دەزانیت ئەو هەیکەلە یانی پەرستگاکە لەسەدەکانی پێشوو خاپوور کرا، دواتر نۆژەن کرایەوە، ئەوجا جارێکیتر وێران بووەوە، ئێدی ئومێدی بنیاتنانەوەی نەما.

ئا لێرەدا لۆسیفەر خۆی تیا هەڵقورتاندو بە دەنگی فیشکەی مارێکی پیر گوتی:

- کاتی ئەوە هاتووە ئەو پەرستگایە بنیاتبکرێتەوە، وەلێ بۆ خودا پەرستنی نا.

عەمرۆ پرسیارێکی قووتکردەوەو گوتی:

- باشە بۆ پەرستنی کێ؟

جۆبیتەر ئاوڕی لێ دایەوەو گوتی:

- بۆ پەرستنی من، خواوەندی ئاسمان.

عەمرۆ چاوەکانی ئەبلەقبوون و لۆسیفەر هەڵیداو گوتی:

- ئەو خاکە پیرۆزە ئەمرۆ سەر بە ئیمپراتۆری ڕۆم و جوولەکەیە، کەتێیدا زۆر لاوازن، (جۆبیتەر)یش سەرۆکی خواوەندی مەزنی ڕۆمە، وامانلێیان کردووە بۆ جۆبیتەر گەورەترین پەرستگا لەسەر زەوی و لەپیرۆزترین شوێن دروست بکرێت، شوێنێك خودای تاك و تەنهای ئاسمانەکانی تیا دەپەرسترا، ئەویش پەرستگای سلێمانە.. ئەی جۆبیتەر بۆ لای (هادریان) ئیمپراتۆری ڕۆم دەڕۆیت و بۆخۆتیش شێوازی مامەڵەکردنت لەتەکیدا چاك دەزانیت، ئەو نووکە لەگەشتێکی شام و میسردایە، بانگەشەی نۆژەنکردنەوەی (هەیکەل)ی پیرۆز بەسەر کێوی پەرستگاوەت بۆ دەکات، چۆنیشتان بوێت وای بنیات دەنێین، ئەگەر جوولەکە بیناکەیان تەواو کرد، بانگەشەی ئەوەت بۆ دەکەن هەیکەلی جوولەکە بە پەرستگای جۆبیتەر بکرێت، ئەوە ڕیسوایان دەکات، تا هەتایە لەهێز و توانیاندا نامێنێت.

عەمرۆ هەستی بەخەتەرناکی کرد، وەلێ قسەی خۆی هەر کرد و گوتی:

- با پەرستگا بۆ کوللە بکەن، بەمن چی؟

جۆبیتەر گوتی:

- هۆزێك لەجنۆکە لەوێ هەن کێوی پەرستگاکە دەپارێزن، لەسەردەمی (سلێمان)ەوە قەیاسەی هەزار ساڵ دەبێت لەوێ

نیشتەجێن، زیاتر پەیامەکەی سلێمان دەپارێزن، خودای سلێمان دەپەرستن، بە فریشتەی کێوی پەرستگا ناسراون.

عەمرۆ بەدەم بیرکردنەوەوە ئەو ناوەی هاتەوە بیر، جۆبیتەر درێژەی بەقسەکەی دا و گوتی:

– ئەو فریشتانە مێژوویەکی ترسناکیان بەسەر بنیادەمەوە هەیە، هەر کەسێك بیەوێت لەو شوێنە شتێك بنیات بنێت، تەنانەت ئەگەر بینایەکی ئاسایشیش بێت لێی قبووڵ ناکەن، ئەگەر خودی جوولەکەش بیانەوێت بۆ جاری سێیەم پەرستگاکە بنیات بنێنەوە، ڕێیان وێنادەن، بۆیە پێویستە بەر لەوەی کار بۆ ئەوە بکەین، ئەوانە لەناوبەرین، ئێمە چاك دەزانین تۆ لەجەنگی قڕ کردن کێیت، ئەوەی لەجەنگی شێتیدا گێڕات ، دەنگۆیەکی زۆر گەورەی هەبوو.

لۆسیفەر گوتی:

– هەڕەشەی قڕکردنیان لێبکە، ئەگەر بەدەنگەوە نەهاتن، لەسەر گۆی زەوی کوێریان بکەرەوە، نامەوێت هەناسەیەکیان بمێنێت.

عەمرۆ بە بێدەنگی چاوی لێیان هەڵبڕی، بەڵێ حەزی بەجەنگی قڕکردن هەبوو، ئەگەرچی تەواو دڵنیا نەبوو، بیرۆکەکەی بەدڵ بێت، بۆیە بەلۆسیفەری گوت:

– جۆبیتەر ئەوا فەرمان لەمنەوە دەست پێبکە، ئەگەر هەموو ڕێگاکان تاریك و ڕەشبینی کردیت، ئەوا پەیکێك لەبنیادەم لە لایەن منەوە دێتە لات، بێ سێ و دوو دوای کەوەو لێی جیا مەبەرەوە.

لۆسیفەر ئاوڕی دایەوە، ڕووی لێیان کرد وەك ئەوەی ئەوە دوایین وتـوو ویژەکەیان بێت.

***

## شەیتان بەدووی پەیکی شەیتانەوە

پـاڵی لێ دابـووەوەو هەسـتی لەمـەزنی خـۆی ڕاگرتبـوو، ڕووناکی و ئاواز و سەمای ڕۆمـانی بەدەوریـەوەبوو، (هادریـان) ئیمپراتـۆری ڕۆمـا دانیشـتووەو بەوای ئەوەی نیوەی گۆی زەوی بەدەسـتەوەیە پەزامەنـدی لەچاوەکانیـەوە دیـاربوو، تەماشـای لـەش و لاری ژن و پیـاوە سـەماکەرەکان دەکـات، دڵـی چووەتە لەش و لاری یەکێکیانەوە، لەش و لاری پیاوێك یا نیمچە پیاوێکە و جەستەیەکی نەرم و نۆڵی هەیە، ڕێك لەجەستەی ئافرەت دەچێت، پرچـی درێژ و جلوبەرگێکی لەبەردایە بۆ پیاو ناشێت، لەنێو سـەماکەرەکان و بـەبان سەکۆکەوە سەما دەکات و لەهەموانیشەوە دیارە، هادریان.. بە پەرۆشەوە دیقەتی دەدا، دیقەتدانەکەی هەوەس یا خۆشەویستی نەبوو، زۆریـش لـەوە گەورەتر بوو، دەیپەرست، وەك سێبەرەکەی خۆی کردبوویە هـاوڵی خـۆی و لەبەر پێی کڕنۆشی بۆ دەبرد، پێی ماچ دەکرد، هەر کە دەیهێنایە ژێر خـۆی، وەك ژن و مێرد بەیانیەوە دەبوو، ئەو گەنجـە جـۆری ژنانـە نـەبوو، ناویشـی (ئەنتینۆس) بوو، هادریـان وای بلاوکردبـووەوە، کـە (ئۆزیریس)ی خواوەنـد بەڕوح بۆ جەستەی ئەو گەنجە ڕۆ چـووە. هادریـان.. ئیمپراتـۆرێکی ئاسـایی نـەبوو، تـەنها کڕنۆشـی بـۆ ئـەنتینۆس نـەدەبرد، بـۆ ئـەوەی نادیارەکـانیش کڕنۆشـی دەبـرد، قسـەی لەتـەکیانا دەکـرد و ئـەوانیش قسـەیان لەتەکیـدا دەکرد، شەیتانەکان گەورەترینیان کە (جۆپیتـەر) مـەزنی ئاسمـان بـوو، لای سەریەوە دادەنیشت.

ئەنتینۆس وەك سۆزانییەك سەمای دەكرد، چاوەكانی شەیدای بینینی بوون، بە ئامادەگی جۆبیتەری نەزانی، عەمرۆی كوڕی جابر لەو هەموو پەوشتە قێزەونانەی بنیادەمی دەڕوانی، ئەوجا هادریان دەنگی لێ بەرز كردەوەو گوتی:

– هەرای تەپڵ و ئاواز تا ئەوپەڕی بەرز بكەنەوە، شەرابم بۆ بێنن.

سەماكەرەكان لەسەماكردندا بوون، مۆزیك ژەنەكان لە ئاواز ژەنین بەگوڕتردەبوون، هادریان.. سەرقاڵی شەراب نۆش كردن بوو، كەللەی مەستببوو، عەقڵی بەسەرەوە نەمابوو، هەستی بەدەوروبەری خۆی نەكرد، تەنانەت ئاگای لەخۆیشی نەمابوو، جۆبیتەر هێدی هێدی لێی نزیك بووەوە، لەو ساتەدا جۆبیتەر هزری بیركردنەوەو خەیاڵەكانی (هادریان)ی خوێندەوە، بوونەوەرێكی مەزنی بەدیكرد، دەستبەجێ ناسییەوە، پەیكەرەكانی جۆبیتەر خواوەندی ئاسمان و برووسكە هەموو شاری ڕۆمانی تەنیبوو، هادریان.. لەسەر كورسییەكەی وەك مشك گرمۆڵە ببوو، جۆبیتەر بێ ئەوەی كەس بیبینێت لە هادریان نزیكبووەوە، تا چاوی بەچاوی هادریان كەوت.

جۆبیتەر.. شەیتانی لە ژینگەیەكی جیاواز لەژینگەی دەوروبەری خۆی دەبینی، قسەی لەتەكا دەكرد و فەرمانی وێدا ڕێ بەجوولەكە بدرێت پەرستگا درووست بكەن، لەناكاو پشێوی شوێنەكەی تەنی، هەراوهوریا بەرزەوە بوو، هادریان بەئاگا هاتەوە، (ئەنتینۆس)ی عەشقەكەی وەك شێتی لێ هاتبوو، پاڵی بەسەماكەرەكانەوە دەناو دەیخستن، خۆی بەزەویدا دەكێشا، وەك ئەوە وابوو جنۆكە دەستی لێ وەشاندبێت، جۆبیتەر لای لە پشتی خۆی كردەوە، ئەنتینۆسی بینی وەك شێت ڕفتاری دەكرد، عەمرۆ بەسەر سەریەوە وەستابوو، دەستی جنۆكە ئاسای لێ دەوەشاند، وەك مەیموون یاری پێدەكرد، چاوەكانی جۆبیتەر تووڕەییان پێوە دیاربوو، لەپڕ

یاخەی عەمرۆی گرت، بەدەستێکی پۆلایین شەقازللەیەکی لێدا، عەمرۆ شێتانە پێدەکەنی، جۆبیتەر پێیگوت:

– تۆ چە کەللە ڕەقێکیت، هەی هیچ و پووچ.

عەمرۆ بەچاوە بریقەدارەکانیەوە گوتی:

– هەتێوێکی قێزەونە، دەبوو کەسێك لەو بەدڕەفتارییەی وەئاگای بێنێتەوە، یا واز لەخواوەندی بێنێت، وەك ژن بەسەریا دەکەون.

جۆبیتەر ڕوانییە ئیمپراتۆر هادریان کە خۆی دابووە پاڵ داروەستەکەی و زۆر بەزەحمەتیش بەرەو ژووری نووستنەکەی دەڕۆیشت، عەمرۆ گوتی:

– قسەت بۆ ئەم گەمژەیە بوو؟

– بەڵێ.. ئەگەر بەر لەوەی لەو ببمەوە داتبڕیمایە دەمقلیقاندیتەوە.

– ئەی خواوەندی هەور نووکە بەرەو کوێ؟

– بۆ لای فریشتەکانی کێوی پەرستگا.

***

## هەست بە هەوەسی کوشتن ناکەیت تا سێیەمینیش نەکوژیت

شارێکی ڕێکوپێك بە ئەندازیارییەکی مەزنی وا چون ئەوەی لەشاران هاوتای نەبێت، مۆریا.. فریشتەکانی کێوی پەرستگا بە جلوبەرگی بەهادارەوە دێن و دەچن، وەك ئەوەی گەوهەر بن، وەلێ پێدەچێت ڕێکوپێکیان ئەمڕۆ شێوا بێت، لەچوونە ژوورەوەی دوو شەیتان بۆ ناو شارەکە بێ ئاگابوون، ئەوانیش جۆبیتەر و عەمرۆی کوڕی جابر بوون، هەر هەموویان جۆبیتەریان دەناسی،

بەتیلەی چاو دیقەتیان دەدا، بوونی کەسایەتییەکی وا لە خراپەکاری بەولاوە هیچی بەدواوە نییە، ئەو سووریاوەش بەدوو چاوی فێڵاوییەوە لەو خەتەرناکتر دیارە، عەمرۆی کوڕی جابر بەدەم سەح کردنەوەی قامچییەکەی دەستییەوە بەجۆبیتەری گوت:

- پێت چۆنە ئەم کەللە سەرانە ڕاستەوخۆ بڕینەوە.
- ئەوە چ گەمژایەتییەکە باز بەسەر قسەی میردا دەدەیت، ئەوە مانای چەندین ساڵیتری زیندانییە.

عەمرۆ بەدەم ڕوانینی بۆ ڕوخساری خەڵکەکە گوتی:

- میری تۆ و میری هی وەك تۆ، پێمبڵێ کێ ئەو قەومەی لەخۆ گرتووە؟

جۆبیتەر زۆر دووری نەڕوانی و گوتی:

- لەوێ، لەکورە شەشپاڵووەکە.

عەمرۆ بینایەکی ڕەشی بینی، بەسەوزایی داپۆشرابوو، بیناکە لەسەر شێوەی شەش لادا درووست کرابوو، بنمیچەکەشی ئەستێرەیەکی شەش لا بوو، هەموو لادیوارەکانیشی بەشێوەیەکی ئەندازەیی ئاڵۆز و ئەستێرە گەلێکی شەش لادابوو، جۆبیتەر گوتی:

- تۆ نازانیت بۆچی پەنامان بۆت ڕۆ بردووە، ئەو قەومە شتگەلێکیان درووست کردووە، نە بنیادەم و نەیش جنۆکە سەری لێ دەرناکەن، بەوای ئەوەی هەستیان بە هێرش کردن بۆ سەر شارەکەیان کردووە، تەنانەت لە ئاسمانیشەوە دیوارێکی وزە لەهەموو لایەکی قوولەکانەوە دەور دراوە، ئەوەی بچێتە ناوی دەسووتێت، نازانین

ئەو پێشکەوتنە دامێنانی خۆیانە، یا لە زانستی (سلێمان)ەوە وەریانگرتووە.

عەمرۆ لەو بینایەی دەڕوانی و لێی نزیکبووەوەو گوتی:

- ئەوەی سلێمان چییە؟

جۆبیتەر بڵمە بڵمێکی لێوە هات لە تووڕەیی دەچوو، دواتر گوتی:

- ئەی تۆ هیچ ناخوێنیتەوە؟
- بۆچی لەبارەی بنیادەمی هیچ و پووچ بخوێنمەوە.
- کەمژە سلێمان پاشای بنیادەم و جنۆکەکان بوو، شەیتانەکانی بەزنجیری سوورەوە کراو دەیەستەوە، کە کرانەوەی بۆ نەبوو، تا هەزار ساڵ دوای مردنی خۆیشی، تەنانەت هەندێکیان نووکەش لەکۆت و زنجیردان.

عەمرۆ بەڕاستی سەیری لێهات، ئەوە بنیادەمە وا لەشەیتان دەکات؟ بیری خۆی لەبابەتەکە تەکاند، ماتەماشای مەزنی بیناکە و تیشکە سەوزباوەکەی کە لەشێوەی ئەستێرەدایە بکات، پەنجەرەیەك لەبیناکە کرایەوە، عەمرۆ ڕاچڵەکی، خۆ ئەگەر گەردی (با) کۆبووەوەو هەموو ڕەنگەکان ڕوحیان وەبەر کرابا، مەحاڵبوو وێنەیەکی وا جوان بنەخشێنن، دووچاو بەڕووناکییەکی شینەوەوە دەرکەوت، بەدەوریانەوە زریزەی ئاوریشمی ڕەش بەسەر نیوچەوانێکی سپیدا شۆڕ بووەتەوە، دواتر گەردنی مانگ و بەو پۆشاکەی چون باڵی پەپوولە دەرکەوت، کچێکی تا بڵێی نەشمیل و شۆخ و شەنگ بوو، بەدڵەڕاوکێوە لە پەنجەرەکەوی دەڕوانی، ئەوە عەمرۆ نییە ئافرەت عەقڵی ببات، عەمرۆ دڵی بەردەو ناجمێت، وەلێ بەرامبەر بەو شۆخ و

شەنگە چی بلێت. ڕوحی موچیار بووەوە، ئەوجا دوور ڕوانی، جۆبیتەر پێیگوت:

- ئەوە (ئینۆر)ە کچی پاشا (ئاموون)ی مۆریا.

عەمرۆ جارێکیتر دیقەتی دایەوە.. ئەگەر ئەوە میر خاتوون نەبێت کێ میرخاتوونە؟ هەرچی ئینۆر بوو لەنزیکبوونەوەی شەیتانە ئازاکانی بەرگوێ کەوتبوو، کە پەنجەرەکەشی کردەوە تا بیانبینێت، کاتێ چاوی بەعەمرۆ کەوت، نەیناسییەوە، وەلێ لەبەرامبەریدا هەستی بەشتێکی سەیر کرد. جۆبیتەر پێیگوت:

- وریابە.. ڕۆژێك لەڕۆژان سەربازی میر لۆسیفەر بووە، دواتر بۆ هەمووان دەرکەوت سیخوڕ بووە.

خاتوو میر کە گوێی لەو قسەیە بوو، عەمرۆ لەدڵیدا گەورەتر بوو. لەپڕ دەرگای (کان)ەکە کرایەوە، هەردوو شەیتانەکە چوونە ژوورەوە، بەر لەوەی بڕواننە بەهای شوێنەکە ئاموون پاشایان لەمۆڵەکە بینی وێساوە و سەربازەکانیش بەدەوریەوە وێستاون، پاشا گوتی:

- ئەوەی بۆی هاتوون ئەگەر خێرە سەرچاومان، ئەگەریش خێر نییە، بەر لەوەی هیچ قسەیەك بکەن، بچنە دەرەوە.

جۆبیتر گوتی:

- لای میری ڕووناکییەوە (لۆسیفەر)ەوە هاتووین، پێیڕاگەیاندووین کە پێتڕابگەیێنین جوولەکە بەنیازن لەسەر کێوی مۆریا هەیکەلی سێیەم بنیات بنێننەوە، ئەگەر هەچ هەڕەشەیەك یا دژایەتییەکیان بکەن، ئەوا لەسەر زەوی قڕتان دەکات.

ئا لێرەوە میرخاتوون خاوەن دوو چاوی شین و ڕوخساری شۆخ و شەنگیەوە بەسەر پەیژەیەکی درێژەوە دەرکەوت، بەجۆبیتەری گوت:

– جۆبیتەر.. ئا ئەمەیە بەکرێگیراوە تازەکەتان، هاتوون پێی بمانتۆقێنن؟

عەمرۆ لەناخیەوە هەڵچوو، دەستی بەقامچییەکەیدا هێنا، وەك ئەوەی بیەوێ بەقامچی وەڵامی بداتەوە، وەلێ ئەوەی نەکرد، حەزی نەکرد دڵی ئەو شۆخ و شەنگە بڕەنجێنێت، وەلێ تەماشای چاوەکانی کرد و گوتی:

– بەڵێ.. ئەوە منم.

***

## جوولەکەکان پێغەمبەرەکانیان کوشت، مەسیحیشیان ڕەتکردەوە، پێش شەیتانەکان کەوتن

هادریان.. ئیمپراتۆری شانشینی ڕۆمانی لە ئۆرشەلیم ئامادەبوو، بەسەر کێوی پەرستگاوە وێستاوە و داروەدەستەکەی بە (ئەنتینۆس)یشەوە گوێ لەفەرمانەکانی بگرن، لەسیلەیدا گەورەترین خاخامی جوولەکە وەستابوو، ئامادەگی ئیمپراتۆری ڕۆما لەهەر دەڤەرێکی مەملەکەتەکەی لەلای خەڵکی ئەو دەڤەرەی تیا ئامادە دەبوون ڕۆژێکی شکۆمەندانە بوو، ئەو سەردانەی پاشا بۆ جوولەکەکان ڕۆژێکی بەختەوەری بوو، ئەمە وێڕای ئەو مامەڵە توندەی لەچەند ساڵی ڕابردوودا لەتەکیاندا کردی، ئەمڕۆ خودی ئیمپراتۆر خاوەن نیوەی گۆی زەوی داوایان لێدەکات پەرستگاکە بنیات بنێنەوەو تا

شاری (ئۆرشەلیم)یش ببووژێتەوە، خەونی ئەوەندە سەدەیان بەدی بێنێتەوە.

چاوانی جنۆکە شەیتانەکان سۆسەی دیمەنەکەیان دەکرد، وەختەبوو دان بەخۆیاندا نەگرن، نەتوانن چەند ساتێکی تر بێدەنگ بن، (ئاموون)ی پاشایان بڕیاریدا تا کۆتایی دان بەخۆیدا بگرێت، هیچ هەڕەشەو گوڕەشەیەکی شەیتانەکانی پێ قبووڵ نەبوو، فەرمانی ویدان هەر کرێکارێک پاچی لەزەوی دا ژیانی بەدۆزەخ بکەن، وەلێ پێدەچوو ئەمجارە بابەتەکە زۆر لەوە گەورەتر بێت، خودی ئیمپراتۆر بۆ ئەو بابەتە ئامادەبووە، ئەوە کاری ئەوانە پەیماننامەی سلێمان بپارێزن، تا پێغەمبەری ئاخر زەمان دەردەکەوێت، ئینۆر.. لەناوەندیاندا بوو، گوێی لەهەموو ئەو قسانە بوو کە لەبارەی کێوەکەوە کرا.

جوولەکەکان ئیمپراتۆر و داروودەستەکەی بۆ شوێنی پەرستگاکەی سلێمان بەسەر کێوەکەوە بردیان، کاتژمێرێکی نەبرد دارەودەستەکەی (هادریان) فەرمانیان پێدرا شوێنی پەرستگاکە ڕێکبخەنەوە تا بنیات بنرێتەوە، گرفتەکە لای (ئەنتینۆس) بوو، هەر هەموو چاویان لێبوو دوور دەکەوتەوەو شوێنی پەرستگاکەی سەح دەکردەوە، بەلەنجەو لار ڕفتاری ئافرەتانەی دەگێڕا، ئەوجا شتێکی زۆر سەیرتری کرد، دەستی بەسەما کردن کرد، جوولەکەکان بە حەپەساوییەوە لێیان دەڕوانی. ئەو هیچ و پووچە لەسەر خاکی پەرستگای پیرۆز ئەوە چییە دەیکات؟ کەی ڕەوایە لە پەرستگا قوون بادان، هیچی تریان نەگوت، چونکە بەلای (هادریان)ەوە ئەو قێزەونە پیرۆزە، ناچار دەنگیان لەخۆیان بڕی، ئەنتینۆس.. ئیرەیی بەخۆی دەبرد، بەوای ئەوەی هادریان سەرقاڵی ئەو نەبوو، ویستی سەرنجی ڕابکێشێت،

ئیمریاتۆر دەستی ئەنتینۆسی گرت و بەدەم قسەکردنی بۆ خەڵکەکە چێژی لەدەستی ئەنتینۆس وەردەگرت، بەو شێوەیە ئەنتینۆس ئارام بووەوە.

کرێکارەکان شوێنی پەرستگاکەی (سلێمان)یان بۆ بنیاتنانەوەی ئامادە کرد، شەیتان دەستی لەو بیناکردنەدا هەبوو، بۆیە بەلای منەوە پەرستگاکە پەرستگای شەیتان بوو، کەس بەو کارە دڵخۆش نەبوو. لەپڕ گوێیان لەدەنگە دەنگێکبوو، چون ئەوەی لەناو زەوییەوە بێت، یا لەدیوارەکانەوە بووبێت، سێبەرێکی درێژیان بینی، کە ئاوڕیان لەدوای خۆیانەوە دا، هیچیان نەبینی، دەست بەکارکردن کرا.

لەسەر ئەم کێوی پیرۆزە بەرد نانرێتە سەر بەرد، مەگەر بەسەر لاشەکانیانەوە نەبێت.

***

# ئاباوی ڕەگەز جیناتەکان تووش ناکات

بەژێرتارای شەوەوەو بەسەر (نیل)ی مەزنەوە بەلەمە سوور و ڕازێنراوەکان بە پەرچەمی (ڕۆم)ەوە دەڕۆیشتن، سەربازەکان بە کڵاوی ڕۆمانی ئاسنەوەو بە ڕمەکانیانەوە لە ئامادەباشیدا بوون، لەناوەندی بەلەمەکان بەلەمی (هادریان)ی پاشای هەموو ڕۆم بە خۆی و داودەستەکەیەوە بڕیاری دابوو ئەوڕۆ گەشتێکی سەیران ئاسا بەسەر ئاوی (نیل)ەوە بکات، هەندێك لەگەورەپیاوانی جوولەکە بە جلوبەرگی ڕەشەوە لێل پاشا دەمەتەقێیان بوو، لەسەرگەی بەلەمەکە ئەنتینۆس لەهیچ شتێك ناڕوانێت و وێستاوە، بەو شەوە هیچ دیار نەبوو، تەنها کاردانەوەی تیشکی مانگەشەوەکە بەسەر ئاوی

(نیل)ەوە نەبێت، لێ ئەنتینۆس لەنێو دارەکانەوە تێبینی شتێکی کرد، نەیزانی چییە.

لەنێو دارە چڕەکاندا، فریشتەکانی کێوی پەرستگا لەبەلەمەکانیان دەڕوانی، (ئینۆر)یشیان لەتەکدا بوو، وەلێ جلوبەرگی خاتوو میریی لەبەردا نەبوو، بەڵکو جلوبەرگێکی سەربازی لەبەردابوو، کارەکانی لەتەک سەربازەکانی لۆسیفەر بیر هاتەوە، کە بەو جلوبەرگە شێوە سەربازییەی هەبوو، ئەو بیرەوەرییەی لەهزری خۆی تەکاند، ما لە نزیکبوونەوەی بەلەمەکەی هادریان بڕوانێت، ئینۆر گوتی:

– ئەو هەتیوە ژنانییە (ئەنتینۆس) ڕێگا چارەمانە بۆ سەرکەوتن و ڕاگرتنی بیناکردنی پەرستگاکە، ئەگەر توانیمان بەجوانی بەکاری بهێنین.

یەکێکیان هەڵیداو گوتی:

– دەزانیت ئەو ڕوح سووکی بێ عەقڵە لەناو دەستی جنۆکەدا وەك حەلوا وایە.

پیلانەکە چۆنێتی دەستبەسەرا گرتنی عەقڵی ئەنتینۆس بوو، تا بەکارێکی گەمژانە هەستێت، قۆرخکردنی عەقڵی جوولەکە تا دژ بەو لەبەرامبەر هادریان قسە بکەن، ئەوەش ئاسان بوو، چونکە هەر لەیەکەم چارپێکەوتنیاندا قێزیان لێ بووەوە، تاوانەکە بخەنە سەر ئەو تا (هادریان) لەمان تووڕە نەبێت، گەمەکردنەکەیش بەوای تواناکانەوە بێت تا بەسەر ئەودا بشکێتەوە، کاتێ ئەنتینۆس بەو گەمەی کەیفخۆش بوو، گەمەکە دەستی پێکرد.

ئـەنتینۆس كـاتێ چـاوی بـە بریقەیـەی نێـو دارسـتانەكە كـەوت، بـۆی ڕاستەوەبوو، پاشـەو پـاش گەڕایـەوە، ئـەودەم چـاوی بەسـێبەرێكی درێـژ كەوت، بەسەر دارەكانی دارستاندا دەكشا، چـون ئـەوەی سـێبەری شـەیتان بێـت، ئـەنتینۆس ترپـەی لێدانی دڵـی زیـادی كـرد، نێوچـەوانی عـارەقی دەردەدا، وەك ئەوەی گوێی لەدەنگێك بووبێت قسـەی خۆمـان بێـت تـرس ئامیازی ببوو، لەوبەریشەوە جوولەكەكان سۆسەیان دەكرد، ئـەوجا ئـەوەی لەخەیاڵدا نەبوو ڕوویدا، لەپڕ ئەنتینۆس لـەرز دایگرت، پێـی هەڵكـەوت و لـە بەلەمەكە بۆ ناو ئاوەكە بەرەوە بوو، ئەوە شتێكی باش نـەبوو، بەوئاوایـەی گوێان لەدەنگی بوو، وەك ئەوەی كەللەی ئەنتینۆس بەر تەختـەی بەلەمەكـە كەوتبێت و ئەو دەنگەی دەركردبێت .

هادریـــان.. تووشـــی شـــۆك بـــوو، لەكۆســـتە ناوادەیـــەدا بەفرمێســـكەوە خۆشەویسـتەكەی و خواوەندەكـەی بەسـەر دەكـردەوە، لـەناو بەلەمەكـەدا تەماشای لاشەی (ئنتینۆس)ی دەكرد، خوێنی لەبـەر دەڕۆیشـت، هادریـانی مەزن بەدەستە لەرزۆكەكانییەوە خۆی بـە بەلەمەكـەوە گرتبـوو، نەیـدەزانی چی بڵێت، ئینۆر تەماشای ئەو دیمەنەی دەكرد، ئەویش لەو بـاوەڕەدا نـەبوو ئەوە ڕوویدات، بلەز هاواری لە هاوڵەكانی كرد:

- هەر ئێستا.

جوولەكـەكان وەك ئـەوەی گەلەكۆمـەیان لێكردبێــت، بەســەر ســەریەوە وێستابوون. چەند ئاسانە دەستڕۆیشـتنی شـەیتان بەسـەر كەسـێكی تـووڕە بـوو. چـاوانی ئیمپراتـۆر سـەرتا تووڕەییـەكی زۆری پێـوە دیـاربوو، دواتـر سـیمای دڵڕەقـی بەڕوخسـاریەوە دەركـەوت و لای لەجوولەكـەكان كـردەوەو گرتی:

- ئێوە کوشتتان!

جوولەکەکان بێ تاوانی خۆیان بۆ دەرخست، وەلێ هادریان لەتەکیاندا لەدەمەقاڵێ نەکەوت، بەڵکو شەیتان هەڵوێستەکەی زیاتر دوودڵی کردبوو، تا یەک لەجوولەکەکان زمانی خۆی بۆ نەگیرا و گوتی:

- تۆیەک ئیمپراتۆر و نیوەی گۆی زەویت بەدەستەوەیە، چیت لەهەتێوێکی هیچ و پووچ داوە؟ بۆ پێگەت جوان نییە، ئەوەتا ئەو بۆ دۆزەخ ملی شکاند.

ئەوە ئەو پووشە بوو کە ژیانی ئەو جوولەکانەی لێل هادریان لەناو بەلەمەکەدا بوون لەناوی بردن، هەر ئەو پووشەبوو بیوو بە بەلا بەسەر جوولەکەوە لە ئیمپراتۆری هەموو رۆمانییەکان و هەر ئەویشبوو تا هەتایە خەونی بنیاتنانەوەی پەرستگای جوولەکەی لەناو برد.

دوای ئەوەی هادریان لەکوشتنی جوولەکەکان بووەوە و فڕێیدانە ( نیل) ەوە، بڕیاریدا ئەو پەرستگایە بەردی بەسەر بەردەوە نەکرێت.

***

# پەیکێکی من بەبنیادەم دێت، دووی کەوەو لێی لا نەدەیت

هادریان.. بەوای ئەنتینۆسەوە زۆربەی کات بەسەر عەرشەکەیەوە بوو، تەنانەت ژنەکەی (هادریان)یش بەو دۆخە ڕاهاتبوو. بەڕاستی دڵ و دەروونی نەخۆش بوو، وڵاتیش بەدەست هی واوە بێت وێران دەبێت. ئەو رۆژە بەسەر کورسییەکەیەوە دانیشتبوو، تەماشای گۆڕەپانی کۆشکەکەی دەکرد، ڕوحی بەتاڵی بەولاوە هیچی تری تێدا نەمابوو، دواتر چاوی بەکەسێک کەوت بە

ڕێڕەوی گۆڕەپانەکەوە دەهات، ئەودەم تەنها خۆی دەبینی، پاسەوانەکان ئەملاو ئەولایان دەکرد و تەماشای بەرپێی خۆیان دەکرد، پیاوەکە کەوایەکی درێژی لەبەردابوو، هێدی هێدی دەڕۆیشت و تەماشای دەکرد، هاردیان دڵی کەوتە ختوورەوەو نەیزانی چی بکات.

هەر ئەوەندەی چاوپرووکاندنێك پیاوەکە لەناوەندی گۆڕەپانەکە وەستا، چوون ئەوەی دەیان هەنگاوی لەچرکەیەکدا بڕیبێت، هادریان لەسەر کورسییەکەی پاشەکشەی کرد، پاسەوانەکان کەسێکیان بینی وەك سێبەر لەگۆڕەپانەکە و کەوایەکی لەبەردایەو لەپڕ ونبوو، دواتر لەشوێنێکی ترەوە دەرکەوت، پاسەوانەکان چاوەڕوانی فەرمانی هادریان بوون، تا دووان لەپاسەوانەکان بە ڕمەکانیانەوە بەسەر سنگییەوە بەرپەرچیان دایەوە، پیاوەکە کەسێکی درێژو پان و پۆڕ بوو، چاوێکی لەدەستدابوو، زەردەخەنەیەکی ناخۆشی بۆ هاردیان دەرخست.

– فەرمان بە پاسەوانەکانت بدە جێمان بهێڵن، ئەوەی بۆتی باس دەکەم خودی خۆت ناتەوێت کەسێکیتر گوێی لێبێت، بیری متمانەی جۆبیتەر بکەرەوە، بۆخۆت چاك دەزانیت ئەو متمانەیەت چی لێکردوویت.

هادریان چوون ئەوەی عەقڵی لەدەست دابێت، دەیوویست لەدوایین قسەکانی حاڵی بێت، کەس نییە ئەوەی لێل جۆبیتەر هەیبووە بزانێت، هادریان ڕاستەوە بوو، فەرمانی بە پاسەوانەکانی دا لەتەك ئەو پیاوە جێیبهێڵن، تاکچاوەکە لێی نزیکەوە بوو، هادریان هاواری کرد:

– لەجێی خۆت بوەستە، لەوە زیاتر مەیەرەپێشەوە.

هادریان بەر لەوەی قسەکەی تەواو بکات، تەماشای ئەو شوێنەی کرد کە پیاوەکە لێی وەستابوو، لەچرکەیەکدا ونبوو، بەبان سەریەوە گوێی لەدەنگی پیاوەکە بووەوە:

– من لێرەم تا خەڵاتت بکەم، خواوەند لێت ڕازی بێت، جۆبیتەریش دوای ئەوەی بێئومێدت کرد ئەویش لێت ڕازی بێت، تا مێژووش لێت ڕازی بێت.

هادریان لەناوی جۆبیتەر ڕاچڵەکی، کاتێ لەو بوونەوەرەی ڕوانی کە بەحەواوە دابەزییە بەرامبەری مووچرکەیەك بە جەستەیدا هات، وا قسانی دەکرد دەتگوت شەیتانە، هادریان بە ترسەوە گوتی:

– ئەوە چ خەڵاتێکە؟

– ئەی هادریان تۆ پەرستگاکە درووست دەکەیت، نەك خواوەندی جوولەکەی تیا بپەرسترێت، وەك لەڕابردوودا وایان پێگوتیت، بەڵکو بۆ پەرستنی خودی جۆبیتەر بێت، واشدەکەیت هەر جوولەکە کارەکە تەواو بکەن، تا ئەگەر زەوییەکیان ڕێکخست و بیناکەیان درووست کرد، وابێت بەدڵ و بەگیان کارەکە بکەن، بەوە تۆ لێیان هەڵگەڕاویتەوەو زیندانت کردوون و ئەشکەنجەت داون و بیناکەش هەر بەخۆیان درووستیان کردووە، تا لەسەر زەوی و بۆ جۆبیتەر گەورەترین پەرستگا بێت، شارە پیرۆزەکەشت گۆڕی بۆ شارێك ئاینگەراکانی ڕۆما لەهەموو لایەکەوە زیارەتی بکەن.

چاوەکانی ئیمپراتۆر زەق داگەڕان و گوتی:

– تۆ کێی.. تۆ بنیادەمی؟

– من پەیکێکی خواوەندم بۆ لات نێردراوم.

هادریان دڵەڕاوکێی تێکەوت و گوتی:

- کەس ناتوانێت بینای بەرد لەو شوێنە دروست بکات، ئەوەم لەوێوە پێگەیشتووە، ئەو شوێنە شەیتانی تیا نیشتەجێبووە.

مۆتەکەی زەردەخەنەیەک بەسەر لێوی تاکچاوەوە گیرسایەوە و گوتی:

- شەیتانەکانی تۆ باسیان لێوە دەکەیت لەژێر کێوی (مۆریا)دا بوون، وەلێ خواوەند ئەمرێ لەسیدارەی دان.

***

## ئەگەر شەیتان باسی لەجەنگ کرد، ئەوا دەنگی بەرزە، کاتێکیش بەرپا دەبێت، ئەو هەوەڵ کەسە لە هەڵاتن

ئەگەر لەشاری(مۆریا)ی فریشتەکانی ئەو سەردەمە ژیابوویتایە، دیاردەیەکت دەبینی، نە بنیادەم و نەیش جنۆکە بینیویانە، ئاسمان بەسەرتەوە دەلەرییەوە، هەورەکان دەلەرزین، دیواری وزەیان بۆ پارێزگاری لەخۆیان دروست کردبوو، وەلێ لەشکری عەمرۆی کوڕی جابر بەقورسترین چەک کەوتە ویزەیان، ئەگەر ئەو ڕۆژە لە مۆریا بوویتایە، چاوت بە ئاسمان دەکەوت چۆن درزی دەبرد، لەڕاستیدا ئەوە درزبوو لەدیواری وزەکە دەدرا، دەموچاوی شەیتانیشت دەبینی لەودیوی دیواری وزەکەوە چەند تووڕەبوو، سوێندیان خواردبوو کە ئاودیوبوون ئەوەی نەشێت پێیان بکەن، وەلێ مۆریا ئاسان نەبوو خۆیان بەدەستەوە بدەن، هەر هەموو سەرگەو سەربان و کون

و کەلەبەری خانووەکانیشیان سەنگەر و سەربازبوون و لە ئەوپەڕی ئامادەباشیدا بوون، بۆ هەر ئەگەرێکی نەخوازراوی هێرشبردن. (ئاموون)ی پاشا تەماشای ئینۆری کچی کرد، دڵەڕاوکێ بەڕوخسارییەوە دیاربوو، پێیگوت:

– بێجگە لەتۆ کەسێکی تر نییە ئەو کارەی پێ ڕاسپێرین؟

ئینۆر بەنەخێر سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

– تەنها یەك ڕێگا چارەمان هەیە لە بنیاتنانەوەی ئەو پەرستگا شەیتانییە ڕێگری بکەین، جوولەکەکان ئاگادار بکەینەوە کە هادریان بەنیازی چییە بیکات، بەڵگەکەشیان نیشان دەدەم، دەچمە لای پیاوێکی بەئەمەکی ئەوان ئەویش (سیمۆن کوڕی کەوکەب)ە و چاکی دەناسم، هەموو شتێکی پێڕادەگەیێنم، بۆخۆم شوێنەکەی پێ دەزانم، بۆ ئەوەی کاتمان لەدەست نەچێت، هەر کەس نانێرم بەخۆم دەچم، ئەوەندە کاتمان بەدەستەوە نەماوە.

– کچی خۆم.. کوڕی کەوکەب پیاو چاك و بەهێزە، ئەو ئومێدەمان بەدەستەوە ماوە، بڕۆ خودات لەگەڵ.

بەنێو گەردەکانی دیواری وزە شتێك لەڕوخسار دەچوو، لەپڕ دەرکەوت، کەسێك بەدیواری وزەوە نووساوە، چون ئەوەی بیەوێت ئەو دیوارە ببڕێت و بچێتە ژوورەوە، دیواری وزەکەیش بەر مووشەکی ئاور دەدرا، مووشەك دوای مووشەکیان تێدەگرتین، لەنێو گەردەکانی دیوارەکەوە ئینۆر دەرپەڕی.

هەر هەموو سەرقاڵی وێران کردن و هاواربوون، خاك دەیناڵاند و ئاسمانیش خوێنی لەبەر دەڕۆیشت، ئینۆر بە جوانی و شۆخ و شەنگییەکەیەوە دەرکەوت، ئینۆر دیواری وزەکەی بەنهێنی بڕی، یەك دوو هەنگاوی ناو سێیەم

ویستا، شەیتانێك بەدوو چاوی تیژەوە بەرامبەری گرت، بۆی چوو بۆ کوشتنی، وەلێ خاتوو میر بەدەر لەوەی ئافرەتێکی ناسکۆڵە بوو، وەلێ جەنگاوەرێکی ئازا و چاونەترس بوو، بە چەقەنەیەك لەبەر چاویان ونبوو، ما بەدوویدا بگەڕێن، لێیان دوور کەوتەوە، ئەگەرچی لەخۆی دڵنیابوو وای هەست دەکرد کەس نایبینێت، وەلێ قامچی بەدەستەکە قامچییەکەی بەحەواوە ڕاوەشاند، هەموو دڵنیاییەکەی ڕەواندەوە، لای لەپشتی خۆی کردەوە، عەمرۆ بە جەستەی جەنگاوەرێکی شێت ئاسا ویستابوو.

عەمرۆ لەهیچ شتێکی ورد نەبووەوە تەنها چاوەکانی نەبێت، چۆن وەك دوو سمۆرە جێیان بەخۆیان نەدەگرت، ئەو پرسیارەی تیا ڕسکا، چییە ئەو ڕوحەی دەیەوێت ئاوێزانی ڕوحی بێت، بی ئەوەی (ئینۆر)یش هەستی بەو ئاڵشتکردنەوەی ڕوحیان بێت، وەلێ عەمرۆ هەر زوو بیرۆکەکەی لەمزری خۆی تەکاند، ئا ئەوەیە سەرکردەی شێت، کە هەموان پیایا هەڵدەدەن. عەمرۆ قامچییەکەی دەستی سەح کردەوەو لەخۆشی سەری سوڕمابوو.. ئەوە دوژمنەکەتە و قامچییەکەی تێسروێنە. وەلێ چون ئەوەی دەستی لەگۆ چوویێت، بەبێزارییەوە تەماشای بەرپێی خۆی کرد و گوتی:

— بۆ کوێ دەڕۆیت برۆ.. ڕێت پێ ناگرم.

ئینۆر.. سەیری ڕیهات، بۆچی ڕوو بەڕووی نەبووەوە، بۆچی بەرسڤی نەدایەوە، ئەی بۆچ لەکانی شەشلاکەدا دەمە دەمی لەتەکا کرد؟ هەموو خەڵکی سەرزەمین بەو دەسەڵاتەی دەزانن، هی وەك ئەو سۆز مانا لەگیانیدا نییە. ئینۆر دەستی خستە سەردەستی و ئەستێرەیەکی شەش لا لەسەر کەمەری عەمرۆ دروستبوو، ئەستێرەکە هاتەوە یەك تا جووڵە لەعەمرۆ ببڕێت و بەندی بکات، ئەوجا ئینۆر لێی نزیکەوە بوو، ڕوانییە چاوەکانی و گوتی:

- من تۆ چاك دەناسم، تۆ لەخۆت وایە لەهەموو کەس بەهێزتریت، وادەزانیت دەتوانی ڕێم پێ بگریت؟

عەمرۆ لەچرکەیەکدا داسەکاو دەموچاوی لە ئینۆر نزیك کردەوە، لەچرکەیەکدا ئەو ئەستێرەیەی کە ئینۆر عەمرۆی پێ بەند کردبوو، زۆر بەئاسانی شکاندی و لەکەمەری خۆی کردەوە، ئەوجا چاوی لەچاو ئینۆر بڕی. کەس نەبوو ئەو ئەستێرەیەی لە جۆرێك شووشە درووست کرابوو بشکێنێت. عەمرۆ.. قامچییەکەی بەدەستەوە گرت، ئینۆر پەشۆکا، لێ عەمرۆ قامچییەکەی لە پشتێنەکەی ناو پشتی لە ئینۆر کرد و دوور کەوتەوە، ئینۆر کەوتە دووی، دواتر بەخۆیا چووەوە.. ئەوە چییە دەیکەیت؟ خۆت بگەیەنە بەکوڕی کەوکەب و ئەو کارە ئەنجام بدە. دوایین نیگای لەعەمرۆ بڕی، ئەودەمەی عەمرۆ لەنێو تاریکییەکەدا ونبوو، بەتووڕەییەوە هاواری بەسەر سەربازەکانیەوە کرد ، چون ئەوەی بیری ئینۆری نەبێت.

***

## یەکەم نیگا کردن بەشی خۆشەویستی ناکات، وەلێ لەدووەمدا ئەو خۆشەویستییە بەتەواوی دەرپسکێت

مێژوو دەگێڕێتەوە پیاوچاکێکی بەهێزی جوولەکە ناوی (سیمۆن کوڕی کەوکەب) لەوە گەیشتبوو ڕۆمانەکان دەیانوویست جوولەکە هەڵخەڵەتێنن و بەدرووستکردنی هەیکەلی سلێمان و پەرستگای جۆبیتەری شەیتان سەرقاڵیان بکەن، بەو ئاوایە ببێتە شاری بێتپەرستی، هەر بەدەستی جوولەکان ئەو هەمووە بنیات بنێن،.بۆیە جوولەکە بەسەرکردایەتی کوڕی کەوکەب شۆڕشێکی گەورەیان هەڵگیرساند، شۆڕشێك دژ بە ئیمپراتۆر دەستی پێکرد، بەدەر لە هەموو بۆچوونێك شۆڕشی جوولەکان سەرکەوت و دەستیان بەسەر خاکی (ئۆرشەلیم)دا گرت، حوکمی خودموختاریان بەدەست هێنا، بەو بۆنەشەوە ئاهەنگیان گێڕا، کە تایبەتبوو بە (سیمۆن کوڕی کەوکەب) کە بە مەسیحی دڵسۆز ئاوزەدیان کرد، گوتیان لەتەورات مژدەی هاتنی کەوکەب لەوەچەی یاقووب باسکراوە و هەموو نەوەی بەلەنگازی شەیتان لەناو دەبات وئیسرائیل درووست دەکاتەوە، ئەوەبوو کەوکەب هات و هەموو بەدکارەکانی لەناو برد. کوڕی کەوکەب دوو ساڵ سەربەخۆیی و بە دراوی تایبەت بە خۆیان ئەو دەوڵەتەی بۆ جوولەکە دامەزراند.

دیواری وزەی فریشتەکانی کێوی پەرستگا سەرکەوت، بەربەرچی هەموو هێرشێکیان پێ دایەوە، شاری (مۆریا)یان پاراست، نەیانهێشت پەرستگا بۆ جاری سێیەم بنیات بنرێتەوە، تەنانەت دوای ئەوەی جوولەکەش سەربەخۆ بوون حوکمی (ئۆرشەلیم)یشیان کرد، ئەو پەرستگایەیان بنیات نەنایەوە، ئێدی شەیتانەکان وازیان لە فریشتەکان هێنا و کشانەوە، وەلێ ڕۆژگار

دەریخست شەیتان ئەو پیلانەی زۆر بە وردی دارشتبوو، ئەوەی جوولەکە کردیان مایەی کارەسات بوو، بۆیە ڕۆمانەکان بە سووپایەکی سەد هەزار سەربازی پڕ چەك هێرشیان بۆ سەر جوولەکە کردەوە، ئەو جەنگە کوشتارێکی زۆری لێ کەوتەوە، بەو بۆنەوە هاتینە خوارەوە بۆ دیتنی ئەو کارەساتە.

لاشەی جوولەکەکان بەوای خوێنەوە ڕوخساریان دیارنەبوو، سەربازە ڕۆمانییەکان بەنێو کوژراوەکاندا دەگەڕان، کۆمەڵێك جوولەکە بەدارەوە هەڵواسرابوون، خوێن خاچەکانیانی سوور کردبوو، کۆمەڵێك سەربازی ڕۆمانی تەوراتیان بەسەر سنگی جوولەکە هەڵواسراوەکانەوە هەڵواسی و ئاگریان تێبەردان، لەو دیمەنە تێدەگەیت لەو سەردەمەدا چی بە جوولەکە کراوە. دوای ئەو کارەساتە جوولەکە وڵاتی بەجێهێشت، چون ئەوەی لەخاکی پیرۆز قڕ کران.

لەکاتی کوشتن و برینەکەداو لە کێوی مۆریا کارەساتێکی تر تووشی فریشتەکان بوو، شەیتانەکان بەسەرکردایەتی جۆبیتەر بۆ تۆڵەسەندنەوە لە فریشتەکانی کێوی پەرستگا، هەزاران جنۆکەی شەیتان لەدیواری وزەکەیان دەدا، تا دیوارەکەیان کوێر کردەوە، بەدەر لەنەمانی دیوارەکە وەلێ فریشتەکان شەڕێکی جەربەزانەیان کرد، تەنانەت زۆربەشیان لێ کوژرا، لە ئاسۆکەکەوە چاوێك ئەو دیمەنەی قۆستەوە و هەڵچوونێك گرتی، چاوی عەمرۆی کوڕی جابر بوو، ئینێزریش لەوێبوو، ئەو هیچ و پووچانەی بینی کە هێرشیان بۆ سەر شارەکەی کرد، عەمرۆ بەتاو دەرپەڕی، چەند چرکەیەکی نەبرد بەرامبەر شەیتانەکان وێستا، جۆبیتەر کە ئەوەی بینی، هەستی کرد خێر بەناوچەوانی عەمرەوە نییە، پێیگوت:

- ئەوە چیتە کوڕی تواسا دی دانان؟

عەمرۆ گوێی وێنەدا و چاوی لەخاتوو میر گێڕەدا، تا چاوی بەچاوی کەوت و لێی دڵنیابوو، عەمرۆ چرکەیەکی بەفیڕۆ نەدا، قامچییەکەی دەرهێناو بەحەواوە ڕایوەشاند، بەشێوازێك لەجۆبیتەری ئاڵاند، جۆبیتەر هەر کە خۆی گف دەکردەوە لەقامچییەکە ڕزگاری بێت، نەیزانی بەهەڵەدا چووە، لەو خۆڕاتەکاندنانەیدا دەرکەوت قامچییەکەی عەمرۆ وەك نەشتەر وایە، تا زیاتر خۆی ڕادەپسکاند، پارچە لەجەستەی دەبووەوە، ئەوجا عەمرۆ دەسکی قامچییەکەی بەدەستەوەبوو، بەشێکی بادا، ئاور لەقامچییەکەیەوە هەڵیسا، جۆبیتەر بە سووتانەوە بەرەوە بوو، ئا لەو دەمەدا عەمرۆ لەققەیەکی پیا ماڵی، ئەوجا تەماشای (ئینۆر)ی کرد، کە لێی نزیکەوەبوو، گوتی:

– تۆ چیت؟

– عەمرۆ پرسیارەکەی بوارد و گوتی:

– – ئێستا لەو دڕندەیە ڕزگارتان بوو، ئەوەی ماوە ئەو سەربازە بچکۆلانانەن.

عەمرۆ ویستی بڕوات، ئینۆر بانگی لێوە کرد:

– ئەوەت لەبەر من کرد؟

عەمرۆ دوور دەکەوتەوە، نەیدەتوانی وەڵامی ئەو پرسیارە بداتەوە، ئینۆر دیسان بانگی لێوە کرد:

– تۆ بەر لەجۆبیتەر سەربازەکانت هێنا تا دیواری شارەکەم کوێر بکەنەوە، کە منیشی تێدا بووم.

عەمرۆ وێستا و نیگایەکی تێبڕی بەو ئاوایەی ڕوخساری ئینۆری لەبیر نەچێتەوە، گوتی:

– تۆم دووجار نەدیتبوو.

***

## *** تەواو ***

دیسانەوە بۆبی فرانك دەڵێت.. كاتی ئەوە هاتووە شتێكی گرنگت پیشان بدەم، چەند ساتێك لەتەكمابە، لەكۆمپیوتەرەكەمەوە دەچمە ناو سیستەمی ئاسایشی تایبەت بەكۆشكی خاكییەوە و چەند چركەیەك و لەتەكما حاڵی دەبیت، وێنەكەم لەم ڕیكۆردەوە دەوەستێت، تا وێنەیەكی چەسپاو جێی دەگرێتەوە، كە كامێرای چاودێری كۆشكبوو، بڕوانە ئەو كۆشكە بەرزەی ناو شیكاگۆ كە ئێمە خاوەنین و ڕەنگە تۆ هەر نەزانیت، بنەماڵەكەی من لەهەرە دەوڵەمەندەكانن، كە خۆیان بە (ڕیكس دوون) ناوزەد كردووە، یانی خوای پاشاكان. ئێمە بنەچەی جوولەكەین، ئابووری ئەم جیهانەمان كۆنترۆڵ كردووە، باوباپیرانمان وا دەگێڕنەوە كە گەورەترین بنەماڵەی نزرگای سلێمان بوونە، خۆ ئەگەر بزانن موسوڵمان بوومە، لەسەر ئەم گۆی زەویە دەمسڕنەوە، بۆ هیچ جوولەكەیەك نییە لەم ئاستەی ئێمەدا ئاینی خۆی بگۆڕێت.

وەرە با نووسینگەی كۆشكت پیشان بدەم، چەند خوولەكێك و خۆم بەژووری كامێراكەوە دەكەم، بڕوانە ئەم ژوورە پان و پۆڕە، كە ئەو سەری دیار نییە، چاوێك بەو پەرتووكانە بكێڕە، بەوای ڕیزكردنیانەوە دەڵێیت دیوارەو هەڵچنراون، ئەو تۆپە دەستكردە گەورەیەی گۆی زەوی كە لەناوەندی گۆڕەپانەكەدایە، بەلای دەستە ڕاستیەوە پەرتووكەكانی جوولەكە بەتەورات و تەلموود و مەشنا و مەدراش و كابالا و بەهەموو بەرگتێگراوەكانیەوە ڕیزكراون، ئەولاكەی تر هی مەسیحییەكانە بە ئینجیل و هەموو بڵاوكراوەكانیانەوە دانراون، لەولاتریشەوە هی موسوڵمانەكانەبەقورئان و پەرتووكی فەرموودەكان و شرۆڤەو

بایۆگرافییەکانیەوە هەڵچنراون، ئەوش لایەنی جادووگرییەکانن بە دەستووسەکانیەوە سەفتە کراون.

لەپەرتووکەکانی بایۆگرافیای ئیسلامدا سەربوردەی شتگەلێکی سەیر هەن، سەحابەیەك لە سەحابەکانی پێغەمبەری خودا کە بنیادەم نەبوو، سەحابەیەکبوو جنۆکەبوو، پێیان دەگوت (عەمرۆی کوڕی جابر)، بەناوباگترین جنۆکەبوو لەسەر دەستی پێغەمبەری خودا موسوڵمان بوو، پێشتر هەندێ سەربوردەی لەتەك (ئینزۆر)مم بۆت گێڕاوەتەوە، ئەوسا لە توندڕەوترین شەیتانەکان بوو، بەڵام لەم دواییەدا هەندێ دەستووس دۆزراوەتەوە، کە ساحیرێك لە خاکی یەمەن دەریهێناوە، باس لە سەربوردەی داستانی عەمرۆی کوڕی جابر دەکات و چۆنیش بەوای ئینزۆرەوە باوەڕی هێناوە، دوای ساڵانێکی زۆر لەشەڕی شێتیدا هاوسەرگیریان کردووە، دواتر کەوتبوونە گەڕ بەدوای پێغەمبەرێکی چاوەڕوانکراو کە محەمەد (د.خ)بووە، زۆر چاوەڕوانییان کردووە، تا خودا پێغەمبەرایەتی بۆ داگرتووە، لەسەر دەستی محەمەد موسوڵمان بووە.

وەرە تا ئەو شتەی کە تۆم لەبەر ئەوە هێناوەتە ئەم ژوورەوە پیشانتی بدەم، ژوورێکە پاشکۆی کتیبخانەیە، دەتگوێزمەوە ئەو کامێرایەی ئەوێ، چاو لەو تەنە ئاڵتوونیە ببڕە، گوێم وێدە تا پێتی بناسێنم، ئەوە شێوەی پەرستگاکەی سلێمانە، کە جوولەکە باوەڕیان پێیەتی، بۆخۆم بەدڵی جیهانی ناوزەد دەکەم، چونکە کارەساتەکانی دنیا تا هەنووکەش بەدەوریەوەن، لای جوولەکە یەکەمین پەرستگا بوو، تەنانەت قوربانیشیان پێشکەش دەکرد، بەوشێوەیە قەشەکانیش لێیان دەخوارد، پێشتر لەناو ڕەشماڵێك ئەو قوربانییەیان پێشکەش دەکرد. دوای وێران کردنی پەرستگاکەیان و لەلایەن بابلییەکانەوە نەفیکردنیان، ئەوجا پەرستگای

دوەمیان دروویست کرد، پێغەمبەر (عیسا)یان بۆ هات، هەستی کرد کاری خەراپ لەپەرستگاکە دەکەن، مامەڵیان بە فایز دەکرد و دەستکاری پەیامی خودایان دەکرد، چەندجارێك ئاگاداری کردنەوە، وەك ئەو پەرستگایە وێران دەبێت، سزایەك لەلایەن خوداوە دەدرێن، ڕێك دوای مەرگی عیسا بە چل ساڵ ڕۆمانییەکان هێرشیان بۆ سەر خاکی جوولەکە کرد، دووەم پەرستگایان خاپوور کرد. جوولەکەکان هەوڵیاندا بۆ جاری سێیەم بنیاتی بکەنەوە، دوای شۆڕشی کوڕی کەوکەب شکستیان هێناو ئاوارەی دنیا بوون، ئیدی قوربانیشیان نەدەکرد، ناشتوانن بۆ قوربانی بگەڕێنەوە ، تا پەرستگای سێیەم جار لەکۆتایی زەماندا دروویست نەکرێتەوە.

لای موسوڵمانەکان شتێك بەناوی پەرستگا نییە، کە قوربانی تێدا ببەخشرێت، تا قەشەکان لێی بخۆن، لەهەچ شوێنێك بێت ئەو قوربانییە دەکرێت، تا هەژارەکان لێی بخۆن. پێغەمبەر سلێمان ئەوەی دروستی کرد مزگەوت بوو، ناویشی مزگەوتی ئەقسا بوو، ئەو شوێنەی پێغەمبەر محەمەد (د.خ) لەوێوە (ئیسرا و میعراجی) بەرەو ئاسمان کردووە، موسوڵمانەکان بۆ نوێژ ڕوویان لە مزگەوتی ئەقسا دەکرد، دواتر ئاراستەکەیان بەرەو کابیە گۆڕی ڕۆیشتن.

بەلای جوولەکەکانەوە هەیکەلی سلێمان بوو، وەلێ بەلای موسوڵمانەکانەوە مزگەوتی (ئەقسا)یە، تەنها بینایەکیش نییە وەك ئەوەی خەڵکی تێیگەیشتوون، بەڵکو شوێنی پیرۆز و کۆمەڵگەی تەواوی شوێنەواری پیرۆزە لە مزگەوت و منارەو کانیاو و شوورای گەورە کە بە شوورای ئەقسا ناسراوە، گرنگترین شوێنەوار و گومبەتە بەناوبانگەکە و مزگەوتی گومبەتی بەرد کە بەگومبەزی ئاڵتوونی بەناوبانگە، بەپێی قسەی جوولەکەکان لەو پەرستگایە هیچ نەماوەتەوە تەنها دیوارێك لە شوورای ئەقسا نەبێت، کە

جوولەکەکان بە دیواری (مەبکا) ناوزەدی دەکەن، دێن و لە لای ئەو دیوارە دەگرین و نزا بۆ درووستکردنەوەی پەرستگاکە دەکەن.

تۆ دەزانیت یا نازانیت هەموو جوولەکەی دنیا چاوەڕوانی هاتنە خوارەوەی (مەسیح)ی دڵسۆزن تا لەخاکی پیرۆز کۆیان بکاتەوەو بۆ جاری سێیەم پەرستگاکە بنیات بنێنەوە. تۆ دەزانیت کۆمەڵێك لەشەیتانەکان هەن کە لە قێزەونترین وەچەی بنیادەمن، ناوی خۆیان بە زایۆنیزم ناوزەد کردووە، جوولەکە لێیان بەریین، مەزهەبێکی تازەی جوولەکەیان داهێناوە، دەڵێن نابێت چاوەڕوانی مەسیح بین تا بمانگەڕێنێتەوە، بۆ خۆمان بۆ خاکی پیرۆز دەگەڕێینەوە، تا ئەو کاتەی ئەو دێتە خوارەوە ئێمە گەڕاوینەتەوە.

لێگەڕێ کەمێك ختووکەی عەقڵت بدەم و پێتڕابگەێنم لای جوولەکە مەسیحی چاوەڕوانکراو، کەبە(هاماشیح) ناوزەدی دەکەن، مەسیحێکە بیرو باوەڕی جوولەکەی هەڵگرتووە و تەواو دژ بە بیروباوەڕی مەسیحییەتی عیسایە، یانی مەسیحی جوولەکە دژ بە مەسیحی مەسیحییەتە، بەو ئاوایە دەبێتە دوژمنی مەسیحی مەسیحییەت بەو ئاوایەش مەسیحی جوولەکە هەر ئەوەیە کە مەسیحی مەسیحییەت ناویان لێناوە (ئەنتیخریستۆس) یانی دژە مەسیح، هەر ئەویشە موسوڵمانەکان بە مەسیحی جەجاڵ ناوی دەبەن.

لەپێناو ئەو بیروباوەڕە و لەپێناو هاتنە خوارەوەی مەسیحی جەجاڵ جوولەکەکان گەورەترین کووشتن و برینیان لەمێژووی تازەدا تۆمار کرد، سێ لەسەر چواری خاکی فەلەستینیان داگیر کرد. ئەوەی نایزانیت و لێی بێ ئاگایت، جوولەکەکان بۆ ڕووخاندنی مزگەوتی ئەقسا بە هەموو شوێنەوارەکانیەوە خویان ئامادە کردووە، تا لەجێی ئەودا پەرستگای سێیەم بنیات بنێنەوە، چونکە جوولەکە لەو باوەڕەدان مەسیح نایەتە خوارەوە، تا ئەو پەرستگایە بنیات نەکرێتەوە. ڕەنگە باوەڕ نەکەیت چونکە

تۆ ناخوێنیتەوە، وەڵێ ئەگەر دەستت بە خوێندنەوە کرد، دەزانیت ئەوان بۆ یەکەمجارە لە مێژووی جوولەکان و دوای داپڕانیـان و تەرتـەو وەرتـەبیان قوتابخانەیەکی تایبەتیان درووستکردووە بۆ دەرچوواندنی قەشـەگەلێك کە کـار بـۆ درووسـتکردنەوەی پەرسـتگاکە بکـەن، نووکـەش ئـەوان لـە مەشـقکردندان، لەسـەر چـۆنێتی پێشکەشـکردنی قوربانییـەکان و چـۆنێتی کارکردن بۆ ئەو پەرستگایە بکرێت، قوتابخانەیەك ناویان لێ ناوە پـەیمانگای پەرسـتگا(Temple Institute ) لێگـەڕێ زانیـاری لەسـەر قەشـەی جوولەکەکانت وێدەم.. دوای وێران کردنی پەرستگای دووەم کەشیشەکان لە بنیاتنانەوەی وێستان، هەرچی ئیسرائیلە ئەمڕۆ دەیـەوێت بنیاتی بنێتـەوە، ئەوە دژ بە هەموو جوولەکەیە، ئەوەش بە دانانی قەشەیەکی مەزن لـەماوەی ئەم چەند ساڵەدا و بۆ یەکەمجار کە ئەوەندەی نەماوە بۆ هاتنـە خـوارەوەی جەجاڵ تەنها ئامادەکردنی مانگا سوورە نەبێت.

جوولەکە باوەڕی وایە بۆ پاکژکردنەوەی کوشتاری پەرستگاکە و ئامادەکاری بۆ هاتنـە خـوارەوەی (هاماشیح) دەبێـت مانگـا سـوورە بسووتێنرێت، بـەو مەرجەی تەنها موویەکیشی جیاوازی لە ڕەنگی سـوورەکەیدا نـەبێت، لەبـەر ئـەوەی مانگایـەك بـەو ناونیشـانە مەحاڵـە دەسـتبکەوێت و لـەبری ئـەوەی چاوەڕوانی ئـەو مانگایـە بکـەن تـا بەڕێکـەوت دەردەکـەوێت، بەرنامەیـەکی داڕێژراو سازبدرێت بۆ زایندە کردنی مانگا سوورە بشێت.

لێگـەڕێ هـەواڵ و مژدەیـەکت لەپەیامبـەریت وێـدەم، محەمـەد پێغەمبـەری ڕوونـاهی (د.خ) هـەموو ئـەو ئاواتـە شـەیتانییەی کـوێر کـردەوە، کـە لەفەرموودەیەکیـدا دەڵێـت(( جـەجاڵ چـل ڕۆژ لەسـەر زەوی دەمێنێتـەوە، بەهەموو شوێنێك دەگات، تەنها چوار شوێن نەبێت، ناتوانێت لێـی نزیکـەوە

بێـت، مزگـەوتی پـیرۆز و مزگـەوتی مەدینـەو مزگـەوتی تـوور و مزگـەوتی ئەقسا)).

لەمنەوە ئەو مژدەی پەیامبـەرە وەربگرە، خـودا مزگـەوتی ئەقسـای پـیرۆز کرد، رێگـای لەهـەموو هـیچ و پووچـەکان گرتـووە دەسـەڵاتیان بەسـەریەوە هـەبێت، تەنانـەت جـەجاڵیش بـۆی نییـە لێـی نزیـك بێتـەوە، گشـت ئـەو ماندووبوونەی زایۆنیزمەکانی کوێر کردووەتەوە، کە پێغەمبەری خودا ئەوەی گوتبێت، مانـای ئەوەیە کـاتێ جـەجاڵ دەردەکـەوێت، مزگـەوتی ئەقسـا لـە لایەن جوولەکەکانی مەسیحییەتەوە زەوت ناکرێت، بـەڵکو لـەژێر دەسـەڵاتی موسوڵمانەکاندا دەبێت.

رەنگە بپرسیت ئەوە چۆن روو دەدات، کە خودی زایۆنییەکان دەسـەڵاتدارن و کەس ناتوانێت دژ بەوان قسـە بکـات؟ با پێتبڵێم ئـەو دەوڵـەتی زایۆنییـە (ئیسرائیل) کە لەمێژووی گۆی زەویـدا ناگاتـە سـەد سالْ و دەکـەوێت، ئـەم قسەیەم بەهەند وەربگرە، ئەوانەی دەیرووخێنن عـەرەب و موسـوڵمانەکانن، خاکی قوودس لەدەست ئەو جەجەاڵییانە رزگار دەکـەن، ئـەوەش ئەوەنـدە دوور نییە، بەڵکو لە نەوەی داهـاتووی تـۆدا دەیبینیـت، واتـە تـۆ جارێ لـە ژیانـدایت و بەچـاوی خـۆت دەیبینیـت و رەنگـە بەشداریشـی تێـدا بکـەیت. تەنهاو تەنها ئەم قسەیەی منت لەبیر بێت.

(وێنەی کامێرای ناوەوەی کۆشك لەپڕ نامێنێت، لـەبری ئـەو وێنەیـە، وێنـەی بۆبی فرانك جێی دەگرێتەوە).

جارێکیتر سڵاو .. پێویست ناکات دەموچاوم ببینیت.

(بۆیی دەست بۆ پشتەوەی خۆی دەبات و ڕووناکییەکە خامۆش دەکات، بینراوەکــە ڕەش دادێــت، تــەنها شــێوەی بــۆیی لــەنێو تاریکییەکــەدا دەردەکەوێت)

ئێدی پێویستم بەچاوەکانت نییـە، بـەڵکو هـزرتم دەوێـت، پاش کـەمێکیتر تێدەگەیت بۆچی چراکانم خامۆش کرد، گەمەی داهاتوو جیاوازە و پێویست بە کارتەکان ناکات.

بەسەرهاتی ئەمجارە تۆ دەیخوێنیتەوە زۆریش گرنگە بەڕادەیـەك مـن لـەنێو سـەردێڕەکانی ڕابـردوو شـاردوومەتەوە.. هـەر کـە جوولەکـە بەسـەر زەویـدا تەرتەو وەرتە بوون و ئاوارە بوون، تاکچاویش سـەرەڕۆ و دێوانـە بـوو، بۆیـە چیرۆك و بەسەرهاتی ئەویش لەنێو هـەموو گێڕانەوەکانـدا ونبـووە، فێریشـت دەکەم چۆنی دەربهێنیت، زۆربەی شارسـتانییەکان تاکچاویان بینیـوە، بـەو وەسپە مەزنەی ئەو، تەنانـەت گەیشـت بـەو ئاسـتەی بپرسـێت بپەرسـترێت، گەورە پیـاوانی قـەوم لـە دەوڵەمەنـدەکان و میرەکـان و تەنانەت خاخـانی جوولەکـەکانیش و قەشـەکان لـە هـەموو ئـەورووپا بـاس لـەو دەکـەن، چـۆن مەتـەڵێك بۆیـان هەڵئـەهێنرێت، پیـاوێکی جوولەکـەی نـامۆ خەسـڵەتکەلێکی هەیە هەر جارەی لێرەو لەوێ دەردەکـەوێت، پیاوێـك نـاوێکی زۆر تایبـەتیان لێناوە، جوولەکەیەکی ونبوو(The wandering Jew).

فێریشت دەکەم چۆن سەربوردە لـەنێو چـیرۆکەکانی پێشووتر دەربهێنیـت، دواتر دایدەڕێژین و دووی گەشـتی ئـەو تاکچـاوە جەجاڵـە دەکـەوین، لەسـەر ئەم گۆی زەوییە دەزانین ئەو لەکوێدایە.

***

# بەشی نۆیەم

## جوولەکەیەکی سەرەڕۆی ونبوو

## ٥٠ دوای زایین _ ٦٠٠ دوای زایین

***

پێویستیمان بە پێشەکی نابێت، لەبەر زانستێکی شاراوەیە تۆ لێرەیت، منیش کە لێرەم تا ئەو زانیارییەت وێدەم. من و تۆ دوو ڕوحین لەجیهانی خەون و خەوبینین دەگەڕێین.

زانیومە بەر لەهاتنت بۆ ئێرە زۆرێك لە حیکایەتەکانت بینیوە یا بیستووە، ڕێك هەشت سەربوردەن، لەحەوتی یەکەمدا وەك ئەوەی شتێك ڕوو بدات، ڕەنگە تێبینیت کردبێت، یا نەشتکردبێت، بیرت دێتەوە لەهەر چیرۆکێك کەسایەتییەك هەس و خەونێکی هەر هەبووە، ڕەنگە زۆر ورد نەبم، دوور نییە خەون نەبێت خەوبینین بێت، ڕەنگە ئەوەندەش بەلاتەوە گرنگ نەبووبێت، لێ لێگەڕێ پێت بێژم.. تۆ ئەمڕۆ لەبەر ئەو خەوبینینە لێرەیت، ئەگەر بیرت چووە، ئەوا جارێکی دی بیخوێنەوە و ئەوسا بێرەوە لام تا لەوەی پێتڕادەگەێنم بە باشی لێی حاڵی بیت.

ئەو کەسایەتییانەی ئەو خەوبینینانەیان بینیوە، بەردەوام کەسایەتی پیاو چاك بوونە، ڕووداوگەلێکیان بینیوە باس لە بانەڕۆژ دەکات، ئەوەدەم شرۆڤەیان بۆ نەکراوە، ڕەنگە شتەکە بەلایانەوە ئاڵۆز و ئاڵۆسکاو بووبێت، ئەوەی ڕاستی بێت، ئەو خەوبینینە دوو ڕای بۆ بووە، جارێك پێشبینی

بەدواڕۆژەوە کراوە، کە خودی بابەتەکە پەیوەست بە ژیانیانەوە بووە، ئەو خەو بینینەی باس لەپیاوێکی سەرەڕۆی ون دەکات، بە شاراندا دەگەڕا، ناوگەلێکی زۆریان لێ نابوو، میخا، سامری، دوژمنەکەی مەسیح، جەجال، هاماشیح، ئەنتیخریستۆس، لەسەردەمی مووسا لەدایکبووە، هەموو بەشەرییەتی بەگومرایی بردووە، لەدوا دوای زەمان دێتەوە ناو خەڵکی و دووریش نییە خۆتیش لەو فیتنەییەدا ئامادە بیت.

لەچوار چیرۆکی یەکەمدا خەوبینینە هەر هەموو کەسایەتییەکان بینیویانە، لەمەڕ ئافرەتێکەوە بووە، لەنێو خەڵکیدا سەمای کردووە، (پاشا)ش بە حەزەوە لێی ڕوانیوە، پێشیگوتووە چیت دەوێت داوای بکە، ئەگەر نیوەی مەملەکەتەکەشم بووە، شاژن پێیگوتووە داوای ملپەڕاندنی ئەو پێغەمبەرە بکە. پیاوێکی تاکچاو لەوێ بووەو ئەو خستبوویە دڵی شاژنەوە وا بڵێت.

ئازیزەکەم ئەمەش بەسەرهاتی پێغەمبەر (یەحیا)یە و سەماکەرەکەش (سالۆمی)یە، سەما بەناوبانگەکەی لەبەرامبەر (هیرۆدس)ی پاشا کرد، ئەو پاشایەی فەرمانی لەخاچدانی بۆ مەسیح دەرکرد، ئەو شاژنەش کە لەسیلەیدا دانیشتبوو (هیرۆدیا)ی ژنی زڕبرای پاشا هیرۆدس بوو، کە دواتر لەو جیابووەوە تا شوو بە پاشا هیرۆدس بکات. تۆش چاک دەزانیت پێغەمبەر یەحیا پیاوێکی جوامێر بوو، زۆر ڕاشکاوانەو بێ ترس گوتی.. ئەو هاوسەرگیرییە ڕەوا نییە، زۆرێك لەخەڵکەکەش لایەنگیریيان کرد، شاژن هیرۆدیا ڕقی لێیبووەوە، داوای لەکچەکەی کرد، ملی ئەو پێغەمبەرە بپەڕێنێت، دەستبەجێ سەربازەکان هێرشیان بۆ سەر پێغەمبەر یەحیا کرد، لەزینداندا لەملیاندا، بەسەرقاپێکی زیووەوە کەللەی یەحیایان بۆ سالۆمی هێنا، گشت ئەو ڕووداوەش بەوای سامرییەوە بوو، ئەوەش فیتنەی سەردەمی یەحیا بوو.

لەو سێ چیرۆکەی دیدا، خەونبینینی پیاوچاکان لەسەر پیاوێکی پرچ درێژی ئاڵتوونی بوو، پێدەچوو مردووی زیندوو دەکردەوە، دواتر بینیمان ئەو پیاوە قژزو جوانە بەنێو خەڵکیدا دەڕۆیشت و دارێکی درێژیشی بەشان هەڵگرتبوو، پیاوێکی تاکچاویش لەوێ بوو، گاڵتەی پێدەکرد، ئازیزەکەم تۆ بەسەرهاتی (عیسای کوڕی مەریەم)ت بیستووە، ئەوەی خەڵکی بۆ خواپەرستی بانگهێشت دەکرد، ئەگەرچی جوولەکە چاوەڕوانی مەسیحی چاوەڕوانکراو بوون، وەلێ کاتێ خودا عیسای بۆ ناردن، بەدرۆیان خستەوە، پاشای ڕۆمانیایان گاڵدایە گیانی تا دەستبەسەری بکات و لەخاچی بدات، ڕێك پاشا وایکرد و داری لەخاچدانەکەشی بەخۆی هەڵگرت، تا بەسەریەوە لەخاچ بدرێت.

کاتێك عیسا بەرەو شوێنی لەسێدارەدانەکەی دەڕۆیشت، سامری تاکچاو لەنێو خەڵکەکە هاتە دەرەوەو پێیگوت(( ئەوە بۆچی خاوەخاو دەکەیت؟)) عیسا وتەیەکی پێگوت، هەر وەك ئەو وتەیەی مووسا پێیگوتبوو.. برۆ ژیانت وەبەرەوەیە، کەسیش ناتوانێت بتکوژێت، تا ڕۆژی خۆی دێت، عیسا پێیگوت.. برۆ لەم سەرزەوییە سەرەڕۆ و ون دەبیت، تا ڕۆژی خۆی دێت.

پێت سەیر نەبێت لەو دیمەنە مەسیح دارێکی هەڵگرتبوو، خاچ نەبوو، جیهانیش ڕایان جیاوازە بۆ لەخاچدانی مەسیح. جوولەکە لەگومراییاندا ئەویان بەتاوانبار لەقەڵمدابوو، هەڵواسراو کوژرا، وەلێ بەوای ئەو ڕێبازەی بانگەشەی بۆ کردبوو، مەسیحییەکان پێیان وایە کە بەسەر خاچەوە لەخاچ دراوەو کوژراوە، دواتر دوای سێ ڕۆژ هەستاوەتەوە، هەرچی موسوڵمانەکانە باوەڕیان وانەبوو، پێیانوابوو مەسیح لەخاچ نەدراوەو نەکوژراوە، بەڵکو خودا هەڵیکێشاوە، خۆ ئەگەر پرسیار لەموسوڵمانەکان بکەیت، کێ لەبری مەسیح لەخاچ دراوە، دەبینی بێدەنگ دەبن، یانەخۆ ڕای جیاوازیان هەس.

لەڕاستیدا عیسای پێغەمبەر دەستبەسەر کرا، نەك دەستبەسەرکردنی لێکچووەکەی ، وەك موسوڵمانەکان بۆچوونیان وابووە، بەڵکو خودی مەسیح دارەکەی هەڵگرتبوو، بەنێو خەڵکەکەشتدا ڕۆیشت، دارەکە خاچیش نەبوو، وەك ئەوەی مەسیحییەکان پێیان وابوو، سەربازەکان ئەشکەنجەی توونديانـدا، ئەويش بـە دارەکـەی سەرشـانييەوە بـەرەو مـەرگی خـۆی دەڕۆیشت، لەو ئەشکەنجەیە ڕزگاری نەبوو، کە موسوڵمانەکان پێیان وابوو، کاتێ گەیشتە شوێنی لەسێدارەدانەکەی، هیچ خاچێك لەزەویدا نەچەقێنرابوو، ئەوەش پێچەوانەی ڕای مەسیحییەکانە، بەڵکو بەسەر ئەو دارەی هەڵیگرتبوو هەڵواسرا. ئەگەر بگەڕێینەوە دەقەکانی ئینجیل، لە ڕیوایەتی کردارەکانی پێغەمبەراندا مەسیح بەسەر دارێکەوە هەڵواسرا، هەڵواسینەکەشی وەك سزایەکبوو بۆ مورتەدەکان، لەتەورات و پەیمانی کۆنیشدا هەر وا هاتووە، خاچ سونبوولی بتپەرستان بووە، ئەوە لە لایەن سۆمەرییەکانەوە کە بەر لەدایکبوونی مەسیح بەهەزار ساڵ وەك سونبوولی خواوەندی سۆمەری تەمموز برای ئینانا دەیانگێڕا. خاچ بوونێکی بۆ نییە ئەمە لە هەموو ئینجیلەکان باسی لێوە نەکراوە، ئەگەر نا خودا چۆن خاچێك دەکات بە سونبوولێکی پیرۆز کە سونبوولێك بێت بە پەرستنی خواوەند وەك بتپەرستی، بۆیە قورئان ئەوەی ڕەتکردووەتەوە کە لەخاچ درابێت، تەنانەت قورئـان ئەوەشـی ڕەتنەکردووەتـەوە کـە گوایـە بـەدارەوە بەستـرابێت و ئەشکەنجەش درابێت.

دوای ئـەوەی مەسیح دەمێـك بەسـەر دارەکـەوە هەڵواسـرا، سـەربازەکان وایانزانی گیانی لەدەستداوە، دایانگرت و لەگۆڕیان نا، لەڕاستیدا نـەمردبوو، وەك چۆن مەسیحییەکان و جوولەکەکان پێیانوابوو، بەڵکو نیوە مردوو ببوو، تـەنها لـەهۆش خـۆی چووبوو. دوای ئـەوەی لەسـەر دارەکـە دایـانگرت، لـە

شوێنێك دایاننا وەك زۆور وابوو بۆ مردوو دانرابوو، دواتر خودا بۆ ئاسمان بەرزی کردەوە، ئەوە بۆچوونی مەسیحییەکان بوو، تەنانەت موسوڵمانەکانیش هەمان بۆچوونیان هەبوو.

ئەمە سەربوردەی مەسیح بوو، ئەی مەسیحی جەجاڵ کێوە چوو؟ چۆن لەسەر زەوی ونبوو؟ چی بەسەرهات؟

تۆ بۆ ئەمە لێرەیەت، هەر وەك چۆن خەونبینین لەداهاتوودا ڕەنگە بێتەدی، بەر شێوەیەش لە ڕابردوودا دەرپسکێت، من ئەوەت پیشان دەدەم چی ڕوویدا و چۆن بوو، تەنها کەمێك چاوت بنووقێنە، کە تۆ خەون دەبینیت، هەموو شتێکت پیشان دەدەم، دەشتوانم لەتەکدا قسانیان پێبکەم.

با دەست بەو گەمیە بکەین.

***

## مەزەندەی وا مەکە کە وایت، دڵنیابە کە وایت

ئەوەتا لەخەوبینینی شاری سۆمەرییەکان دایت، خەڵکێکی زۆر لە دەور پیاوێك گردبوونەتەوە، چون ئەوەی لەخواوەندێك بڕوانن، ساحیرێکە چون ساحیرەکانی تر نییە، بەڵکو خواوەندە و هیچ شرۆڤەیەکیان بۆ نەبوو، تەنها بەحەراوە دەفڕی و لەشوێنێکەوە بۆ شوێنێکیتر بەیەك چاو پرووکاندنی خۆی دەگواستەوە، ژیربێژییەکی سەیری هەیە، هەر بەنێو شاردا دەڕۆیشت و لێی گرد دەبووەنەوە و لێی نەدەگەڕان تا لەسەر زەویەکە خۆی بەرز نەکاتەوە، وەك ئەوەی با هەڵیگرێت. ڕوخسارێکی بەهێزی هەبوو، پرچێکی لوولی درێژ و چاوێکی وەك دەنکە ترێیەکی سپی دەرپۆقیو و جەستەیەکی

کەتەی بەهێزی هەبوو، لەهەوڵێن نیگاکردنیدا لێی دەترسایت. ئەو سیحربازە ناوی (سیمۆن ماگۆس)بوو، کە لە ئینجیلدا نازناوی (سامری)یە.

ئەو ڕۆژە مرۆڤێك پرسیاری لێکرد:

- گەورەم لە ڕیوایەتەکانی تەوراتدا نەتمانبینیوە، تۆ (مەسیح)یت؟

سامری گوتی:

- لە پەرتووك و دەسنووسەکان و لەشەریعەتی خودا مەگەڕێن، ئەگەر ئەو پەرتووك و دەسنووسانە ونبوون، ئەوا خوداش وەن دەبێت، لەناخی خۆتاندا بۆ ئەو شەریعەتانە بگەڕێن، لە دەسنووسەکان گەڕێن.

مرۆڤێکیتر پرسیاری لێکرد:

- ئەی مەزنمان بۆ نایەیتە دێرەکەمان، لەتەکمانا نوێژ بۆ خودا بکەیت؟

بزەخەنەیەك گرتی و گوتی:

- پەرستگاکان بریتی نین لە بەردی کەڵەکەبوو، ناخی خۆتان پەرستگایە.

سامری ئاینێکی تازەی لەجیهان بڵاوکردەوە، ئاینی عیرفانی، ئاینێك پەیامێکی سەرسوڕێنەری هەبوو، باسی لەخواوەندێکی نەبینراو دەکرد، کۆمەڵێك خواوەندۆچکەی داهێنابوو، یەکێکیان خەڵقەندەی جیهان بوو، یەکێکیتری دابەزییە جەستەی سامری سیمۆن ماگۆس، یەکێکی تریان چوەتە جەستەی کەسێکەوە ناوی بوو بە شەیتانیان لێنا، ئەویشی بۆ تاقیکردنەوەی بنیادەم داهێنا، ئاینێکی سەیر بوو، سەرەتا لەناو

هیندۆسـەکان و بوزییـەکان و زەرادەشـتییەکان و ئاگرپەرسـتەکان و دووردییـەکان بـڵاو بـووەوە، تەنانـەت بـۆ نـاو ئـایینی ئیبراهیمییـەکانیش شۆڕبووەوە، لای جوولەکە گۆڕدرا بۆ شتێك ناوی (کابالا)یە، شتێکی پەشە بواری شرۆڤەکردنی نییـە، لـەناو هەنـدێ مەزهـەبی مەسـیحیش بڵاوبـووەوە، لـەناو ئیسلامیشـدا لـەنێو هەنـدێ مەزهـەبی شـیعەی ئیسـماعیلی مەزهـەبی سۆفییەکاندا بڵاوە.

ئەوەندەی نەبرد دوو لەقوتابییەکانی عیسا بۆ لای سامری هاتن، تـا خـەڵکی بانگهێشـتی ئـایینی خـودا بکـەن، ئـەو دوو شـاگردەی مەسـیحیش (بیتـەر و فیلیبس)بـوون، جبریـل بـاوەڕی بـەهێزی خـودای لـەدڵیان تـابوو، بۆیـە مەسیحییەکان باوەڕیان بەڕوحی پیرۆز هەیـە کـە دابەزییـە سـەریان، خـودا ئایەتگەلێکی بۆ داگرتن ، تا لە بڵاەکردنەوەی ئاینەکەی خـودا لەسـەر زەوی ببێتـە پاڵپشـت، خـودا ئـەو دوو سـەحابەیەی خسـتە دڵـی خەڵکییـەوە تـا خۆشیانیان بووێن، شەل و کۆجیان چاك دەکردەوە، باسی پێغمەبەری خودا (مەسیح)یان بۆ خەڵکی دەکرد، پەیامی خودایان بڵاو دەکردەوە، ئـەو کـارە دژ بەکارەکانی تاکچاو بوو. ڕۆژێك تاکچاو ڕوو بە ڕوویان بووەوە، ئەو دیدارە درووست بوو.

کاتێك (بیتـەر و فیلیـبس) بانگەشـەی ئایینی خودایان دەکـرد، چاویان بـە قەرەباڵغییەك کەوت، لەپیاوێکی تاکچار گردببوونەوە، پیاوێکی کورتـەباڵا و عابایەکیشی بەسەر خۆیدا دابوو، تاکچاو لێیـان نزیکـەوە بـوو، لـەپڕ پێیـانی گوت:

– هاوڕێیان بمکەنە سەر ئاینەکەی خۆتان.

فلیبس.. هەستی کەوتە جۆش و دەستی بە شرۆڤەکردنی ئاینەکەی خودای کرد، تاکچاو ڕوخساری خۆشی دەربڕی، بەوە دڵنیای کردنەوە، دواتر بزخەنەیەکی شەیتانانەی بۆ کرد، دەست بە بڕێ پارەی زیوەوەی بۆیان درێژ کرد و گوتی:

– دەمەوێت وەك ئێوە بم، ئێوە کاری زۆر سەیر دەکەن، دەسەڵاتی چاککردنەوەی خەڵکیم پێ ببەخشن، بەهای ئەو بەخشینەتان وێدەدەم، چەندتان دەوێت ئامادەم وێتانی بدەم.

بیتەر تووڕەبوو، بە زمانێکی توند گوتی:

– پارەکەت بۆ خۆت، دڵت ڕاستگۆ نییە.

تاکچاو عاباکەی داکەند و گوتی:

– دەڵێن چی هەندێ شتتان فێرکەم کە لێی بێخەبەرن؟

تاکچاو هێدی هێدی لەسەر زەویەکە بەرزەوە بوو، دوو قوتابیەکەی مەسیح بەسەرسوڕمانەوە لێیان ڕوانی، زۆرێکیش لەخەڵکەکە گاڵتەیان پێدەکردن، وەلێ خواکەیان جێی نەهێشتن، لەپڕ تاکچاو کە بەحەواوە بوو لاقێکی شکا و بەسەر دەمما بەرەوە بوو، لەتاو ئازار ناڵەی دەگەیشتە ئەوپەڕی شار، ما خەڵکەکە پەژیوان بینەوەو هەندێکیشیان لەمەڕ ئەو پەرەجووەوە کڕنۆشیان بۆ بردن، لەنێو خەڵکەکە مرۆڤێك هاواری کرد:

– ئەو ساحیرە بەرد باران بکەن.

خەڵکەکە دەستیان دایە بەرد و سامری تاکچاویان بەردباران کرد، بەوای لاق شکاندنەکەشیەوە برشتی ڕاستبوونەوەی بۆ نەبوو. کاتێ محەمەد (د.خ) لەفەرموودەیەکدا وەسپی جەجاڵی درۆزنی کرد، فەرمووی کورتەبالاو لاقێکی گۆجە. ئەو ڕووداوە کارێگەری بەسەر لاقیەوە هەبوو، تیژ ڕەویەکەیشی بەوای (با)وە بوو، هەر وەك تیژڕەوی هەور کە بارانی هەڵگرتووەو (با)

دەیجوولێنێت، لەو کاتەی بەحەواوە بوو شکستی هێنا، وەختەبوو بیشیکوژن.

تاکچاو بەرەو ڕۆما هەڵهات، لەوێ عەقڵ و دڵگەلێکی لەخۆ گرت، ئەوەندەی زانیاری تێیاندا ئاخنی سەرسامیانی کرد، نەک هەر ئەوەش بەڵکو وەک خواوەندێك تەماشایان دەکرد، لەوێ ناویاننا (سانکۆس) خواوەندی عەقڵ و متمانە و باوەڕ و زۆرێك لە عیرفانی خۆی خستە بیروباوەڕی خەڵکەکەوە، کە وەک خوێن بەدەمارەکانیاندا دەهات و دەچوو، ئەوجا سامری ئەوێی جێهێشت.

***

# ئەگەر ڕانە مەڕەکە لەیەك دابڕان، ئەوا گیسکەگەڕ پێشڕەویان دەکات

لەتاریکیداو نزیك دەریای (ئازۆف)ی ئەو دەریا بچووکەی سەرووی دەریای ڕەش کەوتووە، دوانزە شۆڕەسوار بە ئەسپەکانیانەوە شۆڕەسوارێك پێشڕەویانی دەکرد، کەسێکی تاکچاوی ڕیش چرپڕی بەردابووەوە، شۆڕەسوارێك بەناوی (ئۆدین) دەرکەوت.

سێزدە جەنگاوەرەکە هیچ شەڕێکیان نەدۆڕاندبوو، تەنانەت (ئۆدین) پاڵەوانێتییەکەی لەعەقڵی کەسدا نەبوو، لەنێو گەلێکی نەفام و گێلۆکەی وەك ئەسکەندەنافییەکان هەواڵەکە وەك چاوەقوله(تاعوون) بڵاو ببوەوە.. پیاوێك کەس نەسەریدا سەر نەکەوتووە، ئەگەر بە شۆڕەسوارەکانیەوە دابەزێتە هەر شەڕێك لەبەرامبەر هەر ژمارەیەکیشدا بوویێت نەیدۆڕاندووە،

هەر سەرکەوتوو بووەو سەرکەوتنی مەزنیشی بەدەست هێناوە، لەدیدی خەڵکییەوە زۆر مەزن بووە، ئۆدین هەر خودی سامری بووە.

شاری (ئەسگارد)ی وەك بارەگایەك بۆ خۆی و لایەنگرانی دانابوو، کە دوازدە قەشەبوون، پێیانیان دەگوت (دایار)ییەکان(دێرانجییەکان)، گەڵ قوربانی پێشکەش دەکردن، قوربانییەکانیش بنیادەم بوون، هەرچی ئۆدین بوو لەنێو ئەسکەندەنافییەکاندا ئاینێکی بڵاوکردبووەوە، وەك پەتا وابوو، ئەوەشی نابووە دڵیانەوە کە ئەو ژیانی بەدنیا بەخشیوەو خوڵقاندوویەتی، چاویشی لەسەر زانست و ژیریی و دانایی داناوە، دواتر سووپایەکی درووستکردووە، سووپایەکی ئەفسانەیی لە ئەسکەندەنافییەکان پێکهێناوە، ئەوەشی لەنێویاندا بڵاوکردووەتەوە، ئەوەی دەکوژرێت دەچێتە لای ئەو حۆرییانەی خاکی پڕ بەرەکەت کە ناوی (ڤالاهالا)یە. ئۆدین بەردەوام عاباو کڵاوێکی بەسەرەوە بوو، دوو جنۆکەی گورگ ئاساشی هەبوو، ئەوانیش (جیری و فریکی) بوون، لە قەلەڕەشەکانیش (هۆجین و مۆنین) بوون هەواڵەکانیان بۆ دەهێنا.

١٧٠ ناوی هەبوو، هەر ناوێکیشی گوزارشتی لەشتێك دەکرد، لەوانەش خواوەندی، لایەنگرانی واتێگەیاندبوو، لە کۆتایی زەماندا جەنگێك بەرپا دەبێت، جەنگی وا گەورە نەبووە، خواوەند ئەو جەنگە دەدۆڕێنێت و دنیا کۆتایی پێدێت.

بایەتەکە تەنها ئەسکەندەنافیا نەبوو، نیوەی ئەورووپاشی بەو وەهمە سەرقاڵکردبوو. ساڵ هات و ساڵ ڕۆیشت زۆرێك لە بنیادەمەکان (ئۆدین)یان دەپەرست، ئینگلیزەکان زۆربەیان لەوانە بوون، باوەڕیشیان وابوو کە ئۆدین دامەزرێنەری بنەماڵەی پاشایەتی ئینگلیزەکانە و تەنانەت (ئەنجلۆساکسۆن)ییەکان کە بۆ یەکەمجار حوکمی ئینگلتەرایان کرد،

(ئۆدین)یـان وەك دامەزرێنـەری وەچـەکانیان بێـت، یەکـەم مەملەکـەتیش حوکمی (سوید)ی کرد، هەر (ئۆدین)یان بە دامەزرێنەر و یەکەم پاشا بێت لەحوکم کردنیدا، تەنانەت (ئۆدین)ی تاکچاو ناوی چووە ناو ڕۆژەکان و هەفتـەکان، ڕۆی چوارشـەممەیان بـەناوی ئـەوەوە نـاو نـا، تـا ئـەمڕۆش (ئۆدینزدای)کە دواتر بـوو بـە(Wendnesday) و هـەر بـەو بۆنەیەشـەوە کوڕی ئۆدین خواوەندی (گا)یە و مەلگری چەکوشە بەناوبانگەکەیە. ئۆدین زۆر لـە ئـەورووپا نەمایـەوە، وەك تـیر بـەرەو شـوێنێکی دی و گـەلێکی تـر بەڕێکەوت.

***

## کاتێك هەرچی و پەرچییەکان حوکمی جیهان دەکەن، تەنها زۆرێك لە هەرچی و پەرچی زایندە دەبن

تاکچاوی جوولەکە شار بەشار و ولآت بە ولآت دەگەڕا و بیرۆکەی خۆی بەنێو بنیادەمەکانـدا بلآودەکـردەوە، هـەموو جارێـك نـاوی خـۆی و مەزهەبەکـەی دەگۆڕێت، مەبەستیشی یەکخستنی ولآتەکان نەبوو؛ بەڵکو بۆ ئـەوەی لەیـەك دابڕێن. تۆ بزانیت یا نەزانیت بووزییەکان چوارەمین و گەورەترین ئاینەکانـە کە لەجیهاندا بلآو بووەتـەوە، ولآتـانی ئاسیا وەك ژاپـۆن و چـین و کۆریا و تایلاند و تایوان و کەمبۆدیا لەخۆ دەگرێت، لەپڕ لەنێو هەموو بووزییەکانـدا و لەسەدەی سێیەمی زایینی ناوێکی نوێ هاتە ئاراوە؛ پیاوێك بـەناوی لـۆرد مایتیریا(maiterya) هەبوو.

هەموان باوەڕیان وابوو ئـەوە درێژەپێدانی بووزای مامۆسـتای مەزنـە، کـە لەهەموو خواوەندەکانیتر مەزنترە، لەکۆتایی زەماندا دێت و خـەڵکی بـەرەو

فێرگەی ڕاستەقینە ئاراستە دەکات، ئەو بیرۆکەیە بڵاوبووەوە، کە بووە سەرچاوەیەکی بەهێز لە بوژییەت و تەنانەت زۆرێک لە جەنگەکان و شۆڕشەکان بەوای ئەوەوە لەچین بەرپابوون، کاریگەری بەسەر زۆرێك لە ئاینەکاندا هەبوو، تەنانەت لەم سەردەمی تازەیەشدا هەندێك بزووتنەوە کە بووزی نین بە بیرۆکەکە کاریگەرییان بەسەرەوە دەرکەوت، چاوەڕوانی لۆرد مایتریا دەکەن. جارێکیان وێنەی کابرایەکیان لە کینیا بڵاوکردەوە، کە ڕوخسارێکی توونەڕەو و پۆشاکێکی شامۆی لەبەردابوو، خەڵکێکی زۆر بەدەوریەوە کۆبوونەوە، بەبەر چاویانەوە کاری پەرجۆیی نمایش دەکرد، گوتیان ئەوە مەسیحەو هاتووەتەوە، وەلێ دواتر دەرکەوت کارەکە نیمچە فێڵێکی تێدابوو، ڕەنگە ئەوە پیاوێکی ئاسایی بێت و بۆ نوێژکردن هاتبێت. لۆرد مایتریا هەر خودی سامری بوو.

هەموو ئاینەکان و گەلان بیرۆکەی خوڵقاندنی جیهان بۆ خواوەندێکی نەبینراو دەگەڕێننەوە، ئەوەش ئاینێکە سامری داینەهێناوە، ئەوە لۆسیفەرە لە بابل لەلای نەمروود دایهێنابوو، کە خودی خۆی خواوەندی هەتاو بووەوەو جیهانی خوڵقاندووەو سەمیرئەمیسی هاوسەریشی خواوەندی مانگ بووە، کوڕەکەشیان خواوەندی تەمووز بووە. سامری ئەو ئاینەی لەمیسر لەخۆ گرت، کاتێك بنەماڵەی چوارەم بوو بە قەشەیەکی مەزن سیانەی فیرعەونیبیاسی بۆ دەرهێنا، کە هەزار ساڵ فیرعەونەکان پەرستیان، لەبنەماڵەی پێنجەمەوە تا کۆتایی فیرعەونەکان (ئاموون)ی مەزن کە خۆی خوڵقاند و لێل خواوەند (رع) یەکیانگرت و دواتر لەتەك خواوەند (بتاع) خوڵقێنەری جیهان یەکیان گرتەوە، هەرسێکیان بوون بەیەك، ئەو یەکەش سیانن.

ئەو بیروباوەڕە لەمیسر و بابل بۆ هەموو جیهان تەشەنەی کرد، ئەویش بە بانگەشەی تاکچاو سامری گەڕۆك کە پەرەجووی دەکرد، تا گەیشتە هیندۆسییەکان، کە دەیانگوت خواوەندێکی مەزن بەناو (براهمان) سێ بوونەوەری لێبووەتەوە، یەکێکیان جیهانی خوڵقاند، ئەویش (براهمان)بوو، یەکێکیتریان لەجیهاندا کاری خراپی دەکرد، ئەویش (شیف)بوو لە عیرفانییەت(gnostisizm) کە هاوتای ئیبلیس بوو، سێیەمیشیان پارێزگاری جیهانبوو، ئەویش (فیشنۆ)بوو، کە لەکۆتایی زەماندا دێتە خوارەوە ناویشی دەبێت بە (کالکا)و جیهان ڕزگار دەکات. بەدەر لەسەختی و ئاڵۆزی بابەتەکە، وەلێ سامری خستیە دڵی جوولەکەکانەوە و بەو ئاوایە بیرۆکەی (کابالا) داهات، بەوشێوەیە لای جوولەکەکان باوەڕیان وابوو، خواوەندی نەبینراو (یەهوا)یەو چوار بوونەوەری لێ بووەتەوە، یەکێکیان (yetzirah)یە و هەر ئەویشە جیهانی خوڵقاندووە.

دواجار و دوای دووسەد ساڵ لە هەڵکشانی مەسیح، ئەو دەمەی شاگردەکانی مەسیح نەمابوون، ئەو بیروباوەڕە چووە ناو ئاینی مەسیحیەتەوە، بوونەوەری نەمر بوو بە (ئالاب) کە مەسیحی کوڕی لێ بووەتەوەو جیهانی خوڵقاندووە، لەویشەوە بوونی سێیەم ڕسکاوە کە ئەویش (ڕوحی پیرۆز)بووە.

بیرۆکەی دەرکەوتن لە خوداوە ، یا ڕۆڵەی خودا، ئەوە ڕێی تێدەچێت بۆ کەسانێك لە گۆشت و خوێن بیدرکێنن، یانەخۆ مەزەندەی ئەوەیان لێبکەن لەخوداوە هەڵقووڵاون، سێ لەسەر چواری خەڵکی لەم جیهانەدا بەشێوەیەکی جیاواز باوەڕیان پێیەتی، هیندۆس، بووزییەکان، جوولەکەکان، مەسیحییەکان، هەر ئەو بیرۆکەیەیە کە جەجاڵ بەکاری دەهێنێت کاتێ خواوەندی خۆی بەجیهان ڕادەگەێنێت، وەلێ ئەو خواوەندێك نییە لەخودی

خۆی، ئەوەش هەمان بیروباوەڕە کە لە قورئاندا تانەی لێدراوە، خودا لە ئایەتێك فەرموویەتی(( جوولەکە گوتیان عەزرا ڕۆڵەی خوایە، مەسیحەکان گوتیان مەسیح ڕۆڵەی خودایە، بەوە شێوەیە لەوانە زیاتر خوانەناسی دەکەن، خودا سزای دان کە لەسەر هەق لایاندا)).

بیروباوەڕی ڕۆڵەی خودا یا ئەو ڕوحەی لەخوداوە لەبنیادەمی گۆشت و خوێن ڕسکاوە، دێت و لەکۆتایی زەماندا جیهان ڕزگار دەکات، بیرو باوەڕێکبوو لە هەموو دنیادا بلاوبووەوە، بەو شێوەیە بووزییەکان باوەڕیان بە مەسیحی جەجاڵ کە لەکۆتایی زەماندا وەك مایتریا دەردەکەوێت و لای هیندۆسەکانیش وەك کالکا و لای مەسیحییەکانیش وەك عیسا، کەسیش بە سووکی نازانێت جەجاڵ بەخۆی بڵێت خواوەندە، چونکە هەر هەموویان نێردراوی خوداوەندییە بۆ سەر بنیادەم دابەزیوە، جوولەکەکان باوەڕی پێ دێنن چونکە مەسیحی چاوەڕوانکراوە( هاماشیح)ە و لەتەوراتدا و لە ڕیوایەتی (زەبووری دووەمدا) کە خودا ڕۆڵەکەی دەنێرێتە خوارەوە ، زۆرێك لەخوانەناسەکان بەوای کارە پەرەجووەکانیەوە باوەڕی پێ دێنن، بەو ئاوایەش حوکمی سێ لەسەر چواری دنیا دەکات، هەندێك لە موسڵمانەکانیش نەفرەتی دەکەن، چونکە محەمەد(د.خ) لێی ئاگادار کردوونەتەوە، ئەوان لەژێر سایەی پیاوێکی ماڵپاتی پێغەمبەر بەناوی (مەهدی)یەوە بەرامبەری دەجەنگێت، جەجاڵ زاتی نزیکبوونەوەی لەمزگەوتی (ئەقسا) ناکات، دواتر خودا بەزەیی خۆی بەسەر دنیادا دادەگرێت و مەسیح دەنێرێتە خوارەوەو جەجاڵ دەکوژێت، ئەوجا مەسیحییەکان باوەڕ بەوە دەکەن کە جەجاڵ مەسیح نەبووە، موسڵمانەکانیش باوەڕیان پێدەبێت، جوولەکەیش هەروەسا، ئەوجا هەر هەموو دنیا باوەڕ بەعیسا دێنن.

# ئەوەی کارەکانی ئەو هەموو ساڵانەم بەهەند وەرنەگرێت، شایانی ژیان نییە

من و تۆ بەسەر شەپۆلەکانی ئۆقیانووسی ئەتلەنتیکەوە دەفڕین، بەرەو دوورگەیەك دەڕۆین، هیچ بنیادەمێك پێینەگەیشتووە، ئەوەش دوورگەی تاکچاوە. لەجیهانی خەونبینینەکاندا دەتوانین کوێمان بوێت بۆی بچین، ئەوەتا دوورگەکە لەوێیە، لای هەمووان نادیارە، وەك خاڵێك وایە بەسەر ئۆقیانووسەوە و هەر ئەوەتا دیارە، لە مێژوودا بەو دوورگەیە کەس نەگەیشتووە، وەلێ ئەوە قەدەرە دووجاران کەسانێك ڕێیان بەوێ کەوتووە، ئەوانیش یەکێکیان دەریاوانە وێڵەکەی فیرعەونی و دووەمیشیان پیاوێك لە سەحابەکانی محەمەد(د.خ) بەناوی (تەمیم ئەلداری)یەوە.

دوورگەیەکی بەردەڵان و هیچ شتێك لەیەکی جیا ناکاتەوە، خۆ ئەگەر پاپۆڕێك تێپەڕێت، سەرنشینەکانی هەستی پێ ناکەن، من و تۆ چووینە ژوورەوەو لەدەوروبەری خۆمان دەڕوانین، نەکەی ئەو گیانەوەرە نامۆیە بترسێنیت، ئێمە لەم جیهانی ڕوحەدا دەکرێت چاومان بەجنۆکە بکەوێت، ئەو گیانەوەرانەش لە گیانەوەرانی جنۆکەن، یەکێکیان ئەوەی بەرامبەرمان تووکنە و دەڵێیت (گۆریلا)یە، وەلێ بەهێمنی بەڕێوە دەڕوات، ئەوە هەر هەمان ئەو گیانەوەرەیە کە هاوەڵەکانی (تەمیم ئەلداری) بە سیخۆڕ ناوزەدیان دەکرد، هەر وەك بنیادەم گفتوگۆیان دەکرد، جەجاڵ دەیتوانی لەگەڵ گیانەوەرانی جنۆکەکانیش قسان بکات، چۆنیشی بوویستایە وای ڕادەهێنان، گیانەوەرە سیخۆڕەکەی وا ڕاهێنابوو، هەر کەسێك لەدوورگەکە نزیك بێتەوە هەواڵەکەی پێبگەیێنێت، تا دەستبەجێ بیکوژێت، یا بەخۆی بەدواداچوونی بۆ دەکرد.

لەناوەندی ئەو خاکی بەردەلانەدا بینایەکی ڕەشی بچووک دەرکەوت، لە (دێن) دەچوو، ئەو پیاوە حەزی بە کڵیسەی سەر دوورگە بوو، تۆ بەسەرهاتەکەی دەزانیت و گوێت لێبووە، کاتێک سلێمان لەدوورگەی (حنێش) دەستبەسەری کرد و لە تابووتێکی ناو لەدەریای هاویشت، ئەودەم لە دوورگەی (حنێش) ئاکانجی بوو، کە دەکەوتە نێوان یەمەن و میسر و حەبەشەوە، بۆ بەدەستهێنانی زانیاری و زانستەکان ئەودەم گەشتی زۆری نێو شارو وڵاتەکانی دەکرد، ئەو پیاوە هەر بەدوای زانستەوە بوو، هەر زانستێك لای بنیادەم دەدۆزرایەوە، ئەم تێیدا زۆرشتزان بوو.

نووکەش لەم سەردەمی خەوبینینەی ئێمەدا دوای هەڵکشانی مەسیح بە شەشسەد ساڵ و دوای ئەوەی جەجاڵ تۆی شەڕی لەنێو هەموو گەلاندا ناپەوە، ئەوەتا لەدوورگەیەکی ناو ئۆقیانووسی ئەتڵەنتیك پاڵی لێداوەتەوە، جنۆکە شەیتانەکانیش هەرچی هەواڵێکی لێ داواکردبن بۆی هێناون، لەنێو خەوبینینەکەماندا و لەبەرامبەر کڵێسە تایبەتەکەی دابەزین، دەرگا نەخشێنراوەکەی بەنەخشی (سوور و ڕەش)مان کردەوە، زەمینەیەکی بەرفراوانمان بینی، وێنەی ئەستێرەی گەورەی شەیتان بە ڕەنگی ڕەش و سوورەوە بەسەریا کێشراوە، دیوارگەلێکی بەرز، یەك لەو دیوارانە ناوی(ئەڵلا)ی بەخوێن پرژاندنەوە، پەیکەرێکی سەربەرەوخواری مەسیحیشی ها بەسەرەوەو خوێنی لێ دەتکێت، تاکچاو لەلای سەکۆیەکی دار نزیك بە پەیکەری سەربەروخوارەکەی مەسیح ڕاوەستاوەو سەرقاڵی خوێندنەوەی شتێکە، ئێمە لەپشتییەوە دەمانبینی.

ڕوحی ئەوڕۆ گڕی گرتووە، پێغەمبەر محەمەد لەپڕ لەو بیابانی کۆچەری کە هیچ شارستانیەتێکی تێدا نەبووە دەرکەوت، چەند ساڵێکی کەم توانی دەسەڵاتی بەسەر بیابانی عەرەب لەڕووی فیکرو سەربازییەوە لەخۆ بگرێت،

هەموو تاریکی ڕەواندەوە، هەموو ئەفسانەیەکی کوێر کردەوە، ئابرووی هەموو شەیتانەکانی برد، هیچ پەرەجوورییەکیشی نەبوو، وەك ساغکردنەوەی چاوی نابینا، زیندووکردنەوەی مردوو، دوولەتکردنی دەریا، دارعاساشی نەبوو بەماری بکات، تەنها قسەی لەتەك خەڵکەکە دەکرد و هزریانی ڕووناك دەکردەوە، جەجاڵ ویستی بەخۆی دابەزێتە لای محەمەد، وەك چۆن بۆ لای پێغەمبەرەکانی تر دابەزیبوو، وەلێ لەرز دایگرت و ترس ئامبازی بوو، ئێمەش ڕوحمان لەو خەونبینینە لەرز دایگرتبن، تەنها دەنگێك لەپشتەوە هات:

– بە محەمەد ناوێریت، ئەگەر زەویش شەق بەرێت.

تاکچاو بەتوورەییەوە ئاوڕی لە شوێنی دەنگەکە دایەوە، دەشیزانی دەنگەکە کێیە، تەماشای خاوەن دەنگەکەمان کرد، ڕوخسارێکی ترسناکی هەبوو، پرچ درێژێکی نە پێش ئەو نەپاش ئەویش شتی وا بووەو دەبێت، بۆ خۆت دەزانیت لۆسیفەر کێیە. لۆسیفەر بە نیگا هێمنانەکەیەوە گوتی:

– نووکەش بیرمە چۆن سپێرمی بنیادەمم هەڵبژارد، تا تۆی بەو هزری خۆمە بڕسکێنم، ئەو سپێرمەم لە وەچەی جینۆن دزییەوە، لەکەشێکی سروش ڕووناهی، پیاوێکی گێلۆکە ژنە گێلۆکەکەی وێدام و مەیش ئەو سپێرمەی بنیادەمەی هەڵمبژاردبوو، ئەی (میکا) تۆم تیا چاند.

میکا بەدڵێکی گڕگرتووەوە هاتە دەنگ و گوتی:

– بۆچی ڕێم لەمحەمەد پێدەگریت؟

شەیتان دەستی بەرزەوە کرد و تاکچاو وەك ئەوەی تووشی شۆك بووبێت، کەوتە سەر پەیکەرەکەی مەسیح و خستییە خوارەوە. شەیتان گوتی:

- دەزانیت بەیەك نیگاكردنێك چیم بوێت پێتی دەكەم، تۆ جارێ نەگەیشتوویتە زانستی تەواو.

تاكچاو لەسەر گازەرەی پشت كەوت و ئازارێكی زۆری بوو، تەنانەت هەستی بەدەوروبەری خۆیشی نەدەكرد، لێ هەستی بەشتێك كرد، بەسەر دەست و پێیەوە، كە لێی وردبووەوە، دەست و پێی لەكۆتا بوو، لۆسیفەریش پشتی تێكرد و گوێی وێنەدا. تاكچاو هاواری لێكرد:

- چیم لێدەكەیت؟

لۆسیفەر بێ ئەوەی لای لێبكاتەوە گوتی:

- لووتبەرزییەكەت هەموو شتێكمان لەدەست دەدات، لێرە دەمێنیتەوە تا خۆم ڕێت دەدەم، جنۆكەكان هەواڵەكانت بۆ دەگوێزنەوە، هەندێ لە بنیادەمەكان لەسەر زەوی كارت بۆ دەكەن، بەفەرمانی تۆ دەجوولێنەوە، فێرم كردیت ئەو دەمەی هەموو دنیا كڕنووشت بۆ دەبەن و دەتپەرستن، ئەو كاتە دەبێت كە لەكۆتایی زەماندا دێیتە خوارەوە، بەو ئاوایەی كە تۆ مەسیحی چاوەڕوانكراویت، ئەوەی كە ماوە تەنها چاوەڕوانییە.

تاكچاو بەتووڕەییەوە پێیگوت:

- لێمگەڕێ دڵیان پیس بكەم، وەك چۆن تۆ دڵی ئەوانی پێشووترت پیس كرد.

شەیتان لای لەتاكچاو كردەوەو گوتی:

- ئەگەر ئەمڕۆ دابەزیتە نێو ئەو خەڵكە، باڵبەستت دەكەن و بە بان مینارەی مزگەوتێك لە مزگەوتەكانیان هەڵتدەواسن، ئەوانە جیاوازن

تەنیاحاجی

Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel

Description

بسم الله الرحمن الرحیم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایەن { هۆزان شهاب انور }
کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

t.me/tanyahaji7
Invite Link

لەهەموو ئەوانەی ڕوو بەڕوویان بوویتەتەوە، وەك خۆت بمێنەرەوە، چاوەڕوان بە بزانە چییان بەسەر دێنم، ئەگەر لەیەك دابڕان و دڵیان گۆڕا، ئەوە ئەوانیش وەك ئەوانەی پێشووتریان لێدەکەم، هەر کە وادەت هات، لەهەموو ئاوەدانییەك دابەزەو چیت دەوێت بیکە، ئەودەم کەس ناتوانێت ڕێت پێبگرێت، بیرۆکەی مەسیحی دڵسۆز و ڕزگارکەر کە هاتە بەر باس، کەس ناتوانێت ڕێی پێبگرێت، تەنانەت فریشتەکانیش ڕێیان پێناگیرێت.

***

## *** تەواو ***

ماوڕێی نهێنیم.. دوای ئەوەی دووی زانستە شاراوەکان کەوتین، گەیشتنی ئەو زانستە بەدەست ڕێکخراوە نهێنییەکان و دوای ئەوەی تا دوورگەی ئاکچاویش کەوتین، تێگەیشتین ئەوانە چاوەڕوانی ئەون، لەتەکدا تەنها یەك نامەی کۆتایی ماوەو دوا ریوایەتیش کە باسی بکەین.

سەرەتا با شتێکت بۆ ئاشکرا بکەم، زۆرێك لە پەرتووك و دەستنووسەکان شاردراونەتەوە، دەستنووسی تەوراتی جوولەکە کە بۆ مووسا دابەزی، ئینجیلی مەسیح کە بەدەست شاگردەکانیەوە نووسرابوون، ئەوەی زانراوە کۆنترین دەستنووسی ئینجیل بەتەواوەتی لە فاتیکانە، کە بۆ سەدەی چوارەمی زایینی دەگەڕێتەوە، یانی دوای هەڵکشانی عیسا بە ٤٠٠ ساڵ، کۆنترین تەوراتیش بە بەش بەش لە ئەشکەوتی (قەمران) دۆزراوەتەوە، کە دەگەڕێتەوە بۆ سەدەی سێیەمی پێش زایین، یانی دوای مردنی مووسا

بەهەزار ساڵ، وەلێ دەستنووسگەلێك هەن، مێژوویان زۆر لەوانەش كۆنترە، لە ڤاتیكان پارێزراوەو شاردراوەتەوە، چونكە دەركەوتنی دەبێتە هۆكاری كێشەیەكی گەورە بۆ گەورە قەشەكان و پاپاكان لە دەسەڵاتی ئاینییاندا، كە ڕەنگە ئاشكرا بكرێت و ئەو دەسەڵاتە لەدەستی بدەن، یەك كەس لەدەرەوەی جیهانی پاپا و كەشیشەكان پێیدەزانێت، دەریاوانێك كە بەهەڵسوكەوتی نامۆیی بەناوبانگە، ڕەنگە بەسەر پشتی دەریاكانەوە سەیرترین دەریاوان بێت، ئەویش بەسەرهاتێكی خۆی هەیە، ئەو دەریاوانە ناكرێت ببینرێت، لەسەر شاشەی سینەمادا نەبێت، ڕێم وێدە بتبەمە سینەمایەكی دیاریكراو، لەخۆم و خۆت بەولاوە كەسی تێدا نەبێت، سینەمیشمان شەیتان دەبێت.

پێنج كارتی جوانمان هەیە:

كارتی یەكەم.. كارتی دادگای لێپرسینەوەیە، وێنەی مرۆڤێكی هـا بەسەرەوە، قەشەی مەسیحی ئەشكەنجە دەدات.

كارتی دووەم.. كارتی جەردەی دەریایە، وێنەی جەردەیەكی بەسەرەوەیە باڵندەیەك بەسەر شانیەوەیە.

كارتی سێیەم.. كارتی جەردەی دەریا، وێنەی جەردەیەكی قۆزی بەسەرەوەیە.

كارتی چوارەم.. شارتی گەنجینەیە، جەردەیەكی دەریای بەسەرەوەیە گەنجینەیەكی شاراوە دەردەهێنێت.

كارتی پێنجەم.. كارتی شەیتانە، وێنەی شەیتانێكی شاخداری بەسەرەوەیە، هەندێ دەستكەوتی نامۆی هەڵگرتووە.

ئێستا پشوویەك بدەو لەتەكما وەرە.

***

# کۆتا ڕیوایەت

لەدەوروبەرێکی تاریکی نیویۆرك دا، کە دڵی ڕەشی تاوانباران لەگەڵ کزیوونەوەی ڕووناکی یەك دەگرن، دوای نیوەشەو و لە شەقامێکی وێرانەو بێ ئەوەی بنیادەمێکیش بەدەرەوە بێت، دووکانەکانیش کلۆم دراون، تەنها ڕووناکییەکی کزۆڵەی تابلۆی سینەما نەبێت هەڵبووە، ئەویش بەدەم پرتە پرتەوە نووسراوەکەی دەردەکەوت و دەرنەدەکەوت(cinema ja...) ئەو دوای پیتەکانی بەرییوونەتەوە، پۆستەری فلیمەکان بەدیوارەکەوە ڕەنگیان پێوە نەماوە، ئەو سینەمایە کە لێی نووسراوە بۆ فرۆشتن، سالآنێکە چۆلکراوە، ناوەوەی سینەماکە ئیسفەنجەکانی خوراوەو شاشەکەش لەبنیشیەوە شەقی بردووە، لەوێ لەڕیزی پێشەوەی کورسییەکان پیاوێك دانیشتووەو لەسەرمان دەلەرزێت و چاویشی هەر لەشاشەکە بڕیوە. بۆبی فرانك لەدواین دەرکەوتنیدا. کۆمپیوتەرێکی پێکراو لەسەر کورسییەك لەسیلەی پیاوەکە دانراوەو هەموو شتێك ڕیکۆرد دەکات، لەپڕ شاشەی سینەماکە بە چرایەکی سپی هەڵبوو، ڕووناکییەکەی دەتکوت لەرز گەتوویەتی، بۆبی بەوای تیشکەکەوە چاوی نووقاند، تەماشای کرد، شاشەی کۆمپیوتەرەکەش بە ڕووناکییەکی سپی هەڵبوو، ئەویش پەتای لەرزەکە گرتبووی. بۆبی لەتەك خۆیدا کەوتە قسەکردن:

– کاتی ئەوەیە (دیکۆی) دواین شەیتان بێتە خوارەوە.

بۆبی هەستی بەسێبەرگەلێك کرد، بەسەر کورسییەکانەوە دەجوولانەوە، تا لەدیوارەکەدا ونبوون، دواتر یەك سێبەر دەرکەوت، ئەویش لەناوەندی شاشەی سینەماکە دەرکەوت، ما کەسێك هێدی هێدی بێتە پێشەوە، بۆبی لای لەڕاستی خۆی کردەوە، کە شاشەی کۆمپیوتەرەکەی بینی، هەمان دیمەنی سەر شاشەی سینەماکەی بەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەوە بینی، سێبەرەکە ئەوەندە نزیکبووەوە، وا دەردەکەوت چون ئەرەی لەشاشەکە

بێتە دەرەوە، بۆبی لە ورتە ورتی خۆی نەکەوت، ئەوجا گوێی لەدەنگێکیو، دەنگی دیکۆی بوو:

- بۆبی تۆ لەئاستێکی نزمدا دانیشتوویت، هەموو ڕۆژێك بنیادەمەکان بە چاوی بێ ئاگاوە لەو شاشەیە دەڕوانن، بەدڵ دەیپەرستن، وەك ئەوەی هەموو جیهانی لەخۆ گرتبێت، هەر وەك ئەوەی ئەو شاشەیە خواوەند بێت، بۆ ئەو شاشە زەبەلاحەش شاشیلێکی بچووك هەن، حوکمی جیهان دەکات، وەك گایەلیش خاوەنەکانی دەدەنە پێش.

سێبەرەکە لەشاشەکەوە هاتە دەرەوە، هێند نزیکەوە بوو، تا لەبەرامبەر بۆبی ڕاوەستا، (بۆبی)ش بەوای ڕوخساری شەیتانییەکەی بەرامبەری دەمی داچەقابوو، عابایەکی درێژ و پرچی بەجوانی دامێنابوو، دەموچاویشی ناشرینترین ڕوخسار بوو، کە شەیتان هەڵیگرتبوو، دیکۆی شاوڕی دایەوەو بەرەو لای شاشەی سینەماکە ڕۆیشت و گوتی:

- ئەو شاشانە هۆش و بیرو زانیاری و ژیان و خانوادەو هاوڕێیانن و قسانیان لەتەکا دەکەن، ئەوەندەشیان بەسە لەگەڵ شاشەکان دەدوێن، شاشەکان مزریان دەبووژێننەوە، بژێویان دەدات، کاتێ دەچنە عیشقەوە چاو لەو شاشانە نابڕن، وەك گێلۆکە هەر ئاخ هەڵدەکێشن، وەڵێ ئەو شاشانە بەوەشەوە نەوەستاون، هەرچییەکیان بوێت بۆیانی دەکەن.

دیکۆ دەستی نایە سەر دەموچاوی وەك بزنمژۆك گۆڕا، بۆ دەموچاوی پیاوێکی ئاسایی، ئەوجا قسەکەی تەواوکرد و گوتی:

- وایلێهات شاشەکان گوێی لێیاندەبوو، دەیانبیینی و نهێنییەکانیانی لەدۆسیێ دەنووسیەوە، تا وایلێهات بەنهێنییەکانیانەوە کێ نۆدی وێدابن پێی دەفرۆشتن، هیچ هێزێك نییە لەو شاشانە دوورت بخاتەوە، چونکە کویلەن، هۆ بۆبی تا مردن هەروا دەمێننەوە، خەڵکی بەمردنیشیان نازانن، تەنها لەڕێی شاشەکانەوە نەبێت.

دیکۆی دەستی لەسەر شاشەی سینەماکە دانا، سینەماکە لە لەرزە لەرز کەوت، ڕووناکییەکەشی لە پرتە پرت کەوت، بەدەنگی شەیتانییەکەی گوتی:

- ئەوانەی وێنەیان لەسەر شووشە پیشان دەدا ساحیرەکان بوون، ئاوێنەو کریستاڵیان پێبوو، ئەمڕۆ ئەو شووشانە گەردنی بنیادەمەکانیان هەس، وەك چۆن ساحیرەکان کەللەی پێشینانیان پێ ڕیسوا دەکرد.

دیکۆی دەستی بەرز کردەوەو ئیشارەتی بۆ بۆبی فرانك کرد و گوتی:

- تۆ هەموو شتێکت زانی، ئەوەی زۆرشتزانیش بێت دەمرێت، ئەگەر تۆ دەسەلاتت بەسەر زیرەبێژی شەیتانا هەیە، وا نەبوایە من نەدەهاتمە لات، ئەوەشم پێت ڕانەدەگەیاند کە لەسەر زمانم بوو، بەگیانی ئیبلیس بەسەر دڵما ئەستەنگە کە بەشێکی بە بنیادەم ڕابگەێنم.

دیکۆی چرچاوی گرژ کرد، گوتی:

- ئەوەیان پیشان نادەم ئەوەی نەمبینیبێت، ئەوە فیرعەون بوو گوتی کاتێ خەڵکەکەی دابووە پێش، ئێمەش هەر دەیاندەینە پێش، وەلێ ئەمڕۆ پێت دەڵێم، ئەوەی ڕاستییە ئەوەت پیشان دەدەم، لەڕاستیدا ئەم شاشەیە زۆرێك لە فیلمی جەردەی دەریای بەجیهاندا بلاو کردووەتەوە، کە تۆ هاتوویت چیرۆکەکەی ببینیت، هەر هەمووشی درۆیەو پەیوەندی بە ڕاستییەوە نییە، لەبەر ئەوەی چیرۆکە ڕاستەقینەکەی لەنێو لاپەڕەی کتێبەکاندا وەك ئەوەی لەگۆڕ نرابێت و لەبیر چووبێتەوە، ئەم شاشەیەش بەشێك لەو ڕاستیە لەگۆڕ نراوەت بۆ دەخاتە ڕوو، هەموو گرتەیەك بەهەند وەربگرەو لێی غافڵ مەبە.

***

# بەشی دەیەم

## جاك سپارۆ

## ١٥٥٠ پاش زایین _ ١٦٠٠ پاش زایین

***

شاشە گەورەکەی سینەماکە تاریکەوەبوو، بێ هیچ پێشەکییەك فیلمەکە دەستپێکرد.. کچۆڵەیەك کراسێکی درێژی لەبەردایە، هیچ شتێك بەدەوریەوە دیار نییە، گوێمان لە مۆزیکێکە لەپشتەوە دێت، ئەوجا منداڵەکە دەست بەگۆرانی گوتن دەکات، پێشبینی ئەوە دەکرا ئەوە هێمنی بەر لە زریانەکە بێت(( برۆن بە پاشای ڕابگەێنن، ئەمە لەبەر من بەو بڵێن، ئەگەر هەموو زەوی هی ئەو بێت، ئەوا هەموو دەریاش هی منە)).

دەستێك سەرشانی کچۆڵەکەی گرت، لەپڕ بارودۆخەکەی دەوروبەری وەك دەرکەوتنی گرتەیەکی سینەمایی دەرکەوت، دیمەنەکە لەڕێگایەکدابوو، سەدان کەس بۆ شتێك گردبوونەوە، کچۆڵەکە سەری هەڵبڕی، تا ئەوەی دەستی بەسەر شانیەوەیەتی بزانێت کێیە، باوکی بوو، پێیگوت:

- مۆریا.. ئەو گۆرانییە باش نییە مەیڵێ، ئەوە گۆرانی جەردەکانی دەریایە.

ڕوخساری خەڵکەکە لادێی و ئاسایی بوو، وەلێ شڵەژاوییان پێوە دیارە، کارەساتێك بەڕێوەیە، کامێراکەش تایەویێ ئەوەی بۆی گردبوونەتەوە پیشانی بدات، ئەگەرچی گوێت لە هات و هاوارە، بەڵام لەشوێنێکەوەیە نادیارە.

تا دەهات هاوار کردنەکە بەرزتر دەبووەوە، خەڵکەکە بۆ شتێك لەبەرزییەوە دەیانڕوانی، کامێراکە کەوتە گەڕ تا ئەو شتەت بۆ ئاشکرا بکات، مۆزیکەکەش بەرەو ئاوازێکی دڵەڕاوکێیانە دەچوو، دواتر دیمەنەکە دەرکەوت، شتێك لە پشتەوە کە گوزارشتی لەترس و تۆقاندن دەکرد، دەرکەوت.

لەبەرامبەر ئەو گردبوونەوەیەی خەڵکەکە کۆمەڵێك بنیادەم لە پشتەوە دەست بەستراوبوون، بەسەر سەکۆیەکەوە بەدارەوە هەڵواسرابوون و قورساییش بە پێیانەوە هەڵواسرابوو، لەنێویاندا کچێکی جوان و شۆخ و شەنگ یەکێکبوو لەهەڵواسراوەکان، هەوڵیدەدا لە کۆتەکەی ڕزگاری بێت، بەتووڕەییەوە لەخەڵکەکەی دەڕوانی، لەسیلەی ئەویشدا پیرەژنێك بەدارەوە هەڵواسرابوو، بێئومێدی بەڕوخساریەوە دیاربوو، لەسیلەی ئەویشدا پیاوێکی بەساڵاچوو هەڵواسراوەو لەخەفەتا خەریکە ڕوح بەدەستەوە دەدات، منداڵێك تەمەنی لە دە ساڵان تێپەڕی نەدەکرد، هەڵواسراوەو لەترسا دەلەرزی. مۆزیکەکە بۆ ئاوازێکی خەمبار گۆڕدرا، چاوانی خەڵکەکە ناڕەزاییان پێوە دیاربوو، وەلێ بێدەنگی باڵی بەسەر ئەو دۆخەدا کێشابوو، کێ زانی ئەوە دەکات ورتەی لێوە بێت. تۆ لە ئیسپانیای کاسۆلیکدایت، ئەوەش سزای دادگای پشکنین بوو بەسەر هەڵواسراوەکاندا، هەڵواسراوەکانیش حوکمی سزادانی لادەرییان بەسەرا سەپێنراوە، خۆ ئەگەر دان بەتاوانەکەیاندا

نەهێنن ئەوا بەزیندوویی دەسووتێنرێن، خەڵکەکە بە چپە چپ قسەیان دەکرد، ئیشارەتیان بۆ کچە جوانەکە دەکرد، یەکێك گوتی:

- ئەی خودایە ئەو خاتوو کۆنتێسە تاوانی سیحر بازیان داوەتە پاڵی، حوکمی ئەمانە جیاوازی لەنێوان خانەدان و خزمەتکاردا ناکەن.

لەنێو کەڵلەی خەڵکەکەوە شەپقەیەکی ڕەشی لاکێشە ئاسا دەرکەوت، لەدیمەنەکە نزیك بووەوە، کامێراکەش نەیدەویست خاوەن شەپقەکە ئاشکرا بکات.

((ئێمە.. کڵێسەی کاسۆلیك بە بەزەیی خوداوە، مەترانی شاری غەرناتە))

دەنگێکبوو بەو ئەدایە لەدوورەوە هاواری کرد، خەڵکەکە بەدڵەڕاوکێوە دیقەتیان دەدا، شەپقەکەیش هێدی هێدی نزیك بووەوە، وەلێ ئەمجارە بەشێك لە لای سەرووی شەپقەکەوە دەرکەوت، پیاوێکی پرچ درێژبوو، تەنها هەر ئەوەندەی لێوە دەرکەوت.

((بە بەدواداچوون لە بابەتەکەی ئێوە ، کە بەلادەر تاوانبار کراون))

منداڵە هەڵواسراوەکە هەر دەلەرزی و ئارەقە بەنێو چەوانیەوە دەهاتە خوارەوە، تەنانەت لە خەڵکەکەیشەوە لەرزینەکەی دیاربوو، مۆزیکەکە ئاوازێکی خەمبارانە بوو، پیاوە شەپقە بەسەرەکە پێدەچوو کەسێکی زۆر گرنگ بێت، ئەوەتا لەنێو خەڵکەکە و لە پێشی پێشەوە وێستاوە.

((بەڵگەی زۆر هەن بۆ پرسیار کردن و ئەشکەنجەدانتان، تا ڕاستییەکە لەدەمی خۆتانەوە دەردەچێت))

ئا لێرەدا کەللەی منداڵەکە لەبەرامبەریدا لارەوە بوو، نەتدەزانی مردووە یا لەهۆش خۆی چووە، دڵیان کەوتە ختوورە کردن، یەکێك لە ئامادەبووان لەسەر خۆی گوتی:

- خودا لەکوێیە؟ خودا لەم زەوڵەمەدا لەکوێیە؟ کوا خودا؟

پیاوە شەپقە بەسەرەکە لای لەو پیاوە کردەوە کە ئەو قسانەی کرد و ئیشارەتی بۆ منداڵەکەش کرد و گوتی:

- ئا.. ئەوەتا.

پیاوەکە بێ ئەوەی لێی حاڵیبووبێت لێی ڕوانی، کامێراکە دەموچاوی شەپقە بەسەرەکەی دەرخست، تۆ ئەو ئەکتەرە دەناسیت. لێڵ تێڕوانینی بۆ منداڵەکە گوتی:

- ئەوە خودایە، بەبان ئەو تەختە دارەوە هەڵواسراوە!

پیاوەکە چاوی لەمنداڵەکە بڕی، لە حاڵیبوونەکەشی دڵنیا نەبوو، ئاخۆ ئەوە دەگەێنێت کە خودا بوونی هەر نییە، یا بەو کردەیەی خۆیان ئەمڕۆ خودایان کوشت، یا چیتر؟ لێرەوە خاوەن شەپقەکە بەرەو گۆڕەپانەکە بە ڕۆیشتنێکی نامۆیانەوە کەوتە ڕێ، مەلێکیش بە بان شانیەوە بوو، ئەجا بەگاڵتەجاڕانەوە دەستی بەرز کردەوەو گوتی:

- بەداوای لێبوودن لەخواکەتان، ئەو کچە جوانەم بەدڵەوە چووە، بۆ خۆمی دەبەم.

دەستبەجێ دەیان تفەنگ بەدەست لێی گردبوونەوە. کامێراکە جلوبەرگەکەی دەرخست، پێڵاوەکانی بزمار ڕێژی ئاسن و پاڵتۆکەشی

قاوابیەکی کاڵەوەبوو، شەپقەکەشی مەیلەو ڕەش و چاوەکانیشی بە کل ڕەشکرابوون. یەك لەسەربازەکان هاواری کرد:

- تۆ کێی؟

پیاوە نامۆکە دەستی بەرز کردەوە چون ئەوەی خۆی بەدەستەوەبدات، وەلێ بەشێوازێکی گاڵتەجاڕانە گوتی:

- حەزم نەدەکرد ناوی خۆم ڕاگەیێنم، چونکە کێشە دەنێتەوە.

سەربازەکە بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئەی غەوارە ناوی خۆت ئاشکرا بکە.

پیاوە غەوارەکە بەگاڵتجاڕانەوە گوتی:

- کاپیتان جاك سپارۆ.

خەڵکەکە هەندێ ئاخ هەڵکێشانیان تێکەوت، جاك سپارۆ جەردەی دەریا بوو، نەك هەر ئەوە بەڵکو سەرکردەی جەردەکانی دەریا بوو، ئەو منداڵەی گۆرانییەکەی گوتبوو، باوکی بەتووندی لەخۆی گرتبوو، هۆشێکی وەبەردا هاتەوە. سەربازەکە زۆر بەتووندی گوتی:

- پێدەچێت قوربانییەکانی ئەمڕۆ یەکێکیتری بۆ زیاد بکرێت.

جاك سپارۆ بێ گوێدان بەهیچ شتێك بۆ لای خوارەوەی سەکۆکە ڕۆیشت، چون ئەوەی بیەوێت ڕزگاری بکات، کچە شۆخە دەمبەستراوەکە لێی ڕوانی و پێی سەیر بوو، وەلێ تەقەی فیشەگ بەحەواوە (جاك)ی ڕاوەستاند، لەپڕ مەلەکەی سەرشانی جاك هەڵفڕی، تەواوی خەڵکەکەش سەرنجایان بۆ لای مەلەکە ڕۆیشت، کە بەسەر دارێکی بەرزی سەکۆکەوە نیشت و بەدەنووك لە

گوریسـەکەی دەدا، وەك ئـەوەی بیـەوێت گوریسـەکە بپچـڕێنێت و کچـە شۆخەکە ڕزگار بکات.

سەربازەکان نەیانزانی چی بکەن، فیشەگ بە (جاك)ەوە بنێن یا پاسارییەکە بپـێکن، جـاك فیکەیـەکی لێـدا، گـرژی و ئـاڵۆزی کەوتـە گردبوونەوەکـە، خەڵکەکـە بـەدوای سەرچـاوەی دەنگەکـەدا ڕوویـان وەرگێـڕا، تەنانـەت سەربازەکانیش، لەوێ لەلای ڕووخی دەریاکەوە کۆمـەڵێك زەلامـی جلوبـەرگ نامۆ ە شەپقەبەسەر لە کەشتییەك دابەزین، لەساتێکدا ژمارەیان تـا دەهـات زیاتر دەبوو، وەك ئەوەی لە دەریاکەوە هـەڵقوڵێن، ئـەوە بـە ئاراسـتەیەکی خەراپدا ڕۆیشت، هێرش دەستی پێکرد، شاڵاوی جەردەکانی دەریا بوو.

***

## جاك سپارۆ یا جاك پاساری

لەپڕو بێ ئەوەی سەربازەکان ئاگادارین، جـاك دەمانچەکەی لەبـەر باخـەڵی دەرهێنـاو فیشـەگێکی لـە گوریسـەکە گـرت، کـە کچـە جوانەکـەی پـێ هەڵواسرابوو، کچەکە گوتی:

– جاك پاساری.. تۆ زۆر لەسەرخۆیت و تەمبەڵ و تەوەزەلیشیت.

پاسارییەکە لەترسا هەڵفڕی، کچە شۆخەکە بـەرەوەبوو، لەگـەڵ هـاوارکردنی جاك لەسەر شانی نا، کچەکە ئازاری پێگەیشت، گوتی:

– ئەی گەمژە.. نابێ بزانیت چۆن لەتەك خانمێکدا مامەڵە دەکەیت؟

کچە شۆخەکە لە پشتی (جاك)ەوە دەیڕوانی و هەردوو پێی ڕادەوەشاند و دەیگوت:

– بۆ کەسوکارەکەم ناڕۆم، ئەی هیچ و پووچ دامگرە.

جاك بەدەم غاردانەوە گوتی:

– تەماشایان بکە.

کچە شۆخەکە سەری هەڵبڕی و تەماشای کردن، کۆمەڵێك لە جەردەکانی دەریا چووبوونە سەر سەکۆکەو کەسوکارەکەیان ڕزگار دەکرد، ئەوانیتریش کەوتبوونە وێزەی سەربازە ئیسپانییەکان.

ما کچەکە بەدەم ئازارەوە بتلێتەوە و بڵێت:

– دامگرە، دەتوانم بەخۆم ڕابکەم.

کامێراکە گواستینیەوە دیمەنێکیتر، جاك کچەکەی لەسەر پشتی کەشتییەکە داگرت، کچەش بە هەڵەداوان بەرەو لای کەسوکارەکەی ڕۆیشت کە بەسەر پشتی کەشتییەکەوەبوون، ما دەموچاوی براکەی سەح بکاتەوە، کە لەهۆش خۆی چووبوو، وەلێ هەناسەی هەبوو، شوکری خودای کرد، وەلێ جاك سپارۆ پێیگوت:

– کۆنتێسە عایشە.. مۆریسکییە، بەو شێوەیە ناوزەدیان دەکردی، دوای ئەوەی باوانت لە ئاینی مەسیحییەوە هەڵگەڕانەوەو چوونە ئاینی محەمەدەوە.

بەڕوویدا هاواری کرد:

– ناوی ئاینی ئیسلامە ئەی گەمژە، چیتان لێمان دەوێت؟

جاك لێوەکانی درێژ کردەوە و گوتی:

- هیچ سووپاسگوزارییەکتان بۆ (جاك)ی پیاو چاك نییە، کە ڕزگاری کردن؟

بەدەم تەکاندنی کراسەکەیەوە گوتی:

- نەخێر.. تا نەزانین چیتان لێ دەوێین.

جاك کاغزێکی بەدەستەوەبوو، لە زەل پێچراو دەچوو، گوتی:

- تۆ لە میرانی ئەورووپایت، ئەوانەی بەخۆیان دەڵێن(ڕیکس دوون)، بنەچەتان جوولەکەبوو، دواتر بوون بە مەسیحی و دواجاریش ئەوەتا موسڵمانن.

عایشە لەتەك خۆی بێدەنگبوو، بیری لەوە دەکردەوە چۆن ئەو زانیارییانەی دەستکەوتووە، جاك دەموچاوی لێ نزیککردەوەو گوتی:

- هۆکاری سەرەکی کڵێسە دەیەوێت لەناوتان بدات، بەوای ئاینەکەتانەوە نییە، بەڵکو ئا ئەمەیە.

ئەو زەلە پێچراوەی لەبەردەمیدا ڕاخست، عایشە دیقەتی دا، دواتر ڕوەخساری تووڕەیی لێنیشت و گوتی:

- ئەوە شەرەفی ئەوە نییە کۆمەڵێك جەردە بەدەستیان هێنابێت، ئەوە لەبیر خۆت بەرەوە شتێکت لەمەڕیەوە بۆ باس بکەم.
- گەنجینەی کاسۆلیکی، ئەو سنووقە گەورەیەی دار عاساکەی مووساو ئونگوستیلەکەی سلێمان و تەختە لەوحی تەورات و دەسنووسەکانی پێغەمبەران و تەختە لەوحی زەموورد و پەرتووکەکەی ئادەم هەمووی تێدایە، هەندێ شتیتری پیرۆزیشی لەناودایە.

عایشە هاواری بەسەریا کرد:

- ئەی جەردەی پیاوکوژ.. ئەو شتە لەبیر خۆت بەرەوە.

جاک بەزمانێك بۆ دڵنیاکردنەوەی گوتی:

- کاسۆلیکەکان توندڕەوترین خەڵکانی سەر زەوین و مانەوەی ئەو پیرۆزییانە لەلای ئەوان باش نییە، بیریشی لێ بکەرەوە، وەختەبوو خۆت و کەسوکارەکەت لەناوبەرن، بەوای ئەوەی ئەو پیرۆزییانەوە ئێمە ڕزگارمان کردن.

عایشە ویستی بدوێت، جاک پەنجەی (وس بە)ی نایە سەر لێوی و گوتی:

- تۆ زیرەك نیت، ئێمە لای خۆمان گلی نادەینەوە، هەچ لایەنێك زۆرتر بدات پێی دەفرۆشین و ...

عایشە قسەکەی پێ بڕی و گوتی:

- یەك وشە نادرکێنم، تا نەزانم بە موسوڵمانەکانی عوسمانییەکانی دەفرۆشن یا نا.

جاک هەڵیداو گوتی:

- بەڵێ عوسمانییەکان دەوڵەمەندن، تەنانەت خوێنیش لەپێناویدا دەدەن.

عایشە ئامێکی هەڵکێشاو گوتی:

- گەنجینەکە لە ئینگلتەرا دابوو، لای بنەماڵەیەکی کاسۆلیکی لە (ڕیکس دوون) و چەند ڕۆژێکە گواستراوەتە سەر کەشتییەکی گەورەو بەرەو...

عایشە کەمێك بێدەنگبوو، جاک ورەی وەبەر نا تا بەردەوام بێت: گوتی:

- بەرەو کوێ؟

عایشە کەمێك دوودڵبوو، وەلێ دواتر گوتی:

- بەرەو ئیسپانیا، بۆ بنەماڵەیەکی تری کاسۆلیک وان لێرە لە ئیسپانیا.

جاک لەسەرخۆ گوتی:

- کەواتە لەم کاتەدا گەنجینەکە لەناو دەریا بەڕێوەیە.

عایشە سەری بە بەڵێ بۆ ڕاوەشاند، چاوەکانی جاک سپارۆ ڕەونەقتر بوون، ئەوەش مانای هەموو شکۆیەکە.

***

## ئەگەر کەسێکت بینی شتێکی پیرۆزی دەشاردەوە، بزانە ئاشکرای دەکات

کامێراکە گرتەی خستە سەر مێزێك لەناوەندی دیمەنەکە، نەخشەیەکی کۆن بەسەر مێزەکەوەیە و جاک نووکی خەنجەرەکەی بەسەر نەخشەکەدا هێنا چون ئەوەی هێڵێك بکێشێت و گوتی:

- دوو مانگ.. کەشتییەکە دوو مانگی دەوێت تا بە ئیسپانیا بگات، با کەشتییەکەی لێ بخەینە گەڕ، پێویستیمان بە...

عایشە قسەکەی پێ قاچی، هەردوو دەستی نایە سەر نەخشەکە، بەدەنگی بەرز قسەی دەکرد و شرۆڤەی ئەوەی بۆ دەکرد، چۆن بگەن بەکەشتییەکەو پێشی لێ بگرن:

- دوو هەفتە.. لەم وەرزەشدا (با) لەقازانجی ئێمەدا دەبێت.

جاك بەوردی و سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی، ئاخر شتگەلی وا ئافرەت نایزانێت، پێیگوت:

- تۆ کێی؟

چاوەکانی بەدڵنیاییەوە هەڵبڕی و گوتی:

- ئێمە لە باوباپیرانمانەوە بنەماڵەیەکی دەریاوانی بووینە، زۆربەی بەلەم و کەشتییەکانی بەندەر هی ئێمە بووە.

سەری بۆ لەقاند. دیمەنەکە نێو تاریکی شەو گواسترایەوە، شەپۆلەکانی دەریاش بەرزو نزم دەبوونەوە، وەك ئەوەی هار بووبن، لەنێو تاریکییەکەدا کەشتییەکی مام ناوەند دەرکەوت، ئاڵای خاچپەرستانی بەسەرەوە بوو، کامێراکە بەرەو ئەولا بردنی، لەتەك هاوارێکی نادیار دڵی ڕاچڵەکاند، تا کەشتییەکەی جاك سپارۆ لەنێو تاریکییەکەوە بە ڕەشی دەرکەوت، هەموو شتێکی ڕەشی دەکردەوە، تەنانەت ئاڵاکەشی، جاك دەستی بەرز کردەوەو بەنیگایەکی گاڵتەجاڕانە گوتی:

- سڵاوی گەنجینەی کاسۆلیکم پیشان بدەن.

تۆپە ڕەشەکان لە پەنجەرەکانی تەنیشتەوەی کەشتییەکە دەرکەوتن، لەیەکڕا تۆپی ئاگراویان سەر کەشتی کاسۆلیکەکە هاویشت، لەنێو ئەو ئاگربارانەدا دەنگی خولخولۆکەیەك هات و گوریسی ڕادەکێشا، عایشە بەبان کەشتییەکەوە چاوی لە جاك بڕیبوو، کە بەجلوبەرگە تایبەتەکەی خۆی و شەپقە ڕەشەکەیەوە بەوای گوریسەکەوە بەحەواوە دەفڕی، هەر بەحەواوە گوریسەکەی بەرداو لەناوەندی کەشتی کاسۆلیکەکە خۆی گرتەوە، بەدەر لە گاڵتەجاڕییەکەی، وەلێ لە شەڕی دەریاوانیدا شەیتانێکە وێنەی نەبوو، ئەوجا دەنگی خولخولۆکەکە و دەیان جەردەی دەریا بەحەواوە بەوای

گوریسەکانەوە وەك ئاگر بەسەر پشتی کەشتی کاسۆلیکەکەوە نیشتنەوە، کەس بەسەر کەشتییەکەوە نەبوو، جاك بەچواردەوری خۆیدا دەیروانی، دواتر تەماشای عایشەی کرد، وەك ئەوەی لەوەوە شتێك حاڵی بێت، وەلێ عایشە چاوەکانی زەق کردنەوەو بەترسەوە کشایەوە، کاتێ بینی بەرمیلێك بۆ سەر کەشتی کاسۆلیکەکە بەحەواوەبوو، جاك ئاوڕی دایەوە لەو بەرمیلەی بەحەواوە بوو، پیاوانگەلێکی کاسۆلیك بەتفنگەوە لەنهۆمی ژێرەوەی کەشتییەکە دەرکەوتن، گوێی لەعایشە بوو، هاواری لێکرد:

– جاك.. بەبان سەرتانەوەن.

عایشە تفەنگەکەی بەرزکردەوەو سێری لەبەرمیلەکەی بەحەواوە بوو گرت، تا بەسەر پیاوانی کاسۆلێکەکاندا بتەقێنێتەوە، تەنانەت هەلی هەڵاتنیشیان بەدەستەوە نەمابوو، جاك تەماشای کرد، دوو لە پیاوەکانی بەرمیلیان هەڵدەگرت و دەیانهاویشت و عایشەش بە تفەنگەکەی دەستی دەیتەقاندەوە، لەبری ئەوەی بەوە دڵخۆشبێت، بەتووڕەییەوە هاواری کرد:

– هەی نەفامینە، ئەو بەرمیلانە خواردنەرەی جەردەکانی دەریان، ئەو بەرمیلە (مەی)یانە مەتەقێننەوە.

عایشە پێکەنی و گوتی:

– دواجار یەك سوودی ئەم (مەی)یەم زانی.

جاك لای کردەوەو دەمانچەکەی بەرزکردەوەو تەقەی لەپیاوانی کاسۆلیك کرد، کە لەبەرمیلەکان دوور دەکەوتنەوە و هەڵدەهاتن، پیاوەکانی جاك هێرشیان کرد، ئەوەندەی نەبرد کاسۆلیکەکان دەستبەسەر کران، جاك هێدی هێدی بەرەو لای کاپیتانەکە ڕۆیشت و گوتی:

- ئەی سەرزلی بەقیمەت.. گەنجینەکەتان لەکوێیە؟

کاپیتانەکە کەمێك دڵەڕاوکێ گرتی، جاك دەمانچەکەی بەرز کردەوەو لەکەللەی نزیکی کردەوەو گوتی:

- ئەگەر لەچرکەیەکدا دەنگ نەکەی، ئەوا کەللەتی پێ دەپێکم و دەچمە لای ئەو پیاوەی ئەولاترتەوەو لەویش دەپرسم، ئەم گەمەیەت پێخۆشە؟

کاپیتانەکە زمانی تێکئالاو ئیشارەتی بۆ شوێنی گەنجینەکە کرد، پیاوەکانی جاك بەرەو شوێنی گەنجینەکە ڕۆیشتن، بەو وەسپەی کاپیتانەکە کردبووی، لەناو کەشتیەکە سندووقێکیان دەرهێناو لەژێر پێی جاك دایاننا، جاك بە پەنجەی ئیشارەتی بۆ پیاوەکە کرد، تا کۆدی کردنەوەی سندووقەکەیان پێبڵێت. کاپیتانەکە بە خەمباریەوە لە سندووقەکەی ڕوانی و دواتر تەماشای (جاك)ی کرد، کە دەمانچەکەی لەسەرڕێبوو، جاکیش دووبارە لەکەللەی نزیکی کردەوە، کاپیتانەکە هاواری کرد:

- سوێند دەخۆم کۆدی کردنەوەی ئەم شتە نازانم چییە.

جاك بێ گوێدان بەهیچ شتێك گوتی:

- بیانکوژن . سندووقەکەش بۆ خۆمان هەوڵی کردنەوەی دەدەین.

عایشە بەدەم دابەزینیەوە بۆ لایان هاواری لێکردن و گوتی:

- جاك.. لێیانگەڕێ، من دەزانم ئەو سندووقە چۆن دەکرێتەوە.

جاك تەماشای عایشەی کرد و وەك ڕێزێك بۆی نووشتایەوەو گوتی:

- غەرموو خانمی خانمان.

کۆنتێسە عایشە گوتی:

- ئایکەمەوە تا لەبن دەستی فەرماندارێکی عوسمانیدا نەبێت.

جاك بە سەرسوڕمانەوە لێی ڕوانی و گوتی:

- منیش ئایکەمەوە تا بەهاکەیم وێنەدەن.

***

## کەس وەك جەردەی دەریا چێژ لە مەی خواردنەوە نابینێت

دیمەنی کەشتییەکی زۆر بەو تاریکی شەوەدا بەدووی یەکەوە شەپۆلەکانی دەریا بەڕێوە بردن، ئەو کۆمەڵە کەشتییە لە کۆمەڵێك دڕندەی دەریا دەچوون، جاك لەکەشتییەکەی پێشەوە بەدووربینە ڕەشەکەی لەدووری دەڕوانی، کەس باوەڕی نەدەکرد، جاك ئەو پیاوە سوعبەتچی و گاڵتەجارە سەرۆکی هەر هەموو ئەو کەشتیانەو کاپیتانی هەر هەموو ئەو جەردانەی دەریا بێت، عایشە لەسیلەیەوە بە سەرسوڕمانەوە لێی دەڕوانی، جاك دووربینەکەی لەچاوی دوور خستەوەو گوتی:

- کۆنتێسە چییەتی لێم دەڕوانێت، خۆشتوویستووم؟ کێ هەیە دڵی بەجاکەوە نەبێت.

عایشە گوتی:

- کەشتی کاسۆلیکەکەی کە لەخۆتت گرت، ناوی چیت لێناوە؟
- جۆنی چکۆڵە.

بەر لەوەی عایشە هۆکارەکەی لێبپرسێت، جاك دەستی بەرز کردەوەو بە خۆشیەوە کەوتە ستران چڕین و گوتی:

- دەمێك ڕۆین هوود تەمەنی دوانزە ساڵانبوو، ئاااى کە بێ ڤیزبوو، بێ ڤیز، بێ ڤیز، بێ ڤیز.

جاك ڕووی بۆ لایەکی تر وەرچەرخاند و گوتی:

- چاوم بە (جۆن)ی چکۆڵە کەوت، ئەگەرچی ناوەکەی هی کەسێکی بچووك بوو، وەڵێ بەخۆی کەتتە بوو، ئاااااای کە بێ ڤیزبوو، بێ ڤیز، پێ ڤیز.

عایشە بزەخەنە گرتی و پرسیار ئاسا ڕووی لێکرد و گوتی:

– (جۆن)ی چکۆڵە ماوڕێی ڕۆبن هوود بوو.

دیسانەوە عایشە گوتی:

– خۆت بە ڕۆبن هوود دێتە بەرچاو؟

ڕوخساری جاك نیگایەکی ئێرەییانەی تێیا دەرکەوت و گوتی:

– منیش تەنها دەوڵەمەندەکان ڕووت دەکەمەوە، کچی جوان.. لەڕۆبن هوود باشترم، من گەنجینەی کاسۆلیکم هەیە.

ئەوجا سیمای گاڵتەجاڕانەی دەرخست، کە بێجگە لەخۆی کەس ئەو خەسڵەتەی نەبوو.

– بەم بۆنەیەوە.. ئەو دەستنووس و پەرتووکانە چییان تێدایە، تا ئەوەندە گرنگن؟

عایشە بەرسڤی دایەوەو گوتی:

– ئەگەر ئەو دەستنووسانە دەستنووسە ڕاستەقینەکانی تەورات و ئینجیل بن، ئەوا هەموو کەشیشەکانی دنیا بە پاپاکانیشەوە پلەو پایەکانیان دەدۆڕێنن.

جاك بەسەرسوڕمانییەوە گوتی:

– چۆن؟ بۆچی؟

کۆنتێسە گوتی:

– چونکە کەشیشەکان و پاپاکانی جولەکەو مەسیحییەکان ئەوە داهێنانی خۆیان بووە، تا دەسەڵاتێکی ڕەهای ئاینی بەخۆیان

بدەن، ئەگەر ئەو دەستووسانە لە ئینجیل و تەورات بۆ دنیا ئاشکرا بن، ئەوا دەردەکەوێت چ ئاڵوگۆڕێکیان بەو دەستووسانە کردووە، تا دەسەڵات بەخۆیان بدەن.

جاک سیمای خەمباری لێوە دەرکەوت، عایشە سەیری لێهات و گوتی:

– چیتە؟

جاک بە گاڵتەجارییەوە دەمی هەڵهێناو گوتی:

– چیم نەبێت، تۆ تەنها شتگەلی خەراپ باس دەکەیت.

لای لەپشتی خۆی کردەوە، بەرەبەیاتەو کەشتییەک بەرەو پیریان دێت، عایشە وریابووەوەو گوتی:

– ئای ئەو کەشتی گەل(مۆریسکیوون)ە، ئەو موسوڵمانە هەڵاتووانەی ئیسپانیا دەگوێزێتەوە، تا بەوڵاتی تونسیان بگەیێنێت.

جاک لێوی گەست و گوتی:

– خاتوو میر باوەڕت بەو قسە قۆڕانە هەیە؟ ئێمە لەدەریادایین و دەزانین ئەو (مۆریسکیوون)انە کۆیلەن و دەفرۆشرێن.

عایشە هەڵچوو، چمکی یاخەی کراسەکەی (جاک)ی گرت و گوتی:

– چۆن؟ چی؟ تۆ لەوە دڵنیایت؟

جاک برۆکانی هەڵبڕی و گوتی:

– وەک چۆن لەهەڵهاتنی خۆر دڵنیام.

عایشه ڕوخساری تووڕەبوونی پێوە دەرکەوت، دەستی بۆ لاقە جاك برد، هەردوو دەمانچەکەی لەقەدی کردەوەو ئاراستەی کەللەی جاکی کرد و گوتی:

– هەر ئێستا ئەو کەشتییە ڕابگرە، دەی ڕۆین هوود ئەو خەڵکەش ئازاد بکە.

جاك دەستی بەرز کردەوە، وەك ئەوەی چووبێتە دڵیەوەو نەتوانێت ئەوە بشارێتەوە، پێیگوت:

– وامدەزانی باوەڕکردن لەم دنیایەدا هەر زۆر کەمە.

عایشە بەخورتی پێیگوت:

– هەموو وڵاتانی موسوڵمانەکان وان، تۆ تەنها کیشوەرە تاریکەکەی خۆتت بینیوە.

جاك چاوەکانی لێ کز کرد و سەری داخست، چون ئەوەی شتێکی بیرهاتبێتەوە، دواتر ئاهێکی هەڵکێشاو دەستی بەرز کردەوەو گوتی:

– ئاڵاکانی جەردەی دەریا هەڵدەن.

لەچەند خولەکێکدا زیاتر لەبیست کەشتی بەئاڵای ڕەشی جەردەی دەریاوە گەمارۆی کەشتی گەلیەکەیاندا، کاپیتانی کەشتییەکە دەستبەجێ وێستا، دەیزانی هەر هەڵەیەك بکات ئەوا ژیانی کوێر دەکرێتەوە، یا وەك کرێکارێك لەژووری ژێرەوەی کەشتی جەردەی دەریا دەبێت شان و بازوو بکوتێت.

***

# ئەگەر ئەو میری سەر زەوییە

مەیخانەیەکی بچووك، سەکۆی تەختە
دادەنیشن. ئێمە لەئاوایی (کینت)ی ئینگلی
نەبوو، تەنها دزو جەردەو جەردەی دەریا
وێنەگەلی کەسانی پەرپووت و داواکراوی با
ئەو مەیخانەیەیان دەکرد، خۆیان مەست د
بەسەر دەبرد، منداڵێك چووە نێویانەوەو ل
مەستیان بەهاتنە ژوورەوەی نەکرد،
ئەفسانەیەك دەکرد، زمانیشیان زۆر بە د
دەریا وەك خۆیان چووە ژوورەوەو هاواری

— وەرن.. وەرنە دەرەوە دیمەنی ل

کڵیسەی کاسۆلیك بڕیاری لەسێدارەد
جەردەکانی دەریا بلەز بە پێکەنینەوە بە
لەسێدارەکە ببینن، یەك لەوانەی کە ل
(وارد)ی پاوچی بوو، باوکی ئەو منداڵ
مەیخانەکەدا دانیشتبوو، لەو ڕۆژەوە ئ
مەسیحی هەڵگرتووە، ئەو منداڵە دواتر بە

ڕۆژێکی خۆرەتاو کۆمەڵێك لەجەردە
سندووقێکیان بەسەر شانەوە هەڵگرتبوو، ا
دەڕۆیشتن، جاك سپارۆ بە شێوازە تایبەتە
و عایشەی (مۆریسکی)یش لەسیلەیەوە
دەڕوانی، هەندێکیان خاچی لەمل کردووە



بۆ لاقە جاك برد،
للەی جاکی کرد و

وود ئەو خەلکەش

ەو نەتوانێت ئەوە

وەرە تاریکەکەی

ئەوەی شتێکی
ەو گوتی:

جەردەی دەریاوە
ستیەجێ وێستا،
ا وەك کرێکارێك
ەوو بکوتێت.

لەسەر کردووە، کەسیش ڕێیان پێناگرێت و دەستبەسەریشیان ناکەن و لەسەر ئاینی جوداییان دادگایی ناکرێن، دادگای چاودێری وڵاتی عوسمانییەکان ڕێی دابوو هەڵاتووەکانی جوو وەك موسوڵمانەکان نیشتەجێبن. جاك لەگەڵ لا کردنەوەی لە عایشە گوتی:

– جەردەی دەریا (بەربرووسا) لەم وڵاتەوە هات، وانییە؟

– بەربرووسا و موراد رایس و سلێمان رایس هەموویان جەردەی دەریا نەبوون، بەڵکو لەسووپای دەریاوانی عوسمانییدا جەنگاوەر بوون.

جاك وەك ئەوەی بیەوێت دەماری بگرێت، گوتی:

– ئەوانە بەر لەجاك سپارۆ پاشای دەریابوون؟

ڕێڕەوەکەیان تا دەرگای ماڵی عوسمان بوو، کۆشکی فەرمانداری تونسی عوسمانی، ئەودەم (عوسمان دای) فەرماندار بوو. گرتەی کامێراکە لەژێرەوە بەرەو سەرەوە ڕۆیشت، تا لەدیمەنێکدا گیرسایەوە، جاك دەرکەوت و دەستی بەسەر سندووقەکەوە بوو، گرتەی کامێراکە بەرزەوە بوو، تا فەرماندار عوسمان دەربخات، کە بە سەرسوڕمانەوە لێی دەڕوانی و گوتی:

– تۆ جاك سپارۆی، پاشای دەریایی؟

جاك بەفیزەوە پەنجەی هەڵبڕی و گوتی:

– کاپیتان جاك سپارۆ.

فەرماندارەکە پێیگوت:

– مەزەندەم دەکرد کەمێك جیاوازتر بیت.

دواتر فەرماندارەکە تەماشای سندووقەکەی کردو گوتی:

- پێتگوتم چی لەناو ئەم سندووقودایە؟

جاك هەرزوو بەرسڤی دایەوەو گوتی:

- دارعاساكەی مووسا و ئونگووستیلەكەی سلێمان و بەردەنووسی تەورات و دەستنووسەكانی هەموو پێغەمبەران و شتی تر.

فەرماندار عوسمان گوتی:

- كێ ئەوەی پێتگوتووە؟

جاك تەماشای عایشەی كردو گوتی:

- لەسەرچاوەكانەوە ئەوەمان بیستووە، كە...

فەرماندارەكە قسەكەی پێقاچی و گوتی:

- دارعاساكەی مووسا و ئونگووستیلەكەی سلێمان لای جوولەكەكان نییە، لای ئەو گیانەوەرەیە كە خودا لەكۆتایی زەماندا لەتەكیدا دەینێرێت.

عایشە گوتی:

- گەورەم.. ئەم سندووقە دەستنووسی پێغەمبەرانی تێدایە، بەردەنووسی تەورات، بۆ خۆیشم لە (ڕیكس دروزم)بووم، ئەو خانوادە دەوڵەمەندەی جوولەكە، كە نهێنییەكیان دەزانیت، دواتر موسڵمان بووم، كاسۆلیكەكان ویستیان خۆم و خانوادەكەم لەسێدارە بدەن، تا بەسەرهاتی ئەم سندووقە بشارنەوە.

- سندووقەكە بكەرەوە.

عایشە دەستی بۆ سندووقەکە درێژ کرد، جاك بەر لەوەی دەستی پێبگات، دەستی خستە سەر سندووقەکە و گوتی:

- نرخەکەی بەر لەتەماشاکردنی، ئەی فەرمانداری هاوڕێ، ئێمە خانوادەی کچەکە بە بارمتە لای خۆمان دەیهێڵینەوە، تا نرخەکەیمان وێدەدەن.

فەرماندار عوسمان گوتی:

- لەوڵاتەکەم زەوی و زارت پێدەدەم، کۆشکت بۆ درووست دەکەم، هەموو بەندەرەکان بۆ کەشتییسەکانت بێت، پیاوەکانیشمان لەژێر فەرمانتدا بن.

جاك هەڵیدا و گوتی:

- ئەی پارەو پووڵ؟

فەرماندار گوتی:

- هەرچییەکت دەوێت بەسەرچاو، نەك لەبەر ئەو گەنجینەیە، بەڵکو لەبەر ئەوەی لەتەکماندا بیت، کەشتیگەلەکانمان پێوویستیان بە ئێوەیە.

ئەو قسانە کارتێکەرییان بەسەر (جاك)ەوە هەبوو، ئەو خۆشییەی لەناخی خۆیدا هێشتەوەو نەیدرکاند.

- ئەی نرخی گەنجینەکە؟

فەرماندار گوتی:

- لێگەڕێ با جارێ سندووقەکە بکرێتەوە.

جاك دەستی لەسەر سندووقەکە بەرز کردەوە، ڕێی بۆ عایشە چۆلکرد دەست درێژ بکاتەوە، عایشە بەفێڵی خۆی فشاری خستە سەر سندووقەکە، لەپڕ هەر هەموویان گوێیان لە قرتەی کردنەوەی قفڵی سندووقەکەبوو، عایشە سەری سندووقەکەی بەرزەوە کرد. کامێراکە گرتەی کەللەسەری هەر سێکیانی لەژێرەوە دەرخست، کە بەبێدەنگی لەناو سندووقەکەیان دەڕوانی، بەوای سەرهەڵبڕینی (جاك)ەوە پێدەچوو دۆخەکە بەرەو باشی نەچێت.

سندووقەکە بەتاڵبوو، تەنانەت کاغزێکیشی تێدا نەبوو، جاك سەری خۆی خووراند و فەرماندارێش بە خەنینەوەیەك کە نەیدرکاند و بزەیەکی لەبری دەربڕی و بەعایشەی گوت:

– تۆ گوتت لە (ڕیکس دوون)یت و ئەوانیش ویستیان لەبەر سندووقەکە لەسێدارەت بدەن، چیتر؟

عایشە گوتی:

– دواتر جاك هات و ڕزگاری کردین، ئەویش هەر لەبەر سندووقەکەبوو.

فەرماندار بۆ چەند چرکەیەك بە دەنگی بەرز لەقاقای پێکەنینی دا و دواتر گوتی:

– لەوە گەڕێن، دەبوایە بتانزانیبایە کاسۆلیکەکان هەر وا بەئاسانی نایدۆزێنن، ئەوان چاك دەیانزانی ئەو گەنجینەیە چەند بە بەهایە، هەمووانیش هەوڵی دەستبەسەرا گرتنیان دەدا.

جاك گوتی:

- بەڕێز فەرمانداری گشتی، ئەوەی لەمەڕ کۆشک و خزمەتکردن پێشنیارت کرد، هێشتا لەسەری سووریت؟

فەرماندار پێکەنی و گوتی:

- بەڵێ.. کاپیتان جاك، ئەوە دڵخۆشیشمان دەکات.

جاك پێیگوت:

- بەرامبەر بەچی؟

فەرماندار گوتی:

- ژیانی ئیسپانییەکان بەدۆزەخ بکەیت، کەشتییەکانیشیان دەستکەوتی تۆ بێت، موسڵمانە دەستبەسەرەکان ڕزگار بکەیت و ڕادەستمانی بکەیت.

مەلەکەی سەرشانی جاك هەڵفڕی و بەسەر سندووقەکەوە نیشتەوە. پەردەی سینەماکە دادرایەوە. بەو شێوەیە ئەم بەشە کۆتایی هات، ناوی ستافی کارکردنەکەیش بەدوای یەکدا دەرکەوت.

***

## *** تەواوە ***

لەنێو پەردەکانەوە (دیکۆی)ی شەیتان دەرکەوت و چەند هەنگاوێك لە بۆبی نزیکەوە بوو، گوتی:

- بۆبی.. بریقەی چاوەکانتم بەدڵە، تۆ جاك سپارۆ دەناسیت، ئاخر (دیزنی) چەندین فیلمی لەمەڕ جەردەکانی دەریاوە دەرهێناوە،

دەزانێت (جاك)ی ڕاستەقینە لە کاریبی دا نەبووە، ئەوەندەش بەدڕەوشت نەبووە، وەڵ ئەمە یەکەمجارە ئەم فیلمە ببینێت، لەڕاستیدا جاك سپارۆ سەیرترین کەسایەتی بوو کە چاوم پێکەوتبێت، ئەو دەمەی منداڵبوو، خۆراکی خۆی لەبەندەرەکانی (فیڤەرشام)ی ئینگلیزی و لە فرۆشیارەکان دەدزی، تا گەورەبوو، چووە ڕیزی دەریاوانی بریتانیا بەناوی (شاباتۆی ئینگلتەرا) هێرشی بۆ سەر کەشتییەکانی دوژمن دەکرد، دواتر هەڵگەڕایەوەو بوو بەجەردەی دەریا و ئەوجا ژیانی بەتەواوی گۆڕا و یارمەتی هەزاران موسوڵمان و جوولەکەی دا لە ئیسپانیا هەڵبێن، دواتر موسوڵمانی خۆی ڕاگەیاند، ناوێکی تری لەخۆی نا، بەناوی (یوسف ڕایس) کە دواتر بە جاك پاساری ناوزەدیان کرد، ئەوەی ڕاستی بێت کەسایەتی جاك سپارۆ لەوە گەورەتربوو کە لەفیلمەکانی جەردەی دەریای کاریبیدا هاتووە.

- ڕەنگە تێبینیت کردبێت چۆن (جاك سپارۆ)مان بەشێوازێکی گاڵتەجاڕانە لەفیلمەکەدا پێشکەش کرد، باسمان لەبەسەرهاتە ڕاستەقینەکەی نەکرد، ئەوەش بە لای (جاك)ەوە تازە نەبوو، مێژوونووسانی ئینگلیز ناویان زڕاند، واشیاندانا ئەو کەسە خراپەکارەیە و ئاینی محەمەدی لەخۆ گرتووە، کۆنتێسە عایشە کە لەفیلمەکەدا بینیت، ئەویشیان لەوتاند، بەو ناوایەی ساحیرێکی شەیتانییەو ژن و مێرد لەیەك دادەبڕێت، هەرچی بەسەرهاتە ڕاستەقینەکەیە، چووەتە نێو دەریاوانی عوسمانی و دژ بە کەشتیگەلی ئیسپانیا دەوەستایەوە، ئەوانە باسی لێوە نەکراوە، تا ئەتایە ئەو ڕاستییانەش دەشارنەوە.

- دیکۆی شەیتان. لەجێی خۆی ونبوو. بۆبی فرانك بەوریاییەوە ئاوڕی لێ دایەوەو بەدوویدا گەڕا، دواتر لەسەر کورسییەك و لەسیلەی کۆمپیوتەرەکەی بۆبی دەرکەوت، پێی لەسەر پێ دانابوو، سبیلێکی فەرەنگی بەدەستەوە بوو، دایگیرساند و گوتی:
- تەنیا عەرەب نین مێژووی خۆیان شیواندبێت، بەڵکو هەموو ئەوانەی پێچەوانەی شەپۆل مەلە دەکەن، هەرچییەك هەن دەیانشێوێنن. لە جیهانی دروستکردن گۆرانیبێژی زۆرمان هەن ڕوحی خۆیان بەشەیتان دەفرۆشن، کەمێك لەوانەی پێچەوانەی شەپۆل مەلەیان کرد، لەکۆتاییدا کوشتیانن وەك بۆبی مارلی و مایکل جاکسۆن و ئەوانەی وەك چارەسەر باوەڕیان بە مۆزیکبوو، چارەسەرکردنی نەخۆشی ڕەگەزپەرستی، دامرکاندنەوەی ڕق لەڕێی دەرزیژەنکردنی مۆزیك و خۆشەویستی و ئەوانەش پێچەوانەی شەپۆلەکە مەلەیان کرد، بۆیە هەر زوو کوشتیانن.

لەپڕ شاشەی سینەماکە کوژایەوە، شوێنەکە تاریکبوو، دەنگی دیکۆی لەهەموو لایەکەوە دەهات و دەیگوت:

- بۆبی.. تۆش پێچەوانەی شەپۆلەکە مەلەت کرد، پێمنەگوتی ئەوەی زۆر شتزانبێت بەر لەو کەسە کە کەمشتزانە دەمرێت، پێدەچێت وریابوونەوەکەت خیانەتی لێ کردبێت.

بۆبی هەستی بە نائارامی دۆخەکە کرد و دەستی دایە دارشەقەکەی تا ڕاستەوە بێت، وەلێ بەر لەوەی ڕاستەوەبێت شتێك ڕێی پێگرت، لوولەیەکی سارد لە لاجانگی گیربوو، دەنگی هێنانەوەی دەمانچەیەك هاتە سەرپێ، بۆبی چاوی نووقاند و لێوی خۆی گەزی، گوێی لەو دەنگە بلَحەبوو، کە گوتی:

- بۆبی گەمەکەت دۆڕاند.

ئەوە دەنگی لیۆبۆڵد بوو، کە لەپشتی (بۆبی)یەوە وەستا و (لویب)یش لەسیلەیدا بوو، هەر کە گوێی لە لویب بوو زەنگی مردن لەناو دڵی (بۆبی)دا لێیدا، لویب گوتی:

- دەبوو دوای هەڵاتنت جلوبەرگەکەت چاك بپشکنیایە، ئەوەندە گێلۆکەو نەفام نین لێت گەڕێین، دەبوو ئامێرێکی بەدوادا چوونت تیا بچێنین.

لیۆبۆڵد پرچی بۆبی ڕاکێشا و سەری بۆ لای دواوەی برد و لوولەی دەمانچەکەی نایە نێو دەمیەوەو گوتی:

- بۆبی.. ئەمڕۆ زۆر بڵێیەکەت کۆتایی پێ دێنم، لەئەمڕۆ بەدواوە هیچ سەربوردەیەك ناگێڕیتەوە، هیچ شەیتانێکیش بانگهێشت ناکەیت، ئەمجارە ئێمە چیرۆکێکمان بۆ تۆ هەیە، خۆت شل بکە، ئەوە دوایین حیکایەتە لەژیانی قێزەونتدا گوێت لێ دەبێت، چاکیش دەزانیت ئەوەی ڕێکخراو دەیکوژێت، دەبێت ئەم بەسەرهاتە ببیستێت، تا بیری بێتەوە ئەوەی ڕێکخراو ڕۆژێ لە ڕۆژان پەیمانی وێداوە.

بۆبی فرانك.. سێ کارتی نەفەرتیت هەیە و لەکۆمەڵەی تایبەتەکەماندا بۆمان هەڵبژاردووی.

کارتی یەکەم.. کارتی مەرگە، وێنەی شەیتانی مەرگی بەسەرەوەیە، ماچی کچێکی سۆزانی دەکات.

کارتی دووەم.. کارتی لێکۆڵەرە، وێنەی لێکۆڵەرێکی بەسەرەوەیە، پێدەچێت ئەو شتەی لێی دەکۆڵێتەوە سەخت و ئاڵۆز بێت.

کارتی سێیەم.. کارتی شەیتانە، وێنەی پیاوێکی لەپۆلاوازی بەسەرەوەیە، پێناچێت دڕستانە بێت، بەسەر کۆمەڵێك لاشەوە دانیشتووە.

***

# بەشی یانزەهەم

## خوێنڕێژی جگەرگۆشەکان

## ١٨٨٨ دوای زایین

***

### لەندەن ١٨٨٨

لەندەن بە ڕوحی بەربەیانێکی تەمومژاوی خۆری بەسەرەوە هەڵهات، شۆستەکان بە ئاونگ ڕووکەشکراون، بینا مێورەکان دڵیان دەکردەوە. دیمەنی سەر زەویەکە چون ئەوەی کەسێك کامێراکەی بەسەر زەویەکەوە بیرچووبێت، دوو پێی کەسێك بەسەر شۆستەکەوە پەلەی پێوە دیاربوو، کامێراکە بەدوویەوە بوو، بەپێی پێلاوەکانییەوە پێدەچوو کەسێکی پۆشتەو پەرداخ بێت، لەسیلەیشیەوە پێگەلێك بە پێلاوی بریقەدارەوە ، وەك کەسانێکی ڕێکپۆش دەرکەوتن، مینا وتو وێژێکیان بەدەم ڕێوە بکەن، وەلێ قسەکانیان نەدەبیستران.

پێلاوەکان لە ڕۆیشتن کەوتن، وێنەکە بەسەر پێلاوەکانەوە وێستا، بەڕاستی ڕێکپۆشی هەر ڕێکپۆشە، دەموچاوێکی سێ گۆشەیی و نێوچەوانێکی پان و پرچ قاوەیی و لە دەمەتەقێی خۆشیان هەر نەدەکەوتن، لێمگەڕێ پێتانی

بناسێنم، ئابیرلین.. لێکۆڵەری ئینگلیزی کە لە مێژوودا ناوبانگی هاتووە، لەسیلەی ئەویشدا پیاوێکی قەڵەو چوون ستێبەرێکی قەڵەو بەدوایەوەبوو، جاروبار بەدەستەسڕەکەی نێوچەوانی خۆی دەسڕییەوە، ئەویش گۆدلی بوو، یاریدەدەری (ئابیرلین)ی لێکۆڵەر، پێدەچێت بەشوێنی مەبەست گەیشتبن، بۆیە وێستان.

گویمان لەدەنگە دەنگێکی لەسەرخۆ بوو، خەڵکانێك گردبوونەتەوە وتو وێژ دەکەن، پێدەچێت کارەساتێك ڕوویدابێت، گۆدلی هاواری بەسەر گردبووەوەکاندا کرد، هاوارێکی وا ناچاریانی کرد لەیەك دوور بکەونەوە، تەرمێك لەناوەندی گردبوونەوەکە دەرکەوت، ژنێك لەتەمەنی چل ساڵیدایەو لەشەقام بەکوژراوی فڕێدراوە، بەسەرو چاویدا دیارە دۆزەخی بەچاوی خۆی بینیبێت، پاشماوەی بۆکس بە ڕوخسارییەوە دیاربوو، ددان بەدەمیەوە نەمابوو، گۆدلی گوتی:

- ئەوە چ خوێنڕێژێکی بێ ڕەوشتە وایلێکردووە؟

ئابیرلین لە لاشەکەی ڕوانی و وەك شارەزایەك گوتی:

- بەڵێ خوێنڕێژە، وەلێ کارێکی درندەیی نییە، خوێن بەدارو دیوارەوە نەپژاوە، ئەوە کەسێکە پێشتر پیلانی بۆ کوشتنەکەی داڕشتووەو دواتر بە هێمنی و بە پاڵەوتوویی سەری بڕیوە.

گۆدلی کاغەز و پێنووسی تایبەت بە ڕووداوەکەی دەرهێناو کەوتە نووسینەوەی هەموو ئەو خاڵانەی تایبەتبوون بە ڕووداوەکە، ئابیرلین تەماشای چواردەوری تەرمەکەی کرد، دواتر لە خەڵکەکە وردبووەوە، پۆلیسی لێپرسراو گوتی:

- کاتێ بێرەدا تێدەپەڕیم، بینیم لێرە فڕێدراوەو کەسیش دەستی پێنەگەیشتووە.

ئابیرلین چاوی بە بیان نزیکەکان گێڕدا، چاوی بڕییە پەنجەرەیەکی نزیک لەشوێنی تەرمەکە، کە لەنهۆمی یەکەمدابوو، ئابیرلین دەستیەجێ سەرکەوتە ئەو شوققەیە، ئافرەتێك بەدووچاوی دڵەڕاوکێوە دەرگای لێکردەوە، ئابیرلین خۆی پێ ناساند، ئەویش ڕێی ویێدا بچێتە ژوورەوە، لەسەرخۆ و بەدەم پرسیارەوە چووە ژوورەوە:

- خانمەکەم.. داوای لێبووردنت لێدەکەم کە ناڕەحەتمان کردی، شەوی ڕابردوو لەسەر شەقامەکە گوێت لەهیچ بووە؟

ئافرەتەکە چون ئەوەی هەلی قسەکردنی بۆ هاتبێت گوتی:

- ئای.. مەبەستت ئەو داماوە کوژراوەیە، چەند خەفەت لەو ئاوارانە دەخۆم، لەڕووسیای قەیسەری و ئێرلەندەوە هاتوون و لە (وایت شابل) ئاکانجی بن، داماوی و دەربەدەرییان بەس نییە، تا لەم ڕێ و بانەشدا بەو ئاوایە فڕێ بدرێن.

ئابیرلین هیچ هەڵچوونێکی بۆ نەبوو، بەوای ئەوەی کە وەڵامی پرسیارەکەی نەداوەتەوە، لێ لەپەنجەرەکە نزیکبووەوە، پاپیەکەی دەرهێنا و هەڵیکرد، ما تەماشای گردبوونەوەی سەر شەقامەکە بکات، گۆدلی کراسی کچە کوژراوەکەی هەڵدەدایەوەو تەماشای ژێر کراسەکەی کرد، خەڵکەکە لەوەدابوون لێی ڕاپەڕن، ئابیرلین پێکەنی و بە ئافرەتەکەی گوت:

- دێنی شەو گوێت لە هاوارو فیزاحی ئەو داماوە ئاوارەیە نەبوو؟ یا گوێت هەر لەهیچ شتێك نەبووە؟

– گوێم لەهیچ نەبووە، ئەگەرچی چەند جارێکیش بە ئاگابوومەتـەوە، ئاخر خەوی من پچڕ پچڕە، ئەوەی خەبەری کردمەوە ئامادەبوونی پۆلیس بوو.

ئابیرلین.. کەمێك پرسیاری تری لێکرد، دواتر جێیهێشت، ئـەوجا ئافرەتەکە بەچاوی مێینەییەوە لێی ڕوانی و گوتی:

– ، کوڕی قژز.. سەردانی ترم دەکەیت؟

– بەڵێ.. ڕەنگە ڕۆژێکی تر.

ئابیرلین دابەزی ، گۆدل بە زۆربڵێی پێشوازی لێکرد، گرنگترین پشکنینی کردبـووی لـە هەڵدانـەوەی کراسـی کچـەکە دابـوو، مـاڵی (لامبـیس)ی لێ نووسرابوو، کە لەیەکێ لەو خانووە هاوبەشانە دەژیا، ئـەوێش ژوورگـەلێکی بچووك و خەڵکانێکی زۆر تێید، نیشتەجێن، هەرکەسـەو یا دووکـەس لەسـەر پێخەفێك دەنوون، ئەویش بەوای هەرزانی شوێنەکەوە بوو.

لـەماڵی لامبـیس هـەموو شـتێك هـەژار نشـینە، دیـوارو زەوی و تەنانـەت ئاکانجییەکانیش ژیانێکی کولەمەرگی دەژێن، هـەژاری بـەو نەهامەتییانـەیان قایل بوون، ترس لەچاوەکانیاندا دیاربوو، بەڕێز هۆلاند بەڕێوەبەری ماڵەکەیە و هـەر ئـەوە وەلامـی پرسـیارەکانی ئـابیرلین دەداتـەوە، کوژراوەکـە لێـرە نیشتەجێ بوو، ناویشی (ماری ئان نیکۆلس)بوو نازناویشی (پۆلی)بوو، هۆلاند گوتی:

– پۆلی.. دوێنێ سەرمەستبوو، ئەوەی ڕاستیبێت کرێـی جێخەوەکـەی نەبوو، کـە لەتـەك (لیلۆیین)بـوو، نرخەکـەی (٤) پـنس بـوو، دواتـر ناچاربووین لێرە دەریبکەین، هەر دوێنێ...

گۆدل بەتووڕەییەوە گوتی:

- چوار پنس ئەی کەمژە؟! ئەوەنا خوێنڕێژانی شەقام کوشتیان، دڵت بەزەیی پیا نەهاتەوە؟

- گەورەم.. بۆلی پارەی پێبوو، وەلێ بە مەی دەدا، کەسێکی باشیش نەبوو، مێردەکەی بەر لەحەوت ساڵ کە بەداوێن پیسییەکەی زانیبوو لێی جیابووەوە، خانوادەکەشی بەوای مەی خواردنەوە و ڕەوشتی خراپییەوە دەریان کردبوو.

پێدەچوو ئافرەتێکی قژ سوور کە ناوی (ئیمیلی)یە ئەویش بیەوێت قسان بکات، بەڕێوەبەرەکە ڕێی وێدا، گوتی:

- دوێنی لەسەرگەی شەقامەکە چاوەم بە بۆلی داماو کەوت، دیاربوو مەستببوو، پێیگوتم.. سێ بەقەد کرێی جێخەوەکەی پێ بووە، وەلێ لەمەی خەرجی کردووە، پیاوێك هەیە لەتەکیدا دەخەوێت و پارەی وێدەدات و دوای چەند کاتژمێرێك دێتەوە، پێدەچێت لەتەکیا نەخەوتبێت، دوور نییە ئەو سەری بڕیبێت.

***

## ڕەنگە لێکۆڵەر فریای یەکێك بکەوێت، حەوت دەمێننەوە، حەوت سۆزانی سواڵ بۆ چەند شلنێك دەکەن، یەك لە دادگا دەمێنێتەوەو دواتر کوشتنەکە ڕوودەدات

شوێن پێی ئابیرلین و هاوڕێکەی بەسەر خاکی لەندەنەوە بەوای بارانەکەوە پەلەکردنیان پێوە دیاربوو، دوای هەفتەیەك لە ڕووداوەکە کارەساتێکی تر ڕوویداوە، ئانی شابمان.. سۆزانییەکی قەڵەو بەسەر براوی دۆزراوەتەوە،

سکی هەڵدراوەو ریخۆڵەکانی بەسەرو شانییەوە دیمەنێکی قێزەونی هەبوو، پۆلیس بە پەلە گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکەو تەرمەکەیان بۆ ژووری توێکاری برد، گۆدلی غاری دەداو دەیگوت:

- ئەو بێ ڕەوشتە تەنها سۆزانییەکانی گرتووە.

ئابیرلین گوتی:

- زۆر شارەزایانە دەیانکوژێت، جەستەشیان لەت و پەت دەکات.

گەیشتنە شوێنی ڕووداوەکە، کە شەقامی (هانبۆری) بوو، لەوێ کارەساتەکە ڕوویدابوو، تەرمەکە بۆ ژووری توێکاری برابوو، وەلێ ترس و دڵەڕاوکێ بە سیمای هاموشۆکەرانەوە دیاربوو. ئابیرلین تەماشای شوێنی تاوانەکەی کرد، شەقامێکی سەرەکی و دووکانگەلێکی زۆر و هەڵێکە کەسێك شتێکی بینیبێت یا بیستبێت، یا هەر شتێك ئەوەندەی تاڵە موویەکیش بێت. ما هەردوو لێکۆڵەرەکە لەخاوەن دووکانەکان پرسیار بکەن، تەنانەت لەو ماڵانەی نزیکیش بپرسن، تا ئافرەتێك دەرکەوت، پیرێژنێك ترسی لێ نیشتبوو، لە لێکۆڵەرەکان نزیکبووەوە، دەست و پێی دەلەرزی، گوتی:

- گە.. گەو.. گەورەم، من بینیم.

گۆدلی بەدەنگێك ئاژرەتەکەی ئەوەندەی تر ترساند و گوتی:

- قسە بکە، زێك چیت بینیوە باسی بکە؟ ناوت چییە؟

ئابیرلین بە ئیشارەتێك گۆدلی لەپرسیارکردن ڕاگرت و لە ئافرەتەکە نزیکەوە بوو، لێی پرسی:

- خانمەکەم.. چاوەکانت بۆ ئێمە گرنگن، پێمان بڵێ ئەو چاوانەت چی بینیوە؟

پیرەژنەکە ئامێکی هەڵکێشاو گوتی:

– دە.. دەڕۆیشتم، بب..بۆ بازاڕ.. بازاڕی سب.. سباتیفێڵد، کاتێ ئەو ئافرەتەم بینی لەتەك کەسێکی تۆزکە شەپقەی ڕەشی بازنەیی لەسەردابوو، ڕاوەستابوو، گوێملێبوو گوتی(( دەیکەی؟)) وەڵامی دایەوە ((بەڵێ)).

ئابیرلین پێیگوت:

– ڕوخساری چۆن بوو؟

پیرەژنەکە گوتی:

– پشتی لێمبوو، ئەویش بەرامبەری گرتبوو، دەموچاوی ئەوم لێوە دیاربوو.

گودل ئەو قسانەی لە دەفتەری تێبینییەکانی نووسییەوە. دواتر ئابیرلین سووپاسی ئافرەتەکەی کرد و پێیگوت:

– لەتەکمانا دێیت بۆ ژووری توێکاری، کوژراوەکەمان پێبناسێنیت؟

کارێکی سەختبوو، پیرەژنێکی تۆقیوە دڵنیا بکەیتەوە، وەلێ پەیمانی وێدابوو، بەر لەوەی دەموچاوی کوژراوەکە ببینێت ئارامی پێببەخشێت.

لەژووری توێکارییەکە پزیشکەکە لەبەرامبەر تەرمی دووەمدا دۆشدامابوو، بە ئابیرلینی گوت:

– ئەو هیچ و پووچە لە چەقۆ وەشاندن زۆر شارەزایە، تەنانەت لەمنی پزیشکیش شارەزاترە.

ئابیرلین پەنجەی لەسەر لێوی خۆی دانا، وەك ئەوەی پزیشکەکە بێدەنگ بێت، ئەوجا پیرەژنەکەیان بۆ ژوورەوە بانگ کرد، پیرەژنەکە دەموچاوی (شابمان)ی بینی دامێزرابوو، تەنها جێی بۆکسی پێوەبوو، پیرەژنەکە دانی بەخۆیدا گرت و گوتی:

- بە.. بەڵ.. بەڵێ.. بەڵێ ئەوە.

گۆدل دەستی پیرەژنەکەی گرت و تا بەر دەرگاکە بەڕێیخست، پزیشکەکەیش بەدەنگێکی نەوی بە (ئابیرلین)ی گوت:

- ئەو خوێنڕێژە بێ ڕەوشتە سکی هەڵدڕیوە و هەرچی لەناوسکیدابووە دەریهێناوە و بردوویەتی، تەنها یەك چەقۆ ئەو هەموو ناوسکەی پێ دەرهێناوە، ئەوە نەشەرگەریووە، بێشك ئەوە کارێتی، کەس ئەو ئەزموونەی نییە، تەنانەت پزیشکی ڕاهێنەریش بە چارەکە کاتژمێرێك ئەو هەمووەی پێناکرێت.

ئابیرلین وەك ئەوەی لەتەك خۆیدا قسە بکات گوتی:

- ئەوەشت لەبیر نەچێت لەنێو تاریکی شەقامدا و بە دوودڵییەوە بەنیو چاوەوە ئەوە کرابێت، چونکە نیوچاوەکەی تری چاودێری شەقامی پێ کردووە.

پزیشکەکە گوتی:

- شتێکیتریش هەیە، ئەو هەتیوە سێ ئونگوستیلەی لەدەستی کوژراوەکە بردووە، ئەوەش لەشوێنەواری پەنجەی کوژراوەکەدا دیارە.

هەردوو لێکۆڵەرەکە بەدۆشداماوی گەڕانەوە. پیاوێکی قۆز و بە ئەزموون لە زانستی توێکاری چاك دەزانێت و سۆزانییەکانی پێ ڕاز دەکات، یەکەم و دووەمی بەهەمان شێواز کوشتووە، منداڵدانی دووەمیشی بردووە، ئەوە سەرەڕای بردنی ئۆنگووستیلەکانیشی، کارێگەری ڕووداوەکان بەسەر ئابیرلین نارەحەتی کردبوو، بلەز بەرەو ماڵی (کرۆسینگهام) بەڕێکەوت، دوایین نیشینگەی کوژراوی دووەم، بەر لەوەی بچنە ژوورەوە چاویان بە گردبوونەوەیەك کەوت، وەك ئەوەی دەمەدەمیان بێت، گۆدلی چووە ناویان و خۆی پێیان ناساند، ئەوەندەی نەبرد هەمووان لەبەرامبەر لێکۆڵەرەکان ئارام بوونەوە، یەکێك لە پیاوەکان گوتی:

- بەڕێز لێکۆڵەر.. من (ستانلی)م و هاوڕێی (شابمان)ی کوژراوەکە، نرخی جێخەوەکەیم دەدا، ئەو چەند ڕۆژەی ڕابردوو لێی دواکەوتم، ئەو کینە لەدڵانە لەوێ دەریان کرد، دۆنۆڤان.. بەڕێوەبەری خانووەکە دەری کرد، ئەو ژنە قەڵەوەش بەر لەهەفتەیەك لەگەڵ شابمان بوو بەشەڕیان، لەچاوی شابمانی داو مۆری کردەوە، تا مردنیشی ئەو مۆرییە بە لاچاویەوە بوو.

ژنە قەڵەوەکە بەتووندی بەرپەرچی دایەوە، لێ ئابیرلین دەستی بەرز کردەوەو پرسی:

- بۆچی لەچاویتدا؟

پیاوەکە بەدەم دڵەڕاوکێوە گوتی:

- لەبەر من لێیدا، هەردووکیان لەسەر من شەڕیان بوو.

گۆدلی هاواری بەسەر پیاوەکەوە کرد و یەخەی گرت:

- هەی هیچ و پووچ.. پێتوایە (برۆمیل)ی تا ئافرەتێك هاوڕێكەی لەبەر تۆ بكوژێت و ئاوسكی بە منداڵدانییەوە دەربهێنێت؟

ئافرەتە قەڵەوەكە بۆ بەرگری كردن لەخۆی گوتی:

- گەورەم.. شەڕەكەمان لەسەر سابوون بوو، ئەم پیاوە هیچ پەیوەندییەكی بەوەوە نەبوو، دواتر ئاشتەوە بووین، ئەو ڕۆژە كە مرد لەسەر كۆڵانەكە بینیم، باروودۆخی جێگیر نەبوو، پێیگوتم دەچێت لە ستراتفۆرد هەندێ پارە پەیدا بكات، دەنا نەیدەتوانی لێرە بمێنێتەوە.

ئابیرلین بەزمانێكی سەرزەنشتانە پێیگوت:

- كەواتە شەوی مردنەكەی دەرتان كرد؟

دۆنۆڤان خاوەن نیشینگەكە گوتی:

- بەڵێ.

ئابیرلین گوتی:

- ڕەوشتی چۆن بوو؟مەی زۆر دەخوارەدەوە؟

لیزا بەڕێوەبەری نیشینگەكە بەدەم ڕێكخستنی چاوێلكەكەیەوە گوتی:

- بەڵێ، مێردەكەی بەوای ڕەوشت خراپییەكەیەوە وازی لێهێنا، دوای دابڕانیان بە یەكجاری ڕووی لە بەدڕەوشتی كرد.

ئابیرلین هەناسەیەكی هەڵكێشاو گوتی:

- ئەمە زەنگێكیتر لێدەدات، هەمان چیرۆكی (بۆلی)یە قوربانی یەكەم، پێبڵێ نازناوی ئانی شابمان چیبوو؟

ستانلی گوتی:

– ئانی کوژاوه، یا تاریك.

ئابیرلین بیری دەهات و دەچوو، دواتر هەمووان گویان لەدەنگی گەنجێکبوو، ڕۆژنامەیەکی بەدەستەوەبوو، بەدەنگی بەرز هاواری دەکرد و دەیگوت:

– بەڕێز دۆنۆڤان، خاتوو لیزا خوێنڕێژەکە نامەیەکی بەهەموو دنیادا بلاوکردووەتەوە.

گەنجەکە وەستاو چاوەکانی لەناحاڵبوونی گردبوونەوەی ئەو هەموو خەڵکە بەدەوری دۆنۆڤانەوە ڕاما، هەر هەموو چاویان لەڕۆژنامەکانی دەستی بڕی، وەك ئەوەی ڕۆژنامەی کارەکانیانی پێبێت.

***

## ڕەنگە لێکۆڵەر یەکێك ڕزگار بکات، حەوت سۆزانی بچووك لە پێناو چەند شلنێك سواڵ بکەن، یەکێك لەدادگادا دەمێنێتەوە، دواتر کوشتنەکە ڕوودەدات

نامەیەك لە (جاك)ی خوێنڕێژەوە

(( ئازیزەکەم سەرۆکی ڕۆژنامە..

بەردەوام گوێم لەهەواڵەکان دەبێت، گوایە پۆلیس دەستبەسەری کردووم، بەو هەواڵە زۆر پێکەنیم، دەشڵێن بۆ ئەو بابەتە لەڕێگای چارەسەردابن، ئەو نووکتەیەش هەر لەدووبارە کردنەوەی ناکەون، لەمەڕ خاوەن پاڵتۆ چەرمەکەوە، بزانن دادەبەزمە گژەپانی سۆزانییەکان و لەکوشتنیان

ناکەوم، تا لێیان دەبمەوە، دوا چالاکیم مەزنبوو، تەنانەت هەلی ئەوەشم بەو سۆزانییە نەدا هاوار بکات، بەم زووانە شتێترم لێ دەبیستن، هەندێك لەخوێنەکەیشم خستە بۆتەیەك تا ئەم وتارەی پێبنووسم، مەخابن زوو مەیی، مەرەکەبی بۆ نووسینەوەی ئەم وتارە بەسە ، جاری ئایندە گوێی ئەو سۆزانیانە دەبڕم و ڕەوانەی پۆلیسی دەکەم، چەقۆکەم لەگوێزان تیژترە، بەو ئاواتەوەم بەزووترین کات هەلێك بقۆزمەوە. بەختی بەختەوەر (جاك)ی خوێنڕێژ، لێمگەڕێن ئەم نازناوە شایەستەیە لەخۆم بنێم)).

گۆدل لەگەڵ قەمچکردنی ڕۆژنامەکە بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئەو ڕێویانە وشەگەلێك لەڕۆژنامەکەیان دەهۆننەوە، هەر بۆ ئەوەی سەرفیاتیان زۆرتر بێت، دەچینەوە دیدەنیان، وەلێ ژیانیان بەدۆزخ دەکەین.

گۆدل تەماشای (ئابیرلین)ی کرد، ئەویش شانەیەکی بچکۆلەی لەگیرفانی دەرهێناو قژە سەرەکەی پێ داهێنا ، گۆدل دەزانێت ئابیرلین کاتێ تووڕە دەبێت، ئەوشانەیە دەردەکات و قژی دادێنێت. ئابیرلین گوتی:

- قسەی ڕۆژنامەکان لەمەڕ ئەم تاوانەوە ڕاست نییە، ئەوان کێشەی گشتی دەنێنەوە، باسیان لەو تاوانانە نەکرد، کە بەدواداچوونمان بۆ کردن، ئەو خاتوونانەی جەستەیانمان بێ دەست و پێ دۆزییەوە،ی ڕۆژنامەکان ئەوە ناکەن مەگەر...

گۆدل بەچاوی پرسیارەوە لێی ڕوانی، ئابیرلین شانەکەی لەگیرفان نایەوەو گوتی:

- مەگەر فەرمانیان بۆ ئەو کارە بۆ هاتبێت، خوێنەرێك ناتوانێت نامەی لەم جۆرە بڵاوبکاتەوەو بەریەرەکانی جیهان بکات، مەگەر پارێزراوبێت.
- ئابیرلین.. ئەم ڕۆژنامەیە درۆزنە، تەنها بۆ ئەوەیانە زۆرترین ژمارەی لێ بفرۆشن.

ئابیرلین گوتی:

- هەموو ئەو ڕۆژنامانەم دەوێت، لە ناوخۆییەکان و نێونەتەوەییەکان کە لەسەرەتای ئەم مانگەوە تا ئەمڕۆ دەرچووە.

لەو کتێبخانەیە و لەژێر پانکایەکی بەدار ڕاجەوە کراو، کە لەگەڵ سووڕانەوەی سایەیەکی درووست دەکرد، ئابیرلین شەکەت و ماندوو، قژە سەریشی ژاکاوە، بە سەر کۆمەڵێك ڕۆژنامەدا نووشتابووەوە و بەسەری دەکردنەوە، (گۆدلی)ش بەسەر کورسییەکەوە چاوە خەواڵووەکانی لە خەو نزیکبیووەوە، لەپڕ ئابیرلین لەتەك سەح کردنەوەی ڕۆژنامەیك گوتی:

- ئەی پڵنگ.. میر ئەلبەرت فیکتۆر دەناسیت؟

گۆدل ڕاچڵەکی و گوتی:

- بیرم نییە: چییەتی؟
- بەلاتەوە گرنگە بزانیت، میر فیکتۆر بەر لە دە ڕۆژ بۆ (یۆرکشایر) گەشتی کردووە، بۆ میوانی لای هەندێ لەپیاو ماقووڵان و هەر ئەمڕۆش بۆ شاری (یۆرك) بۆ ڕاو گەشتی کردووەو هەفتەیەك دەمێنێتەوە.
- ئازیزم ئابیرلین.. وابزانم ماندوویت و پێویستت بەخەوە.

گۆودلی بۆ خۆی چاوی داخست، وەلێ ئابیرلین لەشوێنی خۆی هەستاو گوتی:

– هەرچی زانیارییە لەمەڕ ئەم میرەوە هەیە بۆمی کۆبکەرەوە، زانیاری ڕاست و دروستم دەوێت، هەر هەموو ئەو نەشتەرگەرانەی لێیەوە نزیکن، ئەو هەواڵانەش لە ڕۆژنامەکان دەست ناکەوێت، ڕەنگە بۆ دوورخستنەوەی گومان دایبڕێژن.

گۆدلی ویستی شتێك بڵێت، وەلێ یەك لە لێکۆڵەرەوەکان هاتە کتێبخانەکە و کۆمەڵێك ڕۆژنامەی ئەوڕۆی خستە بەردەمی و پێیگوت:

– بڕوانە (جاك)ی خوێنڕێژ نامەیەکی تری ناردووە.

ئابیرلین بلەز ڕۆژنامەکەی وەرگرت و خوێندیەوە.

(( ئازیزەکەم سەرۆك.. دەمەوێت ئامۆژگاریەکت وێدەم، هیچ ڕەمزێکیش بەکار ناهێنم، سبەی گوێت لە چالاکییەکی تری (جاك)ی ئاشرین دەبێت، تاوانێکی دووانەیی دەگێڕێت، ئەمجارەیان گوێی سۆزانییەکەت بۆ دەنێرم.. جاکی خوێنڕێژ)).

ئابیرلین ڕۆژنامەکەی جێهێشت و بە پەلە دەرپەڕی و گوتی:

– تاوانێکی دووانەیی.

***

## یەکێکیان لەدادگا دەمێنێتەوە، دواتر کوشتنەکە ڕوودەدات، شەش سۆزانی بچووک دڵخۆشن کە لەژیاندا ماون، یەکێکیان بۆ لای جاك ڕۆیشت، ئەوجا پێنجی مانەوە

دوای چەندین کاتژمێر پیرەی گەرەر فرۆش لەنێو عارەبانەکەیدا دانیشتووەو بەو شەوە بە ئارامی بەرەو گۆڕەپانی دۆتفێڵد بەڕێ کەوت، پیرە تێبینی ئەوەی کرد دەروازەی گۆڕەپانەکە کراوەیە، ڕاستەوخۆ چووە ژوورەوە، لێ ئەسپەکەی بێ هۆکارێك وێستاو سەری بەلای چەپا وەرچەرخاند، پیرە سەری بۆ لار کردەوە، تا بزانێت ئەسپەکەی لەبەر چی وەستا، تاریکییەکە و چاوە کزەکانی هاوکاری نەبوون، شتێك لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، پیرە دەنکە شقارتەیەکی پێکرد، تا لەو شتە ورد بێتەوە، دڵی ڕاچڵەکی، ئافرەتێك لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، پیرە پەشۆکا، بەتاو بەرەو بارێکی نزیك ڕۆیشت، بەسەر دانیشتوانی بارەکە هاواری کرد، تا چرا ببەن و تەماشای ئەو کارەساتە بکەن.

خەڵکەکە لەبارەکە هاتنە دەرەوە، چرایان بەدەستەوە، چاویان بە ئافرەتێك کەوت لەسەر زەوییەکە کەوتبوو، خوێن بەژێریەوە جۆگەلەی بەستبوو. پیرە لەوپەڕی پەشۆکاویدابوو. کاتژمێرێکی نەبرد ئابیرلین و گۆدلی ئامادەبوون، (ئابیرلین)ی لێکۆڵەر بەوریاییەوە دەستی لەسەر تەرمەکە دانا، سەری برابوو، ددانەکانیشی شکابوون، وەلێ ئەوەی زۆر کاریگەر بوو بەلایەوە گوێکانیشی برابوون، ئابیرلین بە گۆدلی هاوڵی گوت:

- وەك لەنامەکەدا هاتبوو، گوێکانیشی بڕیوە، کەواتە نامەکە درۆ نەبوو.

گۆدلی گوتی:

- ئەمجارە سکی هەڵتەدریوە.

ئابیرلین لەدەورووبەری خۆی ڕوانی و گوتی:

- ڕەنگە کاتی بەدەستەوە نەبووبێت، یاخود...

لەنێو تاریکییەکە پۆلیسێك بە پەشۆکاوییەوە لەناو گۆڕەپانەکە هاواری کرد:

- هەموو هێزەکان بەرەو گۆڕەپانی میتری بەڕێبکەون، جاکی خوێنڕێژ تاوانێکی تری کردووە.

***

## ئافرەتێك بۆ لای جاك ڕۆیشت، دواتر بوون بە پێنج، چوارو سۆزانییەك، من و سیانی تر

پێکەلێك بە هەڵەداوان و پەشۆکاوییەوە بەسەر خاکی لەندەندا غاریان دەدا، ئەوی پێڵاوەکەی پۆشتەتر بوو، پێدەچوو لە هاوڕێ قەڵەوەکەی زیاتر نوو دڵ بێت، لەگۆڕەپانی میتری تەرمی چوارەم بەناشرینترین شێوە شێوێندرابوو، سەر بڕاو و سك هەڵدڕاو و ڕیخۆڵەکانیشی بەسەر شان و ملیدا ئاڵکابوو، شوێنێکی نەبوو بە چەقۆ ونجڕ ونجڕ نەکرابێت، ئابیرلین بە ئەزموونی خۆی لەو بوارەدا تەماشای سك هەڵدڕانەکەی کرد، دیاربوو گورچیلەکانی برابوون، ئارەقە بەنێوچەوانی (ئابیرلین)ەوە دەرکەوت، شتێکی نائاسایی لەو هەموووەدا هەبوو.

بکوژێکی شارەزا بەربەرەکانی هەمووانی دەکرد، دەشیزانی پۆلیس بەوای ئەو نامەیەی ناردبووی لەبۆسەیدا دەبن، وەلێ بەوپەڕی شارەزاییەوە تاوانەکەی ئەنجامدا، ئەو ماوەیەشی بەدەستەوەبوو گورچیلەکانی

دەریهێنێت، جاری پێشوو بەهەمان شارەزاییەوە منداڵدانی برد، تۆ بڵێی ئەو پشتەی هەیەتی لە هێزی پۆلیس بەهێزتر بێت؟

گۆدلی گوتی:

– بڕوانە گورچیلەکانی بردووە، شێت ئەو گورچیلانەی بۆچییە؟

یەکێك لەپیاوەکان دەستی نایە سەرشانی ئابیرلین و گوتی:

– گەورەم شتێك هەیە پێویستە ببیبنیت!

بەدووری سێ کۆلانی بچووك پارچەیەك لەکراسی ژنە کوژراوەکەی چوارەم بەسەر زەوییەکەوە کەوتبوو، ئابیرلین پشکنینێکی وردی بۆ کرد، وەلێ ئەوەی دڵی ئابیرلین و گۆدلی خستبووە واقوڕمانەوە، ئەو ڕستەیەبوو کە بەسەر دیوارەکەوە نووسرابوو(( تەنها جوولەکەکان لەسەر هیچ شتێك لۆمە ناکرێن)) وشەی جوولەکە بەشێوازێکی نامۆ نووسرابوو، ئەویش juwes نەك jews.

***

## چوار سۆزانی، من و سێیتر
## بەئاور گڕ لەشار بەردەدەم
## دووانیتر لەوێ دەبن

گۆدلی بەدەم سەرخوراندنی کەچەڵییەکەیەوە ما لەو ڕستە نووسراوەی بەتەباشیر نووسرابوو ڕابمێنێت و دواتر گوتی:

– ببوورە.. بەڵام ئەوە چی دەگەیێنێت؟

ئابیرلین گوتی:

- وشەکان نابینیت؟
- بەڵێ دەیبینم، مانای ڕستەکە چییە؟ یانی لۆمەی جوولەکە دەکات، یا لۆمەی ناکات.

ئابیرلین گوتی:

- ئازیزەکەم.. درۆ بەدرۆ خستنەوە بەڵگەیە، هەرچی درۆیە لەڕستەکە لای بدە، تێدەگەیت، کاتێ دەڵێم حەزم بەناوبانگدەرکردن نییە، ئەگەر درۆکەی لێ دەربکەیت، یانی حەزم بەناوبانگ دەرکردنە.

گۆدلی ئەمجارە بەوردی خوێندییەوە:

- کەواتە جوولەکە لەسەر هەموو شتێك لۆمە دەکرێن.
- ڕێك وایە.

کەمێك گفتوگۆیان کرد و دواتر ئامادەی ڕۆیشتن بوون، ئەوەندە دوور نەکەوتبوونەوە، عارەبانەیەکی پۆلیس ئەسپ ڕایدەکێشا گەیشتە جێ، پیاوێکی شکۆمەند بەجلوبەرگی سەربازییەوە لەعارەبانەکە دابەزی، لەسەربازەکانی خوی. ئابیرلین پشتی بەدیوارەکەوە بوو، تا بەرچاویان نەکەوێت، (گۆدلی)ش هەمان شتی کرد، ئابیرلین ئیشارەتی بۆگۆدلی کرد بێدەنگ بێت. ئەو پیاوە شکۆمەندە تشارلز وارین بوو، بەڕێوەبەری پۆلیسی سکۆتلاندیارد، لەتەك داروەستەکەی زۆر بەتووندی دەدوا و دەیگوت:

- ئەو ڕستەیەی سەر دیوارەکە بسڕنەوە، نمانەوێ لەتەك جوولەکەکان تووشی شەڕی ناوخۆ بین.

پیاوانی پۆلیس ڕستەی سەر دیوارەکەیان وا سڕیبیەوە، وەك ئەوەی هیچ بەسەر ئەو دیوارەوە نەنووسرابێت، هەرچند پیاوەکان دەیانویست ڕازی بکەن تەنها وشەی جوولەکەکە بسڕنەوە، وەلێ ئەو هەر زۆر سووربوو تەواوی ڕستەکە کوێر بکرێتەوە.

***

## به ئاور شارەکە دەسووتێنم، دووانیان لەوێ دەبن

## دوو سۆزانی بچکۆلە

## لەنێوەشەودا و لەنێو دەروازەی گەرمی شاردا لەترسان دەلەرزێن

لە (وایت شابل)ی لەندەن ڕوحی خەڵکەکە هەڵچوو، ڕۆژنامەکان دڵی خەڵکیان جۆش دەدا، شەقام بەتەواوی وڕووژا، هەر هەموو بەدوای (جاک)ی خوێنڕێژ دەگەڕان، گەورە بازرگانەکان تیمێکیان لەخۆبەخشان پێکهێنا، ئەوان لەتەک پۆلیسەکاندا بەدوای بکوژەکە دەگەڕان، ناوی تیمەکەشیان ناو نا لیژنەی چاوکراوە.

شەوێك لەو شەوانەی تیمەکە ڕاهاتبوون بۆ (جاك)ی خوێنڕێژ بۆسە بنێنەوە، پۆلیسیش لەتەکیاندا بەچڕی لە ئامادەباشیدا بوون، شتێك لای ماڵی سەرۆکی لیژنەی چاوکراوە ڕوویدا.

جۆرج لاسك.. بازرگانی کەلوپەلی ناوماڵ و سەرۆکی لیژنەی چاوکراوە، ترس ئامبازی ببوو، بەوای ئەرەی پیاوێکی ڕیشدڕی لەبەرامبەر دەرگای ماڵەکەیدا بینی، هەموو ڕۆژێ لەو شوێنە دەوێستا، بۆیە پۆلیسی لێ ئاگادار کردەوە، ئەوانیش بەدەور ماڵەکەیدا ئێشکگرییان دەکرد. لاسك.. لە پەنجەرەی ژوورەکەیەوە چاوی بە (ئیڤانس)ی پۆستەچی کەوت، هات و کۆمەڵێك نامەی لەسندووقی پۆستەی لاسك داناو بەرەو هاوسێکانی لاسك ڕۆیشت، تا پۆستەکانیان پێبگەیێنێت، لاسك بەوای دڵنیابییەوە پاپشە پاپشە بەرەو لای سندووقی پۆستەکەی بەڕێکەوت، ویستی کۆمەڵە نامەکە دەربهێنێت و بەرەو ژوورەوە بڕوات، لاسك.. شەیتانی بەچاوی خۆی بینی، لەناو سندووقەکە سۆپرایزێك هەبوو، نیوەگورچیلەیەکی بنیادەم لەشووشەیەکی (مەی)دا دانرابوو، کاغەزێکیش بە مەرەکەبی سوور خوێن ئاسا لێی نووسرابوو:

(( بەڕێزم مستەر لاسك..

ئەو نیوگورچیلەیەی لە ژنی چوارەمم دەرهێنا و ئەوا بۆتی دەنێرم، نیوەکەی تریشم بۆ خۆم برژاند و خواردم، چەند بەلەزەت بوو، ڕەنگە ئەو چەقۆ خوێناوییەشت بۆ بنێرم، کە سکیم پێهەڵدڕی، وەلێ دەبێت کەمێك چاوەڕوان بیت.

وازۆ.. مستەر لاسك ئەگەر توانیت بمگرە))

لاسك.. ترس ئاخی هەژاند، وەلێ هەوڵی دەدا هزری هێور بکاتەوە، بەو ئاوابییەی هەموو ئەوانە هەڵبەستراون، یەدەستێکی لەرزۆکەوە سندووقەکەی ڕادەستی پۆلیس کرد، پزیشکەکانیش پشکنینی وردیان بۆ کرد، گوتیان گورچیلەی چەپی ژنێکە لەمەیخواردنەوە دانەبڕاوە، نەخۆشی گورچیلەشی هەبووە، بەناوی نەخۆشی(برایت)ەوە. ئەوەش وەسپی قوربانی چوارەم بوو.. ئەلیزابیت ستراید‌ەر خودی ئەو ئافرەتەی گورچیلەکانی دەرهێنرابوون.

***

## دوو سۆزانی بچووك، له دەروازیەك و لەنیوەشەودا و لەترساندا دەلەرزن، چەقۆکەی جاك دەبریقێتەوە، تەنها یەکێك ماوە

دوای هەردوو تاوانەکەی یەکەم، چاوانی خەڵکەکە ترسیان پێوەدیاربوو، وەلێ له تاوانی سێیەم و چوارەم شایەتحاڵەکان زۆرتر بوون، بنکە پۆلیسی سکۆتلاندیارد وەك شانەی هەنگ خەڵکی بۆ شایەتحاڵی گردببوونەوە، ناوی (جاك)ی خوێنرێژیش بەسەر زاری هەمووانەوە بوو، لە گۆشەیەکی ئەو بنکەیە ئابێرلین گەورە لێکۆڵەری سکۆتلاندیارد گوتی:

- بابەتەکە بووە بە گەڕەلاوژێ، شەیتانەکە بلەز دەجووڵێتەوەو بەریەرەکانی هەموانیش دەکات، بەڵام لەدەست من دەرناچێت.

گۆدلی بە حیرسەوە گوتی:

- **هاورێ هیمەت بکە، با وەك ئەو رۆژانە بگێرینەوە کە دەمانگێرا، پێمبڵێ تا ئێستا چیمان بەدەستەوەیە؟**

ئابێرلین لێوی خۆی گەزت، لەبەرامبەر دیوارێکدا وێستا، کە نەخشەی شەقامە سەرەتاییەکانی بەسەرەوەبوو، گۆدلی یاوەری گوتی:

- ماری ئان.. ئەو قوربانییەی یەکەم لێرە دەژیا، ئەوەی گوتبووی دەڕوات تـ لەتەك پیاوێك بخەوێت بەرامبەر برێ پارەی وێدات، نەگەڕابووەوە، چونکە ئەوەی کە بۆ لای ڕۆیشتبوو، سەری بڕیبوو.

ئابێرلین هێمایەکی(X)ی سووری کێشاو گوتی:

- سۆزانی دووەم.. ئانی شابمان ئەویش لە گەڕەکی هەژارنشین دەرکرا، گوتبووی دەشێت بەرامبەر برێك پارە لەتەك پیاوێك

بنوێت، بەڵام پیرەژنێك بینیبووی لەتەك پیاوێكی شەپقە بەسەردابوو، ئەو سەری بڕیبوو، منداڵدانیشی دەرهێنابوو.

ئابیرلین لەخاڵێكی سەر نەخشەكە وێنەیەكی كاریكاتێری پیاوێكی شەپقە بەسەری كێشا، لەتەنیشتیەوە هێمای(X)ی دووبارە كردەوەو گوتی:

- ئیلیزابێت ستراید كوژراوی سێیەم سەربوردەكەی شایەتحاڵی زۆرتری هەبوو، دوای ئەوەی خەڵكی بەوای سۆسە كردنی بارودۆخە ناهەموارەكە بەوای جاكی خوێنڕێژەوە، بەر لەچەند كاتژمێرێك ئەویان بینیبوو لەتەك كابرایەكی كورتەباڵای سمێڵدار كە جلوبەرگی پۆشتەی لەبەردابوو، شەپقەیەكی بازنەییشی لەسەرنابوو، یەكتریان ڕادەمووسی.
- ئەوە هەمان كەسە هەمان شەپقەی بەسەرەوەیەو لێرەش دووبارە بووەتەوە.

ئابیرلین بەردەوامی بەقسەكەی دا و گوتی:

- دوای ماچ و مووچ، ئەلیزابێت بەرەو شەقامەكە ڕۆیشت، لەوێ لەتەك پیاوێك بە پاڵتۆی ڕەش و شەپقەیەكی دەریاوانییەوە بینرا، ئەویش ماچ و مووچی خۆی كرد، پێیگوتبوو(( تۆ هەرچییەكم پێ دەڵێیت بیڵێ، تەنها نوێژ نەبێت)).
- هەر هەمان پیاوە شەپقە بەسەرەكەیە یا یەكێكیترە؟
- یەكێكیترە، شەپقەكەی جیاوازترە، تەنانەت جلوبەرگەكەشی جودایە.

ئابیرلین وێنەی كاریكاتێریی پیاوێكی شەپقە بەسەری دەریاوانی كێشا، بەڵام لەخاڵێكیتری سەر نەخشەكە و گوتی:

- لێرە بینراوە، پشتی بەدیوارێکەوە دابوو، پیاوە شەپقە بەسەر دەریاوانییەکە لەسەرەکە پێیگوتبوو(( نا.. نا ئەمشەو نا، شەوێکیتر)) دوای یەکتر ماچکردن، ئەلیزابیت بەرەو ئەوێ ڕۆیشت، ئەو شەقامەی تێیدا کوژرا.

ئابیرلین هێمای(X)ی سووری لەسەر نەخشەکە کێشا و گوتی:

- لێرە.. ڕێبوارێك بینیبووی لەگەڵ پیاوێکی سمێڵداری قاوەیی و شەپقەیەکی ڕەش و پاڵتۆیەکی درێژی لەبەردابووەو قسەی لەتەکا کردووە، دواتر هەڕلێداوە بۆ ناو کۆڵانەکە بیبات، ئەویش هاواری کردووە، پیاوێکیتر لەوبەری شەقامەکەوە خەریکی پێکردنی پایپ بووە، بەهێمنی چاودێری کردوون.

گۆدلی بەدەم چەناگە خوراندنەوە گوتی:

- یانی لە خوێنرێژێك زیاترمان هەیە، پێکەوەش کار دەکەن، نەك بەتەنها.

ئابیرلین بەدەنگێکی نەوی گوتی:

- بەڵێ، هەرهەمووشیان هێزێك لەپشتیانەوەیە لە پۆلیس بەهێزترە، تۆ بینیت بەڕێوەبەری پۆلیس چۆن ڕستەی سەر دیوارەکەی سڕییەوە، ئەوە پێچەوانەی ئاکاری کارەکانمانە، ئەو ڕستەیە چارەسەرەکەی تێدابوو، گۆدلی دەبێت مانای ڕاستەقینەی ئەو ڕستەیە تێبگەین.

ئابیرلین لای لەنەخشەکە کردەوەو وشەی (juews)ی لەهەمان شوێن نووسی و دواتر گۆدلی پرسیاری لێکرد:

- ئەی ئەوی چوارەم، ئەوەی کە بینیمان گورچیلەکانی دەرهێنرابوو، ئەو ڕستەیەش کە بەسەر کراسەکەیەوە نووسرابوو؟
- چوارەم.. کاترین کیلی ئەویان توندترین ئەشکەنجەی جەستەییان دابوو، لێرە چوویبووە دەرەوەو لای پاسەوانی شەقامەکە دانی بەوەدا هێنابوو کە (جاك)ی خوێنڕێژ دەناسێت و دەیەوێت خەبەر لەدەستی بدات، پاسەوانەکە مۆچیاری کردبووەوە ئەوەکو جاك دەستی پێبگات و بیکوژێت، وەڵێ گوێی بە ئامۆژگاری پاسەوانەکە نەدابوو.

ئابێرلین هێمای(X)ی چوارەمی کێشا و گوتی:

- لەم شەقامە سێ پیاو بینیبوویان لەگەڵ کەسێکی سمێڵداری ڕەش، چاکەتێکی فلێت و شەپقەیەکی گوڵدار و ملپێچێکی سوور بە ملییەوە قسەیان دەکرد، پێدەچێت دواتر ئەو پیاوە (کاترین)ی سەربڕیبێتو منداڵدان و گورچیلەکانیشی دەرهێنابێت، وەك چۆن پزیشك باسی لێوە کرد، بکوژەکە نیوەی گورچیلەکەی بۆ سەرۆکی لیژنەی چاوکراوە ناردبێت.

گۆدلی وەك پرسیار گوتی:

- قوربانی سێیەم و چوارەمیش هەر سۆزانی بوونە؟
- بەڵێ سۆزانی بوونە، چیرۆکی هەر چواریان لەیەك دەچێت.
- گوتت ئەوەی ئەو تاوانە دەکات، لەپۆلیسیش بەهێزترە، مەبەستت.. ئای خودایە، مەبەستت کەسێکە لەبنەماڵە دەستڕۆیشتووەکان؟ هەر بۆ ئەوەش ڕاتسپاردم زانیاری لەسەر میر کۆبکەمەوە؟

- بێنە بزانم چیت لێیان هەڵکراندووە.

گۆدلی دەفتەرەۆکەی تێبینییەکانی دەرهێناو گوتی:

- میر وەچەی شاژنی ئینگلتەرایە، بەڕوکەش پیاوێکی پۆشتەو رێکوپێکە، وەلێ لەناخەوە هەوەسبازی سێکسێکی نامۆیە، ئابڕۆچوونیشی لەگەڵ ژنانی نامۆدا زۆرن، وەلێ بەوای پاشایەتییەوە ئەو بابەتەی بەهەچ رێگایەکبووە داپۆشراوە، لەڕێی قسەکردنیشدا بۆت دەردەکەوێت نەخۆشی دەروونی هەیە، پزیشکی تایبەتی نەشتەرگەری هاوڕێی بنەماڵەکە (ولیام گول)ە.

ئابیرلین بزەخەنەیەکی بۆ کرد و گوتی:

- دڵنیابە هاوڕێ ئەوەی لەدڵی مندا بووە ڕاستە، دۆسێی (جاک)ی خوێنڕێژت بینیوە؟ ئەم زیل و خاشاکەی تەنیشتت بینیوە؟ دەیخەیتە دووتوێی و تا هەتایە دایدەپۆشین.

***

**هەشت سۆزانی هەرزە، ئومێدیان بە بەهەشت نییە، لێکۆڵەر ڕەنگە هەر یەکێکیان ڕزگار بکات، حەوتی دەمێننەوە، حەوت سۆزانی هەرزە بۆ چەند شلنێك سواڵ دەکەن، یەکێکیان لەدادگا دەمێنێتەوە، دواتر کوشتنەکە ڕوودەدات، شەش سۆزانی تری هەرزەکار دڵخۆشن بەمانەوەیان لە ژیاندا، یەکێکیان بۆ لای جاك ڕۆیشت، دواتر پێنج مانەوە، چوار سۆزانی.. من و سیانی تر. شار بە ئاور دەسووتێنم، دووان دەمێننەوە، دوو سۆزانی بچووك لەترسا دەلەرزن، لەدەروازەییەکی گەرم و لەنێوەشەودا چەقۆی جاك دەبریقێتەو، تەنها یەکێك ماوە، دواینیان پێگەیشتووتریانە، لە پێناو بیرۆکەی جاك بۆ ڕابواردن ، دوایین نامەی ( جاك )ی خوێنڕێژ**

سۆزانییەکی هەرزەو جوان لەشەقامی (میلەر) پێدەچێت تەمەنی لە بیستەکاندا بێت، گرو تینی ژیانەوەی تیا ڕسکابوو، دوای خۆرئاوابوون پەنجەرەی ژوورەکەی کردەوەو ما گۆرانی بچڕێت و بڵێت((دیمەنەکانی منداڵیم بیر دێتەوە، بەتایبەت ئەو ڕۆژانەی دڵخۆشبووم)). سەرەتا بۆخۆی گۆرانییەکەی دەگوت، دواتر دەنگی لێ بەرزەوە کرد، ئەوانەی بەوێدا تێدەپەڕین بە دزەوە تەماشیان دەکرد.

ماری جین کیلی.. دەموچاوێکی زۆر جوانی هەبوو، باوەڕت نەدەکرد ئەو شۆخە نازدارە سۆزانی بێت، کەسێك بەو جوانی و شۆخییەوە دەتوانێت بەهەموو شتێك بگات، مەخابن جلوبەرگەکەی و دۆخی هەژار نشینییەکەی هی ئەوە نەبوو بەرامبەر بە ژیان بەپێوە خۆی ڕابگرێت.

(( بەنێو باخ و سەوزاییەکاندا وەك کارێك منداڵی خۆشم بەسەر برد، قەدەر دەستی تێوەردام و لەم وێرانەی خانووە کۆنە کەسێکم نەما دڵخۆشم بکات)).

گوڵفرۆشەکەی سەرگەی شەقامەکە لە گۆرانییەکەی بێزار ببوو، ویستی رۆژەکەی لێ بەدۆزەخ بکات، وەڵێ مێردە پیرەکەی گوڵفرۆشەکە، کە لەسەر کورسییەکی کۆندا دانیشتبوو، لێی هاتە دەنگ و گوتی:

– تۆ ئەی کوندەپەپووی پیر لەو کچە هەژارە گەڕێ.

لەو ئان و ساتەدا دراوسێکەی کیلی هات و لێی روانی، دۆخەکەی بەدڵنەبوو، بەرەو ئاپارتمانەکە رێك بۆ ژوورەکەی خۆی رۆیشت، بەر لەنیوەشەو هاوسێکەی لەژوورەکەی هاتە دەرەوە، ئەوەی بەلایەوە سەیربوو، کیلی هێشتا لەگۆرانی نەکەوتبوو(( ژیان با هەر بڕوات، لەیادەوەرییە جوانەکانم ناکەوم، ئەم گوڵە وەنەوشەییەم لە سەر گۆڕەکەی دایکم هەڵمپچڕاندووە)).

بەربەیان خاوەن کرێ هات و لەدەرگای ماری جین کیلی دا، ئاگای لەخوێنە مەیوەکەی سەر زەوییەکە نەبوو، چەند جارێك لەدەرگای دا، وەلآم هەر نەبوو، ما لەپەنجەرەکەوە بڕوانێت، ئەوەندەی نەمابوو لەهۆش خۆی بچێت. نیو کاتژمێری نەبرد هێزی پۆلیس لەبەردەم دەرگاکە ئامادەبوون، گۆدلی تەنگەستووری لێکۆڵەریشیان لەتەکدا بوو، هەوڵیاندا دەرگاکە بکەنەوە، پێیان نەکرایەوە، گۆدلی تەورێکی بەدەستەوە گرد، ما لەدەرگاکە بدات، تا دەرگاکەی شکاند و کردیەوە، دوایین دیمەنی قێزەونی (جاك)ی خوێنڕێژ دەرکەوت، ماری جین لەسەر جێوبانەکەی کەوتبوو، یا ئەو بەشەی لە ماری مابووەوە، لەملییەوە سەری بڕابوو، سکی بەتەواوی هەڵدڕابوو، هەرچی لەناو سکیدابوو، دەرهێنرابوو، خوێن ئەو ناوەی هەڵگرتبوو.

لەشوێنێکیتر (ئابیرلین)ی لێکۆڵەر لەسەر کورسییەك و لەنێو کتێبخانەیەکدا لە (وایت شابل) سەرقاڵی خوێندنەوەبوو، هەرچی پەیوەندی بەوشەی (juwes)ەوە هەبوو، ئەوەی لەسەر دیوارەکەدا نووسرابوو، سەحی دەکردەوە، ئەو تاوانە سەر بەلایەنێکە دەستڕۆیشتوو، ترسیان لەپۆلیس نییە، تەنانەت خودی بەڕێوەبەری (پۆلیس)یش کارەکانیان دادەپۆشێت و ئەو نووسراوەش دەسڕێتەوە کە پەیوەندی بەوانەوە هەیە، ئەو لایەنەش بەهەچ شێوەیەك بێت پەیوەندی بە جوولەکەوە هەیە، وەلێ جوولەکە لەلایەن کۆمەڵگاوە ڕەتکراونەتەوە، دەسەلأتی ئەوەتۆیان لێرەدا نییە. ئەم بابەتە چۆن یەکدەگرێتەوە؟

ما ئابیرلین تەورات و پەرتووکەکانی جوولەکە بەسەر بکاتەوە، ئەمە خوایە شتێك بدۆزێتەوە پەیوەندی بەو نووسراوەوە هەبێت. بەرپرسی کتێبخانەکە هاتە لای تا پێی بڵێت کات تەواو بوو، ناچارە کتێبخانەکە دابخات، ئابیرلین کارتی ناسنامەی پۆلیسی سکۆتلانیاردی پیشان دا، کابرا بزەخەنەیەکی بۆ کرد و شانی ڕاوەشاند و هیچی تری نەگوت، تەنانەت کلیلی دەرگاکەشی لەگیرفانی دەرهێناو ویدا و گوتی:

- گەورەم.. ئەمە کلیلی کتێبخانەکەیە، تکایە بیرت نەچێت چراکان بکوژێنیتەوە، تا لێرە دەرم نەکەن، سوپاست دەکەم.

چەند کاتژمێرێك خەریکی بەسەرکردنەوەی فەرهەنگەکان بوو، بەدواداچوونی بۆ هەردوو وشەی ( juwes , jwes )کرد، زۆر بێتاقەتبوو، لەپڕ ڕاستەوەبوو، تەماشای ڕاست و چەپی ڕەفەکانی کرد و بەخۆی گوت:

- ئەی کچی لەڕو لاواز وەرە ئێرە.

دواتر بیری کەوتەوە کچەکەی کتێبخانەکە ڕۆیشتووە، کلیلەکەی لەگیرفانی دەرهێنا، ئەوجا دڵنیابوو تەواوی کات بەدەستەوەیە، ما لەکتێبێکی دیاریکراو یا بڕێ کتێب بگەڕێت، لەوەدا بوو بە ئاواتی خۆی بگات، ما چاو بەکتێبەکانی سەر ڕەفەکان بخشێنێت، بەو کتێبانەیش کە بەردەبوونەوە، لەپڕ کتێبێك بەردەستی کەوت، پەڕەکانی هەڵدایەوە، وشەی(juwes)ی بەرچاو کەوت، وشەکە ناوزەدیی سێ کەس بوو، جۆبیلا(jubela) و جۆبیلۆ(jubelo) و جۆبیلۆم(jubelum) کە لەفەرمەنگی ماسۆنیدان، سێ کریکاری هیچ و پووچ لەنێو دوانزە کرێکاری گەورە لە هەیکەلی سلێمان دابوو، دواتر ماستەری مەزنی هەیکەل(حیرام ئابیف)یان کوشت، دوای ئەوەی چوونە لای تا نهێنی بیناکەی لێ بستێنن، ئەوەی سلێمان متمانەی ڕێدابوو، ئەویش ئەو ئامانەتەی نەدابووە دەست بۆیە کوشتیان، جەستەیان ونجڕ ونجڕ کرد و ناوسکیان دەرهێناو بەملییەوەیان ئاڵاند.

ئابیرلین ما لەکتێبەکە ڕابمێنێت.. ڕیخۆڵەکانی بەسەر شانی چەپییەوە، ئەوە ڕێك وەك ئەوەی بەسەر قوربانی چوارەمدا هات، وەك هەموو قوربانییەکانیش ناوسکەکەی دەرهێنرابوو. دەستی بەخوێندنەوە و چاوپیاخشاندنی کتێبەکە کرد، بۆی دەرکەوت ئەم چیرۆکە ماسۆنییەکان بەکاری دەهێنن بۆ فێرکردنی ئەندامەکانیان بۆ پاراستنی نهێنییەکانی ڕێکخراوی نهێنی و ئەوەی دەچێتە ماسۆنییەتەوە سوێند بەچاوبەستراوەیی خۆی بخوات، کە هیچ نهێنییەك نەدرکێنێت، دەنا دەکوژرێت و دڵی دەردەهێنرێت و ناوسکیشی هەڵدەدڕن و ڕیخۆلەکانیشی بەسەر شانی چەپیدا هەڵدەواسرێت، وەك ئەوەی لەتەك (حیرام ئابیف) کردیان.

ئابیرلین.. بابەتەکەی بەتەواوی ئاوتوێ کرد، بەر لەدوو سەدە ماسۆنییەت شۆڕشی ئینگلیزی لەوڵاتەکە بەرپا کرد، هەر ئینگلیزەکانبوون جوولەکە

ئاوارەکانیان لەخۆ گرت، هەر ماسۆنیەتیشە گریێ ملی دەسەلاتی لۆردەکانی ئینگلتەرای گرتە دەست، بەوای ئەوەی هەر ئەوانبوون لۆردەکانیان گەیاندە سەر عەرش و هەر ئەوان دەتوانن لەناویشیان بەرن، وەلێ ئابیرلین لەنێو کتێبخانەکەدا بەدەنگێکی ئەوی بەخۆی گوت((ئەوە چ بێ ماناییەکە؟ پەیوەندی بە سۆزانییەکانەوە چییە؟وەلێ بێستە.. ئەوە دەچێتە عەقلەوە...)).

***

## ئێمە لەماسۆنییەتدا ڕێکخراوێکی نهێنی نین، هەموو خەڵك دەمانناسن، وەلێ ئێمە ڕێکخراوێکین نهێنیمان پێیە، جیاوازییەك لەگۆڕا هەس

داربازێکی ڕەش بەسەر شانەوە بەرەو گۆڕستانی (سان باتریك)ی کاسۆلیك بەرێوەبوو، ئافرەتێکی تێدابوو هەموو ژیانی بە تەنیایی بەسەر برد، هەر بەتەنیایش کۆچی دوایی کرد، کەسێك لەنێو جەنازەکەیدا لە خزمان و خانوادەکەی نەبوو، ئەگەرچی جەنازەکەی چەندینجار دواخرا. ڕەنگە خەڵکانێك جێتبهێڵن تۆ هێشتا لەژیاندایت، دەشمرێت و کەس هەستی پێناکات، ماری جین کیلی مردنێك مرد لەمزری شەیتانیشدا نەبوو، تەنانەت ماندوو بوون بەدەست کۆکردنەوەی پارچەکانی جەستەی بۆ ناو تابووتەکە تا لەناو داربازەکەیدا بنێن، بڕێ لەپیاوانی کڵێسەو ئاکانجییەکانی ئاپارتمانەکەی لەتەکیاندا دەژین، لەگەڵ جەنازەکەیدا بوون. هەروو لیکۆڵەر (ئابیرلین و گۆدلی)ش لەبەخاکسپاردنەکەی لەتەکیدا بوون.

ئابیرلین چون ئەوەی دوێنێ شەو نەنووستبێت، چاوەکانی خەواڵوو بوون، هەرچە گۆدلی بوو تەواو وریا بوو، ئابیرلین لەمەراسیمی بەخاکسپاردنەکەی دەڕوانی، لێوی خۆی گەزت و بە گۆدلی گوت:

– وەڵامی ئەو دوو پرسیارەی دوێنێ لێم کردی، زانیت؟

گۆدلی دەستی بۆ دەفتەرۆچکەکەی برد و کردیەوەو گوتی:

– تشارلز وارن بەڕێوەبەری پۆلیسی سکۆتلاندیارد کە ڕستەکەی سەر دیوارەکەی سڕییەوە، ماسۆنییەکی کۆنە، ئەنجوومەنێکم نەبینی لە ئەنجوومەنەکانی ماسۆنییەتی لەندن ئەو تێیدا ئەندام نەبووبێت، بەڵکو ئەوان بەماستەری مەزنی ماسۆنییەتی لەندەنی دەزانن.

ئابیرلین وەک حاڵیبوونێک سەری بۆ ڕاوەشاند و گوتی:

– ئەی دەربارەی (ویلیام گول)ی نەشتەرگەری بنەماڵەی پاشایەتی چیت کۆکردووەتەوە؟

گۆدلی دووبارە پەنای بردە لای دەفتەرۆچکەکەی و گوتی:

– بەڵێ ئەویش لە ئەنجوومەنی (سالیزبۆر)ی ماسۆنییە.

ئابیرلین بەچاوە خەواڵووەکانی لە گۆدلی ڕوانی و بەنیوە بزەیەک گوتی:

– پێدەچێت وەک ڕۆژانی ڕابردوو کار نەکەین، لەو بابەتە گەڕێ.

گۆدلی بزەخەنەیەکی بۆ کرد، وەڵێ هەرزوو بەخۆیدا چووەوە، وەک ئەوەی بەوای جەنازەکەوە بزەخەنەکەی بشارێتەوە، گوتی:

– وەک ڕایەک.. ماسۆنییەت پەیوەندی بەو هەموو تاوانانەوە هەیە، بۆیە بەڕێوەبەری پۆلیسیش ڕستەی سەر لادیوارەکەی سڕییەوە،

دەبێ چی بەسەر ئەو کەسەدا بێت کە ڕاستییەکان دەردەکێنێت؟ هەڵبەتە ئەندامەکانی جەستەمان لەدەست دەدەین، بۆ خۆم گەدەی خۆمم لا گرنگە.

- بەڕێوەبەری پۆلیس بۆ ئەوە ڕستەکەی نەسڕییەوە کە ئیشارەت لەماسۆنییەت دەکات، ئەوەی کە نووسی چاك دەزانێت کەس نایباتەوە سەر ماسۆنییەت، بەوای ئەوەی شتێکە لەبیروباوەڕیان و خەڵکیش بەعام ئەوە نازانێت، بۆ ئەوە سڕییەوە وشەکە نزیکە لەوشەی جوولەکەوە، ماسۆنییەتیش پێیان قبوول نییە بەهەر شێوەیەك بێت جوولەکە تاوانبار و سرا بدرێن.
- باشە لەراپۆرتەکەت چی دەنووسیت؟
- شتگەلێکی ناڕوون دەنووسم، ناتوانم بڵێم ڕێکخراوی ماسۆنی بنەماڵەی پاشایەتی لە ئینگلتەرا لەسەر ئابڕوو نەچوونی میر فیکتۆر وەچەی شاژن پێنج سۆزانی کوشتووە، بەو ئاوایەی سەر بەماسۆنییەتن، هەر لەسەر ڕێبازی ماسۆنییەتیش کوشتوونی، بەدەردی ئەوانەی نهێنی ڕێکخراوەکە ئاشکرا دەکەن.

گۆدل بەدەم تێڕوانینی پرسەکەرانەوە گوتی:

- ئەی ئەو سۆزانییە داماوانە، پێت وایە دەچنە بەهەشت؟

ئابیرلین دەستی نایە گیرفانی و گوتی:

- ئەی بەور تۆ نازانیت خودی خۆت ناچیتە بەهەشت.

گۆدل بەتووڕەییەوە گوتی:

- ئای ئەوە چی دەڵێیت هەی نالەبار؟

ئابیرلین بەنیازی ڕۆیشتن ئاوڕی دایەوە، دەستی هەر لەگیرفانیدا بوو، هەر هەموو بابەتەکەی لەگۆڕ نا، کەس ناسنامەی (جاک)ی خوێنڕێژی نەزانی و ناشیزانن.

***

## *** تەواو ***

لەژوورێکی بچووکی یەك لەگەنجینە چۆڵکراوەکان، بۆبی فرانك لەسەر گازەرەی پشت کەوتبوو، بەتەنیشتییەوە لیۆبۆڵد و لویب بە بالآزرافیەکانیانەوە وێستابوون، ڕووناکی چرای بنمیچەکە بەسەر سەریانەوە شۆڕەوەبیوو سەمای دەکرد. لیۆبۆڵد گوتی:

– هەر کەسێك نهێنییەکانمان ئاشکرا بکات، دەکوژرێت و جەستەشی دەشێونرێت، دەبێ تۆ چی لێبکرێت کە هەموو نهێنییەکانت بۆ خەڵکی ئاشکرا کردووە.

لویب گوتی:

– هەی بەنەفرەت بیت، تۆ لەکەشی (حیرام ئابیوف) ئامادە بوویت، هەر کەسێك بێتە ناو ڕێکخراوەکەمان لەپلەی یەکەم دایدەنێین، بیرت نییە کاتێ چاوتیان بەستەوە و حەبلێکیان لەملت ئاڵاند، وەك ئاژەڵێك لەدیمەنێکی نمایشکارانە وەك ئاژەڵ داتیانە پێش، پێتیان گوت ئەمە بەمانای دانپێنا کە تۆ لەبارودۆخێکی ئاژاوەگێڕیت و نابینای هیچ نابینیت، ڕەزامەندیش بوویت ماسۆنییەت کوێت بوێت بتبات.

لیۆبۆڵد.. وەك سووكایەتی پێكردنی بەدارێك كەللەی بۆبی پاڵنا و گوتی:

- بەئەفرەت بیت، پێمبڵێ بەر لەمە ناسنامەی (جاك)ی خوێنڕێژت دەزانی.

بۆبی سەری داخستبوو، گوتی:

- كارم بەوەوە نەبوو، مەبەستی من (تشارلۆ وارن) بوو، بەڕێوەبەری پۆلیسی ماسۆنی، كە ڕستەی سەر دیوارەكەی سڕییەوە، بەوای ئەوەی ئیدانەی جوولەكەی تیا كرابووە.

لیۆبۆڵد گوتی:

- هەی زۆڵ.. چ كارت بەوەوە بوو؟

بۆبی گوتی:

- ئەو ئەشكەوتانەی پێشتر باسم لێوە كردن، بەتایبەت لە سەریوردەی (ئادەم)دا كە لەژێر خاكی پیرۆز ونبووە، ئەوەی دۆزییەوەو ئاشكرای كرد، تشارلز وارن بوو، كاتێ بەفەرمانی ئەنجوومەن بۆ پشكنین دەرچووبوو.

لویب دەستەوانەكانی لەدەستكرد و گوتی:

- با وابێت، بۆنی ئەو بۆنە دەكەیت كە لەگەرماوەكەوە دێت؟ ئەوە بۆنی ترشەڵۆكە، كە دوای چەند خولەكێك دەتكەینە ناوی، دەزانیت ئەو ترشەڵۆكە بەر جەستەت بكەوێت چۆنی شی دەكاتەوە، تەنانەت ئێسكەكانیشت دەتوێنێتەوە.

بۆبی دەمی داچەقابوو، قسەی بۆ نەدەكرا، دڵی هەزارو یەك لێیدەدا.
لیۆبۆڵد گوتی:

- بۆبی دوا داخوازیت هەیە؟

بۆبی چاوی نووقاند و قسەیەکی تێیانسرواند وەك بروسكە وابوو، گوتی:

- داخـوازیم نییـە، بەڵکو زانیـاریم هەیـە، هـەموو ئـەو ڕێكۆردانـەی كردتان لەكۆمپیوتەرەكـەم یا بـە ئـامێری دەنـگ كۆپیكردن لـەناو هەرەمەكە هیچ سوودێكی نییە.

لیۆبۆڵد لە یاخەی كراسەكەی گرت و بەتووڕەییەوە گوتی:

- هەی هیچ و پووچ مەبەستت چییە؟ قسەكانت هەمووی درۆ بوون.
- یەك وشە چییە لەو قسانەی كردم درۆ نین، وەڵێ پەخشی كامێرا بە وێنەو دەنگ ئەوەی لەقسەكانی مندا ڕێكۆردنـان كـرد، بـەو هـەموو نهێنییانەوە، ئۆتۆماتیكی دەگوازرایەوە بـۆ كەسێكی مەبەسـت تـا بڵاوی بكاتەوەو هەموو نهێنییەكان ئاشكرا بن.

پیلەقەیەك دەموچاوی بۆبی گرتەوە، لویب پێیگوت:

- هەی پووشت ئەوەتیش كرد؟

بۆبی خوێن بەباڵایا هاتە خوارەوەو گوتی:

- بەرنامـەی شـاراوە لەهـەچ كـامێرای مۆمپیوتـەرێك یا مۆبایلێك بـۆ ئەوەیە وێنەو دەنگ بنێریت بۆ ئەو لایەنەی كە دەتەوێ بیزانن، من ئەو بەرنامەیەم دەستكەوت و هەرچی پەخشێك هـەبوو نـاردم بـۆ كەسێكی دیاری كراو تا بڵاوی بكاتەوە.

لویب هاواری بەسەریا كرد و گوتی:

- ئەو كەسە نەفرەتییە لەكوێیـە؟ قسـە بكـە، دەنـا هـەموو ناوسـكت دەردێنم و...

بۆبی قسەكەی پێ قاچی و گوتی:

- پێوویستت بەوە نەماوە، ئەو هەموو شتەكانی بڵاوكردووەتەوە.

لیۆپۆڵد جوێنێکی زۆر ناشرینی پێدا و دواتر لەپرچی گرت و لەسەر کورسییە دارینەکە دایینیشاند، ما دەستی لەپشتەوە ببەستێت ، (لویب)یش خەریکی بەستنەوەی پێیەکانی بوو، هاواری کرد:

- لیۆپۆڵد کامێراکە ئامادە بکە، کاتی لەسێدارەدانی هاتووە.

لیۆپۆڵد بلەز کامێراکەی هێناو بەرامبەر کورسییەکە دایبەست، کە بۆبی بەسەرەوە بوو، سیستەمی پەخشی خستە سەری تا ڕاستەوخۆ لە ئەنتەرنێتەوە بڵاوی بکاتەوە، دواتر هەر یەکەیان دەمامکێکی بەست، دەمامکی ڕەشی گوێرەکەی شەیتان بوو، لەسیلەی کورسییەکەی وێستان، کامێراکە بەرەو پەخشکردن کەوتە گەڕ.

لەجێکەوتی قێزەونی ئەنتەرنێتی کەسی دیاری کراو، وێنەی بۆبی فرانك دەرکەوت، کە بەسەر کورسییەکەوە دانیشتووەو دوو کەسیش بەدیاریەوە دەمامکیان بەسەرەوەیە، یەکێکیان پرچی بۆبی بەتووندی گرتووەو دەڵێت:

- لەبەر خاتری چاوە نەفرەتییەکانتان کە ئوکە تەماشای ئەم ڤیدیۆیە دەکەن، ئەمڕۆ شتێکتان پیشان دەدەین، تەنانەت لەخەونیشدا نەتانبینیوە، ئەم نەفرەتییە لەسێدارە دەدەین، لەشلەی ترشەڵۆکی دەنێین، لێدەگەڕێین بەچاوی خۆتان ببینن چۆن لەناو ئەو ترشەڵۆکە پەل بە پەل دەتوێتەوە.

لافاوێ کۆمێنتی بەدڵمەو بەدڵم نییە بەسەر ڤیدیۆکەدا دابەزی، تا دەهات بینەران لەزیادبووندا بوون، کۆمێنتی (ئەو نەفرەتییە لەسێدارە بدەن) یانەخۆ کۆمێنتی(ئامەنگ بگێڕن) بەسەر شاشەی کۆمپیوتەرەکەوە دەرکەوت، لویب کامێراکەی گرتە دەست و لەدەموچاوی بۆبی نزیکی کردەوەو پێیگوت:

- ئەی بەنەفرەت بیت، هەرچییەکت هەیە بیڵێ، تۆ لەدواساتەکانی ژیانتدایت.

بۆبی تەماشای کۆمێنتی ئەو گەمژانەی کرد، کە داوای کوشتنی دەکەن، نەیاندەزانی بۆبی کێیە، ئەوەی هەبوو تەنها ئارەزووی خوێنڕشتنیان دەکرد. بۆبی تەماشای کامێراکەی کرد و گوتی:

- دوای من گوێتان لەزەنگی خەتەرناکی دەبێت، چوار جار زەنگەکە لێدەدرێت، هەرجارەی زەنگەکە لەپەرتووکێك لێدەدرێ دنیا پڕ دەبێت لە ئەرگۆمێنت، هەر کە زەنگی دووەم لێدرا، نیشانەکان بەچاوی خۆتان دەبینن، ئەودەم دەزانن، چونکە بانگهێشتان دەکەن بۆ گردبوونەوە، ئەگەر بینیتان دووی کەون، لێی لامەدن، سوێند بەخوا ئەم نەوەیەتان دارو بەردیان بەسەرا دەڕوخێنن و کۆتایی بە پیلانەکانیان دێنن، ئامادەبن، ڕێکبن، دنیا پڕکەن لەڕووناکی، وەك چۆن ئەوان تاریکیان کرد.

بۆکسێك بەردەموچاوی بۆبی کەوت، لەگۆشەیەکی دەمییەوە خوێن فیچقەی کرد، لیزبۆڵد لەپرچی گرت و بەسەر زەویەکەوە بەدوای خۆیەوە پەلکێشی کرد، (لویب)یش گرتەی کامێراکەی خستبووە سەر ڤیدیۆ وێنەکەی دەگرت، تا بەگەرماوەکە گەیشت، ئەوجا دەمی گرت، تا هاوار نەکات، بۆبی هەر کەچاوی بە ترشەڵۆکەکە کەوت لەترسا چاوەکانی ئەبڵەقبوون، بۆبی چاوەکانی لێ نووقاند و لەبەر خۆیەوە وڕێنەی دەکرد، وڕێنە نەبوو، بەڵکو شایەتمانی دەهێنا، بۆ دواجار ئاوڕی لەکامێراکە دایەوە، ئەوجا تەماشای بانێۆکەی کرد، لیزبۆڵد بەتووندی پرچی گرتبوو، بەرزی کردەوە، تا ناو بانێۆی پڕ لەترشەڵۆکەکەی بنێت، کامێراکەیش قێزەونترین گرتەی کوشتنی بنیادەمێکی بەجیهاندا وەك مێژوو بڵاو کردەوە.

## *** دوا ڕیوایەت ***

من نازانم چ شەیتانگەلێکە حوکمی ئەم شارە دەکات.

ئـەوە قسـەی ڕیکـس واتسـۆن بـوو، بـەدەنگێکی بیسـتراو و لـەژووری کتێبخانەکەیدا ئەوەی گوت، بیری لەنێوان دووکەڵی سبیلەکەی کە بەسەر خۆڵدانکی جگەرەکەیەو و ئەو هەڵمەی لە کوپی قاوە تایبەتەکەی بەرز دەبووەوە ڕۆیشتبوو، ئەو سەرۆکی لێکۆڵینەوەی ونبوونی بۆبی فرانک بوو، کە دوای ساڵێك گۆڕدرا بەتاوانی کوشتن، دوای ئەوەی خەڵکی تەرمی نەناسراوی لەدەریاچەی (وڵف) دۆزرایەوە، بەوای بەدوادا چوونی ورد و پشکنینەوە توانرا ناسنامەکەی بزانرێت، کە دەگەڕێتەوە بۆ ڕۆبێرت یاقووب فرانکس بە نازناوی بۆبی فرانك ناسرابوو. بەر لەساڵێك ونببوو، شوێنەواری دیار نەبوو، بەپێی لێکۆڵینەوەی پزیشکی دەرکەوت بەترشەڵۆکی خەست ڕوخساری سڕابووەوە.

لێکۆڵەر ڕیکس.. تووڕەبوو، دوای لێکۆڵینەوە توانی تاوانبارەکان ئاشکرا بکات، لیۆبۆڵد و لویب دەستنیشان بکات، دوای ئەوەی چاویلکەیەکی پزیشکی لەکەنار دەریاچەکە دۆزرایەوە، کە پێوەرەکەی تایبەتبوو بە لیۆبۆڵد کوڕی ملیاردێری جوولەکە، دوای دەستبەسەرکردنی دانی بەتاوانەکەی هێنا، بەو هاوڕێیەشی کە هاوبەشی بووە لەتاوانەکەو ئامۆزای بۆبی فرانك بوو، بەدەر لەدەستبەسەرکردنیان و ئارەزووی ڕیکس بۆ جێ بەجێکردنی سزای لەسێدارەدانیان، وەلێ خانوادە دەوڵەمەندەکەیان باشترین و زیرەکترین پارێزەریان لە وڵاتە یەکگرتووەکان بۆ گرت، ئەویش کلارنس دارۆ بوو، کە بەدڕندە ناوزەد دەکرا، هەر ئەو ڕۆژە پارێزەرەکە توانی حوکمەکەیان سووك بکاتەوە، لەسێدارە ڕزگاریان بکات.

لێکۆڵەر ریکس.. قرێك قاوەی هەڵدا، ئەوجا دەستی بۆ سندووقێکی بچووك برد، کە لەسیلەیدا بەکراوەیی دانرابوو، کۆمەڵێك دەستنووسی کۆنی تێدابوو، کە بەزمانی عیبری و هەندێکیشیان بەیۆنانی و عەرەبی نووسرابوون، ئەو سندووقەبوو کە لەو ژوورەی لیۆپۆڵد و لویب ئەشکەنجەی (بۆبی)یان دا، دەستنووسەکان دیاربوو زۆر گرنگبوون، هەر هەمووشیان بەجوانی پارێزراوبوون، مۆری ئەنجوومەنی ماسۆنی مەزنیان لەنێوپۆرك بەسەرەوە بوو، ریکس لەخۆی پرسی هۆکاری ئەو دەستنووسانە چین کە لای بۆبی فرانك دا بوون. ریکس دەستنووسەکانی دەرهێناو ما یەك بەیەکی بەسەر بکاتەوە، هیچی لەو زمانانە نەدەزانی، تەنها یەك دەستنووس نەبێت، ئەویش بەزمانی ئینگلیزی نووسرابوو، ناونیشانی دەستنووسەکە( ئەو پێشبینییانەی نۆستردامۆس کە شاردراونەتەوە)) وازۆش کرابوو، پێدەچوو وائاۆی نۆسترادامۆس بێت، بەناوبانگترین حەساوەگەر لەمێژوودا، کاغزێکی زەرد بەدەستنووسەکەوە لکێنرابوو، بەدەستخەتی بۆبی فرانك نووسرابوو(( بەوای نامۆیی، بابەتەکە لەژێر لێکۆڵینەوەدایە)).

ما لێکۆڵەر ریکس دەستنووسەکە بخوێنێتەوە، لەپڕ رووخساری گۆڕا، وەك ئەوەی پەشۆکا بێت، تەنانەت سبیل و قاوەکەشی بیرچووەوە، لەتەك خوێندنەوە دڵی زیاتر کەوتبووە ترپە ترپ، تا گوێی لەدەرگاکەبوو، هاواری لێکرد:

– بێرە ژوورەوە.

هەر کە ریکس زانی کێ لەدەرگایە، وەك رێزێك راپەڕی و سڵاوی لێکرد، ئەویش ملیاردێری جوو(یاقووب فرانك ) بوو، باوکی کوژراوەکە بوو، قەدو باڵای بەرز و چوارشانە و رووخساری جەولەکەیی ترسی دەخستە دڵەوە، یاقووب گوتی:

- هاتووم سوپاست بکەم کە بکوژەکانت دۆزیوەتەوە، ئەوانەی ژیانی کورەکەمیان لەناوبرد.

ریکس وەک توورەبوونێك پێیگوت:

- دەموویست لەسێدارە بدرێن، ئەگەر (دارۆ)ی پارێزەر نەبوایە.

بزەخەنەیەك کە دڵخۆشکەریش نەبوو لەسەر لێوی یاقووب فرانك درووستبوو، گوتی:

- ئەگەر بمانوویستایە زیندانیشمان نەدەکردن، ئەوان رۆڵەی رێکخراون، ئەگەر یەك شتێکیان نەبینیایە ، بریارمان دەدا ۹۹ ساڵ لەزینداندا بن.

دڵەکوتەی ریکس تا دەهات زیادی دەکرد، نەیدەزانی یاقووب ئەوەی بۆچی پێدەڵێت، کە بێجگە لە مانایەك هیچی تری تێدا نییە، بەدڵەراوکێوە گوتی:

- یانی چی؟ ئەوشتە چییە بەرێز یاقووب؟

یاقووب لەسەرخۆ پێیگوت:

- ئەو دەستنووسانەی بەدەستەوەن.

ریکس سەری دانواند تا لە دەستنووسەکان بروانێت، دواتر سەری بەرزکردەوە، فیشەکێك لەدەمانچەکەی دەستی یاقووب کەللەی لێکۆڵەر (ریکس)ی پێکا لەناوەندی کتێبخانەکەیدا، یاقووب دەستنووسەکانی نایە ناو سندووقەکەو هەڵیگرت و ئەوێی جێهێشت. کەسیش زاتی ئەوەی نەدەکرد تاوانەکە بداتە پاڵ یاقووب فرانك، کە سەرۆکی هەموو رێکخراوەکانی ماسۆنی ئەمریکا بوو.

***

تەنیاحاجی

Tanya Haji | تەنیاحاجی

public channel

Description

بسم الله الرحمن الرحيم

🤍چەناڵێک تایبەت بە کتێب و بابەتی جیاواز🤍

ئەم کتێبە لەلایەن { هۆزان شهاب انور }
کراوە بە دیاری بۆ خوێنەران

چەناڵ
https://t.me/tanyahaji7

t.me/tanyahaji7
Invite Link

# بەشی دوازدەهەم

## سەردەمی داهاتوو

## میشێل نۆسترادامووس دەینووسێت

## ١٥٦٦ دوای زایین _ ٢٢٠٠ دوای زایین

***

بە پەرموچێکی نێو قامکەکانی دەستم دڵی پیاوان دێنمە جۆش و هەستی ژنانیش دەبزووێنم، شێوازێکی قووڵتر لە شێوازی ئاینەکانیان تیا دەپسکێنم، شێوازێك بەناوی هۆشیاریی دەستەجەمعی ناوزەد دەکەم، مۆمەکان و ئامرازەکانی گۆسێك و عابا ڕەشەکە بەدەوەرەوەمدان، وشەگەلێکی ئاڵۆز کە زیاتر لەمانایەکی لەخۆ گرتووە، گشت ئەوانەئامرازگەلێکن وامکردووە ئەو خەڵکە گەمژە و نەفامانە هەرچی پارەو پووڵیان هەیە ویمیدەن، لەم گەمەیەدا زۆر سەرکەوتوو بووم، تەنانەت شاژنی فەرەنسا (کاترین دی میسی) گەورەترین پاڵپشتم بووە، بۆ خۆیشم ڕاوێژکاری ڕوحی کورەکەی میر تشارلز بووم ، دەزانی مانای ڕاوێژکاری ڕوحیی یانی چی؟ بۆ خۆم نازانم، وەلێ دەبێت وای بێژم، تا کار لەخەیاڵ و هزریاندا بکات، ئەگەر لەناخی بنیادەمدا گرتدا، ئەوا مەیلی بۆ لای خۆت ڕادەکێشێت.

ناوێك یا نازناوێكیشم بۆ خۆم هەڵبژاردووە، كە پەیوەستە بەوەی دەصەوێت پێیبگەم.. نۆستراداموس، خۆم بە فالگرەوە یا درۆزن نازانم، دەزانم فاڵچییەكان چۆن پارەو پووڵ بەدەست دەهێنن، درۆیان پێدەفرۆشن، من درۆیان بۆ ناكەم، بەڵكو هەقی خۆیان دەدەم، وەلێ بەشێوەیەكی تایبەت بەخۆم. ئەگەر زانیارییەكی پزیشكیت هەبوو، دات بەكەسێك لەم ئەورووپای تاریكستانە و پێی چاكەوە بوو، دواتر لای رۆیشتیت، مەزەندەی ئەوە دەكات كە تۆ بەختەوەریت، بەڵام ئەگەر چاوت كز كرد و واتپیشاندا كە تۆ لەتەك بوونەوەرە روحییەكان هەڵسوكەوت دەكەیت، هەمان زانیاریت پێدا و چاكەوە بوو، لای ئەو دەبیت بەپێغەمبەر، منیش لێرە لەتەك میللەتی گێرەشێوێنی وادەكەم. بەهەموو ئەو ئاوایانەدا تێپەڕیوم كە دووری دەستێ و دەستی پزیشكی پێنەگەیشتوون، یە عابا رەشەكەم و ئەزموونی پزیشكی خۆم بەگژ ئازارەكانیاندا چوومەتەوە، فێرم كردوون خۆیان لە تاعونەكە بپارێزن. خۆ ئەگەر پزیشك لەچارەسەركردنیاندا شكستی هێنا، ئەفرەتی دەكەن، ئەگەر قەشەیەك لەچارەسەركردنیاندا شكستی هێنا، خەتاكە دەخەنە سەر خۆیان.

تەنها بەزانست پەرتووكی (ئەلقروون)(centures)م نووسیەوە، لەم دەورووبەرە شوێنێك نەماوە تیدا نەخوێنرابێتەوە، نەك زانستی حەساوگەرییەكان، ئەوانەی شار بەشار و وڵات بە وڵات دەگەڕێن، تەماشای ئەستێرەكان دەكەن، ئەوانەیەش حەساوگەریی دەستكرد دادەنێن، ئەوەی درك بە بانەپۆژ دەكات و درۆزنە، لە دەمی (نۆستراداموس)ەوە وەری بگرە، هیچ ڕێگایەك لەزانستی دیار و نادیاردا بەر لەڕوودانی واتلێبكات بزانیت چی ڕوودەدات، باوەڕی زۆرم بەمە هەبوو، وەلێ لەباوباپیرانمەوە كتێبخانەیەكی گەورەم بەمیرات بۆ مایەوە، هەر كە دەستم بۆ كتێبێك دەبرد

و چەند دێڕێکم لێ دەخوێندەوە، ئەو بیرۆکەیەم لا کاڵتر دەبووەوە، بۆم دەرکەوت لەم جیهانەدا کەس نەبووە بە بانەڕۆژی زانیبێت، دواتر ئەوەی ڕوویدا، تەنها پێغەمبەرەکان بوون.

تەورات، ئینجیل، قورئان، من درۆ بەخەڵکی دەڵێمەوە، ڕەنگە جوولەکە بتوانن پەیامێکی پێغەمبەرایەتی ساختە دابێنن کە گوایە مووسا گوتبێتی، یا موسوڵمانەکان قسەیەکی ساختە لەسەردەمێکی دیاریکراودا دابێنن، کە گوایە محەمەد گوتبێتی، ئەم گەمانە من تێیاندا (ماستەر) بووم، بەڵام هاتنە دی ڕووداوێکی دیاریکراو دوای چەندین سەدە لە پێشبینی نووسراوی پەرتووکێکدا ئەوە پێشبینییەکی هەقە، لەنێو هەموو ئەو پێشبینییانەی هەق تەنها پێشبینییەك لەنێو هەموو پەرتووکە پیرۆزەکان دووبارە بووەتەوە، ئەویش کۆتایی ئەم گۆی زەوییەیە و هاتنە خوارەوەی پیاوێکی دووزوان حوکمی هەموو جیهان دەکات، بەو حوکمەی ئەو گەلان عەقڵ لەدەست دەدەن، وەك بزمژۆك ڕەنگیان دەگۆڕدرێت، شتگەلێکیان پیشان دەدات، مەحاڵە بنیادەم هەیبێت، مەگەر خواوەندەکان، دەیپەرستن و کڕنۆشی بۆ دەبەن. تەمەنی خۆمم لەنێو گردۆلکەی کتێبەکان لەناوبرد، تا بەوەڵامی یەك پرسیار بکەم، ئەو شەیتانە کەینێ دێتە خوارەوە، دوای چەندین ساڵ تێگەیشتم شتەکان لەزانستی پێشبینییەکاندا نووسراون، بەدەق نووسراون.

هەرچیم زانی و پێیگەیشتم لە پەرتووکی (ئەلقروون)دا نووسیوەتەوە، ڕێك لە بەشی یەکەمەوە تا کۆتا بەشی، پەنجاو هەشت ئایەتم تیا نووسیەوەتەوە، وەلێ هەر زوو ئەو ئایەتانەم کوێر کردەوە، چونکە کڵیسەی کاسۆلیك ڕەحم ناکەن، هەر زوو چۆنێتی گەیشتنم بەو پێشبینییانە ئاشکرا دەکەن، ئەودەم لەملم دەدەن، یا بەخاچێك هەڵمدەواسن، تەنها ئەم بەشەم

ئ نەکوژاندەوە، وەلێ بەجوانی پاراستم، تا لەدوای خۆم بڵاو ببێتەوە، کەی وادەی هاتنە خوارەوەی مەسیحە و ڕێک لەچ ساڵێکدا دەبێت. بۆ یەکەمجار لە پێشبینییەکانمدا ئەوە دەنووسم چۆن ئەو پێشبینییەم لەناوئاخنی پەرتووکەکاندا دەرهێنا، چۆنیش دەست پێدەکەین.



## خوێندنەوە بۆ ئاستێکی بڵندترت دەبات لەوەی بە حەساوگەران و زانستی ساختە پێی دەگەیت

هەموو شتێک دوای دۆزینەوەی دەستنووسی تەورات (٦٠٠ پێش زایین) لەکتێبخانەکەی باو باپیرانم دەستی پێکرد، تێیدا هاتبوو ((سەردەمێک دێت، حاکمێك دەردەکەوێت، فەرمان بە بیناکردنەوەی ئۆرشەلیم دەدات، پاش ٤٨٣ ساڵ مەسیحی چاوەڕوانکراو دێت، دواتر لەجیهان دادەبڕێت، پاش ئەو ئۆرشەلیم دووبارە خاپوور دەکرێتەوە)).

ڕێک دوای نووسینەوەی ئەو بەرگەی تەورات بەچەندین ساڵ ئیمپراتۆر کۆرش فەرمانی بەبیناکردنەوەی (ئۆرشەلیم)یدا، ئەوەش دوای خاپوورکردنی یەکەم، دواتر پاش ٤٨٣ ساڵ ڕێک عیسا دابەزی و پێشبینی خۆی کرد، بەدەر لەوەش جوولەکە بەدرۆیان ناوزەدیان کرد، ئەگەرچی ئەو پێشبینییەش لە پەرتووکەکەیاندا نووسرابوو، مەسیح بۆ ئاسمان بەرز کرایەوە، دوای ئەو ئۆرشەلیم خاپوور کرا، لەوساوە باوەڕ بە پەرتووکی پیرۆز کرا و وەك سەرچاوەی ڕاستەقینە پێشبینییەکان دانران.

لەهەمان کتێبخانە کۆمەڵێك پەرتووکی بەرگتێگیراوم دۆزییەوە، لەسەری نووسرابوو(( فەرموودەکانی محەمەد)) تێگەیشتم ئەوە هەر ئەوەیە موسوڵمانەکان بە (سوونەت) ناوی دەبەن، باو پیرانم ئەو پەرتووکەیان وەرگێڕاوە، هەر هەموو فەرموودەکانی محەمەدی تیا نووسراوەتەوە، بە پێی بابەتەکانیش دابەشیان کردووەو ناوی فەرموودەکانی (محەمەد)یان لێناوە، تەنیا یەك بەرگی تێگیراو سەرنجی ڕاکێشام، ئەو پەرتووکە بەرگتێگیراوەش لەسەری نووسراوبوو(( زانستی دوادوای زەمان))ە، پەرتووکێکە هەموو فەرموودەکانی محەمەدی تێدایە کە پێشبینی تێدا کردووە، دوای مردنی ڕوو دەدەن، تا کۆتایی زەمان، نەمتوانی دەستبەرداری خوێندنەوەی بم، محەمەد ئەو تەنیا پیاوەی لەمێژوودا، ئەو هەموو پێشبینییە وردانەی هەبووە، هەر هەمووشی ڕوویاندا، لەفەرموودەیەکیدا، سەحابەیەکی جلو بەرگ شڕ و وڕ دێتە لای ، هەر کە محەمەد بینی، چوون ئەوەی دواڕۆژی سەحابە هەژارەکان ببینێت گوتی(( سبەی بەلاتانەوە چۆن دەبێت، کەسێکتان لە پۆشتەییەوە بۆ دۆخێکتر بچن، لە پەیامێکەوە بۆ پەیامێکی تر بەرزترەوە بێت، ماڵەکانتان بپارێزن، وەك چۆن کابەتان پارستووە، گوتیان ئەی پێغەمبەری خودا ئێمە ئەو ڕۆژانە لەئەمڕۆ باشتر دەبین، هەر خەریکی خواپەرستی خۆمان دەبین، بەوە شوکرین خودا ویمانی دەدات، نا.. ئێوە ئەمڕۆ باشترن لەوەی دادێت.

ئەوەتا موسوڵمانەکان دەوڵەتی گەورەیان پێکەوەنا، سێ لەسەر چواری جیهانی گرتووەتەوە، ژیانیان خۆشگوزەرانی و ئازادییەکی ڕاستەقینەی هەموو ئاینەکان دەدەن. چۆن پیاوێکی هەژار لەبیابانی دوورگەی عەرەب سەحابە هەژارەکان دەوریان داوەو تەنانەت عابایەکیشیان بەسەر شانەوە نەبوو، دواتر لەکۆمەڵێك پێشبینی ئاماژە بەوە دەکات ژیانێکی خۆشگوزەران

دەژێن و فەتحی ڕۆم و فارس دەکەن، کە دوو دەوڵەتی زۆر بەهێزن. مێژوو وەک چۆن محەمەد پێشبینی کرد هەر وا دەرچوو.

وامدەزانی ئەو جۆرە فەرموودانە ڕەنگە هەڵبەستراو بن، یانەخۆ موسوڵمانەکان دوای کۆچی دوایی محەمەد دایانهێنابێت، وەلێ بەوای خوێندنەوەی زیاتری پێشبینییەکان و گەڕان بەنێو مێژوودا و نووسراوەکانی کتێبە پارێزراوەکان، لەڕاستی و درووستی فەرموودەکان بێ گومانیان کردم. محەمەد لەفەرموودەیەکیدا بە سەحابەکانی گوتبوو((فەتحی قووستەنتینییە بکەن، میرێکی میرزادەی هەیەو سووپایەکی ڕێک و پێکیشیان هەس)). یەکەم دەرکەوتنی ئەو فەرموودەیە لەپەرتووکێکدابوو، پیاوێك بەناوی ئیمام ئەحمەدەوە ئەو پەرتووکەی نووسیوەتەوە، پەرتووکەکەیش ئەوەتا لێرە لەلامە و باویاپیرانم لە مزگەوتی ئەقسا بردبوویان، ئیمام ئەحمەد ساڵی (٨٥٥)زایین کۆچی دوایی کردووە، فەتحی قووستەنتینییەش لەسەر دەستی محەمەد فاتیح ساڵی ١٤٥٣ کرا، یانی دوای دەرکەوتنی پەرتووکەکەی ئیمام ئەحمەد بە شەشسەد ساڵ، ئەودەم قسەکانی محەمەد و قورئان بۆ من بوون بەسەرچاوەی ڕاست و درووست.

***

## ئەگەر دەرگاکانی ڕاستی بکەیتەوە، بەسەر پلەکانی ڕووناکیدا بەرز دەبیتەوە، وەلێ ناگەیت بەکۆتایی

ئەگەر دوو پێشبینی لەدوو پەرتووکی پیرۆزی دوو تایەفەدا لەیەکچوون، هەر یەکەیان نیوەی زەوی دەگرێتەوە، ئەوەش ڕاسترین و باوەڕپێکراوترین پێشبینی دەبێت، لەنێو ڕستەکانی ئینجیل و لەتەك پێشبینی فەرموودەی محەمەد لەیەکچوون دەبینین، ئەو دوو پێشبینییە لەیەکچووە سەرەتای داواکەیە بۆ هاتنی ئەو پیاوە پیس و گلاوە، هەردوو دەقەکە وەك خۆیان دەگێڕمەوە، تا تۆش هزری خۆتی لێ بخەیتە گەڕ.

لە ئینجیل (مەتی)دا هاتووە: بەشی ٢٠

((فریشتەی ئاسمان لە پیاوێك دەچێت بەرەبەیان دەرچوویێت، تا بۆ کێلگەی ڕەزی ترێکەی تایبەت بەخۆی کرێکاری بەکرێ بۆ بگرێت، لەتەك کرێکارەکان بە بڕی یەك دینار ڕێکدەکەوێت، دوای دەستبەکاربوونیان لەناو ڕەزی ترێکەی و دواتر کاتژمێر سێی هەمان ڕۆژ لە لەشوێنی کریکاران چاوی بە کرێکاری تر کەوتووە، بێ کار دانیشتوون و چاوەڕوانی کەسێکن بیانبات بۆ سەر کار، پێیانی گوتووە ئێوەش بڕۆن بۆ کێلگەی ڕەزی ترێکەم و ئەوەی هەقی خۆتانە وێتانی دەدەم، ئەوانیش ڕۆیشتن، دواتر کاتژمێر شەش و حەوت دەرچوو هەمان مامەڵەی لەتەك کۆمەڵێك کرێکاری تر کردەوە، کاتژمێر یانزە دەرچوو، کرێکارگەلێکی بێ کاری بینی، پێیانی گوت.. بۆچی لێرە وێستاون و بێ کارن؟ پێیانگوت.. ئەمڕۆ کارمان دەست نەکەوتووە و کەس نەیبردووین بۆ کارکردن، بەوانیشی گوتووە.. ئێوەش بڕۆن بۆ کێلگەی ڕەزی ترێکەم، کرێی خۆتان وێدەدەم.

کاتێ لای ئێوارە خاوەن کێڵگەکە بە بریکارەکەی دەڵێت.. بانگی کرێکارەکان بکە، تا کرێکەیان پێبدەم، لە دواینیانەوە دەست بە بانگکردنی بکە، کرێکارەکانی کاتژمێر یانزە هاتن و سەرو دیناریان وەرگرت، کاتێ مەوەڵینەکان هاتن، وایانزانی زیاتر وەردەگرن، بەوانیش سەرو دیناری پێدان، کاتێ پارەکەیان وەرگرت گلەییان لەخاوەن کێڵگەکە کرد و گوتیان.. ئەوانەی لەدواجارا هاتن یەك کاتژمێر کاریان کرد، ئێمە لەوان زۆرتر کارمان کرد و هەر وەك ئەوانیشت پێداین، ڕووی لەیەکێکیان کرد و گوتی.. زوڵمم لێتان نەکردووە، ڕێکنەکەوتین بەدینارێك؟ ئەوە هەقەکەی خۆتە بیبەو بڕۆ، ئەوەی دواجاریش هات هەر لەسەر دینارێك ڕێککەوتین، هەقی خۆم نییە چۆنم بوێت وا مامەڵە بە پارەی خۆمەوە بکەم؟ یا چاوی تۆ نەباشە لەبەر ئەوەی من پیاوێکی ساڵمم؟ بەوشێوەیە دەبێت دواینەکان ببنە هەوەڵین و هەوەڵینەکانیش ببنە دواینەکان، لەبەر ئەوەی داوای زۆرتر دەکەن و کەمتر هەڵدەبژێرن.

دەقی یەکەم تەواوبوو، پێدەچێت حیکمەتی باشترینیان بێت لەخواپەرستی بەلای خوداوە، وەلێ لەدەقی حیکمەتی محەمەد بۆ شرۆڤە کردنی دەقی یەکەم گەیشتن بەسەرە داوەکەوە بێت.

محەمەد لە فەرموودەیەکی ڕاست و درووستدا دەڵێت.. مانەوەتان و نەمانەوەتان لە نەمانی ئەوانەی پێشی خۆتان ئەو نەتەوانەی نەمان وەك نوێژی نێوان عەسر و خۆرئاوایە، نموونەشتان وەك نموونەی جوولەکەو مەسیحی چون پیاوێك کرێکار بەکرێیەکی دیاریکراو گرتبێت، دواتر گوتبێتی ئەوەی لەبەریەیانەوە تا نیوەڕۆ بە قیراتێك هاتبێت هەر قیراتەکەی وەردەگرێت، لایەنگرانی تەورات کە تەوراتیان بۆ هاتە خوارەوە، تا نیوەڕۆ هەر قیراتەکەیان بەرکەوت، کاتێ بوو بەنیوەڕۆ برشتیان لێ برا، گوتیان

پێویستمان بەکرێی تۆ نییە، ئەوەی شەرتت لەتەکا کردین گزیمان لێ نەکرد، پێیانیگوت.. وامەکەن، ئەودوای ڕۆژەکەش تەواو بکەن، ئەوەی لەسەری ڕێککەوتبووین هەر ئەوەتان وێدەدەم.

خەڵکانێکیتری بەکرێ گرت و گوتی.. کێ لەنیوەڕۆ بەدواوە بە قیراتێک کار دەکات؟ لایەنگرانی ئینجیل بوون ئینجیلیان بۆ دابەزی، لە نیوەڕۆوە تا لای ئێوارە بەقیراتێك کاریان کرد، کاتێك گەیشتن بەنوێژی عەسر گوتیان.. ئەوەی داوات لێکردین کردمان، گوتی.. ئەو دوای کارەکەتان تەواو بکەن، ڕۆژ ئەوەندەی نەماوە. کاریان نەکرد. خەڵکانێکیتری بەکرێ گرت و گوتی.. کێ لەنوێژی عەسرەوە تا خۆرئاوابوون بەدووقیرات کار دەکات؟ قورئان هاتە خوارەوە، تا خۆرئاوا دوو قیراتیان پێدرا.

لایەنگرانی ئینجیل و تەورات گوتیان.. خودایە ئەوان لە ئێمە کەمتر کاریان کردووەو بەخششی زۆرتریان وێدراوە، خودا پێیگوتن..لەهەقی خۆتان زوڵمم لێکردوون؟ گوتیان.. نەخێر، خودا فەرمووی.. ئەوە بەخششی خۆمە چۆنم بوێت وای دادەنێم. وەك دەبینن ئایەتی ئینجیل و فەرموودەی محەمەد باس لەمەمان بیرۆکە دەکەن، خەڵکانێکی بێ شومار چەند کاتژمێرێك کار دەکەن و دواجار باشترین کرێیان پێدەدرێت، ئەوجا هەندێکیان بەزوڵمی دەزانێت، وەلێ خودا دەفەرموێت.. ئەوە بەخششی خۆیەتی و چۆنی بوێت وای دابەش دەکات.

***

## ئەگەر دابزیتە ژێرزەمینی تاریکی و نەزانین، دەخزێیت و تەنانەت ناتوانیت جارێکیتر سەربکەویتەوە

ئەم بیرەوەریانە کە دەنووسمەوە، بەمیرات بۆ نەوەکانمی جێدەهێڵم، ئەوانیش نەوە دوای نەوە دەیگوێزنەوە، تا دەگاتە دەستی تۆ، لێمگەڕێ سەری داوەکە وەک دەستپێک بۆتی بەهۆنمەوە، ڕەنگە بۆ خۆتیش ئاشکرات کردبێت.

پێغەمبەر محەمەد لە قسەکانیدا زۆر وردەکار بووە، موسوڵمانەکان قسەکانیان بە شەریعەت داناوە، لەم فەرموودەیەدا فەرموویەتی(( مانەوەتان و چارەنووستان لەپێناو ئەوانەی پێشووتانە و ئەوانیش وەک نەتەوە بەسەر چوون))، ئەوەش مانای ئەوەیە تەمەنی نەتەوەی موسوڵمان لەمەڕ مێژووی نەوەی ئادەم هەر هەمووی هەر وادەبێت.

بەپێی قسەی محەمەد لەفەرموودەیەکیدا کە ئیشارەت بۆ نەمانی ئومەتەکەی دەکات، دەڵێت.. کاتێک خودا بایەکی خۆش دەنێرێت، ڕوحی هەموو موسوڵمانێکی باوەڕدار و هەموو کەسێکی موسوڵمان لەکۆتایی زەماندا دەبات، ئەوەش کاتێک دەبێت کە عیسای کوڕی مەریەم دێتە خوارەوە، ئەویش حوکمەکەی حەوت ساڵ و کۆتایی پێدێت، ئەودەم ئومەتی موسوڵمان کۆتاییان پێدێت، ئەوەی لەسەر گۆی زەوی دەمێنێتەوە، تەنها مرۆڤە خراپەکانن، ئەوجا دنیا بەتەواوی کۆتایی پێدێت، وەلێ کەس کاتەکەی پێنازانێت خودا نەبێت.

محەمەد لەفەرموودەیەکی درووستیدا دەڵێت(( جەجاڵ لە ئومەتی من دەردەچێت، چل ڕۆژ دوای ئەو خودا عیسای کوڕی مەریەم دەنێرێت تا لەناوی ببات، دوای ئەوەش حەوت ساڵ لەناو خەڵکیدا ئاشتەوایی دەبێت،

نابینی دووکەس دژایەتی یەکتر بکەن، ئەوجا خودا بایەکی ساردی بەستەڵەک لەشامەوە دەنێرێت، کەس لەسەر زەوی نامێنێت، هەر کەسێك میسقالە زەرەیەك ئیمانی تێدابێت، ڕوحی هەڵدەکێشرێت، ئەگەر کەسێك چووبێتە ناو جەرگەی چیاش هەر دووی کەوتوون تا ڕوحی دەردێنن، ئەوەی دەمێنێتەوە خەڵکانێکی خراپن، لە هەڵەکەو سەما و گەمەگاکردنی خۆیان نەکەوتوون، بە بەرچاوی خەڵکییەوە کاری خراپ دەکەن، ئەودەم بەتەواوی کۆتاییان پێدێت.

ئەگەر سەردەمی ئومەتی ئیسلامان زانی کەینێ تەواو دەبێت، ئەوا دەتوانین کۆتایی حوکمی عیسا بزانین، چونکە حوکمی عیسا حەوت ساڵ بەر لەکۆتایی ئومەتی ئیسلام دەبێت.

ئەوەش ئاسانە بزانین سەرەتای حوکمی عیسا کەی دەبێت، ڕێك دوای کوشتنی جەجاڵ دەبێت، محەمەد لەفەرموودەیەکیدا دەڵێت((کوڕی مەریم دوای کوشتنی جەجاڵ چل ساڵ لەسەر زەوی دەمێنێتەوە)).

ئاسانیشە بزانین کەینێ مەسیحی جەجاڵ دادەبەزێت، محەمەد کاتێ پرسیاری مانەوەیان لەسەر زەوی لێکرد، لەفەرموودەیەکیدا هاتووە((چل ڕۆژ)).

هەوڵدە چاو بەفەرموودەکەدا بگێڕە، بۆخۆت سەردەمی ئومەتی ئیسلام دەزانیت، بەر لەوەی من پێتی بڵێم.

***

## کاتێک گوێت لەڕاستی دەبێت، ڕووناکییەک دڵت دەکاتەوە

لەدەمی (نۆستراداموس)ەوە وەریبگرە، هەوڵ شتێک کە بیکەی بۆ شرۆڤە کردنی هەر پەیامێك پێغەمبەر گوتبێتی، دەبێت سەرەتا دەستنیشان کردنی مەبەستی پێغەمبەر لەو پەیامەیدا چی بووە، ئەویش بە پێی سەردەمی خۆی نەك سەردەمی تۆ لە ئامۆژگارییەکاندا.

لێگەڕێ شرۆڤەی پەیڤەکان بکەین، دواتر شرۆڤەی پەیامەکەی:

یەکەم: بەر لەهەموو شتێك ڕۆژ لای محەمەد چییە، سبەی یانی چی، نیوەڕۆژە لای محەمەد مانای چییە؟

پەیڤی سبەی بەپێی فەرموودە وا هاتووە(( بەیانییانێك بەر لەخۆر هەڵاتن پێغەمبەر هاتە لامان، کەواتە سبەی بەمانای بەرەبەیان دێت، وشەی زوو هەمان مانا بەدەستەوە دەدات. محەمەد لەفەرموودەیەکیتردا دەڵێت(( خودایە لەگەڵ خۆرهەڵاتندا بەرەکەت بخەرە ناو ئومەتەکەم)). هەرکاتێکیش سووپای بەنهێنی ناردبێت، بەرەبەیانێکی زوو ناردوویەتی. سبەی یا زوو مانای سەرەتای بەر بەیانە، واتە خۆر هەڵاتن.

ڕۆژ لای محەمەد بە پێی فەرموودە یانی خۆرهەڵاتن تا خۆرئاوابوون، ڕێك نوێژی مەغریب. دوای ئەوە ڕۆژە لای محەمەد ڕێك نیوەی ئەو ماوەیە کە دەکەوێتە نێوان خۆرهەڵاتن و خۆرئاوابوون واتە نوێژی مەغریب، نزیك بەنوێژی نیوەڕۆیە، ئەو ماوەیەیە کە محەمەد نوێژی لەسەر ئومەتەکەی هەڵگرتووە. لە فەرموودەیەکیدا دەڵێت(( ئەگەر نیوەڕۆژەبوو، نوێژ کورت کەنەوە تا خۆر بەلای خۆرئاوادا دەکەوێت.

ئووکە دوای تێگەیشتنمان دەتوانین بڕێک لێی حاڵیبین، محەمەد لە پێغەمبەرایەتییەکەیدا دەڵێت(( نموونەی ئێوەش چوون نموونەی جوولەکەو مەسیحییەکان..)). کاتی کارکردنی هەر سێ ئومەتەکەی بە کاتژمێر دیاری کردووە، جوولەکەکان کاریان بەتەورات کرد، ئەوەش دوای ئەوەی بەتەواوی ڕادەستیان کرا(( تەورات بۆ خەڵکی تەورات دابەزی...)) لەخۆرهەڵاتنەوە تا نیوەڕۆژەی ڕۆژ، دواتر کە ئینجیل بۆ مەسیحییەکان دابەزی(( ئینجیل بۆ ئومەتی ئینجیل دابەزی)) یانی مەسیحییەکان، ئەوانیش بە ئینجیل کاریان کرد، لەنیوەڕۆژەی ڕۆژ تا نوێژی عەسر ، دواتر قورئان بۆ ئومەتی محەمەد دابەزی(( نوێژی عەسر تا خۆرئاوابوون)) یانی لەنوێژی عەسرەوە تا نوێژی مەغریب.

سوودی ئەم هەمووە چییە؟ با هەر ئومەتێك چەند کاتژمێرێك کاری خوداپەرستی بکەن، پێغەمبەرایەتی لەمەدا لەکوێیە؟

پێغەمبەرایەتی لە گوتنی هەوەڵین فەرموودەیاندا(( مانەوەتان و چارەنووستان وەك ئەوانەی پێشی خۆتانە، لەو ئومەتانەدا وەك نوێژی نێوان عەسر و خۆرئاوابوونە)). ئەو دەڵێت سەردەمی ئومەتی ئیسلام وەك مەودای نێوان نوێژی عەسر و نوێژی مەغریبە، چاك بزانن سەردەمی جوولەکە مەودای خۆرهەڵاتن تا نیوەڕۆژەیە، سەردەمی مەسیحییەکان لە نیوەڕۆژەی ڕۆژەوە تا نوێژی عەسرە.

کێشەکە ئەوەیە چۆن بتوانین مەودا لە فەرموودەکاندا کە بە کاتژمێر هاتووە بگۆڕین بە مەودای ساڵ.

لەگەڵ شرۆڤەکردنی ئەو پەیامە تووشی گرفتێك بووم، کە بەحەسابگەر ناوزەدیان کردم.. ڕۆژ بەپێی هاوین و زستان درێژ و کورت دەبێت، هەروەسا

بە پێی پێگەی جوگرافی درێژو کورتی دەبێت، کاتی نوێژی موسوڵمانان ناتوانین لەهەموو شوێنێك کاتێکی وەك یەکی بۆ دیاری بکەین، وەڵێ محەمەد قسەکانی زۆر بە وردی بەکار هێناوە، بۆیە وەك گەردوونناسێك بە سەرسوڕمانەوە لەخۆم ڕوانی.

هەرچەند ڕۆژ درێژ یا کورت بێت، هەتا گۆڕانکاری لەپێگەی جوگرافیشدا هەبێت، ماوەکە لەنێوان نیوەڕۆژەی ڕۆژ و نوێژی عەسر لەسەدا پەنجا و شەش لەماوەی خۆرهەلاتن و نیوەڕۆژەی ڕۆژدایە، یانی هەرچۆنێك بێت مەودای مەسیحییەکان لەم پەیامەدا لەسەدا پەنجاو شەش سەردەمی جوولەکە دەبێت.

هەرچەند ڕۆژ کورت و درێژ بێت، پێگەی سەر گۆی زەویش جیاواز بێت، کاتی نوێژ لەنێوان نوێژی عەسر و نوێژی مەغریبدا ٤٤٪ ئەو ماوەیەدایە لەنێوان خۆرهەلاتن و نیوەڕۆژەی ڕۆژ، یانی هەرچییەك بێت سەردەمی ئیسلام ٤٤٪ سەردەمی جوولەکە دەبێت.

دەتوانیت کاتەکانی نوێژ لەهەچ ولاتێك و لەهەچ وەرزیکیشدا بێت بەسەر بکەیتەوە، لەم پێوەرە دڵنیا دەبیت.

ئێستا دەتوانین دەست بەژماردن بکەین، ئەو ماوە زانراوە مێژوورییە و هامڕابوون لەسەر سەردەمی مەسیحییەتدا، بە پێی ئەم پەیامە لەو دەمەی ئینجیل بۆ ئومەتی ئینجیل دابەزی ، تا قورئانیش بۆ ئومەتی قورئان دابەزی ، یانی دوا ساڵی عیسا کە ئینجیل تەواو بوو، تا کۆتایی ساڵی دابەزینی قورئان بۆ محەمەد ٦٠٠ ساڵە، ڕێك لەودەمەی عیسا ساڵی ٣٣ هەڵکێشرا، تا کۆتایی محەمەد ساڵی ٦٣٢ زایینی بوو.

که سەردەمی مەسیحییەکان ٥٦٪ ی سەردەمی جوولەکە بێت، بەو ئاوایەی سەردەمی مەسیحییەکان ٦٠٠ ساڵبوو، کەواتە سەردەمی جوولەکە ١٠٧١ ساڵ دەبێت.

هەروەها سەردەمی ئومەتی ئیسلام ٤٤٪ سەردەمی ئومەتی جوولەکە بێت، ئەوا سەردەمی ئومەتی ئیسلام ٤٧١ ساڵە.

هەنووکە ئێمە لەساڵی ١٥٦٦ی زایینی داین، قورئانیش لەدوایین ساڵی ژیانی محەمەد تەواو بوو، کە ٦٣٣ زایتی یانی ٩٣٣ ساڵ بەسەر ئومەتی ئیسلام تا سەردەمی من تێپەڕیوە، یانی پەیامی پێغەمبەرایەتییەکە هەڵەبووە، وەڵێ هەر زوو لەفەرموودەیەکی تردا هەموو شتێکم بۆ ڕوون بووەوە.

لەو فەرموودەیەی محەمەد داهاتووە(( هیوادارم ئومەتی من لای خودا نیوەڕۆژەی ڕۆژ درەنگتر بکات)).

محەمەد داوای لەخودا کرد، ئومەتەکەی نیوەڕۆژەی ڕۆژ دوا بخات، یانی سەردەمییان درێژتر بکاتەوە کە مەزەندەی نیوەڕۆژەی ڕۆژیان کردبوو، بەوئاوایەی نیوەڕۆژەی ڕۆژی ئەمڕۆ لەخۆرهەڵاتەوە بۆ نیوەڕۆژەیە، ڕۆژ یانی بەقەد سەردەمی جوولەکە بێت، ڕێك وەك ئەوەی لەفەرموودەکەدا هاتووە.

بەکۆکردنەوەی هەردوو فەرموودەکە دەگەینە ئەوەی سەردەمی ئومەتی ئیسلام دەکاتە ٤٧١( سەردەمی مەزەندەی ئومەتی ئیسلام کۆی ١٠٧١ نیوەڕۆژەی ڕۆژ زیادکردنی بەقەد سەردەمی جوولەکە، یانی دەرئەنجام ١٥٤٢ ساڵ دەکات، یانی سەردەمی ئومەتی ئیسلام ٢١٧٥ ی زایین تەواو دەبێت.

بۆ ئەوەی ئەو پەیامی پێغەمبەرایەتییە تەواو بێت، پێویستە ڕوو بەڕووی مێژوو ببینەوە، ئاخۆ سەردەمی جوولەکە تا دابەزینی تەورات تا تەواوکردنی دابەزینی ئینجیل ۱۰۷۱ ساڵە؟

لای محەمەد تەورات چی دەگەیێنێت؟ خودی خۆشمان وەك جوولەکە جیاوازین لەشرۆڤەکردنی، تەورات لای هەندێك مانای یاسایە(شەریعەت) یا تەنها هەر پێنج ڕیوایەتەکەی مووسایە، لای هەندێکیتر مانای ئەو دوای ڕیوایەتەکانی (عەهدی کۆنە) لەیاساو هەر هەشت پەیامبەرەکەیە.

محەمەد وشەی تەوراتی بە هەر پێنج ڕیوایەتەکەی مووسا و ڕیوایەتی پەیامبەرە گەورەکان وەسپ کردووە، لەبەر ئەوەی لەقورئانیشدا ناوی محەمەد وەك مژدەیەك لەتەوراتدا هاتووە(( ئەوانەی دوای پێغەمبەری نەخوێندەوار کەوتوون، دەزانن ناوی لە تەورات و ئینجیلیشدا هاتووە)) پێغەمبەرایەتییەکەی محەمەد لەتەوراتدا و لە ڕیوایەتی(ئەشعیا)دا هاتووە، کە دەڵێت(( ئەو بەندەی کە پارێزگاری لێدەکەم ، هەڵبژاردەی خۆمە، ڕوحی خۆمم ناوەتە سەری، هەق لەنێو گەلان بڵاودەکاتەوە، لەشەقامەکان هاوار ناکات، هەڵناچێت و دەنگیشی بەرز ناکاتەوە، نەدەشکێ و نەیش کوڵ دەدات تا هەق لەسەر زەوی بڵاو دەکاتەوە، هەموو زوڵملێکراوێك چاوەڕێی یاساکەی (پەیام) دەکەن، ئەوانەش لەتەك قسەی ئەو ئەسحابانە یەك دەگرنەوە، کە دەڵێن(( ئەو لەتەوراتدا وەسپ کراوە)) کە لەقورئانیشدا هاتووە(( ئەی پێغەمبەر تۆمان وەك شایەتحاڵ و مژدەبەر نارد، تۆ بەندەو پەیامبەری منیت، نە تێکدەری نەیش ڕقاوی و نەیش لەنێو بازاڕەکاندا دەم بەهاواربووی)).

بەو ئاوایە تەورات لە لایەن محەمەدەوە هەر پێنج ڕیوایەتەکەی مووسایە، ئەو ڕیوایەتانەیش کە لە لایەن پەیامبەرە گەورەکانی جوولەکەوە هاتوون،

ئەو پێغەمبەرانەیش کە دوای سلێمان لەسەردەمی دووڵەتکردنی مەملەکەتی ئیسرائیل بۆ هەردوو بەشی باکوور و باشوور دابەشبوون.

تەنها ڕێگای مێژوویی کە بێشك مێژووی مەملەکەتی دابەشکراوی جوولەکە دیاری دەکات ، زانینی ئەو کاتەی مەملەکەتی (سلێمان)ە کە دابەش نەکراوە.

مەملەکەتی سلێمان لە (نیل)ەو بۆ (فورات) بوو، یانی بەشێك لەخاکی میسری بەدەستەوە بوو. مێژوو بیرمان دەخاتەوە کە خانوادەیەکی فیرعەونی هەبووە، لەشەك فیرعەونەکان گوزەرانی دەکرد، وەلێ کەمێك جیاوازتربوو، بەوای ئەوەی پاشاکانی ناوی جوولەکەیان هەبوو، وەك یاقووب و قوورا و ئەوانیتر، بەشی باکووری خۆرئاوای میسریان بەدەستەوە بوو، یانی لە (نیل)ەوە بۆ دەلتا، ئەوانیش شانزەمەین بنەماڵەی سەر بەحوکمی (هیکسۆس)ەکان بوون، ئەوانەی (شام)یان بەدەستەوەبوو، یانی ئەو بنەماڵەیە سەر بەحوکمی سلێمان بوونە، ماوەکەشیان لە ١٦٥٠ پێش زایین تا ١٥٨٠ پێش زایین بوو.

سەردەمی سلێمان ١٦٥٠ پێش زایین بووە.

ئەوەی زیاتر ئەو مێژووە پشتڕاست دەکاتەوە، لەگەڵ ئەو ئایەتەی قورئان یەك دەگرێتەوە کە دەڵێت.. کاتێك جوولەکە بەتەواوی خاکی پیرۆزیان خستە ژێر دەسەڵاتی خۆیان، ئەو ساڵەبوو، کە هەموو شوێنەواری فیرعەونەکان تێك و پێك شکێنران، لەقورئانیشدا هاتووە(( ئەو قەومە بێدەسەڵاتەی لە خۆرهەڵات تا خۆرئاوای دنیامان کرد بە میراتگر، قسەی خودا هاتە دی و قەومی ئیسرائیل بەوای دان بەخۆداگرتنیان کە

فیرعەونـەکان ئـەوەی نەشـێت پێیانیـان کـرد، دەسـەڵاتی فیرعەونـەکانمان کوێرەوە کرد)).

بەپێی مێـژووی فیرعەونـەکان هـەموو شـوێنەواری فیرعەونـەکانمان خـاپوور کرد، ئەویش لەسەردەمی (ئەحمەس) کە ویستبووی هـەموو شـوێنەوارەکان نۆژەنبکاتەوە، کە بەوای بامۆزێکەوە وێـران بـوون، ئـەوەش لەگـەڵ ئـەوەی زاناکان دەربارەی گرکانی ( سێرا)ی ساڵی ١٦٠٠ای پێش زایین ڕیکدەکەوێت، کە بەسەر میسردا هات، هەرچی شوێنەواریان بوو وێران بوو.

بـەو شـێوەیە میـژووە جیۆلۆجییـەکان لەگـەڵ میـژووی فیرعـەونی و دەقـی ئایەتـەکانی قورئانـدا یەکدەگرنـەوە، هـەروەها لەگـەڵ پـەیامی پێغەمبـەر محەمـەدیش لەمـەڕ سـەردەمی جوولەکـە، تەقینـەوەی گرکـانی (سـێرا) بـە پێـوەری جیۆلۆجییـەکان سـاڵی ١٦٠٠ی پـێش زایـین ڕوویـداوە، کـە لەتـەک مێژووی بنەماڵەی شانزەهەمی فیرعەونییەکان سـەر بـە سـلێمان بـووە، هـەر ئـەوەش بـوو لـە قورئانـدا خـاپوورکردنی شـوێنەواری فیرعەونییـەکان کـە هـاتووە.. ئـەو وێرانکارییـە کاتێـك ڕوویـداوە جوولەکـە خـاکی پیرۆزیـان لەسەردەمی سلێمان بەدەستهێناوە.

کە مێژووی سلێمان ١٦٥٠ ی پێش زایین بێـت، میـژووی دوایـین پەیامبـەری گەورەی دوای سلێد ان ٥٧٩ ساڵ بە پێی دۆسێی جوولەکە بێت، یـانی ١٠٧١ پێش زایین.

پەیامی پێغەمبەرایـەتی محەمـەد درۆ نـەبووە، کـاتێ گوتوویـەتی سـەردەمی جوولەکـە دوای تـەواوکردنی تـەورات لەسـەردەمی دوایـین پەیامبـەری دوای سلێمان تا هاتنی عیسا ساڵی (١)ی زایینی، ١٠٧١ ساڵە.

ئەگەر ئومەتی ئیسلام دوای ٢١٧٥ تەواو بێت، بەو بەرپابوونە بۆن خۆشە کە ڕوحی هەموو موسوڵمانێك دەکێشێت، کەواتە حوکمی عیسا بە پێی فەرموودەکەی پێشوو بەحەوت ساڵ پێش ئەو تەواو دەبێت، یانی ٢١٦٧ی زایینی. سەرەتای حوکمی عیسا و کوشتنی جەجاڵ بەر لەوە بە چل ساڵ دەبێت، یانی ٢١٢٨ی زاینیی، جەجاڵ بە چل ڕۆژ بەر لەوە پەیدا دەبێت، یانی ساڵی ٢١٢٧ی زایین.

بە پێی فەرموودەی محەمەد بەر لە جەجاڵ بەحەوت ساڵ داستانە گەورەکە بەرپا دەبێت، وەك محەمەد ئاوزەدی کردووە، کە لەگەڵ پەیامی ئینیجل ڕێك دەکەوێت، داستانە گەورەکەیش (هەرمەجدوون)ە، محەمەد لەفەرموودەیەکیدا دەڵێت((داستانە گەورەکەو فەتحی مەدینە شەش ساڵی بەینە، جەجاڵ لە حەوتەمدا دەردەکەوێت، یانی داستانە گەورەکەی (هەرمجدوون) لە ٢١٢٠ی زایین ڕوودەدات.

لەسەرەتای هەڵگیرساندنی داستانە گەورەکە، کەسێك بەناوی (مەهدی) دەردەکەوێت. محەمەد لەفەرموودەیکدا دەڵێت(( مەهدی لەمنە ناوچەوان رووتاوە، لووت بەران، دادپەروەری لەسەر زەوی ڕادەگەیێنێت، وەك چۆن زوڵم و ستەمکاری دنیای گرتبووەوە، حەوت ساڵی بەدەستەوە دەبێت)) یانی دەرکەوتنی مەهدی ٢١٢٠ی زاینیی دەبێت.

بەر لەوەش ئاشتی نابێت، وەڵێ بەر لەسەد ساڵی دەرکەوتنی مەهدی نیشانەکانی دەردەکەوێت، کە محەمەد باسیانی لێوە کردووە، وەك کەڵبەدار و تەن جەستە، ڕاڕایی لەسەر پەیرەوی پەیام، دوای ئەوەی لەسەر خاکی موسوڵمانان کۆیرەوە دەبێت، شەڕی سێ لە وەچەی جێنشینەکان لەسەر گەنجینەی عەرەب، دەرکەوتنی ئاڵا ڕەشەکان، کەمکردنەوەی فورات، گەمارۆدانی شام و عیراق دووزمانی کە گەورەترین جەنگە، دووزمانی کەسێك

وا ڕادەگەیێنێت لە بنەماڵەی محەمەدە و درێ دەکات، دووزمانی هەرچی و پەرچی پیاو دەبێت بە باوەڕهێن و بەخوانەناسی سەر دەنێتەوە، ئەوجا کاولبوونی (یەسرب)، دوای ئەوە داستانەکەیەو دەرکەوتنی (مەهدی) و (جەجال)، بۆ ئەوەش شتێکیترو بیرەوەرییەکیتر هەس.

***

**ئەم پەرتووکە بچووکەی بیرەوەرییەکان لەژوورەکەی بۆبی فرانك دۆزرایەوە، حەزمکرد وەك خۆی بیخەمە ڕوو، جیاواز لە ڕۆمانەکە، بەو ئاوایەی بەر لە ڕۆمانەکە ڕوویانداوە.**

بەپێی ئەم نووسراوە چەند*** کۆتایی زەوی (١٧٥) ز
دەبێت دەجال لە (١٦٥) ز دەردەکەوێت
ئێستا ئێمە تەنها (٩٧) ساڵمان ماوە
بۆ هاتنی مەهدی وە (152) ساڵمان ماوە
بۆ کۆتایی هاتن بە زەوی.

# بەشی سێزدەهەم

## کەوتنە خوارەوەی ئەستێرەیەك بە ژێر چارشێوی شەوەوە

## ٧٥٠٠ پێش زایین _ ٧٠٠٠ پێش زایین

***

بەتێڕوانینێکی عاشقانە لە لۆسیفەری دەڕوانی، بەدەم نزیکبوونەوەی لە لۆسیفەر پرچە زیوینییەکەی چون زریزە بەسەر شان و ملیدا شۆڕ ببوەوە. ڕوخسارێکی شیرینی هەبوو، دوو چاوی ڕەنگ کەوەیی ئەوەندەیتر جوانی کردبوو، ناوی (وازییە)یە و ژنی یەکەمی لۆسیفەربوو، بەدەم ڕامانییەوە لە کۆشکەکەوە بۆ خاکی عەدەن هەستی بەنزیکبوونەوەی وازییە نەکرد، وازییە پێیگوت:

– سامایل.. دوای دوو هەزار ساڵ ، ئەمڕۆ ڕۆژی چاوەڕوانکراوەکەیە.

دوای ئەوەی گوێی لەنازناوەکەی خۆی بوو، بە ڕوخسارە سیحراوییەکەی لای لێکردەوە. وازییە.. لەچاوانییەوە لەخۆبایی بوونەکەی بینی، بزەیەکی بۆکرد.. ئەگەر میری ڕووناکی هەست بەلەخۆباییکردن نەکات، کێ ئەو هەستەی هەبوو، ئەمڕۆ ڕۆژی شکۆدارکردنێتی، ڕۆژی بەرزبوونەوەیەتی بۆ لای فریشتە نزیکەکانی ئاسمان تا نازناوی (سامایل)ی پێبدرێت، (بەوازییە)ی گوت:

– دەزانیت چی دڵی گوشیووم، کاتێ بیر لەهەموو ئەوەی پیا ڕەتبووین دەکەمەوە؟

بلەز گوێی خۆی بۆ شلکرد و پێیگوت:

- جەنگی یەکەمی شێتی، بەهەموو ئەو ئاوریاران و خوێنڕشتن و کوشتارگەیەی لەسەر زەوی ڕژاندمان، خوێنی وەچەکانی خۆمان بوو، وەچەکانی خۆم و خۆت بوون.

وازییە دەستی لەسەر شانی دانا و گوتی:

- خودا ڕێی پێدایت کە تۆ یەکەم جنۆکەو باوکی جنۆکەکان بیت دژ بە گەندەڵی و خراپەکاری نەوەکانی خۆت بجەنگیت، تۆ ڕاوتنان بۆ ناو دوورگەکانی دەریا و لاپاڵی چیاکان هەر هەمووشمانت کۆکردەوە، ئەوانەیش کە لەسەر ئەم زەوییە پیرۆزەی ئەتلانتس کە باوەڕیان بەخودا بوو، ئەمڕۆ پاداشتی خێری خودات پێدەدرێت.

لۆسیفەر بێدەنگبوو گەڕایەوە لای هەڵاتنەکەی، هەر کە ئەو ڕۆژە خۆر لە ئاسۆگەوە دەرکەوت، لۆسیفەر بەئاسمانا هەڵکشا، تاریکی لە ڕەوینەوەدا بوو، عاباکەی بەدەم باوە دەشەکایەوە، چاویشی هەر لەبەرزی دەڕوانی، پرچە ڕەشەکەی بەدەم باکەوە دەفڕی، بەرەو بەککە ڕێڕەوی گرتبوو، تا لەوێوە بەرەو فریشتەکانی ئاسمان هەڵکشێت.

ئەوانە فریشتەگەلێکن لەماڵی خواپەرستیدا یەك دەگرنەوە بۆ خواپەرستی، ئەویش بە ئاسمانی سەر مەککەوەیە ڕۆژانە حەفتا هەزار فریشتە دەچنە ئەو شوێنە و هەر کە دەرچوون بۆی تا ڕۆژی پەسلان ناگەڕێنەوە، ئەمڕۆ لۆسیفەر بوو بەیەکێك لەو فریشتانەی ئاسمان شەرەفێکی مەزنبوو، نە پێش خۆی و نە پاش خۆی بەکەس نەدراوە.

لەتەك نزیکبوونەوەی لە ماڵی خواپەرستی دیمەنگەلێکی ئاوریارین و خوێنڕژانی بەهزردا هاتەوە، لەجەنگی شێتی (لاقیس)ی کوڕی بیرهاتەوە، دڵی گووشرا، دەستی بە برینەکەی لاجانگی خۆیدا هێنا، ئەوجا هەر هەموو

ئەو بیرەوەرییانەی لەمزی خۆی تەکاند، بەو ئاوایەی دەچێتە ماڵی خوا پەرستی، پردێکی درێژ ئەو سەری دیار نەبوو، بەسەر بیناپەکی لەزیوی سپی بەرزبووەتەوە، هەور بەملاو ئەولای ڕاست و چەپدا بڵاوببوەوە ، بەدەر لەو تەمەنە هەڵکشاوەیدا، دڵی بەو دیمەنەی بەرچاوی کەوت هەناسە بڕکێی تێکەوت، ئەو دەمەش کە بەسەر پردەکەوە دەڕۆیشت و تەماشای لای خوارەوەی دەکرد، دەیان هەزار فریشتە سڵاوتیان لێدەدا و بەدەوری خانوویەك کە لە یاقووت درووستکرابوو، لەناو ماڵی خواپەرستیدا ناوی ماڵی سەربڵندی، گوێی لە شوکرانە کردنیان بوو، شوکرانەی خودایان دەکرد. ئەوەبوو پێیان دەگوت پادشاکانی ئاسمان.

لۆسیفەر شاگەشکەبیەکەی لەڕوخساری خۆی ڕەواندەوە، هەموو ئەو خەیاڵانەی سەر پردەکەی کە دەچووە شوێنی هەرە پیرۆز قۆستەوە، کە چوار ستوونی تێدابوو، دووانیان لەیەکەوە نزیك و دووانەکەی تر لەیەکەوە دوور بوون، دڵی خورپەی کرد، نیگا بەسەرسوڕماوییەکەی گواستەوە لای سەرسوڕمانی بەدانیشتوانەکەی و چاوی بە هارووت و مارووت و ئیسرافیل و عوزێر کەوت، دواتر چاوی بە فریشتەی گیانکێشان کەوت، فریشتەی گیانکێشان نیگایەکی تێبڕی، نیگاکەی هێند بەسامبوو وەختەبوو دڵی بوەستێنێت، چاوی لەبەر داخست، ئەو فریشتانە دڕ بە هەموو چاوێك دەبەن، وەلێ ئەو لەخۆبایيەی لەناخیدابوو گەورەبوو، توانی بە فریشتەکانی ئاسمان بگات، ئەمڕۆ ڕۆژی پێشوازیکردنێتی، هەر هەموو ئەو مەزنانە بۆ ئەو پێشوازیەی ئەو لەوێ ئامادەبوون.

***

دوای دەستنیشانکردنی شوێنی میری ڕووناکی لەنێو فریشتەکانی ئاسماندا، هەر هەموو فریشتەکان هەستیان بە گەڕەلاوژێی شوێنەکە کرد، لە

سلاوتکردن کەوتن، هەمووان چاویان لەدەروازەی پیرۆزی پیرۆزەییەکان بڕی، وەك ئەوەی لەچاوەڕوانی کرانەوەیدا بن، هەرواش دەرچوو دەروازەکە کرایەوە، فریشتەیەك چووە ژوورەوە مەزنی ئەو لەتایەك و مەزنی ئەوانیش لەتایەکیتردابوو، تەنانەت لۆسیفەر حەسرەتەکەی بۆ ڕانەگیرا، ئەویش فریشتە میکائیل بوو، ئەو فەرمانی لەخواوە بۆ دەهێنان، دەستبەجێ و بێ هیچ پێشەکییەك گوتی:

– فەرمانی خودایە.. جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێت.

لەیەکڕا فریشتەکان سلاوتیان لێدا و فەرمانەکەیان پیرۆز کرد، لۆسیفەر چاوەکانی زەق لێکردەوەو ویستی بدوێت، وەلێ ترسی لە میکایل بێدەنگی کرد، هەموو فریشتەکان میوایان بۆ ئەو جێنشینە خواست ڕێگای ڕاست لەبەر بگرێت، لۆسیفەر چرکەی لەخۆی بڕیبوو، دیاربوو ئێرەیی بەو جێنشینە دەبرد، نەیدەویست لەخۆی بەولاوە کەسیتر جێنشینی سەر زەوی بێت، سەرەتا وایزانی ئەو کارە دوادەکەوێت، ڕەنگە دوای مردنی خۆیشی بێت، وەلێ بە پێی دەنگۆی قسەکان بۆی دەرکەوت بەهەڵەدا چووە، ڕەنگە بەزووترین کات ئەوە ڕوویدات، مێشکی هەراسان بوو، گوتی:

– خودا جێنشینێك لەسەر زەوی دادەنێت، کە خوێن دەڕێژێت.

هەر هەموو فریشتەکان بێدەنگبوون، میکایل گوتی:

– سامایل.. چووزانیت ئەو جێنشینە خوێنڕێژ دەبێت؟

لۆسیفەر دەستبەجێ گوتی:

– ئەی دانانی جێنشین پێویستی بەدەسەلاتداری نییە، بۆ ئەو نەتەوەیە حاکمێکی ناوێت، خۆ ئەگەر هەر هەموویان لەپیاوچاکان بن چ پێوویست بەحاکم و دەسەلاتداری بەسەریانەوە دەکات، ئەوەش مانای ئەوەیە دەکەونە گیان یەکتر و خوێنی یەك دەڕێژن.

جبریل هاته بەینەوەو بارە خوارەکەی ڕاست کردەوەو گوتی:

- خودا بەر لەهەزار ساڵ (تەها و یاسی)ینی بۆ داگرتن، چیرۆکی گەلێك لەخەڵقەندەی خۆی تێدایە، کە لەفریشتەکانیش نین، خراپەو خوێنڕشتنیان تێدابوو.

کاتێ سیرافیم و کیرۆبیم گوێیان لەو ئایەتە بوو، گوتیان:

- کاتێ گوێمان لێبوو، گوتمان پیرۆزە لەو ئومەتەی ئەوەی بەسەرا دێت، پیرۆزە بۆ ئەو زمانەی وا دەدوێت، ئەوانەیش کە هەڵگری پەیامن.

هەر هەموو دڵنیابوون ئەو جێنشینەی خودا لەسەر زەوی دایدەنێت، خراپەدەکات و خوێن دەڕێژێت، ڕەنگە لەخراپەکاریدا لەجنۆکەکانیش بەدڕفتارتر بن. خودا لەنادیارییەوە قسەی لەتەکیاندا کرد. خودا هەر خەڵقەندەیەکی دەخوڵقاند لەنادیارییەوە قسەی لەتەکیدا دەکرد، وەك بەزەییەکی خۆی پەیامی خوڵقاندنەکەی پێدەگوت. هەر هەموو فریشتەکان بە (لۆسیڤەر)یشەوە ویستیان هۆکاری ئەو خەڵقەندەییە لەخودا بپرسن، گوتیان:

- خودایە.. یەند لەوەدا چییە لەسەر زەوی جێنشینێك دادەنێیت، کە مەزەنە دەکەین خراپە کار و خوێنڕێژ بێت، خودایە ئێمە لەسەر زەوی سڵاوات لەدیارت دەدەین، شەو و ڕۆژ لەپەرستنداین.

خودا یەك ڕستەی پێگوتن(( ئەوەی من دەیزانم ئێوە نایزانن)).

*************

فریشـــتەی گیانكێشـــان بەحـــەواوە بـــوو، هـــەر وەك فریشـــتەكان بـــەعابا ڕەشەكەیەوە كون و كەلەبـەری گۆی زەوی دەگـەڕا و چنگی لـەخۆڵی سـەر زەوی گیر دەكرد و لێی دەخستە خورجەكەیـەوە، هەوەڵێن چنگی لـەخۆڵی ئەشكەوتی (مەكفیلە) گیر كردو لێی هەڵگرت، دواتر لە خۆڵی سپی و سوور و ڕەشـی كـۆكردەوە و هـەر هەمووشـی تێكـەڵكرد و ئـەوجا بـەرەو بەهەشـت گەڕایەوە و ئاوی لەهەر چوار ڕووبارەكـە گرتـەوەو بەسـەر خۆڵەكەیـدا كـرد، شێلای و كردی بەقوڕ، دواتر لـەو شـوێنەی خـودا پێیڕاگەیاندبوو قوڕەكـەی دانا، لەو شوێنە فریشتەی گیانكێشان لۆسیفەری بینی، چاوی بڕییـە چـاوی لۆسیفەر، لۆسیفەر وەختەبوو لەهۆش خۆی بچێت، دانی بەخۆیـدا گـرت، بـە فریشتەی گیانكێشانی گوت:

---

– ئـەمانبینیوە قـوڕ بگرێتـەوە، ئـەوەی لێتمـان بینیـوە دوای ڕوح كێشان دەینێتە ناو قوڕ و لەگۆڕی دەنێیت.

فریشتەی گیانكێشان گوتی:

– سامایل.. فەرمانی خودات پێنەگەیشـت؟ خـودا نەیفـەرموو جێنشـینێك لەسەر زەوی دادەنێت؟

– بەڵێ.

– ئـەو جێنشـینەی پێیگـوتین، ئـەمڕۆ بەتـەواوی بەفریشـتەكان دەڵێـت جێنشینێك لەقوڕ لەسەر زەوی دەخولقێنم.

لۆسـیفەر چـاوەكانی نەبڵـەقبوون، بـەڕای جێنشـینێك لـەقوڕ دروسـتكراو تووڕەیی ئاور لەهـەناوی هەسـتاند، ، نـەیتوانی ناڕەحەتییەكـەی ڕوخسـاری بشارێتەوە، فریشتەكە پێیگوتەوە:

– دەزانیت خودی زەوی کە دەستم بۆ برد، نارەحەت نەبوو، دەبوو فەرمانی خودا بەجێبگەیێنین، وا پێدەچوو زەویش مەزەندەی ئەو خەڵقەندەیەی وەك ئێمە کردبێت.

تەماشای لۆسیفەری کرد، لۆسیفەر هزری لەدڵیدا کۆببووەوە، لۆسیفەر سەری دانوواند و دوور کەوتەوە، وەلێ ئەو شوێنەی بەتەواوی جێنەهێشت، دەڕۆیشت و دەهاتەوە تەماشای تۆپەڵە قوڕەکەی دەکرد. چەند ڕۆژێکی بەسەرچوو تا قوڕەکە وشکەوەبوو، لۆسیفەر تەواو نارەحەتببوو، تا ڕۆژی هەینی هات، هات بۆ لای قوڕە وشکەوەبووەکە و لێی ڕوانی، دڵی خورپەی کرد، سێ وێناکراوی بەرجەستەکاروی لە قوڕەکە بینی، کە بەسەر خاکی بەهەشتدا ڕاکشابوون، پۆشاکی نایابیان لەبەردابوو، تا عەورەتەیان دەرنەکەوێت، ئەوانیش ئادەم و حەوا و لیلیس بوون، لۆسیفەر نەیتوانی بێدەنگبێت، لێوەکانی تەتەڵەیان دەکرد.

لەجەستەی ئادەم نزیکەوەبوو، بە ڕقەوە لێی ڕوانی.. تۆ چیت؟ لەقوڕ دروستکراویت؟ بۆچی خەڵقەندەکراویت؟ بەم ئاوایە قسەی لەتەك خۆیدا دەکرد نەك (ئادەم)دا، ئەوجا دەستی بۆ ئادەم درێژ کرد، مستێکی لێدا، گوێی لە زرنگانەوەی قوڕە وشکەوەبووەکە بوو، چاوەکانی زەق زەق لێکردنەوە، بەخۆی گوت:

– ئەمە خەڵقەندەیەکی بۆشە، بەخودا بمەوێت بەمستێك وردو خاشی دەکەم، قەستەم بەخوا...

– خودا کە ئەوەی خەڵقەندە کرد، گوتی ڕەحمەتم بەر لەتووڕەبوونمە بۆی.

لۆسیفەر ڕاچڵەکی، هەر زوو ئاوڕی لەپشتی خۆی دایەوە، میکائیل فریشتەی مەزن وەستابوو، پێیگوت:

- من پەیامی خودات پێڕادەگەیێنم، خودا دەفەرمێت.. لەقوڕ خەڵقەندەیەك دەخولقێنم، ڕوحی خۆمی وەبەر دەکەم، هەر هەموو فریشتەکانیش کڕنۆشی بۆ بەرن.

لۆسیفەر ئەوە یەکەمجاریبوو دان بەخۆیدا بگرێت، هەڵماتەکانی چاوی جێیان بەخۆیان نەدەگرت، هەزارو یەك بیرۆکە بەمێشکیدا دەهات و دەچوو، کڕنۆش؟ بۆ کێ؟ بۆ ئا ئەمەی لەقوڕ دروستکراوە، نەشیدەتوانی فەرمانەکانی خودا لەبەهەشتدا جێ بەجێنەکات، ئەوەی لەبەهەشتدا یاخی بێت، لەبەهەشت وەدەر دەنرێت، ڕووی لەفریشتە میکایل کرد و گوتی:

- ئەی میکایل.. پەیامی خودام پێگەیشت و وەرمگرت.

ئەوەندەی نەبرد فریشتەگەلێکی گەنجینەی بەهەشت هاتن و هەر سێ جەستەی قوڕە وشککراوەکانیان هەڵگرت تا لەبەهەشت دەریان بکەن، لۆسیفەر بەدەر لەو ڕقەی ناخی تەنیبوو، وەلێ بە دەرکردنی جەستەکان لەبەهەشتدا سەبوورییەکی هاتەوە، ما بۆ یەکەمجار بیر لە خراپەکاری شەڕ بکاتەوە.

**************

ئەو ڕۆژە لای فریشتەکانی ئاسمان گەڕەلاوژێ بوو، لۆسیفەر بەبان پردەکەوە تەماشای لای خوارەوەی دەکرد، شوێنێك نەمابوو فریشتەی تێدا نەبێت، هەر هەموویان چون ئەوەی چوار باڵیان لێ ڕوابێت، بلەز بەرەو ماڵی خودا پەرستی دەفڕین، دواتر لەیەك دوور دەکەوتنەوەو بەردەبوونەوە ئەو شوێنەی جەستەی (ئادەم)ی لێبوو، بای باڵیان ئەوەندە بەهێزبوو، لۆسیفەر ئەگەر توند خۆی بە پردەکەوە نەگرتبا بەردەبووەوە، هەر هەموویان بۆ

لای ئەو بنیادەمەکان دەهاتنە خوارەوە، ژمارەیان لەژماردن نەدەهات. گوێی لەدەنگێکبوو، ئاوڕی لەپشتی خۆی دایەوە، چاوی بە فریشتە میکایل کەوت، میکایل پێیگوت:

- لۆسیفەر.. کاتی کڕنۆش بردنە، پاش کەمێکیتر خودا ئامادە دەبێت، لەڕوحی خۆی بەو پەیکەرانە دەبەخشێت.

لۆسیفەر وەلامی نەدایەوە، بەلام سەری بۆ لەقاند، دواتر بەحەواوە بەرزەوەبوو، ئەوجا بەرەو خوار بۆ لای گردبوونەوەکە شۆڕ بووەوە، شوێن پێی لەبەر زۆری فریشتەکان نەدەبووەوە، تا چاو بڕیکات فریشتەبوو، جەستەی ئادەم لەنێویاندا ڕاکشابوو؛ ڕوح بە بەرییەوە نەکرابوو، ئەوێ خاکی دەرەوەی بەهەشت یانی(عەدەن)بوو، جەستەی حەواو لیلیس بە تەنیشتییەوە نەبوون، کەس نەیدەزانی بۆ کوێ برابوون.

شێوەی ئادەم جیاوازتربوو، قوڕەوشکەکەی دوێنێ نەبوو، ئەو ئێستا گۆشت و خوێنە و خودا فەرمانی بە بوون بەقوڕەکە دابوو ببێت بەو بنیادەمە کە گۆشت و خوێنە، جارێ ڕوحی بەبەرا نەکرابوو، هەموان لەچاوەڕوانی ڕوح بەبەردا کردنی بوون، تا فەرمانی خودا بەجێ بگەیێنن و کڕنۆشی بۆ بەرن، لەپڕ ئادەم جوولەی تێکەوت، پشتی لەزەوییەکە بەرزەوە بوو، دانیشت، وەلێ کەس کڕنۆشی بۆ نەبرد، چونکە چاوەڕوانبوون میکایل کڕنۆش بەرێت و ئەوجا کڕنۆش بەرن، بەو ئاوایەش میکایل دەیزانی جارێ ڕوحی بە بەرا نەکراوە، خودا دابەزی، ئادەم سەری بۆ ئاسمان بەرز کردەوە، ڕوحی خودا بەگەروویدا ڕۆ چوو، قیتەوەبوو، ئەوجا میکایل کڕنۆشی بۆ خودا برد بەو ئاوایەی کڕنۆشیشی بۆ ئادەم برد، هەر هەموو فریشتەکان دوا بەدوای میکایل کڕنۆشبان بۆ برد، لۆسیفەر وێستابوو، دانەچەمییەوە، تەماشای

فریشتەکانی دەکرد، چۆن کڕنۆش بۆ ئادەم دەبەن، ئەوجا شتێکی سەیر ڕوویدا.

هەر کە ڕوحەکە گەیشتە پشتی، خۆی قیتەوەکرد، ئەوجا ڕوحەکە گەیشتە ناوشانی و شانی ڕاتەکاند، خودا لە نووری خۆی پێبەخشی و گوتی(( لەبەهەشت پەناگەم بۆ دانا، چونیان بویێ وابکەن، ئەوجا بە پێی کردەوەو کارەکانیان لەبەهەشت نیشتەجێیان دەکەم)) لۆسیڤەر لاقەکانی لەرز گرتنی، ئەوەندەی نەمابوو خۆی بە پێوە نەگرێت.

بلیۆنها گەرد لە گەردی وەچەکانی ئادەم لەسەرەتای خەڵقەتدەییەوە بەرزەرەبوون، تا لەخاکێکی نزیك بەککە نیشتنەوە، خاکێك بە (نوعمان) ناوزەد دەکرا، ئەویش لەلای کێوی عەرەفەوە بوو، لەپشتی کێوەکەشەوە باڵەکانی لۆسیڤەر دەرکەوتن، لۆسیڤەر بەحەسرەتی بینینیانەوە بوو، گەردە وەچەکان بە تەنیشت و باڵی یەکترەوە ریزببوون، تا بەئاسمانی فریشتەکان گەیشتن، لەژماردن نەدەهاتن، بەو ژماردنەی لۆسیڤەر کردنی، زیاتر لە سەد بلیۆن گەردە وەچە دەبوون، بگرە زیاتریش، ئەوجا گەردەکان لەیەك دوور کەوتنەوە، تا بە جووت خۆیان ڕێکبخەنەوە، هەر دوو گەردەوەچە بەتەنیشت یەکەوە، ئەوجا خودا وێنای کردن و بەو شێوەیە لەسەر زەوی دەبن، لۆسیڤەر برشتی لەبەر برا، ڕەنگ و ڕوخساریان لەیەك نەدەچوون، تەنانەت دووانیان لەیەك نەدەچوون، پۆشاکەکانیشیان جودا بوو، بەرای جەستەیانەوە هێزو لاوازییان بەدیدەکرا، لە جل و بەرگەکانیشیانەوە دەوڵەمەند و هەژارت لێکدەکردەوە، خودا پنتکێك ڕووناکی بە نێوچەوانیانەوە لکێنرا، تیایاندابوو ئەو نوورەی نێوچەوانی خنکاندبووی، تیاشیاندابوو لەو نوورەوە دەرکەوتبوو، هەشبوو ئەو نوورەی گەیشتبووە گەردن و سینەی، تیاشیاندابوو تاریك دەچووەوە، بەسەر ئەو نوورەوە

تەمەنیان نووسرابوو، ئەو نەهامەتییەی تیا نووسراوە کە تووشی دەبێت. لۆسیفەر عاباکەی گرد کردەوەو بەرەو دیمەنێکیتر ڕۆیشت، دیمەنی فریشتەکانی سەر کێوی عەرەفە، ژمارەیان هێند زۆر بوو، ئاسمانیان پڕ کردبوو، خودا فەرمانی وێدابوون، بۆ هەر وەچەیەکی ئادەم سێ فریشتەی هەبێت، یەکێکیان فەرمانی خێری وێدەدات، ئەو دووانەکەی تریش کارەکانیان دەنووسنەوە. لۆسیفەر چاوی بەو ژمارە زۆرە هەڵنەدەمات، هەر هەمووشی بە ئاسمانەوە تەنها چەند فریشتەیەك لە پێشەوە دانیشتبوون، دانشتنێکی کڕنۆشبەرانە، تەماشای (ئادەم)یان دەکرد، کاتێ ڕوحەکە بەگیانیدا دەگەڕا.

*********

ئادەم کاتێ چاو و گوێی کرایەوە، هەستی بەڕوحی خۆی کرد. خودا بە ئادەمی گوت:

– ئادەم.. ئامانەتەکەمان خستە ڕوو، ئاسمان و زەوی و کێوەکانمان ئاگادار کردەوە ئەو ئامانەتەی ئێوە هەڵگرن، بەزەییان پێاتانا بێتەوە، تۆش ئامادەگی خۆتیان بۆ بخەرە ڕوو. ئادەم گوتی:

– خودایە.. چی بکەم؟

– ئەگەر چاکەکار بوویت، پاداشتت دەبێت، ئەگەر خراپەکاریش بوویت سزا دەدرێیت.

ئادەم ئەو ئامانەتەی لەتەك ڕوح لەبەرکردنیدا هەڵگرت، ڕوح بە کەللەیدا هەڵگەڕا، چاوی کردەوە، شتێکی سەیری بینی، خودا سرووشتی وێدا، ئادەم گوتی:

- ستایش بۆ خودای هەردوو دنیا.

ئەوە هەوەڵین وشەیەکبوو بنیادەم گوتی، ئادەم بەزانینەوە خەڵقەندە کرا، بۆیە خودای ناسی، خوداش ڕوو بەڕوو قسەی لەتەکدا کرد، لەبەر ئەوەی هەوەڵین خەڵقەندەی بنیادەمییەکەی خۆی بوو، بەر ڕەحمەت و سۆزی خودا کەویت)).

دواتر خودا پێیگوت:

- ئەی ئادەم.. بڕۆ بۆ لای ئەو فریشتانەی لەوێ دانیشتوون، پێیان بڵێ.. سڵاوی خواتان لێ بێت.

ئادەم بەرەو پیریان ڕۆیشت و گوتی:

- سڵاوی خوداتان لێ بێت.

ئەوانیش سڵاوەکەیان بۆ سەندەوە.

خودا پێیگوت:

- ئەی ئادەم.. ئەوە سڵاوی تۆ و نەوەکانت دەبێت.

خودا هەوەڵین شتێك فێری ئادەمی کرد، سڵاوکردن بوو. لۆسیفەر تەواو بە ئادەم ناڕەحەتبوو، دەتگوت هەناوی گڕی گرتووە، ئەو بیری لەخراپەکاری ئادەم دەکردەوە.. نابێت خراپە نەکات؟ خودا فریشتەکانیشی سەرقاڵی ئادەم کردووە، تا فەرمانی خێریان وێبدەن. ئەوجا خودا بۆ تاقیکردنەوەی ئادەم گوتی:

- ئادەم هەردوو دەستم نووقاندووە، یەکێکیان هەڵبژێرە.

ئادەم بەدەم سەر نەویکردنەوە بیری لەو قسەیە کردەوە، ئەوجا گوتی:

– لای ڕاستی خودام هەڵبژارد، هەردوو دەستی خودا ڕاستەن و پیرۆزن.

خەڵقەندەیەکی باوەڕدار و کارچاکی خۆی بۆ خودا پەیانکرد، چون کەس وەك ئەو نەبێت و هاوتای نەبێت، بەفەرمانی خودا بەرچاوی ئادەم وەك شتێك بکرێتەوە بەر چاوی ڕووناکەوەبوو، لەوێوە تەماشای سرووشتی کرد، دیمەنگەلێکی نەوەکانی خۆی وەبەرچاو هاتەوە، بەڕێکوپێکی لەخاکی عەرەفە وێستابوون، خۆیشی لەناوەندیاندا وێستابوو، کە ئەو دەم خۆی لەخاکی عەدەندا بوو، چاوی بەجیاوازی گوزەرانیان کەوت، لەمەڕ هەژاری و دەوڵەمەندی، هێز و بێ هێزیان، ئادەم گوتی:

– خودایە ئەگەر یەکسانیت لەنێو بەندەکانتا بکردایە...

خودا قسەکەی پێبڕی و گوتی:

– من حەز بە شووکرانەییان دەکەم.

ئادەم چاوی بەنەوەکانیدا گێڕا، ئەوەی کەڕی تووش ببوو، ئەوەی شەل بوو ئەوەی کوێر بوو، ڕووی لەخودا کرد و گوتی:

– خودایە بۆچی وات بەنەوەکانم کرد؟

– تا شوکرانەی نیعمەتەکەم بکەن.

تەماشای کرد، قەومێکی بینی لەڕیزی پێشەوە ڕووناکییەکی مەزنیان بەسەرەوە، گوتی:

– خودایە ئەو قەومە کێیە، ئەو نوورەیان بەسەرەوەیە، دەیانبینم دەرکەوتووترین ڕووناکیان بەسەرەوەیە؟

– ئەی ئادەم.. ئەوانە پێغەمبەر و پەیامبەرانن، هەر لەنەوەی تۆن، کە دواتر بۆ بەندەکانم دەیانێرم.

ئەوجا خودا بانگی لەڕوحەکان کرد و گوتی:

– ئەی بنیادەمەکان.. من خودای ئێوە نیم؟

گوتیان:

– تۆ خودای ئێمەیت.

گوتی:

– زەوی و ئاسمان شایەتحاڵتان دەبن، ئادەمی باوکیشتان هەر شایەتحاڵتان دەبێت، کە ڕۆژی پەسلان نەکەن بڵێن نەمانزانی، یا بڵێن ئێمە ئاگامان لێنەبوو، شەریکم بۆ پەیدا مەکەن، تا بیرتان بخەمەوە پەرتووکەکانتان بۆ دەنێرم.

گوتیان:

– خودایە.. باوەڕمان پێتە، تۆ خودای ئێمەیت، بێجگە لەتۆ خودایەکتر نییە.

خودا ئادەمی فێری ناوەکان کرد، فێری چاکەو خراپەی کرد، بڕێك لەنەوەی ئادەم بەرچاویان تاریکبوو، خودا پرسیاری لەفریشتەکان کرد:

– خوو ڕەوشتی ئەرانەی نوور بەچاویانەوەیە بەلاتانەوە چۆنن، کە مەزەندەتان دەکرد خراپەکارە بن؟

فریشتەکان ئادەمیان بینی ئیشارەتی بۆ زۆربەی هەرە زۆری ئەو نەوەیەی خۆی کرد، کە نوور بەچاویانەوەیە، وەلێ لەمانای ئەو نوورە نەگەیشتن، تەماشای لۆسیفەریان کرد، کە سەری دانوواندبوو، گوتیان:

– خودایە هەرخۆت بەهەموو شتێك دەزانیت، هەر خۆت دانا و زانایت.

خودا بە ئادەمی گوت:

- ئەی ئادەم.. خووڕەوشتی نەوەکانتیان پێ بڵێ.

ئادەم خووڕەوشتی پیاوچاکان و پێغەمبەران و پەیامبەران و زانا و دانایانی پێگوتن، باسیشی لەنادیاری کرد، ئەو نوورەی نیوچەوانیشیان یانی باوەڕ و چاکەکاری و ڕەزامەندی و شوکرانەکردنی خودایە، ئەو ڕووناکییە یانی ئاشتی. زۆربەی هەرە زۆری نەوەکەی باوەڕدارن و خراپەکارە نین و خوێنڕێژیش نین، ئەوەی دوای خراپەکاری دەکەوێت، خەڵکانێکی هەوەسبازن، کەمترینیان دوای ئەو خراپەکارییە دەکەون و خوێن دەڕێژن.

خودا بەفریشتەکانی گوت:

- پێمنەگوتن من لەنادیاری دەزانم، نادیاری ئەرز و ئاسمان دەزانم، چی هەیەو چی تیا شاردراوەتەوە.

فریشتەکان تەماشای (لۆسیفەر)یان کرد، کە خودا دەیزانی لەخۆبایی بووە، ڕوخساری وەك پارچەی بنە کورتان شڕ و کۆن بوو، هەر هەموو ڕوحەکان خوڵقێندراوەکان گەڕانەوە ناوڕۆکی ئادەم، تەنها دوو ڕوح نەبێت، دەرپەڕین تا لەدوو ئافرەتدا بڕسکێن، یەکێکیان حەوا بوو، ئەویتریش لیلیس بوو، ئەوەش سەرەتای بەشەرییەت بوو، سەرەتا سیان بوون، هەموو شتێك تا ئەمڕۆ لەوانەوە دەستی پێکرد.

********

II

خویەکی زۆر ناشرینت هەیە، حەز دەکەیت ئەو چەند دێڕەی پشتی ڕۆمانەکە بخوێنیتەوە و ئەوجا بڕیار دەدەیت بیبەیت یا هەر بەسەر ڕەفەکەوە جێیبهێڵیت، بۆ خۆم گوێم لە حەزەکانت نییە، بەلاشمەوە گرنگ نییە ڕۆمانەکە دەبەیت یا بەسەر ڕەفەکەوە جێیدەهێڵیت، بەڵام تا تۆ لێرە بیت، چاک بزانە ئەنتیخریستۆس خودای تۆ نییە، بەوەش نییە مرۆڤ دەمرێنێت و زیندووی دەکاتەوە، یا ئیشارەت بۆ ئاسمان دەکات تا باران داکات، یانەخۆ زەوی شین بداتەوە، نەخەڵەتابیت بەخودای خۆڵی بچوێنیت، زۆر باش ئەوە بزانە ئەنتیخریستۆس خودای تۆ نییە.

# انتیخریستوس

احمد خالد مصطفى




لە بڵاوکراوەکانی ناوەندی فێربوون
هەولێر - بازاڕی ڕۆشنبیری - نزیک پارێزگا
07504046205 - 0662231318
نرخ: ٨٠٠٠ دینار